








بين الفلسفة والعلم والقرآن

الشيخ نديم الجسر

مفتي طرابلس

# داستانی ئیمان

## لە نێوان فەلسەفە و زانست و قورئاندا

وەرگێڕانی
نوری عبداللە صالح
ی
ئاغجەلەر

پێداچوونەوە و لێکۆڵینەوەی
دەستەی نووسینگەی تەفسیر

پێشەکی
نوری فارس حەمەخان

تفسیر



# داستانی ئیمان

## لە نێوان فەلسەفە و زانست و قورئاندا

مەبەست لە

## زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامیو سازێنەری بێداریو قیامەتی ئیسلامیی پیرۆزن.
- شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەویو رەوتگەرایی.
- بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.
- دەگەڵ رێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.
- با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت.

﴿ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ﴾ الزمر- ١٨

نوسینگەی تەفسیر

# داستانی ئیمان

## لە نێوان فەلسەفەو زانست و قورئاندا

نووسینی

**ندیم الجسر**

وەرگێڕانی : نوری عبداللە ئاغجەلەری

پێشەکی : نوری فارس

پێداچوونەوە و لێکۆڵینەوەی

**دەستەی نووسینگەی تەفسیر**

لە بڵاوکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر / هەولێر

ناوی کتێب بە عارەبی: قصة الإیمان

ناوی نوسەر: نەدیم کوڕی حسین الجسر

ناوی کتێب بەکوردی: داستانی ئیمان

ناوی وەرگێڕ: نوری عبداللە صاڵح ئاغجەلەری

چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر

کۆمپیوتەر: نوسینگەی تەفسیر

خەت: نەوزاد کۆیی

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٢٣ك ٢٠٠٣ز

چاپکردن: چاپخانەی پەروەردە

تیراژ: ١٥٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ٤٤٢ ساڵی ٢٠٠٢




هەولیر - شەقامی دادگا

ت: ٢٢٢١٦٩٥-٢٢٣٠٩٠٨

tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پێشەکی مامۆستا نوری فارس حەمەخان

سوپاس بۆ خودا، سلاو لە حەزرەت
درووود لە یاران، ڕەحمەت لە ئومەت

مامۆستای داناو زانا، کورد پەروەر و خواناس، جەنابی مامۆستا نوری عبدالله، هەڵساوە بە وەرگێڕانی ئەم شاکارە نازدارە، کەناو دارە بە (قصة ألإيمان: داستانی ئیمان) تا ڕادەیەکی باش بە کوردییەکی سەرکەوتوو، پاش ئەوەی کە ڕەشنوسەکەی تەواو کردبوو، داوای هاوکاری لە بەدە کرد، بۆ نووسینەوەی پاك نووسەکەی، گەرچی من مەشغەڵەتی تری زۆر زۆرم هەبوو و، باش باش دەزانم کە ئەم کتێبە وەك گەوهەر و ئەڵماس وایە، کڕیارو خوازیاری خۆی دەوێ، بەڵام لە خزمەت مامۆستا نوری‌دا، زۆر بەوردی لە سەرەتاوە هەتا کۆتا، لەگەڵ عەرەبیەکەیدا بەراوردمان کردەوە و، پیادا چویینەوە، بەلام لە بەر ئەوەی مامۆستا نوری خۆی چاوی یارمەتی نەئەدا، کە کتێبەکە چەند جاری نووسراوەتەوە، لەو بڕوایەدام، لەهەر شوێنێ کەم و کورتیەك لەوەرگەڕاوەکەدا هەبێ، لەهەڵەی نووسیارەوە نزیکترە و هەتا لە هەڵەی وەرگێڕ، بە هەرحاڵ بە کوردی کردنی کتێبێکی وا شاکاری نایاب، لە بابەتەیکی وا قورس و گراندا، لەلایەنی تاقە کەسێکەوە، لە بارو دۆخێکی ئاوادا، بەتایبەتی لە زمانێکی پێشکەوتووی دێرینی وەك عەرەبی‌یەوە، بۆ سەر زمانی کوردی، کەتازە لە دەوری گەشە کردندایە، قەت قەت لەمە باشتر نابێ.

بەڕاستی مامۆستا نوری حوسنی اختیاری بەنسیب بووە، کە ئەم شاکارە جوانەی هەڵبژاردووە، کە لەو ئەدەبە باڵایانەیە، کەدەبن بە خۆراکی گیان و ڕۆشنایی چاوان، لەو جۆرە کتێبە نەمرانەیە، کە شایانی ئەوەن بە ئاوی زێڕ بنوسرێنەوە، بەر منگقو مفهومی ئەم حیکمەتە دەکەوێ کە دەفەرموێ: (كلام الملوك ملوك الكلام).

یاخوا مامۆستا نوری دەستت هەر خۆش بێ، قەڵەمەکەت نەڕزێ

# پێشەکی

سوپاس و ستایشی بێ پایانم بۆ خودای میهرەبان، سلاو دروودی بێ شومار، لە سەر پێغەمبەر خۆشەویست و نازدار، پاش ئەمە عەرزم ئەمەیە لە خزمەت ئازیزانی خۆما:
لە سەرەتای حەفتاکانەوە ئاشاییم لەگەڵ ئەم کتێبە بێ وێنە، کەم مان ندەدا پەیدا کردووە، پاش ئەوەی کە بە باشی لێی حاڵی بووم، ئەشقی بووم، خولیایی بە کوردیکردنیو کردنی بە دیاری بۆ نامەخانەی ئاوەدانی کوردی کەوتە سەرم، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە سەرپەرشتیار بووم، لە پسپۆڕی زمانی عەرەبیدا، لە ناوەند و دوا ناوەندیی قوتابخانەکانی پەروەردەدا، ئەم ئاواتەم دواکەوت، پاش ئەوەی ڕاوێژم بە هەندێ مامۆستای پسپۆڕ کرد لەم بوارەدا، پاش ئەوەی کە خانە نشین بووم، پشتم بە خوا بەست و دەستم کرد بە وەر گێڕانی، بەڵام بەهۆی ئەوەوە کە چاوم یارمەتی نەدەدام، ناچار هانام برد بۆ خزمێکی خۆم، کە خوشکێکە، یارمەتی دام لە خوێندنەوەی ئەصڵە عەرەبیەکە و ن لە نووسینەوەی وەرگەڕاوەکەی.
جالەبەر ئەوە ئەم کتێبە کتیبێکی فرە لایەنە، فرە بابەتە، ڕاوێژم بە فرە مامۆستای پسپۆڕ لەو بابەت و مەودایانەدا کردووە، هەرکەسێ لە بابەتی خۆیدا- وەك: فەلسەفە و منطق و بەلاغەو عەقیدەو پزیشکیو سروشتناسی... تاد- بە پێی توانای خۆی یاردەری پێشکەش کردووم، جا پاش ئەوەی لە ماوەیەکی قیاسی دا هەڵسام بەم ئەرکە پیرۆزە، تەواوی کتێبەکەم وەرگێڕایە سەر زمانی شیرینی کوردی، بۆ دڵنیایی تەواو، لەگەڵ بەڕێز: مامۆستا نوری فارس حەمەخان دا، دەقی وەرگەڕاوەکەمان دوو بەدوو، لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی، لەگەڵ دەقی ئەصڵە عەرەبییەکەیدا بەراورد کردەوە، بەپێی بواری گونجاو توانای سنوورداری خۆمان، لە هەر شوێنێ پێویست بە ڕاستکردنەوەبێ، یاهەڵە بژێریەك،

یا گۆڕانکارییەك بوو بێ، بە هاوکاری هەردوو کمان کردوومانە، لە هەندێ جێگە ڕستەکانمان دا ڕشتۆتەوە.

واتە: دووبە دوو پێکەوە پیادا چوونەوەیەکی تەواوی وردمان ئەنجام داوە، ئەوەمان چەسپاندووە کە کوردییەکی ڕەسەنی ڕەوانی پەتیەوە دەقاو دەق تەرجەمەی ئەصڵە عەرەبیەکەیە، لە بەر ئەوە زۆر سوپاسی ئەو ماندوو بوونەی مامۆستا نوری فارس دەکەم، کە لەگەڵما، بۆ خزمەتی ئەم کتێبە کێشاویەتی، خوا پاداشتی باشی خێری بداتەوە، هەروەها سوپاسی مامۆستا مەلا ئەبوبەکر دەکەم، کە ئیمامی مزگەوتی شەهیدانە، لە گەڕەکی مامۆستایانی لە سلێمانی، هەروەها سوپاس و ڕێزم بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بەهەر شێوەیێ یاریدەیان داوم، بەتایبەتی بەڕێز جەنابی حاجی مخلص کە ئەرکی لە چاپدانی ئەم کتێبەی گرتۆتە ئەستۆ.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العلمين

نوری عبدالله ئاغجەلەری

**سەرپەرشتیاری پسپۆڕی خانەنشین**

**لە زمانی عەرەبیدا**

**١٠/ رەجەب/ ١٤٢٣ ك**

**١٧/ ٩/ ٢٠٠٢**

# پێشەکی نووسەر

## چۆن ئەم کتێبەم بە دەست گەیشت

ئاوەدان بێ یاریگای کاتی منالی و، هەوارگەی سەردەمی لاوی، چەوندە شیرین و دلگیرو خەم هەژێنە، بەتایبەتی لە کاتی دێنی و سەرلێدانیدا، لە پاش چەشتنی تالی و سوێریی غەریبایەتی و پیریتی!

کاتێ پێی شاد دەبینەوە، پیری وەك کاژە هەور، پەردەو تارای لاوازی پێ پۆشیوە... بەراستی ئەم جۆرە یادگارییانە، گێژەلووکەی بیرەوەری و یادگاری، لەناخی دەروونماندا هەلدەکات، کە وەك بۆتە ئەم سۆزو هەستانەی تیادا دەتوێننەوە و ئاوێتە دەبن: هاودەمی و هۆگریو سۆزو هۆرۆییو داخ و نامۆیی و خەم و خەفەت و هات و هاوارو بێ ئومێدیو دلدانەوە و فەرامۆش هاتن.!

ئای لەناو گێژاوی ئەم هەموو خەم و پەژارە خەمۆکاویەدا چەن خۆشە گریان، کاتێ بەگریان خۆمان و ئەو ئازیزانەی لێیان دابڕاوین بلاوێنینەوە، هەروەها ئەوانەشی کە هاکا لێیان جیابووینەوە!

وەك رێبوارێك لە زێدو نیشتمان هەلکەنراو، کەلەتاو رووییو دابڕانی لە ئازیزان و خۆشەویستانی، کولی گریانی بەهیچ شتێ دانامرکێ، مەگەر بە ئومێدی شادبوون بە کۆمەلێ خۆشەویستانی نوێ، کەچاوە نواڕی دەکەن لە وولاتێکی دوور دوور!

لەم ئاخرو ئۆخری تەمەنەدا، ژیان لەبەر چاومان زۆر بەنرخ و شیرین دەبێ، لەهەمان کاتدا بەرە بەرە زۆر تفتو تال دەبێ، بیردۆزەی مردن و نەمان تۆقێنێ لە هەموو کاتێ پتر پێویستیمان بە باوەڕی تەواوە، بەو خوادایەی کە نەمری هەمیشەیی یە، کە خۆی بەلێنی ژیانێکی تری بێ بڕانەوەی پێ داوین، ئەگەر ئومێدی ئەو ژیانە نوێیەی تر نەبێ، ئەم ژیانە کەم و کورتەی دنیا بێ هوودەو پڕوو پووچ دەبێ!

لەو یادەوەرییانەی کە هەرگیزو هەرگیز لە بیرم ناچێ، لە شارەکەی خۆم (مزگەوتەکەی تەینالە) کە کەوتۆتە ئەو پەڕی ئاواییەوە، کەوتۆتە ناو باخ و مێرگێکی

دڵرفێنەوە، هەموو یادگاری زێڕینی منداڵیم وا لەوێ چونکە بەیانییەکانی جێژنم دەهێنێتەوە یاد، کاتێ باوکم لەگەڵ گزنگی خۆرهەڵات دەهات و، منیش لەدوایەوە دەرۆیشتم بۆ زیارەتی مردووەکانمان لە گۆڕستانەکەی تەنیشت مەزگەوتەکەدا، پاشان نوێژی جەژنی لەمزگەوتەکەدا دەکرد، هەروەها لەیادەوەریە خۆشەکانی ئەو مزگەوتەیە، ئێوارە فێنکە خۆشەکانی هاوین، یاریم دەکرد لەبن دارەگەورەکەی ناو حەوشەی مزگەوت، کەلە نێوان حەوزەکەو بیرەکەدا بوو، باوکیشم لە ژوورەکەی خۆی دادەنیشت، کۆمەڵێ لە پیاوماقوڵان و مامۆستایانی بەڕێز لەدەورەی ئەڵقەیان دەدا، گوێبیستی وتەکانی دەبوون، هەرکە دەرفەتم دەست کەوتایە، هەستم بکردایە، کەباوکم بێ ئاگایە لەمن، ڕام دەکرد بۆناو باخەکە، لە پەرژینەکەی قامیشێکی درێژم دەبڕی و، دەمکرد بە ئەسپ و غارم پێ دەکرد.... هەر لەو یادەوەرییانەمە منارە پێچاو پێچەکەی مزگەوتەکە، کە بە پێپلیکە کانیدا سەردەکەوتین، پاش کەمێ کە خۆمان دەبینییەوە لەناو ماڵی مزگەوت.... دێتە یادم ئەو پیرە مێردەی کە بانگدەربوو، کە وڕکم لێدەگرت، لەگەڵ ما سەرکەوێ بۆ بانگدان، تا بانگ بدا، لە پێش هاتنی کاتی بانگدا، ئەویش دادەما، کە هەڵم خەڵەتێنی ودام بمرکێنێ، تاکاتی نوێژی شێوان دێ... هەروا پەرۆشی دایکم دەهێنێتەوە یادم کە چۆن کاتێ باسی ئەو منارە سەیرەی مزگەوت و بیرەکەم بۆ دەکرد، لەگەڵ پەرژینە قەرەمە چڕەکەی، ئەویش هەمیشە دەیترساندم لە مارو مێروو، جەختی خزمەتکارە دەکرد کەنەهێڵی بەتەنها سەرکەومە سەر منارەکە، یابچمە قەراغ بیرەکە...

ئەمانەهەموو دێنەوە یادم، کە زۆربەیان مردن پێچاونیەتەوە، هەموو ڕۆیشتن و ، ئاە و ناسۆرێکی زۆریان لەناخی دەروونمدا بەجێهێشت، لە کەلاوەکانی ڕۆژگاری دووروو درێژدا، هەر کاتێ کە دەگەڕێمەوە بۆ تەینالْ ئەم یادەوەرییە خۆش و ناخۆشانە، وەك سکلی سوورو شیشی سوورەوە کراو، هێرش دەبەنە سەر ئەم دڵە پڕ لەخەم و جەخارە....

ڕۆژگاری دوورودرێژ دووری خستینەوە، دوور کەوتینەوە لە گەڕەکەکەمان، لە مزگەوتەکەمان، تەنانەت ئاخر شت دووری خستینەوە لە شارەکەمان... ئەوەتا پاش غەریبیەکی زۆر گەڕاینەوە بۆ لای... شەوق و ئارەزو پاڵیان پێوە نام بەرەو (تەینالْ)

لـەوێش ڕووم كـردە مـزگەوتەكە لـەكاتی گەرمـەی خـۆردا، كـە نوێژكـەرانی لـێ نەبوو كەوتمە هاتوو چۆ لەنێوان یاریگاكانی منداڵیما، هەموو یادەوەرییەكانم وروژاند... پاشان گریانێكی زۆرم بۆ هات.

لـە كاتێكا كەلـە دەریـای بێدەنگیدا نوقـم بـوو بـووم، گوێـم لەهیچ نـەبوو، مەگەر لـەدەنگی گریانەكەی خۆم نەبێ، كە گومەزەبەرزەكانی مزگەوت دووبارەیان دەكردەوە، ئالـەم كاتـەدا لـە هۆدەكەی لای ڕاستمەوە گوێ بیستی دەنگێ بووم واتە: ئەو ژوورەی كەلـە منداڵیم دا دەترسام بچمە ناویەوە، لە سام و بیمی ئەو گۆڕنەی كەلەناوی دا نێژرا بوون، كوتوپڕ لەدەرگاوە پیرە مێردێكی نوورانی، سەرپاك سپی، جل نامۆ، سەری كێشا، بەرەو لای من هات، پاش سلاوكردن دانیشت، بەزمانێكی عەرەبی ڕەوان، بەڵام شێوەی ناعەرەبێتی پێوە دیار بوو، فەرمووی (ئەی برا! هۆی گریانت چی‌یە؟) وتم: یادەوەرییەكی زۆری كاتی منداڵی ئەم مزگەوتەم هەیە لەسەردەمی باوكمەوە.

فەرمووی: (باوكـت كێ‌یـە؟) هەركـە نـاوی بـاوكم هێـنا، ئـەو لـەشی كەوتە لەرزین، بەچاوێكی فرمێسكاوی‌یەوە سەرنجی دام و وتی: (باوكی تۆ شێخ جسر بوو؟) وتم: بەڵـێ گەورەم! ئـەی جەنابـت كێ‌یـت؟ وتـی: مـن بنەچەی دوورم میصرە لـە (ئالی مائی)م، كە لـەوێوە هەندێكیان پەڕاگەندەی شام بوون، هەندێكی تریشیان پەڕاگەندەی حیجازبوون، لـە حیجازەوە چارەنووسی خوایی باپیرەی باوكمی ڕاپێچ كرد بۆ هیندو لەوێ جێگیر بوو، ناوی خۆم (حەیرانی كوڕی ئەزعەفی بەنجابی)یە.

وتم: چـی تـۆی هێـناوە لـە هیـندەوە بـۆ ئـەم جێگایە؟ وتـی: من لە هیندەوە نەهاتووم بۆ ئێرە، بەڵكو لەسەمەرقەندەوە هـاتووم، وتم: چـی تـۆی هێـنا لـەو جێگا دوورەوە بـۆ ئـەم شارەی ئێمە، هۆی مانەوەت چی‌یە لەم مزگەوتەدا؟

وتـی: لەڕێگـەی سـەفەرەكەمدا لام دا بـۆ ئـێرە، بـۆ زیـارەتی باوكـت: منـیش بەسەرسامی‌یەوە تەماشام كرد، لە دڵی خۆمدا وتم باوكم دەمێكە كۆچی دوایی كردووە!

هەستی بەخەیاڵەكەم كـردو گـوتی: سەرت سوڕنەمێنێ من سەفەری حیجازم لەبەرە، لام داوە بۆئێرە كـە سـەردانی ئارامگـای باوكـت بكـەم/ هـەروا زیـارەتی ئـەم مـزگەوتەش بكـەم، كەلـەكاتی خـۆی‌دا شـێخی مامۆسـتام زۆر خۆشەویسـتی كـردبوو لـەلام، پـێی ڕاگـەیاندم كـە باوكـت ئالـیرە تەشریفی دەرسـی وتۆتەوە، نوێژكەران ڕێنماییان كردم كە

دەرسی تیادا وتوەتەوە، دەبینم ئەم مزگەوتە زۆر لە مزگەوتەکەی خەرتگ دەچێ، ئەو مزگەوتەی کەوا خۆشترین و بەنرخترین ژیانم تێیدا بردۆتە سەر، لەبەر ئەوە پێم خۆش بوو کە چەند ڕۆژێکی تێچدا بمێنمەوە، تا کاتی حەج دێ، خۆم تەرخان بکەم بۆ خواپەرستی، لەبارەگای ئەو مامۆستایەی کە مامۆستاکەی منی ڕێنمایی کرد بۆ ڕێگەی خوا... وتم: مامۆستاکەی تۆ کێیە ! وتی: شێخ ئەبو نوری مەوزوون بوو، کە یەکێ بوو لەزانا هەرە بەرزەکانی سەمەرقەند!!

وتم: هەمو ڕۆژەکانت هەر بە پەرستش و خوا پەرستی دەبەیتە سەر؟ وتی: ئێستا بەڵێ بەڵام لەمەو پێش داستانی سەرلێشێواوی و باوەڕی خۆمم دەنووسی‌یەوە، ئەوەی کە شێخی مەوزوون پێی نوسیمەوە، لەو داستانەوە باوکتم ناسی.

وتم: داستانی باوەڕو سەرلێشێواویت چی‌یە؟

وتی: چیرۆکێکی دورو درێژە کە خودا یارمەتیم بدا بلاوی دەکەمەوە بەناو جەماوەردا.

ئینجا پیرە مێردەکە چووە ناو ژووری قەبرەکانەوە، لەپاش کەمێ هاتە دەرەوە، دەفتەرێکی گەورەی پێ بوو، لەبەردەممدا داینا، فەرمووی: (ئەمە ئەمالی شێخ مەوزوونە)، خۆم بەدەستی خۆم ئەم نوسخەیەم نووسیوەتەوە بەشێوەیکی جوان بەبێ کەم و کوڕتی.

وتم: ئەمە کتێبێکی گەورەیە، ڕێگەم دەدەی بیبەمەوە بۆ ماڵەوە هەتا لەیەك دووشەودا بیخوێنمەوە، پاشان بۆت بهێنمەوە؟

وتی: ئایا تورکی‌یەکی باش دەزانیت؟

وتم بەڵێ زۆر باش دەیزانم.

وتی: کتێبەکەت دەدەمێ، کاتێ باوەڕم بوو کە تۆ بەڕاستی کوڕی شێخی جیسریت و شایانی خوێندنەوەی ئەم پەڕاوە مەزنەیت.

وتم: باشترین بەڵگە بۆ چەسپاندنی ڕەگەزی بەندە، ئەوەیە کە تەشریف بێنی لەگەڵمان بۆ ماڵەوە، تا خەڵکی بەگشتی شایەتی ئەوەم بۆ بدەن کە من کوڕی شێخی جیسرم، لەهەمان کاتدا کتێبخانەکەی باوکمت پێ نیشان دەدەم.

فەرمووی: پێویست بەم هەموو زەحمەتە ناکات، بەڵام یەك پرسیارت لێ دەکەم: مەزنترین کتێبی باوکت کامانەیە؟ کام سەرباسی لەهەموو سەرباسەکانی تر گرنگترە؟

وتم: بەناو بانگترین کتێبی باوکم (الرســالة الحميدية) یە، گرنگترین سەرباسی ئەو باسەیەتی، کە سەبارەت بە چەسپاندنی بوونی خودایە، لەگەڵ بەرپەرچدانەوەی زانایێ باوەڕە سروشت پەرستەکان، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم باسە هەرە گرنگە، لەنێو چەند باسێکی تردا، کە پەیوەندی یان بە چەسپاندنی بوونی پێغەمبەرایەتیەوە هەیە شاراوەتەوە، کەوان لەسەتای کتێبەکەوە، هەروا بەهەندێ حیکمەت و فەرمایشتی بەرز کەوا لەدوایەوە ! لەبەر ئەوە هات بەدڵما کە ئەم باسە گرنگە زیادەکانی لێی فڕێ بدەم/ و کورت و پوختی بکەم و سەربەخۆ بەچاپی بگەیەنم.

فەرمووی: باوەڕم کرد کەتۆ بەڕاستی کوڕی مامۆستا جیسریت، لەهەمانکاتدا شایانی هەڵگرتنی ئەم سپاردەیەیت، ئەم کتێبەم بەدیاری بۆ یادگاری پێشکەش بەتۆ کرد، ئەم کتێبە پوختەی کتێبەکەی باوکتی واتیاداوە داستانی گومان و باوەڕی منی بەتەواوی وا تیادا، وەری بگرەو وەری بگێڕەو چاپی بکەو پەخشی بکەرەوە بەناو خەڵکا، من لەم بارەیەوە داوای کرێ و پارەت لێ ناکەم تەنها داوای پاداشتی باش لەخوای بەخشندە دەکەم، کە ئەم کارەم ساخ بۆ ڕەزامەندی ئەو بێ و بەس، مەردووم بەگشتی سوودی لێوەربگرن و، خۆشم لە پاش مەرگم لەپیت و فەڕو خێرو بێری بەهرەمەند ببم.

لە پاش چەند ڕۆژێ ئەم پیاوە باشە موبارەکە بەرەو وڵاتی حیجاز بەڕێکەوت، منیش لەماوەی چەند ساڵێکا ئەم پەڕاوە کەم مانەندەم وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، پاشان ڕۆژگار منی هەڵدا بۆشاری (تەشقەند).

گەورەترین ئاواتم ئەوە بوو بگەمە گوندی (خەرتەنگ) هەتا سەردانی حەیرانی کوڕی ئەزعەف بکەم... وەرگەڕاوی کتێبەکەی پێ نیشان بدەم، هەروەها دیدەنی وزیارەتی گۆڕی پیرۆزی ئیمامی بوخاری بکەم ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێت- جا بۆ ئەم مەبەستە، پیاوی مەردی خانەدان: شێخ ضـــايا والدين باباجانی کوڕی عەبدی صالح، زاهیدی عابید وەلی خوا، باباخان، موفتی گەورەی وڵات ڕەحمەتی خوای لێ بێت- بۆ گەیشتنم بەم مەبەستە، ئەم زاتە یارمەتی دام، کە یەکێ بوو لەخۆشەویستانی باوکم، کاتێ هەستی پێ کردم ئارەزوی سەردانی گوندی خەرتەنگم هەیە و گەورەیی نواند، لەگەڵما هات بۆ شاری (سەمەرقەند) لەوێشەوە بۆ گوندی (خەرتەنگ) لەوێ

بەهۆی بجێوری مزگەوتەکەوە زانیم کە حەیرانی کوڕی ئەزعەف ڕۆیشتووە بۆ حەج، لەمەککەی پیرۆز وەفاتی کردووە.

لەوێ سەردانی مزگەوتی پێشەوا بوخاریمان کرد، لەسەر گۆڕی ڕاوەستاین، کە سەرنجم دا مزگەوتەکە، وەکو حەیران باسی کردبوو ڕێك وابوو، زۆر لەمزگەوتەکەی تەینالْ دەچوو، کە تاك کەوتبوو لەنێو باخ و ڕەزێکی زۆردا، کەتەماشام کرد وا مەرقەدی ئیمام وا بەدەرەوە، خانووی بەسەرەوە نییە، والەناو باخچەیەکا، لەبن گەورە دارێکی سێبەر چڕی فێنکدا، گۆڕێکی ئاسایی، نە هەڵبەستارە، نەگەچکاری کراوە، نەلاوانەو چەتری بۆ کراوە، نەڕازاوەتەوە، چوومە ناو ئەو ژوورە بچووکە، کە حەیران و شێخ مەزونی مامۆستای دەرسیان تیادا دەخوێند، بینیم وەکوو وەصفی کرد بوو بۆم وابوو، دەیڕوانی بەسەر گۆڕی ئیمامدا، لەوێ نوێژم کردو، ڕەحمەتم نارد بۆ گیانی حەیرانی کوڕی ئەزعەف و مامۆستاکەی، کوڵی گریانم بۆهات بەشێوەیەکی وەها هاوڕێکەم سەری سوڕما لەم گریانەم.

ئابەم شێوەیە ئەم کتێبە گەیشتۆتە دەستم و کردوومە بە عەرەبی، کە ئێستا وا پێشکەشی ئەکەم بەخوێنەرانی بەڕێز، ئەو سپاردەیەی کەلە ئەستۆمدا بوو خوا یاربێ، وا جێ بەجێم کرد.

**هەژاری بەردەرگای ڕەحمەتی خوا**
**عبدالله نەدیم کوڕی حسین الجسر**
**موفتی تەرابلس**

# ڕاکردن بەرەو شێخ مەوزون

سوپاسی بێ هاوتا بۆ خودای بەخشندەو بەخێوکەری گشت گیانەوەرێك، سڵاوو درودی خوا لەپێغەمبەری سەروەرمان (محەممەد) کۆتایی هێنەری پێغەمبەران و پەیامنێران.

بەندەی بێدەستەڵات، هەژار بۆ بەخشندەی خودا، (حەیرانی کوڕی ئەزعەف مائی بەنجابی) دەڵێت:

کاتێك خوازیاری زانست بووم لەزانکۆی (پیشاوەر)، خۆرسکی خودم، هەردەم پەرۆشمەندو ئارەزومەندبووم بۆ زانیاری : کە هەموو نادیارێك رووناك دەکات، مل درێژ دەکات بۆ هەموو نەزانراوێك، بەمە لەبنەمای هەموو شتێك و ناوەرۆکی و، هۆکارو دەردەکانی، نهێنی و کارزانیەکانی دەکۆڵێتەوە؛ خو و دابم وابوو، کەپرسیار بکەم لەمامۆستایان و هاوەڵانم، لەم گەردوونە، کەچی‌یە، کەی دروست بووە، لەچی بنیاد نراوە، کێ دروستی کردووە، چۆن دروستی کردووە؟ لە بەرامبەر ئەم پرسیارانە سەر زەنشت دەکرام و،بەگاڵتەوە وەڵامم دەدرایەوە، مامۆستایانم دەربارەی من دەیان ووت: ئەمە خوازیاری زانست و ئایین نی‌یە.. بەڵکو فەلسەفەچی و بێفەڕە، تاوای لێهات بوومە گاڵتەچی هەموو هاوڕێیانم، پشتگوێیان خستم، پێشبڕکێیان دەکرد لەفەرامۆشکردن بۆ ڕەزامەندی مامۆستایان، بەجۆرەها ناو ناتۆرەی دژوار ناویاننام، هەتا زانکۆی فراوانیان لێ تەنگ کردم،....

بەڵام ئەم جودایی و گاڵتەپێکردنەیان سوربوون و دوو دڵی زۆرتر کردم، تا لەناخمدا چەسپا کە ئەو ڕاستیانەی، کە بەدوایاندا وێڵم، دەرکی پێ ناکرێ و نازانرێ، ئەقڵ و ئایینیش کۆ نابن، مەگەر لەرێی فەلسەفەوە نەبێت؛ گەر وا نەبوایە مامۆستاکانم دوورەپەرێز نەدەبوون لەفەلسەفە، وەڕس نەدەبوون لەهاتن لەگەڵمدا بۆ قوڵایی باسەکانم، لەهەموو موناقەشەگرتنێکی عەقڵیدا، دەربارەی نهێنی بوون (سر الوجود)، کەوتمە فەرامۆشکردنی وانەکانی دین، وێڵیم بەدوای کتێبەکانی فەلسەفەدا گرتەبەر، بەڵام

لەولاتی خۆماندا هێجگار کەمم لێی دەستگیر بوو، تا وام لێهات بەبێ تێگەیشتن دەم خوێندەوە، رۆژ بەرۆژ، سەر سورمانیی و دوو دڵی و موناقەشەگیریم زۆرتر پەرەی دەسەند، کەتا ئێستاش ئەمە حاڵمە، هەتا مامۆستاکان لەمن نائومێد بوون، ئەوان ترسان لێم، کە دەردەکەم سەربکێشێ و تەشەنە بکا بۆ هاوڕێکانم، لەبەرئەوە بڕیاری دەرکردنمیان دا لەزانکۆ.

ئەم هەواڵە هەورە تریشقەیەك بوو لەناخی باوکمیدا، هەوڵیدا بمخاتەوە سەر رێگای راست، بەهەموو ژیرو سۆزیەوە، ئامۆژگاری کردم کەدەست بەر داربیم لەفەلسەفە و، رووبکەمەوە زانستی ئایین، ئەگەر رۆژانی خوێندنم تەواو بوو ئەوکاتە بۆم هەیە بەئارەزووی خۆم بە دروستی بچمە قولایی خوێندنی فەلسەفەوە. لەدوا ووتەیدا پێی راگەیاندم : ئەی حەیران! منیش بەم گێژاوەی تۆدا تێپەڕبووم، ناخم تامەزۆری فەلەسەفە بو، کەوتمە گۆمی دوو دڵی و سەرسامییەوە، بەلام منیش کاتی خۆی مامۆستای خواناسی گەورەمان، شێخ (ئەبونور مەوزونی سەرمەرقەندی)، کە فەقیهێکی گەورەو، زانایەکی بەرزو، فەیلەسوفێکی سەرکەوتوو بوو، ئامۆژگاری کردم، وەك ئەم ئامۆژگارییەی من بۆ تۆ، هەروەها پێی وتم : (فەلسەفە دەریایە، بەپێچەوانەی دەریاکانەوە، چونکە کەشتیوانی فەلسەفە دووچاری ترسناکی و ناهەمواری لەرۆخ و کەناریدا بەپێچەوانەی دەریای ئاساییەوە دەبێتەوە و، دڵنیایی و ئیمان لەبنی و قووڵاییدا دەستگیر دەبێت).

جا لەبەرئەوە ئێستا ئەم بابەتە دوور بخەرەوە لەخۆت، ئەی کوڕەکەم، ئەم بڕیارە ناتەواوە، شێواوە، بڕاوە، چونکە لەسەر عەقڵ و ئیمانت ترسناکە.

وتم : ئایا عەقڵ و ئیمان جیاواز و دژ بەیەکن؟

ووتی : خوا نەکا.

وتم : کەواتە ئەم مامۆستا زانایانە بۆچی هەموو موناقەشە و گفتوگۆیەکی عەقڵی لەبابەت جیهان و دروست بوونیەوە، بەرەوای من نابینن؟

وتی : گەورە زانایانی ئاینی، لەم موجادەلە عەقڵیانە لێبوونەتەوە، بۆ وەلام دانەوەی بێباوەڕان و کافران، چەندەها کتێبی دووروو درێژیان نووسییەوە، بەلام مامۆستایان

قینیان دەبێتەوە لەو قوتابیەی، کە لەکاتی خوێندنا هاوەردی فەلسەفە بێت، چونکە بۆچونیان وایە کەئیمانی ئاینیان دەترازێنێ.

وتم : بەلام برایانی، خوێندنگاو زانکۆکانیتر، فەلسەفە دەخوێنن، وەك زانستێکی رەسەن کەخوێندنی پێویستە، کەواتە سوود چیە، گەر قوتابیانی زانیاریە ئاینیەکان لە فەلسەفە دووربخرێنەوە، کەئەمانە کەمێکن لەچاو قوتابیانی زانیارییەکانی دونیادا، ئەمانە چۆن دەردەچن گەر رۆژێك لەپلەی راوێژکاری و فتوادا بوون، ئەگەر یەکێك مەسەلەیەکی پێدان، کەبەکاریگەری فەلسەفە بەدەرخرابێت، کەفێری بووە بەبێ ئارەزوومەندی خۆی؟ ئایا دەبێت دەستەوستان بەهەلوێستێکی کرچ و وشکەوە بمینی، وەك چۆن مامۆستاکانم ئێستا دوورم دەخەنەوە لەخۆیان، باوکە گیان دەزانی ئەم حالە بەم شێوازە دەبێتە هۆی زیادبوونی بەرفراوانی بێباوەڕی بەخودا لەناو خەلکدا.

وتی : ئەمە راستە، بەلام شێخی گەورەمان شێخ مەوزون دەلێت، خوێنەری کەمی فەلسەفە، دادی تێگەیشتن نادات، ئایا لەو باوەڕەدایت کەمەودای قوتابخانەکانی وانە فەلسەفەییەکان بەرفراوان بکرێت، هەتا هەموو قوتابیەك و هەموو کەسێك فەیلەسوف دەرچێت؟.

وتم : نەخێر. بەلام ئەم بەرفراوانیە، کەهەرچەندە نابێت، سەبارەت بەقوتابیان گرنگ نییە، بەلام بۆ زانایانی ئایینی گرنگە، بەلکو پێویستییەکی هەمیشەیی رەسەنە لەسەریان، تا بتوانن هەستن بەو داواکاریانەی کەلەسەر شانیانە بۆ رێنمیای هەق و بانگەوازی کردن بۆ خوا.

باوکم بەکزییەکەوە سەری لەقاندو فەرمووی : ئەمە راستە، بەلام چارچییە.... ؟

وتم : ئایا، مامۆستا شێخ مەوزون، بەلێنەکەی بردەسەر.... ؟

وتی : پەیمانی نەشکاندوە، بەلام لەتەمەنی پیریدا رووی کردە گۆشەگیریی و خوداپەرستی، (بنجابی) بەجێهێشت و رووی کردە (سەمەرقەندی) نیشتمانی، ئێستا لە دێیەکی نزیکێتی، ناوی (خەرتەنکە) لەخەلکی دابڕاوە بۆ خوداپەرستی، لەو مزگەوتەیە کەئارامگای بوخاری (رەزای خودای لێبێت) تێدایە.

باوکم ئەمەی پێوتم : بەلام نەیزانی کەرێنماییەکەی دەبێ بەهۆی دەربازبوونم لەزانکۆ. کەهەولی ئەدا بمگەڕێنێتەوە بۆی، کە بڕیارێك بوو لەسەرخۆی، کە تەمەنی بەرەو پیری

دەچوو بۆ هەرگیز نەبینینەوەم.. جا بەرەو مەبەست ڕێگەم گرتەبەر پاش ڕێبڕینێکی زۆر بەپێ گەیشتمە (سەمەرقەند)، پرسیاری گوندی (خەرتەنك)م کرد، ڕێنماییان کردم، کەدووریش نەبوو لەشارەکە، بەپێ بۆی چووم، پێش خۆرئاوابوون گەیشتم، منالآن بەسەرسامی‌یەکەوە بەرەنگارم بوون، وەك چۆن بەرەنگاری هەموو نەناسراوێك دەبن.

پیاوانی گوندەکە منیان بینی، سێ پیاویان بۆلام هاتن، بەخێرهاتنیان کردم و، بانگێشیان کردم بۆ مالی گەورەی گوندەکە. کەڕێزی هاتنمی گرت و پرسیاری مەبەستمی کرد.

بەپێزانینی پێکەنی و وتی : زۆر دوورە، هەروا بەئاسانی بەختەوەر بیت بەدیداری شێخ مەوزون لەبەرئەوەی زیاتر لەپێنج سالە لەخەلکی دابڕاوە بۆ خوداپەرستی، لەو باخانەی دەوری مزگەوتی ئیمامە، ناگەڕێتەوە بۆ مزگەوت تاشەو بالی ڕەشی نەکێشێ، هاوینان لەمەزارگای ئیمامدا دەخەوێت، زستانانیش لەژوورێکی بچووکدا کەدەڕوانێتە ئارامگای ئیمام  هیچ کەسێك سەردانی ناکات، زۆر کەس خوازیار بووە پەیوەندی پێوە بکات، بەلآم نەیانتوانیوە پێی بگەن، تەنانەت ئێمەی دانیشتوانی ئەم گوندە ناتوانین پەیوەندی پێوە بکەین. بەهۆی بجێوری مزگەوتەکەوە خواردنی بۆ دەنێرین کە لەپەرژینی باخەکەدا بۆی دادەنێت بێ ئەوەی بیبینێت.

وتم: تکام وایە خودا شەرەفناکم بکات بە بەهرەی گەیشتن پێی، کە خەلکانی‌تر بۆیان نەکراوە. ئێوە یارمەتیم بدەن و پەیمانم بدەنێ، کەمن خواردنەکەی پێ‌بگەیەنم.

پیاوە خانە خۆیەکە وتی : ئەمە ئاسان ترین داواکاریی‌یە.

بەیانی زوو خوانەکەی شێخم هەلگرت، گەورەی گوندەکە فەرمانی بەپیاوێك کرد، ڕێنمایی ئەو باخەم بکات کە جێ پەرستشی شێخە، تا مزگەوتەکە لەگەلمدا هات، باخەکەی پیشاندام لەگەلْ ئەو شوێنەی کەخواردنەکەیان تیا دادەنا، نزیك بوومەوە لێی و خواردنەکەم بۆ دانا، نوسراوێکی بچووکم بەپەرژینەکەدا هەلواسی ئەم چەند پرسیارەم تیادا نووسی:

چی.... ؟ کێ.... ؟ لەچی.... ؟

چۆن.... ؟ لەکوێ.... ؟ کەی.... ؟

بەپاشدا گەڕامەوە تا درەختێکی گەورەی چراویی، لە باوەشی گرتم و حەشاریدام،

خۆم تیامەلآسدا بەجۆرێك، کەشێخ ببینم پاش کاتژمێرێك، شێخ بەڕوویەکی سامناکەوە لەناو درەختەکاندا بەدەرکەوت، کەپیاوێکی باڵابەرزی پشت چەماوەی گەنم رەنگی، سیما عەرەبی رۆحسووك بوو، بەرەو خوانەکەی هات، لەکاتی نان خواردندا چاوی کەوت بەنووسراوەکە و خوێندیی‌یەوە، ئاوڕی دایەوە بەلای راست و چەپیدا، بەلادا هات و بێهۆش کەوت، رام کرد بۆلای و ئەوەی لەتوانامدا هەبوو بۆ بەئاگابوونەوەی کردم، بەهۆش خۆی هاتەوە و، چاوەکانی کردەوە، بەدرێژی سەرنجی دام، چەند وشەیەکی درکاندو وتی : مەترسە. یارمەتی هەستانم بدە، منیش یارمەتیم دا هەتا بردمەوە جێگەی خۆی، لەقەراخ جۆگایەك دانیشت و دەم و چاوی شۆشت، بە چاوی نوقاوە خامۆشی گرتی، پاش بێدەنگیەکی زۆر، گوێم لێبوو بەدەنگێکی گریاناویەوە دەیووت : (لا حـول ولا قـوة، الا بـالله) سێ کەڕەت وتیەوە.. لەپاشدا ڕووی تێکردم و وتی : کوڕەکەم، بێزارت کردم، چێژی بەندەیی و تامی داماویم لەبەر خودای خۆم دا شێوانت لێم، نالەکانی خودی مرۆڤ بەدەست دوو دڵی و سەرسامی‌یەوە بەبیر هێنامەوە.. خودا بت بەخشێت.. خودا بت بەخشێت. کوڕم تۆ کێ‌ی؟

وتم : من، حەیرانی کوڕی عبداللەی ئەزعەفم، کە قوتابیەکی (بنجابی) دێرینت بووە.

وتی: بەخێر بێ‌ی. باوکت چۆنە؟ وتم:باشە.

وتی: ئەبینم، کەوتوویتە ئەو گێژاوەی، کە پێشتر باوکت تێی کەوتبوو. وتم : بەڵێ، هەر ئەویش ڕێنمایی کردم کەبێمە خزمەتی بەڕێزتان.

شێخ بەوردی سەیری کردم، ڕووی گۆڕی بەرەو ئاوی جۆگاکەو سەرنجێکی قووڵی دایە، چاوەکانی پڕ بوو بوو لەفرمێسك، وتی : خودا یارمەتیتان بدات، ئێوەی لاوانی تازە و نەوەی دوارۆژ، لەنێوان قوتابخانەی ئیمان کە لەرێگای دەق و گێڕانەوە کەوتۆتەوە، قوتابخانەی ئیدراك کە لەرێگای عەقڵ و هۆشمەندەوە دەستەبەر کراوە، لەنگەرتان گرتووە.

کەوتوونەتە جووینی کرچ و تاڵی توێکڵی دین و فەلسەفە، تا چەسپا لەمێشکتاندا کە ئیمان و فەلسەفە پێکەوە کۆنابنەوە، عەقڵ و دینیش هاودەم نابن، لاتان وایە فەلسەفە رێگای بێ بڕواییە.... بەڵام وا نی‌یە کوڕم، بەڵکو رێگایەکە بۆ باوەڕهێنان بەخودا، بەهۆی رێگای عەقڵەوە، کە هەموو باوەڕێکی لەسەر چەسپاوە، بەڵام فەلسەفە دەریایەکە

بەپێچەوانەی دەریاکانەوە، کەشتیوانی، دووچاری ترسناکی لەکەنارو رۆخیدا دەبێتەوە، دڵنیایی و ئیمان لەبن و قوڵاییدا بەدەست دەهێنێت، کە ئەمەشم پێشتر بەباوکت وتووە.

خۆمدا بەسەر دەستی شێخدا ماچی بکەم و سکاڵای ناهەمواری و دوودڵی و سەرسامی بۆ بەدەربخەم، بەبیرکردنەوەیەکی قوڵەوە کەدەستەکانی بەچیلکەیەك خۆڵەکەی بەردەمی دەشێواند. وتی : حەیران، کورم بەو چەشنە ئاسان نی‌یە کەبیری لێدەکەیتەوە.پێویستی، بەئەرك و کاتێکی زۆرە، لەکاتێکدا هاتوویت بۆلام کە پێم لەسەر لێواری قەبرە.. لەچ ماڵێکی ئەم گوندە جێنشینیت؟.. وتم: ماڵم لێرە نی‌یە، دوێنێ گەیشتووم، لەماڵی گەورەی گوندەکە دابەزیووم کەرێزێکی زۆری لێگرتم.

وتی : ئەم گوندە خانووی بەکرێی تیانی‌یە، نابێت هەروا بە بەردەوامی میوانی ئەویش بیت.... ئێستا هەستەو بچۆرەوە بۆ ناو دێ، پێخەف و راخەرو دەفتەرێکی گەورە بکڕە، بۆ نووستن بگەڕێرەوە بۆ مزگەوت...، شەوان تەرخان دەکەین بۆ خوێندن، کەساتەکانی خامۆش و فەرامۆش و بێ‌دەنگە، بەرۆژیش من واز لە پەرستنی خۆم ناهێنم، چونکە، تەنها چێژی ژیانم لەم خوداپەرستیە و گۆشەگیری‌یەدا دەبینم. لەم مەزارگایەدام لەکازیوەی بەیانەوە تا خۆرئاوا بوون. تەنها سەرماو سۆڵە ئەم خۆشیەم لێتێك دەدات و، بەندم دەکات لە نێوەند ئەم دیوارانە.. حەیران تا بەیەك گەیشتنێکی تر...

# وێڵ بوون بە دوای دۆزینەوەی خوادا

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت :

پێش خۆرئاوا بوون شتوومەکەکانم هەڵگرت و گەیشتمە مزگەوت، دەبینم چۆڵە، بێجگە لەپیرەمێردێك کەچراکانی دادەگیرسان، هەر ئەو بوو کەسەر لەبەیانیەکەی لەگەڵمدا هات بۆ مزگەوت، بەبینینم دەستبەجێ بەرەو پیرم هات و سڵاوی لێکردم و هەواڵی پرسیم، پێم ڕاگەیاند نیازمە لەمزگەوت بمێنمەوە بۆ خوداپەرستی، نزیك بەئیمامی بوخاری (ڕەزای خودای لێبێت)، بەدڵخۆشیەکەوە پێی وتم : بەخێربێیت، بەڵام تکا دەکەم لەهاوڕێیەتیت بێ بەشمان نەکەیت، وەك بەڕێزمان شێخ مەوزون، کەپێش پێنج ساڵ بەدراوسێیەتی هات، دوایی لێمان دابڕا بۆ خوداپەرستی، بەڵام چۆن دابڕانێك کەبەهیچ شێوەیەك نایبینین، پێش گەیشتنم بۆ مزگەوت، لەگەڵ گزنگی بەیاندا دەچێتە پەرستگاکەی تا دوای خۆرئاوا بوون ناگەڕێتەوە، حەزیش ناکات هیچ کەسێك ببینێت.

وتم : تۆ بجێوری مزگەوتەکەی؟

وتی : بەڵێ، نزیکەی پەنجا ساڵە.

وتم: بۆچی وا چۆڵە لەنوێژکەران؟ وتی : نوێژکەر لەکوێوە بێت؟! مزگەوتەکە دوورە لەگوندەکە، مەگەر ڕێبواران یان میوانانی ئارامگای ئیمام نوێژی تیا بکەن، پاش ئەوەی پێکەوە نوێژی ئێوارەو خەوتنامان کرد، جێگای ئاوی پیشاندام، داوای لێکردم، گەر پێویستیم بەچراکان نەبوو بیانکوژێنمەوە، خوا حافیزی لێکردم و گەڕایەوە بۆ گوندەکەی، شێخ مەوزون بەدەنگی زەنگۆڵەی دەرگاکە کە لەکاتی داخستنیدا بەهۆی پیرەمێردەکەوە گوێبیستی بوو، دەرگای ژوورە بچووکەکەی کردەوەو بانگی کردم، چوومە لای، دەستم ماچ کرد، بەخێرهاتنی کردم و پرسیاری تەندروستی کردم، بۆ ماوەی کاتژمێرێك باسی باوکمی بۆ کردم وتی : دەفتەرەکەت ئامادە کردووە؟

وتم : بەڵێ، وتی : پڕ کردنەوە لەسەر من، تۆش وتەکانی خۆم و خۆت بنووسەوە، بە ڕۆژ بەسەریاندا بچۆرەوە، ڕێگای گفتوگۆ و دایەلۆکی (مەنتقی) م بۆ هەڵبژاردویت کە

ئاسانە بۆ تێگەیشتن و موناقەشەکردن، ئێستاش پرسیارەکانت بکە.

حەیران : پرسیارەکانم ئەوە بوو کە لەنوسراوە بچووکەکەدا بۆم نووسیت، کەسڵ دەکەم لەدووبارەکردنەوەی.

شێخ : ئەم پرسیارانەت، عەقڵی فەیلەسوف و خەڵکانی گیرۆدە کردووە، هەر لەساتەکانی بیرکردنەوەی مرۆڤەوە. فەلسەفە هەوڵ ئەدات وەڵامیان بۆ بدۆزێتەوە.... ئەگەر وەڵامی راستی دەست نیشان کرد بۆ هەموو پرسیارەکان، یا نەیتوانی، ئەوا تۆ ئەمە دەزانیت کاتێ لەمەرامی خۆت تێگەیشتیت لەفەلسەفە، ئەی حەیران! فەلسەفە دەیەوێت، راستی هەموو شتێك و ناوەڕۆك و بنەڕەت و ئامانجەکانیت پێ بناسێنێ، تەنها بەروخسار بەڵگەسازی ناکات فەلسەفە، تا نەچێتە ناو قوڵاییەکانەوە، دەستەوستان نابێت بەدنیای بەرجستەتە.

بەڵکو دەیەوێت بزانێت چی لەدوایدا دێت و چی لەپێشیەوە بووە، بزانێت کێ دروستی کردووە و، لەچی دروستی کردووە، کەی دروستی کردووە، هەروا بزانێت ئەم دروستکەرە کێیە، حەقیقەتی زات و سیفاتەکانی چییە؟، مرۆڤ چییە و، حەقیقەتی چییە و، عەقڵی چییە، چۆن هۆشمەندار دەبێت، رادەی دەرککردنی بۆ راستیەکان چەندە؟

چاکە چییە، ئەی جوانی چییە، بۆ چاکە پەسندە، جوانیش جوانە، چەندەها پرسیاری‌تر لەم چەشنە کەبێ کۆتاییە، هەروا تێکۆشانە بەدوای زانستی پرەنسیپە سەرەتاییەکان (المبادیء الاولیة)ی هەموو شتێك هەربۆیە لەپێناسەی فەلسەفەدا وتویانە (وردبوونەوەیە لەراستیەکانی هەموو شتێك)، هەندێکی‌تر وتویانە (زانستی بنەما سەرەتاییەکانە) پێناسەی تری زۆرە، بەڵام من وا پێناسەی دەکەم، کە (هەوڵدانی عەقڵە بۆ دەرك پێکردنی ناخی هەموو پرەنسیپە سەرەتاییەکان)، لە دواییدا بۆت بەدەر دەکەوێت کە تا چ رادەیەك راستم.

حەیران : گەورەم، زانستیش لەدوای راستیەکاندا دەکۆڵێتەوە، ئایا زانست جودایە لەگەڵ فەلسەفەدا؟

شێخ : جیاوازی نێوان زانست و فەلسەفە، زانست تۆژینەوەی رووکەشەکانی گەردوون و دانان و یاساکانی دەکات، بەڵام فەلسەفە لەبنەماکانی گەردوون.و هۆکارەکان و راستیەکانی دەکۆڵێتەوە.

بۆ نموونە، زانای سروشتی، تۆژینەوە دەکات لەروو کەشەکانی سروشتی ماددە، بەبێ لێکۆڵینەوە لەبنەڕەت و هۆکارو بوونەکانی. ماتماتیك زان لەئەندازە و ژمێریاریی دەکۆڵێتەوە، بێخۆماندوکردن لەبیرکردنەوەی مانای شوێن و کات، هەردوولایان لێکۆڵینەوەکانیان بەهۆی عەقڵەوە دەکەن، کەچێژێکی خۆشی لێوەردەگرن، بەبێ بیرکردنەوەیان لەناوەڕۆکی ئەم عەقڵەو، توانای بۆ بەرجەستەکردنی راستیەکان، بەڵام فەیلەسوف لەهەمان کاتدا دەیەوێت تێبگات لەپێکهێنەرەکانی ماددەو بنەماو هۆکاری بوونی، مانای شوێن و کات و، ناوەڕۆکی عەقڵ و راستیەکانی و، توانای بۆ دەرککردن، واتە لەیەك کاتدا باسی (مەعقول و عەقڵ) دەکات.

بەهۆی لێکۆڵینەوە لەگەردوون و هۆکارەکانی، (فەلسەفەی بوون: فلسفة الوجود) هاتە کایەوە. لەتۆژینەوەی عەقڵ و تواناو ناوەڕۆکی (فەلسەفەی زانین: فلسفة المعرفة) پەیدابوو. لەلێکۆڵینەوە لەناوەڕۆکی چاکەو جوانی و دژواری، (فەلسەفەی بەها: فلسفة القيم) پەیدابوو.

ئەوەی مەبەستمە بۆت ساکارو رەوانی بکەم، تەنها ئەم دوو تۆژینەوەیە (تۆژینەوەی بوون) و (تۆژینەوەی زانیاری).

حەیران : گەورەم تێناگەم، لەهۆکانی ئەم گرنگیەت بەتۆژینەوەیەك و، وازهێنانت لەتۆژینەوەیەکی تر.

شێخ : گەر بیربکەیتەوە گرنگیدانەکەم ئاشکرایە، تۆژینەوەی بوون (الوجود) سروشتی بوون و، راستی و، بنەما و هۆکارەکانی باس دەکات. واتە (دروستکراو و دروستکەر)؛ تۆژینەوەی زانین ئەو روانگانە باسدەکات کەفەیلەسوفەکان وتویانە لەسەر چۆنێتی بەدەرخستنی زانیارییەکان و، شێواز و رادەی راستیەکانی. ئەو پرسیارانەی کەئائارام و سەرگەردان و دوو دڵی کردوویت؛ لەم دوو تۆژینەوە سەرەتاییەدا کۆدەبنەوە، بەڵام (تۆژینەوەی بەهاکان) کەلەراستیەکانی جوانی و ناشرینی و چاکەو دژواری دەدوێت و، ئەوانەی لەم چەشنەن زۆر پەیوەست نین بەپرسیارەکانتەوە.

حەیران : لەراستیدا ئەو شتانەی کەبیرمی گیرۆدە کردووەو پەنگ دەخواتەوە، لە (تۆژینەوەی بوون)دا خۆی دەبینێتەوە، نەوەك لەشتی تردا.

پێویست بەدرێژە باسی تۆژینەوەی زانین ناکات.

شێخ : ئەزانم، تەنها مەسەلەی میتافیزیکی گیرۆدەی کردوویت[1] ، بەڵام تۆژینەوە و باسی لەسەر ناکرێت؛ بەبێ تیشك خستنە سەر تۆژینەوەی زانین.

چونکە باسەکەمان بیرۆکەی چەندەها زانایانە، کە ووتراوە بۆ شیکردنەوەی بابەتە میتافیزیکیەکان، رێك و دروست نابێت بەبێ لێکۆڵینەوە لە رێگاکانی زانین و شێوازەکانی و بۆ زیاتر دڵنیابوون لەو راستیانەی کە بەدوایدا وێڵین.

حەیران : کەواتە، لە مەسەلەی میتافیزیکیدا تۆژینەوەی زانین (مبحث المعرفة) لە خرمەتی تۆژینەوەی بوون (مبحـــث الوجـــود) دایە و، رێگایەکە بۆ بەرجەستەکردنی راستییەکان.

شێخ: ئەمە راستە.

حەیران: کەواتە کرۆکی فەلسەفە، مەسەلەی میتافیزیکیە.

شێخ : ئەمە راستە، **ناوەرۆکی فەلسەفە هەمیشە بە بەردەوامی بریتییە لە گەڕان بەدوای خوادا.** پاشان شێخ لەژێر بالیفەکەیدا کتێبێکی گەورەی دەرهێناو وتی : بادەست پێبکەین.

حەیران : ئەم کتێبە چییە گەورەم؟

شێخ : ئەم کتێبە، باسی ئەو بیرمەندانە دەکات کە دەربارەی خودا دەکۆڵنەوە.

حەیران : ناوی چییە؟.

شێخ : فەیلەسوفەکانی یۆنان.

حەیران : چۆن بەڕێزتان دەڵێن، کتێبی ئەو بیرمەندانەیە، کەبە دوای خودادا دەگەڕێن.

شێخ : بەڵێ پەیوەستە بە خاوەن بیریارەکانەوە، کە وێڵن بەدوای خوداوەندی راستەقینەندا، ئەی پێم رانەگەیاندی، ناوەرۆکی فەلسەفە گەڕانە بەدوای خودادا.

حەیران : لەوتەکانی پێشینانی فەیلەسوفە یۆنانییەکان چەند شتێکم خوێندۆتەوە ، کەبێ باوەڕیان بەخودا لەخۆ گرتووە.

شێخ : بەڵێ بێ باوەڕن بەخوداکانی یۆنان، بەڵام وێڵن بەدوای خودای راستەقینەدا، هەندێکیان خوای راستەقینە دەدۆزێتەوە، بەڵام هەندێکی تریان عەقڵ و ئەندێشەکانیان

---

١ میتافیزیکا: واتە ئەو شتەی کە لە سروشت بە دەرە (ما وراء الطبیعة) ئەمەش زاراوەیەکە فەیلەسووفەکان و نووسەرە رۆژئاواییەکان بەکاریان هێناوە لە جێگای زانستی بیر و باوەڕدا. (سەرچاوە) عقیدة أهل السنة و الجماعة تألیف محمد بن إبراهیم الحمد. —لێکۆلەر—

مەزەندەی ناکات، کەوا لەهەندێکیان دەکات کە لەراستییەکان دووربن، بۆت روون دەبێتەوە کەبیروراکانیان ژیری و دڵسۆزی لەخۆگرتووە، سەرنجەکانیان بۆ گەردوون ساکارو سەرسامە، لەگەڵ ئەوەی تروسکایی رێگای راستی تیا بەدی دەکرێت لەناو تاریکاییەکانی، نادیارو نهێنی و هاو دژی و دوو دڵی و سەفسەتەدا. (فطالـــیس)، بە (بیرۆکەی ئاڵۆزی درۆینە)، (العقـــدة الکاذبة) دەست پێدەکات، کە بەردەوام لەگەڵ عەقڵی هەموو فەیلەسوف و مرۆڤەکاندا پەیوەستە.

جیهان وا بەدی دەکات، کە ناشێت لە نەبوونی رووتەوە (عدم المحض) دروست کرابێت.

لە راستیدا هەموو سەرەتاییەك بریتییە لە گۆڕان، کەواتە پێویستە گریمان (افـتراض)ی ئەو ماددە سەرەتاییە هەر بوویییە (أزلي)[1] بکەین، کە هەموو بوونەکانی لەسەر دروست بووە، کە ئەویش ئاوە. ئەوەی کەوای لێکردووە ئاو هەڵبژێرێت، تۆژینەوەکانی بوونە بۆ ماددەیەك، کە توانای گۆڕانکاری و شێوازکاری هەبێت، دەیبینی ئاو دەتوێتەوە و، دەبێتەوە بەسەهۆڵ لەکاتی بەستنداو، دەگۆڕێ بۆ هەڵمێکی بێگەرد، جارێکی تر دەبێتەوە بەئاو، بینی کە (شێ) مەرجێکە بۆ ژیان و، بڕوای هێنا کە ئاو لەبەرئەوەی ئەم هەموو سیفاتانەی گرتۆتەخۆ بناغەیە بۆ هەموو بوونێك...

بەڵام (ئینکسـمینس) دەبینێت هەوا لەئاو زیاتر بەتواناترە بۆ گۆڕانکاری، بەسارد کردنەوە دەبێتە ئاو، بەگەرم کردن دەبێتە هەڵم، بەزیاتر گۆڕانکاری دەگەڕێتەوە بۆ هەوا،پێی وابوو گۆڕانکارییەکی زۆرتر دەیکاتە ئاگر، کەخۆر و مانگی لێدەکەوێتەوە، چڕێتی دەبێتە هەور،و ئینجا دەبێتە ئاو،گەر چڕێتی زیاتر بێت دەگۆڕێ بۆ گڵ و بەرد، هەروا بینی کە پێویستیەکی ژیانە، باوەڕی هێنا کە بناغەی هەموو بوونەوەرە.

بەڵام (ئینکسیمندەر)، کەبیرۆکەکانی قوڵتر دەبنەوە، هەرچەندە روو کەشانە زیاتر بێفەری پێوە دیارە، دەڵێت : وتەکانمان بۆ ئاو وهەوا، یەك ناگرێت لەگەڵ سیفاتی هەموو

---

١ (أزلی) واتە خوای گەورە هەربووە لە ڕابردوودا و هەر دەبێش لە داهاتوودا و نەمانی بەسەردا نایەت، هەروەکو فەرموویەتی (كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فانٍ* وَ يَبْقى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الجلالِ وَ الإكرامِ) الرحمن( ٢٦-٢٧) -لێکۆلەر-

شتێکدا، ئاو سیفاتی خۆی هەیە، هەروەها گشت بوونەکانی تر سیفاتی تایبەتمەندی خۆیان هەیە.

جێی بڕوا نییە کەهەموو بوونەکان لەگەڵ جیاوازی سیفاتیان لەیەك بنەڕەت دروست بووبن، کەجودا بکرێنەوە بەهۆی سیفاتی تایبەتمەندی خۆیانەوە.. لێرەدا عەقڵی ساغ زۆری لێکرد کە بڵێت بناغەی هەموو بوونەکان (ماددەیەکە نەشێوەی هەیە، نەکۆتایی، نەسنور)

حەیران : بەڕاستی تۆژینەوەی (ئەنکسیمندر)، لەشتێك دەکۆڵێتەوە کەدەشێ بگونجێت لەگەڵ ئەم بوونەوەرە جۆراوجۆرانەدا. پێچەوانەی تێکڕای هەموو تۆژینەوەکانی ترە، لەشێواز و رادەیی و وێنە و شێوە، کە نیشانەی قووڵی بیرکردنەوەیەتی، بەلام مانای چی‌یە کە بە (مادە) ناوی دەبات، لەهەمان کاتدا دەڵێت : نەشێوازی هەیە نەکۆتایی نەسنور؟

شێخ : لێرەدا ئەو راستیانە بەرجەستە دەکەیت کەپێم راگەیاندی، ئەم فەیلەسوفە سەرەتایی‌یە بڕ و بەهانەیان لە بێباوەڕیان بەخوداکانی یۆنان قبوڵە، لە تۆژینەوەیان بۆ عەقڵی رەها (طلــیق) لەسەر راستین، بۆ سەرچاوەی جیهان، عەقڵ و ژیریان باوەڕی نەدەهێنا کە ئەم گەردوونە لەدروستکراوی ئەو خواوەندانە بێت، کەسیفاتی رەوشت و دژواری مرۆڤیان لەخۆگرتووە، سەرخۆشی و درۆو فێڵبازی و داوێن پیسیان سیفات بێت. جا دەستیان کرد بەگەڕان و لێکۆڵینەوە بەدوای خودای راستەقینەدا، کەهیچ شتێك لێی نەکاو لێی نەچێت (لیس کمثله شيء) بەبێ هەستکردنیان!

بەلام (فیـــثاگۆرس) ئەم بۆچوونەی پەسەند نەکرد، چونکە تەنها لەڕووی (سروشتی‌یەوە) بنەماکانی گەردوونی شی دەکردەوە، هەربۆیە رووی کردە لێکدانەوەی ماتماتیکیانە.

لەگەڵ لایەنگرەکانیدا وتیان : ئاو و هەواو هەموو ماددەکان، هەرچۆنێك بن، ناگونجێن ببنە سەرچاوەیەك بۆ ئەم جیهانە کە لەگەلێك شتی جیاواز لەیەکتر پێکهێنراوە گەر ماددە بێت، یان ماددە نەبێت، پێویستە لەسەرمان لەشتێك بکۆڵینەوە کەسیفەتێکی گشتی هەبێت، هەموو شتێکی لەخۆگرتبێت چ ماددە یاخود جیاواز لەو.... هیچ سیفەتێك نی‌یە کە هەموو جیهانی لەخۆگرتبێت، جا گەر ماددە بێت یاخود ماددە نەبێت.

بێجگە لەسیفەتی ژمارە (العدد) (Lenombre)، ئێمە ئەتوانین ئەندێشەی هەموو شتێك بکەین بەبێ ڕەنگ و بۆن و چێژو قەبارە، بەڵام ناتوانین ئەندێشەی شتێك بکەین کەسیفەتی ژمارەی نەبێت، کەواتە ژمارە سیفەتێکی تەنهای هاوبەشە کەهەموو بوونەکانی گەردوونی پێ‌سیفەت دەکرێت، تەنها هەرخۆشی شیاوە کە ببێتە سەرچاوەی جیهان، لەبەر ئەوەی هەموو شتەکانی گەردوون بریتی بوو لەژمارەیەکی دووبارەوە بوو، ژماردنیش بریتی‌یە لە دووبارە بوونەوەی (یەك)، کەواتە (یەك) بنەمای گەردوون و هۆکار و ڕاستیەکانیەتی.

ئەم بیروڕا تەجریدیانەی کەپەنگی خواردۆتەوە و لەناو ئەندێشەکانیاندا، هەموو ئەو هەوڵدانانەمان بۆ بەدەردەخات کە کراوە **بۆ گەیشتن بەبیری خواوەندی ڕاستەقینەی ڕووتکراوە لەهەموو سیفاتێکی ماددی**، گەر هەستی پێ بکەن یان هەستی پێ نەکەن.

حەیران : ئایا.. لەلای فەیلەسوفە یۆنانیە کۆنەکان، بیرۆکەی بوونی خودای تر هەبووە جگە لەخوداکانی خۆیان؟

شێخ : لەو ڕۆژەوەی کەمرۆڤ مرۆڤە، بەعەقڵی بیرکەرەوە جیاکراوەتەوە، زەوی بێ بەش نەبووە لەبیرۆکەی بوونی خودای ڕاستەقینە. ئەمە (ئەکزنۆفنس) کە یەکێکە لە فەیلەسوفە سەرەتایی‌یەکانی یۆنان، هەروەك هاو زەمانی خۆی، ئەفسانە یۆنانیەکانی لەخۆ دوورخستەوە، کەدەیانووت : (خوا وەك ئادەمیزاد جەستەی هەیە) ( Anthro omorphisme)، گاڵتەی بەخوداکانیان دەهات کە دەخوات و دەخواتەوە، لەدایك دەبێت و دەمرێت، دەیووت: (خەڵکی خۆیان ئەم خواوەندانەیان دروستکردوە و لەسەر شێوە و ئەندازەی خۆیان وێنایان کردووە، گەر گا و شێر و ئەسپ، وێنەکردنیان بزانیایە، خودایەکیان لەسەر شێوەی گا و شێر و ئەسپ بۆ دروست دەکردین، نەخێر و نەخێر خودای تر نی‌یە جگە لە یەك خودا، کە لەهەموو بوونەکان بەرزترە، لەسەر شێوازمان دروست نەبووە، بیرناکاتەوە وەك بیرکردنەوەکانی ئێمە بەڵکو خودا، هەموی هەر بینایی‌یە، هەموی هەر بیسەریە، هەموی هەر فیکرە.

(ئەکزنوفنس) باوەڕی وایە، کەحەقیقەتی ئەم خودا گەورە، تەنهایە، هەرگیز عەقڵمان دەرکی پێناکات، لەسەر ئەمە بیرۆکەی بەنرخی دارشت کە هەزار ساڵ لەمێژووی میتافیزیکیدا بەرەو پێش بازی پێدا.

کە دەڵێت: (هیچ ئادەمیزادێك ناتوانێت پێناسەی خودا بەوردی بکات، هەتا ئەگەر ڕێکەوت خوازیار بوو، ڕاستی هەموو ڕاستیەکان لەوەسفی خودادا بەئادەمیزاد بڵێت، چونکە مرۆڤ خۆی پێنازانێت لەوتەکانی کەتا چ ڕادەیەك ڕاستە).

حەیران : گەورەم لەوتەکانت تێدەگەم، کە (ئەگزنوفنس) بەم وتەیەی لەمێژووی میتافیزیکیدا بەرەو پێش بازی داوە.

فەلسەفەش بە باوەڕهێنان بە بوونی خودا کۆتایی پێهات، گەر کێشەکە بەم جۆرەیە، تکا لەشێخی بەرێزم دەکەم، کە من و خۆیشی ئاسودە بکات لە ناماقوڵی بیروباوەڕی فەیلەسوفە سەرەتاییەکان، کە لە (پیشاوەر) هەندێکم لێخوێندۆتەوە، هەروا بەرەو فەلسەفەی نوێم ببات.

شێخ : تکام لێکردیت بەئارام بیت، ئێستاش ئەم ئامۆژگاریەت بۆ دووپات دەکەمەوە، هیچ سوودێك نابینیت بەیەك هەنگاو بتگەیەنمە ئاکامی ئەو کۆتاییانەی، کە فەیلەسوفەکان پێی گەیشتن کەتۆی سەرقاڵ کردووە، بێئەوەی ئاگادار بیت لەکۆششی فەیلەسوفە سەرەتایی و ناوەندییەکان، لەوانەیە بیروڕای فەیلەسوفە کۆتاییەکانت بە دڵ نەبێت، هەروا یەکێك پێت ڕابگەیەنێت کەهەموو ڕاستییەکان لای بیروڕای فەیلەسوفە سەرەتاییەکانە، ئەوکاتە دوو دڵی و سەرسامیەکەت بۆ دەگەڕێتەوە و، تێگەیشتنی تەواوی کۆتاییەکان بەدەست ناهێنیت بەبێ تێگەیشتنی زانستەکانی پێشوو. تکا دەکەم بەئارام بیت.

حەیران : ئێستا.. تێگەیشتم دانایی شێخی گەورەمان لەپێکەوە بەستنی زنجیرە بیروڕاکان، تکا دەکەم لێم ببوریت.

شێخ : ئنجا (بارمنیدس) بڕوا دەهێنێت کەئاو، هەوا، ژمارە یان هەر چ شتێکی تر، ناگونجێت کەببێتە سەرچاوەی هەموو شتێك لەبەرئەوەی ئەم شتانە لە (گۆڕانکاریدان) ئێمەش تەنها لەسیفاتە روو کەشەکانیان دەکۆڵینەوە، ئەم سیفاتانەش بەرەو گۆڕان و لەناوچوون دەچن، تەنها سیفەتێك نەبێت کە ئەویش سیفەتی بوون (الوجود)ە (Fetre )، هەر ئەم بوونە هەمیشەیییە، کە دەشێت بیکەینە سەرچاوە بۆ هەموو بوونەکان.

حەیران : ئەم بوونە (الوجود) چییە؟ چی دەوێت؟ مەبەستی لەوجود چییە؟

**شێخ.. (بارمنیدس) بۆمان وەسف دەکات کە بوونێکی هەمیشەیی (أزلی)یە نەدەگۆڕێت و نە لەناو دەچێت، نەرابوردوی هەیە و نەئاییندە.**

**بەڵکو هەمیشەیی و هەتا هەتایی لەخۆ گرتووە[1]، کە نەدەجوڵێت و نە بەش بەش دەکرێت، چونکە جوڵە، وێنەیەکە بۆ گۆڕان، کە (تەواوە) هیچ بوونێکی تر لەدوایدا نایەت.**

حەیران : چۆن بوون رووتە لەجوولەو گۆڕان، لەکاتێکدا ئێمە دەبینین ئەم شتانە دەگۆڕین و دەجولێن.

شێخ : ئەم شتانەی کە ئێمە دەیبینین و هەستی پێدەکەین (بارمنیدس) بەبوون (الوجود)ی دانانێت، بەڵکو بەرووکەشێکی (apparences) خەیاڵاوی دادەنێت، چونکە لەناودەچێت و نامێنێت، بەڵام (بوون) نەمرە، هەروا لەبەرئەوەی گۆڕانی بەسەرا دێت، گۆڕانیش پێویستی بەکۆبوونەوەی بوون و نەبوون هەیە. کە ئەمەش مەحاڵە.

حەیران : من تێناگەم، ئایا (بارمنیدس) دەیەوێت بڵێت کەیەکێتی‌ی بوون (وحدة الوجود) هەیە؟ کە بوونەکان یەکگرتوون.

شێخ : بەڵێ.. حەیران، **تەجرید بەم شێوەیە کار دەکاتە سەر عەقڵ. لەڕاستیدا ئەم فەیلەسوفانە نایانەوێت ئینکاری بوونەکان بکەن، بەڵام لەسەرچاوەیەکی تەواو دەکۆڵنەوە، چەسپاو، نەگۆڕاو، رووت بێت لەسیفەتە بوونەوەرییەکان، دەگونجێت دروستکەر بێت بۆ بوونەکانی فەلسەفەکانی بارمنیدس**، کە ئەمەش لەخۆیدا لێکۆڵینەوەیە بەدوای خوادا. بێئەوەی فەیەسوفەکان بیانەوێ و هەستی پێبکەن...، لەپاش (بارمنیدس)، (مەلیسوس)ی قوتابی‌ی هات و پشتگیری بیروڕای مامۆستاکەی کردو وتی : ئەم بوونە بێ کۆتاییە و، (ژیانێکی ژیرە). ئەگەر گوێبیستی بەڵگەکانیان بیت کە دەیهێنیتەوە بۆ هەمیشەیی و هەتا هەتایی و بێ کۆتایی و نەجوڵاویی بوون کە (ژیانێکی ژیرە)، ئەوکاتە لەگەڵمدا دەتووت

---

[1] خوای گەورە فەرموویەتی: (هُوَ الاوَلُ وَ الاخِرُ وَ الظاهِرُ وَ الباطِنُ وَهُوَ بِكُلِ شَيءٍ عَلِيم) سورە الحديد، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اللهم أنت الاول فليس قبلك شيء و أنت الاخر فليس بعدك شيء) ئیمامی موسلیم گێڕاویەتیەوە، واتە: ئەی خوایە هەر تۆ هەبووی هیچ کەس پێش تۆ نەبووە، هەر تۆش هەتا هەتایی دەمێنیٔ و کەس دوای تۆ نابێت. -لێکۆڵەر-

عەقڵی ئەم فەیلەسوفانە، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان کردوە بۆ دۆزینەوەی خودای تاك و تەنها، بیانەوێت، یا، نەیانەوێت.

هەروا دەڵێت : هەموو پەیدا بوویەك پێویستی بەسەرەتایەك هەیە. بەڵام بوون، پەیدا بوو نی‌یە، چونکە گەر پەیدا بوو بوایە، لەنەبوونەوە دەکەوتەوە، کەواتە بوون بێ سەرەتایە، هەر شتێك سەرەتای نەبێت کۆتایی نابێت، لەبەرئەوەی بێ کۆتایی و بێ جوولەیە، چونکە هیچ جێگایەك لەدوایەوە نی‌یە هەتا بۆی بجولێت.

هەروەها نەگۆڕە، چونکە گەر بگۆڕێت دەبێتە زیاتر لەیەك، کەواتە یەکە، هەمیشەیی‌یە، هەتا هەتایی‌یە، زیندووە، ژیرە، نەگۆڕە.... کەواتە حەیران، ڕامێنە.

(هرقلیت) هات، کەڕاڕا بوو لە بیروڕاکانیدا، لەنێوان بیروڕای تەجریدی و بیروڕای سروشتی‌دا لەنگەری گرت و، وتی: ئەم شتانەی، کە بەمشێوەیە دەیبینین لەگۆڕانێکی هەمیشەیی و بەردەوامدایە.

بۆ یەك چرکە جێگیر نابێت لەسەر شێوازی خۆی، ئەم جێگیری‌یە ڕێژەیی‌یەی کەدەیبینین، خەیاڵە، دەستەوەستانی ئێمەیە بۆ دیدی گۆڕانکاریی، لەمانەوە خەملاندی کە تەنها شتێك لەیەك ساتدا بوو ون و نەبوونی هەیە، ئەم یەکگرتنە کاتی‌یەی نێوان بوون و نەبوونە، (گۆڕانکاری)یە، کە حەقیقەتی بوونە.

بەڵام هرقلیت، لە ڕاڤەکردنی بۆ گەردوون لەسەر ئەم خەیاڵە جێگیر نابێت، بەڵکو پەنا دەباتە بیروباوەڕە کلاسیکی‌یە سروشتیەکان و، دەڵێت : گەردوون لەئاگر دروست بووەو، گۆڕڕاوە بۆ هەوا، هەواش گۆڕڕاوە بۆ ئاو، ئاویش بۆ وشکایی، دووبارە وشکایی دەبێتەوە بەئاو، دەگۆڕێتەوە بۆ هەواو دووبارە بۆ ئاگر، باوەڕی وا بوو کەژیانی ئاژەڵ بێ گەرمایی نابێ، لەبەرئەوە وتی گیان (روح) بریتی‌یە لەئاگر.

(ئەمبدوقلیس)، فەیلەسوفی چوار توخمەکان، لەپێشدا ویستی، ڕایەکانی نێوان (بارمیندس) و (هرقلیت) یەك بخات، لەبەرئەوە وتی : بوون لە چەند گەردیلە پێکهاتوون، وتەکانی (بارمندیس) کە لەسەر وەسفی بوونە وتویەتی بەوەی، کەنەزیاد دەبێت و نە کەم دەکرێت، بەسەر گەردیلە دەچەسپێت.

وتەکانی (هرقلیت) لەسەر (گۆڕانکاری بەردەوام: الصیرورة)دا بەسەر قەوارەکاندا (الاجسام) دەسەپێت، لەڕووی گۆڕاندنی شێوازەکانی‌یەوە، لەپاشدا ویستی ڕایەکی ناوەند وەرگرێت لە نێوان ئەم دوو بیرۆکەیەدا، یەکەم بیرۆکە: (گەردوون لەیەك ماددە پێکهاتووە کە گۆڕانکاری لەخۆگرتووە، وەك ئاو، هەوا، ئاگر). دووەم بیرۆکە ماددەی

بوون (الوجود) سیفەتی گۆڕانی، نی‌یە). لەئاکامی ئەم دوو وتەیەدا، بیرۆکەی (توخمە چوارینەکان) دانا کە پەیڕەوکراوبوو هەتا سەدەی هەژدەی زاینی؛ پێی وابوو، کەبوون لە چوار توخم پێکهاتووە، کە ئەمانەن: (خاك، ئاو، ئاگر، هەوا)، پێکهاتەی هەموو شتێکی ئەم گەردوونەش بریتی‌یە لەتێکەڵەی ئەم چوار توخمە، بوونی جیاوازی لەنێوانیاندا، بەهۆی جیاوازی ڕێژەی ئەم چوارەیە تیایاندا...

لێرەدا بەدەردەکەوێت، کە (ئەمبدوقلس) هاوبیری زانستەکانی سەردەمی خۆی بووە، بەڵکو دەتوانین بڵێین پێش سەردەمی خۆی کەوتووە لەدانانی بیرۆکەی (المبدأ الـذري)، بەڵام کاتێك دەدوێت دەربارەی ئەو هێزەی کە ئەو گەردیلانە دەجوڵێنێت، بەبیرکردنەوەیەکی ساغ دەست پێدەکات و بەئەندێشەیەکی نەزۆك کۆتایی دەهێنێت...

لەکاتێکدا کەدەڵێت: ماددەکانی گەردوون، مردن و ژیانیان تیانی‌یە و لەخوودی خۆیانا بێ جووڵەن، پێویستە باوەڕ بهێنین، کە ئەم جووڵانە هێزێکی دەرەکی پاڵیان پێوە دەنێت، دەبینین خۆی دەدا بەلای خەیاڵ و دەڵێت: جوڵەی مادە بریتیە لە بەیەکگەیشتن و لێکدابڕان، کەهەر دووکیان پێچەوانەی یەکن و لەیەك هێزدا کۆك نابن، بەڵکە پێویستە دوو هێزی کاریگەر هەبێت، یەکێکیان پاڵپێوەنەر و ئەویتریشیان ڕاکێشەر، ئەم دوو هێزەش بریتین لەخۆشەویستی و ڕق و قین (l amouvetla) هێزی چوار توخمەکە بەهێزی خۆشەویستی بەیەکەوە پەیوەست بوون، هێزی ڕق و قین کردی بەچوار لەت، ئینجا خۆشەویستی هێزی خۆی کۆ کردەوە و، چوار توخمەکەی لێکدا و، ئەو شتانەی لێ پێکهات کە دەیبینین.

حەیران : ئەی ئەم هێزی خۆشەویستی و ڕق و قینە لەکوێوە هات؟

شێخ : دەتەوێت.... لەباسێك بکۆڵیتەوە کەلەئەندێشەوە کەوتۆتەوە.... ؟ ئەم فەیلەسوفە بەمانەشەوە نەوەستا بەڵکو باوەڕی وابوو کەخواکان و بەندەکانیان لەم چوار توخمەکە پەیدا بوون، بەڵام توخمی ئاو و هەوا زیاتر پەسەند دەکات، خودای ئاگر (زفس)، خودای هەوا (هیرا)یە، خودای خاك (ئارکۆس)ە، ئاویش خودای چوار هەمینە کەبە (نستیس) ناو دەبرێت، کاتێك دەگری فرمێسکەکانی وەك شەونم دەبارێتە سەر زەوی بەچەشنێك... کەوتە ناو گێژاوی ورێنەکانیەوە کەهەموو مانی بەخودا دائەنا، کەوا دەیووت : خودی ئادەمیزاد لەخۆیدا خودایەکی هەڵەیە، وای لەچارە نووسراوە کە دوور لەجێگای بەختەوەران نیشتەجێ بێ،

لەقەوارەو شێوازێکی نەماندا خۆی دەنوێنێ... جەستەی زیندوو سەربەبێ مل دەردەهێنن، بازووەکانیان بەبێ شان بەرز دەکەنەوە، وەچاویان بەبێ تەوێڵە دەڕوانێت هێزی خۆشەویستی لەیەکتریان نزیك دەکاتەوە و دەیانکاتە ئادەمیزاد...

حەیران: باسکردنی ئەم بیرو باوەڕە بێفەڕانە، نزیکە بمگێڕێتەوە بۆ جارانی دوو دڵیم، تکا لەشێخم دەکەم ئەم لێکۆڵینەوانەم لێ بەدوور بخات.

**شێخ :( نمایشکردنی، ئەم وتانە بۆ خۆت، تەنها لەبەر دەرخستنی پلەکانی عەقڵە بۆ گەیشتن بەدەرککردنی گەردوون و، تۆژینەوە لەهێزێك کە بیجوڵێنێت و بیبات بەڕێوە... ئەم تۆژینەوە مایەوە بەدرێژایی چەرخەکانی فەلسەفە، کە کەلێنێکی گەورەی گرتبوو لە مەسەلەکانی میتافیزیکی دا... بەئارام بە... من بەرە و ئامانجت دەبەم.**

لەپاشدا (دیموکریتس) هات ڕێبازی ئەتۆمی (المذهب الذرات)ی دەدرێتە پاڵ، ڕوونی کردەوە کاتێ، کەوتی: ئەم گەردوونە لەژمارەیەکی ئەتۆمی (atomes) بێ کۆتایی پێکهاتووە، کەلەیەکچوو هاودەمن، هەمیشەیی و بێکۆتایین، بەخۆیان دەجولێن لەبۆشاییەکدا، جا لە جوڵەو تێکەڵ بوونیان، شتەکان پەیدا بووە و، تێکڕای گەردوونی لێ دروستبووە، بەڵام جوودایی سیفاتی شتەکانن لەئاکامی بەیەکگەیشتنی ئەم ئەتۆمانە و هاودەم بوونیان و حاڵەتیان لەلەشدا و، بە جیاوازی دەرکەوتنیان لەچاوی بینەردا پەیدا دەبێت، بەهانەی بۆ بەردەوامێتی و هەمیشەیی ئەوەیە، چونکە بوون لەنەبوونەوە ئەگەر لەبۆشایدا جێگیر نەبوایە توانای جوڵەی نەدەبوو، لێرەدا بۆی دەرکەوت، کە لەگەردووندا سێ حەقیقەتی سەرەتایی هەیە، کەئەمانەن : گەردیلە، بۆشایی، جوڵە.

(Les atomes, Levide, LeMovment)

حەیران: دروستبوونی جیهانی ماددی لە گەردیلە، شتێك نیە کە لە عەقڵەوە بەدوور بێ، بەڵام کێ ئەم گەردیلانەی دروست کردووە و کێ دەیجولێنێت؟

شێخ: وەڵامی پرسیارەکەت بۆ (دیموکرایتس) نەنوسراوە، بەڵکو بۆ کەسانێکی تر، بەڵام بیرۆکەکانی ئەو دوور بووە لەبیر کردنەوەیەکی ساغ:

کاتێك پیێ وابوو کە، جووڵەی گەردیلەکان لەئاکامی (پێویستیەکی کوێرانەوەیە)، کەپاڵ دەنێت بۆ جووڵە و بەیەکگەیشتن، وچوونە ناویەك و تێکەڵبوون، بۆ پەیدا بوونی

ئەم گەردوونە لە گیانەوەر و ڕووەك و بێ گیانەکان، هەتا ڕۆح و خواوەندەکانیش پێکهاتەی ئەم گەردیلانەن کەئەم هێزە کوێرانەیە بەڕێوەیان دەبات.

لەدوای (دیمو کریتس)، (ئەناکساگۆرس) هات، بیرۆکەی پێویستی کوێرانەی پوچەڵ کردەوەو گاڵتەی پێهات، وەك خاوەن باوەڕێکی بەرز، ووتی: (**مەحاڵە هێزێکی کوێرانە بتوانێت، ئەم جوانکاری و یاسایە بخاتەوە، کە هەردووکیان لەم جیهانەدا رون و دیارن، چونکە هێزی کوێرانە تەنها گێژاو دەنێتەوە" ئەوەی کەماددە ئەهاوێتە جموجوڵ، عەقڵێکی کاملی، بینای دانایە**).

حەیران: ئەمە زۆر گرنگە، ئایا دەکرێ (ئەناکسا گۆرس) بەم ووتانەی مەبەستی بێ کە بوونی خوا بسەلمێنێ؟

شێخ: نازانم ئەی حەیران هیدایەتی خودا، بۆ بەندەکانی لەسەر زمانیپێغەمبەرەکانی، لەیۆنانیەکان وفەلسەفەکانیان دێرین ترە.

بەڵکو من بە پەسەندی دەزانم کەزۆربەی فەلسەفە دێرینەکانی (میسر و هیند و چین) پاشماوەی پێغەمبەرانی پێشینەن کە مێژوو لە یادی کردوون و، خاوەنەکانیان لەریزی فەیلەسووفەکان دانراوە، کە لەوانەیە پێغەمبەر بووبن، یا پەیڕەوانیان بووبن. لەووتەکانی (ئەناکساگورس) وا بەدەر دەکەوێت، کەدەور و خولی باوەڕهێنانی ڕاستی دابێت، کاتێك هەستی کرد بەژیری و هۆشمەندی خۆی، کەیاسای بێ هەڵەی ئەم گەردوونە، دەبێت لە لایەن عەقڵێکی داناوە دانرابێت، هەر لەبەر ئەم هۆکارەیە، کەبەیەکەم کەس دەژمێردرێت بۆ کردنەوەی دەرگای (فەلسەفەی رۆحی) لەدانانی بیرۆکەی گەڕان بەدوای ڕاستیدا، هەر ئەمەیش وای لە ئەرستۆ کرد، کە بڵێت: (ئەناکساگۆرس) **تەنها کەسێکە لەپارێزگاری کردنی کاملی ژیری بەرامبەر ووڕێنەکانی، فەیلەسووفەکانی پێش خۆی**).

حەیران: سوپاس بۆ خودا، کەگەیشتینە سەرەتاییەکانیفەلسەفەی بەرزی دوور لەووڕێنە.

شێخ: گومانی تێدا نییە، کەفەلسەفە بەهەنگاوە سستەکانی بەرەو ڕاستی دەڕوات، هەندێ جاریش کۆمەڵە گومانبارێك دەبنە کۆسپ و ئاستەنگ لە ڕێی دا، وەك

کۆمەڵـەی (سوفسـتائیەکان) کەنـزیك بـوو بـەهۆی موناقەشـەگیری، سەرسـوڕهێنەر و بێفەریان بیرکردنەوەیەکی ساغ لە ناوبەرن.

حەیـران: گوێبیستی وشـەی (سفســـــطة) بـوم، کـە مەبەسـت لێی وتـو وێـژی هەڵخەڵەتێنەرە.

شـێخ: بـەڵێ، سەفســەتە لەووشـەی سوفسـتائیەوە هـاتووە، (سۆفسـتائي) ڕێـبازی کۆمەڵـێکە، کەدەستە باڵابوون لەفێرکردنی خەڵك لەهەڵگێڕانەوەی ڕاستیەکان، بەهۆی موناقەشـەگیری درۆیـنەیانەوە، ناوەکـەی لەووشـەی (سوفیستەوە) هاتووە، کە لەووشەی یۆنانـیدا، مانـای ووشـەی (مامۆستا) دەبەخشێت، لەهەربەشێکی پیشەسازی و زانیاریدا، تاوای لێهات ئەم ووشەیە بەسەر ئەو مامۆستایانەدا سەپا، کەناویان دەرکرد بە سەفستائی.

عەرەبیش لەووشەی (سۆفیست)ەوە، ( سفسطة) یان داتاشی، ئەمانە ڕێبازێکی فەلسەفەی زانـراویان نی‌یـە و، هـیچ بیروباوەڕێکیان نی‌یـە، هـەتاوەکو، فەلسـەفەی رۆحی، پێکیانەوە ببەستێت، کەوێڵـە لـەدووی ڕاستیدا، بەڵکو کۆمەڵێك مامۆستابوون لە وڵاتی یۆناندا، لە بارودۆخـێکی نائاسـایدا بەدەرکـەوتن، کەشـەپۆلی شـك و بـێ بـاوەڕی بـەخواکانی داستانەکانیان داپۆشیبوون، لەهەمان کاتدا، شەپۆلێکی دیموکراسی دەرگای پلەوپایەی بـۆ خـەڵکی کـردبۆوە، بـەهۆی چەواشـەکردنی جـەماوەرەوە، دانـا و لـێهاتوو بـوون لەفـێرکردنی خـەڵك بـۆ (هونـەرەکانی ڕەوان بـێژی و، خوتـبە و، موجادەلـە و قسـەی نەخشـین)، شـانازیان بەوەوە دەکرد کە لەتواناياندايە، پشتگیری بیروڕا و دژەکەی بکەن، بـەردەوام بـوون لـەم سەرلێشـوانانەدا، نـزیك بـوو ڕێـبازەکەیان هۆکـارێك بێـت بـۆ ڕووخاندنی بنچینەکانی زانین و عەقڵ و، تێکدانی ڕەوشتی چاك.

بەناوبانگترینــیان (بــروتاگوراس)ە کەدانــەری ئــەو بــنەمایە، کەبـێفەڕی و پوچـی سوفستائیەکانی تیا دەبینرێتەوە، بە ووتـە بەناوبانگـەی کـە دەڵێـت: (ئادەمیزاد پێوەری هەمووشتێکە)؛ زانـا و فەیلەسوفەکان وای دەبینن کەڕاستیەکان بـەهۆی عەقڵەوە دەرك دەکرێن نـەك بـە هەسـت؛ چـونکە (هەسـت) هەڵخەڵەتێنەرە، لەم ماوەیەدا (بروتاگوراس) پـەیدا بـوو، ئینکاری زانستی دەکرد بـەهۆی ئەقڵـەوە، بـاوەڕی وابـوو کـە هەسـت تـەنها سەرچاوەیەکە بۆ زانین.

لەکاتێکدا، بەهۆی جیاوازی قەوارە و تەمەنیان خەڵك جیاوازن لەهەستا، لەبەر ئەوە مەحاڵـە دەرککـردنی ڕاستیەکان، هەرکەسێك شتێکی دەرککردایە، بەڕاستیان دەژمارد،

هیچ شتێك نەبوو كە ناوی هەڵەبێت، چونكە لای وابوو هەموو رایەكی دەرككەر و هەستدار ڕاستە...

عەرەب، ئەو بیر وباوەڕەی كەدەڵێت (ئادەمیزاد پێوەری هەموو شتێكە) ناونا (عنْدية) واتە باوەرهێنانی تاكە كەسێك بەو ڕایانەی كەهەیەتی.

پاشان (گورگیاس)ی سوفستائی بیرۆكەكانی بەدەركەوت، سوفستائی گەیاندە ئەو پەڕی بێفەری و وورێنە و بەرەڵایی، كاتێك بەیەك كەرەت ئینكاری بوونی هەمووشتێكی كرد، لای وابوو مەحالە زانین و تێگەیشتن و یەكتر ناسین لەنێوان خەڵكدا، ئەی حەیران، ئەبینیت ئەم وورێنانە زۆر لەوە نزمترو لاوازترە، كە بكەونە تۆژینەوە و باسەكانی فەلسەفەوە، تەنها ئەو چاكەیەی هەبوو كە زەمینە خۆشكەر بوو، بۆ پەیدابوونی (سوكرات: سوقرات)...

حەیران: چۆن، ئەم ورێنانە سوكراتی دانای خستەوە؟

شێخ: سوكرات، خۆی دامەزرێنەر و دانەری بنەماكانی (فەلسەفەی زانین) (فلسفه المعـــرفة) بوە، كە تا ئێستاش لەگەڵ جیاوازی ڕووەكانی موناقەشەگیری دەربارەی، لە ۲٬۰۰۰ ساڵ لەمەوپێش بەسەر هەموو عەقڵێكی ساغ و ڕاست زاڵە. هەموو ئامانجێكی (سوكرات) لەفەلسەفەدا ئەوە بوو، كە ڕێڕەوی زانین لەسەر بناغەی عەقڵ دابڕێژێت و پایەكانی (ڕەوشت بەرزی) بچەسپێنێت لەدڵ و دەروونی خەڵكدا، لەسەر بناغەی ئەو ڕاستیەی كە بێگومانە.

ئەم فەیلەسوفە پیرۆزە كاتێك دەیبینی كەڕەوشتی بەرزی خەڵكانی هاوزەمان و هاودەمی بەرەو ڕووخان و نەمان دەچێت لە بەردەم فڕووفێڵی سوفستائیەكان، كەئینكاری عەقڵ و، حەق و، ڕاستیەكان و، ڕەوشت بەرزیان دەكرد،بەوەی كەوا ڕێڕەوەكانی زانینیان دەگەڕانەوە بۆ هەست، سوكرات خوازیار بوو ڕێڕەوەكانی زانین بگەڕێنەوە بۆ عەقڵ و، مەردوم بەگشتی و بەبێ جیاوازی لەسەر ئەحكامەكانی عەقڵ بەندن.

تا بەمە بگاتە دانانی سنورێك و پێناسەیەكی چاك بۆ ڕەوشتی بەرز (الفضيلة).

دوای سوكرات، ئەفلاتونی بەناوبانگی قوتابی (سوكرات) پەیدابوو، پشتگیری (تیۆری زانین: نظرية المعرفة)ی كرد، كەمامۆستاكەی دایڕشتبوو، زیاتر چەسپانی، بەڵام

تێناگەین بۆچی ئەم زانینانەی لەسەر بنەمای (نموونەیی: المُثُل)، دانا؟ مەبەستی چی‌یە لە (نموونەیی: المثل)؟

دەڵێت: ماناگشتی‌یەکان ناتوانرێت بەهەست دەرك بکرێت، بەڵکو بەهۆی عەقڵەوە دەرك دەکرێن؛ بۆ نموونە جوانی و ناشیرینی دوومانان کە، لەزۆر شتی جۆراو جۆر و جیاواز لەروخسار و شێوازیاندا، دەرکیان پێدەکەین. بەڵام کێ پێمانی ناسان کە هەندێك لەم شتانە هاوبەشن لەجوانی دا، هەندێکی تریان هاوبەشن لەناشیرینیدا، بەهەست دەرکی ئەم هاوبەشیەمان نەکردووە بەڵکو بەعەقڵمان، ئەو عەقڵەی کە بەراورد دەکات لەنێوان شتە هاوبەشەکانی جوانی، ئەوکاتە عەقڵ بەرجەستەی جوانی دەکات، بەڵام بۆ ئەوەی عەقڵمان لەتوانایدا بێت ئەم بەرەنگاری و بەراوردیی‌یە پێویستبە بیرۆکەیەکی رەسەنی پێشینەی هەبێت لەسەر جوانی و ناشیرینی. هەتا ئەگەر ووتمان ئەم بیرۆکەیە لەداهێنەری عەقڵمانە،دەبێت بگەڕێینەوە بۆ سەفسەتایەتی پێشوو، کەپێوەری راستیەکان بەپێوەری: تاکەکەسی ڕووت دەپێوێت، کەواتە پێویستە لەسەرمان بڵێین ئەم ماناگشتیانە، بوونێکی راستەقینەیان هەیە لەپشت عەقڵمانەوە، هەر ئەمانەیە کە (ئەفلاتۆن) بە (نموونەیی: المثل) lesidees ناویان دەبا.

هەروەها ووتی: خودی خۆمان پێش جێگیر بوونی لەناو جەستەدا، لەجیهانی نموونەیی (المثل) دەژیا، لەپاش جێگیر بوونی لەجەستەدا، جیهانی نموونەیی (المثل) لەبیر کرد، لەبیرچوونەوەیەکی کەم بەچەشنێك، کە چاوی ئەکەوێت بەماناگشتیەکانی جوانی و ناشیرینی نموونەیی دێتەوە یاد، بەهۆی بەراورد کردنەوە، جوانی و (ناشیرینی) شت دەرك دەکات، هەروەها بەهەمان شێوە بۆ هەموو ماناگشتیەکانی (ڕەووشت بەرزی) و یەکسانی و چاکەکردن..... وهتد.

زانست یادکردنەوەی (نموونەیی: المثل)ە، نەزانیش لەبیرکردنێتی، ئەزموونەکانی ژیانی ئەم دونیایە بریتی‌یە لە ڕێگایەك بۆ بەئاگاهاتنەوەی عەقڵ بۆ ئەو زانینانەی کەلەوە و پێش لەجیهانی (نموونەیی) فێر بووە.

حەیران: گەورەم ئەم نموونەیی‌یە چین و راستیەکانیان چی‌یە؟

شێخ: ناحەقت نیە سەرسام بی، پێش تۆ ئەرستۆش سەرسوڕماو بوو؛ ئەفلاتۆن ئەم نموونەیی‌یەی بە چەندەها وەسف پێناسە کردووە بەچەشنێك کە نە تێی دەگەی، نەگونجاویشە، جگە لەو وەسفانەی کە پەیوەستە بەوکارانەی کەلەزانستەکانی خودایە.

ئەی حەیران من ئەمە پەسەند دەکەم، کە دەربارەی نموونەیی دەڵێت، نموونەیی ماددی نی‌یە، بەڵکو چەند مانایەکی ڕووتە، توخمەکانی بوونی لەخودی خۆیدایە، نەك لەشتێك لەدەرەوەی ئەو بێت، هەرخۆی بناغەی هەمووشتێکە، پشت بەهیچ شتێکەوە نابەستێ بەڵکو شتی تر پشتی پێ دەبەستێ، هەمیشەیی و نەگۆڕ و هەتا هەتایی‌یە و جێگیر و تەواوە، پابەند نی‌یە بەکات و شوێنەوە.

ئەی حەیران، لەم وەسفانەوە تێناگەیت کەئەفلاتۆن ئەیەوێت ئەو باسانە بەدەربخات کە پەیوەستە بە زانیینەکانی خوداوە؟

حەیران: ئایا ئەفلاتۆن باوەڕی بەبوونی خودا هەبووە؟

شێخ: (ئەفلاتۆن) یەکەم فەیلەسوفە کە باوەڕی بەخودا هێناوە و، وتوویەتی: هەرخودا دروستکەری جیهانە سەرپەرشتیاری کارەکانیەتی، بۆ ئەمەش چەندەها بەڵگەش دەهێنێتەوە گرنگترینیان بەڵگەی نیزامە کە ئەڵێت: **ئەم جیهانە، نیشانەیەکە بۆ ئەوپەڕی جوانی و یاسایی دا، مەحاڵە لەئاکامی هۆکاری ڕێکەوتن بێت، بەڵکو عاقڵێك دروستیکردووە، تەواوە، خێرمەندە، هەمووشتێکی بەمەبەست و دانایی ڕێکخستووە.**

کاتێك ئەفلاتۆن ئەیەوێت ئەندێشە و چۆنێتی وەسفی خودا بکات لەدروستکردنی ئەم جیهانەدا، گرێیەك دەبێتە کۆسپ لەعەقڵیدا، وەك چۆن عەقڵی هەموومان بەگشتی بێ‌بەش نی‌یە لەم گرێیە، ئەو کات ناتوانێت تێڕوانینی دروستکراوەکان. لەنەبوون بکات و، دەڵێت هەموو شتێك پێکهاتەی (مادده) (matiere) و (وێنە: صورة) formeیە، هەر ئەم وێنەیە کەوا لەمادە دەکات ببێتە شتێکی دیاریکراو. ئەمش لەکاریگەری نموونەیی (المثل) کەوتۆتەوە کەسیفەت و شێوازێکی تایبەتی ئەداتێ.

جا شت پێش ئەوەی وێنەی نموونەیی خۆی وەرگرێت، مادده بووە، کە نەسیفەتی هەبووە و نەشێواز، لەپاشدا لەسەر نموونەی خۆی دروست بووە، حەقیقەتی بوونی بەرجەستە کرد پاش ئەوەی کەنەبوو بوو، ئەوەی کە سیفەتی نموونەکەی پێدەبەخشێت و لە نەبوونەوە دەیهێنێتە کایەوە، هەر خودایە.

حەیران: من تێناگەم چۆن مادده پێش ئەوەی وێنە وەربگرێت نەبوو بووە؟.

شێخ: نەتۆ تێدەگەیت و نەمنیش، هەروەها ئەفلاتۆن خۆشی بەو عەقڵە ساغە و تەوا و بەرزەوە، تێناگات کەچۆن (شت) لەیەك ساتدا مادده و نەبوو دەبێت.

بەلام ئەم عەقڵە گەورە ڕاپێچدەکرێ، وەك هەموو عقلێکی گەورە چۆن ڕاپێچدەکرێت بۆ چەسپاندنی ئەم ووتانە بەهۆی نەتوانامانەوە لە ئەندێشەکردنی دروست بووەکان لەنەبوونی ڕووت، کە لە (نمونە هێنانەوە) هەڵخەڵەتێنەرەوە کەباڵی کێشاوە بەسەر هۆشماندا دەستمانکەوتووە، واراهاتووە کە ئەندێشەی دروستکراو بکات لەنەبوو: ئەوان شتەکان دەبینن کەلە وێنەیەکەوە دەگۆڕێت بۆ وێنەیەکی تر، واباوەڕدەکەن کە ئەم وێنانەی کەلەگۆڕان کەوتوونەتەوە، وێنەیەکی دروستکراوی نوێن.

موجادەلەی عەقڵی (الجدل العقلي) ڕایان دەکێشێ بۆ ئەندێشەکردنی (ماددەکۆنەکان) بەبێ وێنە، سەرسام دەبن لە وەسف کردنی ماهیەتی ئەو ماددەیەی، کە بێ فورمەو، دەڵێن ئەم ماددەیە بێ سیفات و شێواز و ڕەنگ و بۆن و چێژ و قەوارەیە چونکە هەموو ئەم وەسفانە لە وێنەوە بەرجەستە دەبێت. کێشە تۆژینەوەکانیان دەیانگەیەنێتە ئەوەی، کەبڵێن ماددە لە نەبوونەوەیە، ئینجا عەقڵیان لەتوانایدا نییە و ئەندێشەی دروستکردنی جیهان بکات لەنەبوونەوە، دەڵێن: خودا بێ سیفات و بێ شێوازی دۆزیەوە، هەروەها بینی نموونەیی (المثل) ڕووتە، جا ماددەی لەسەر وێنەی نموونەیی پێکهێنا، واتە وێنەی دا بەماددەو، بووە شتێکی دیاریکراو، بەووتەکانیان ئەتگەیەننە ئەو باوەڕەی کە بڵێن، خودا ئەم جیهانەی لەو ماددەیە دروستکردوە، کە لەنەبوونەوە پەیدای کردوەو، ئەو وێنانەی پێبەخشین کەلەزانستی ئەزەلی خۆیدا هەیە، بێجگە لەم بیرۆکەیە هەموو بیروڕایەکی تر ناپەسەند و ناڕەوایە، هەرچۆنێك بێت (ئەفلاتۆن) باوەڕی بەبوونی خودا هەبووە، دەرکی کردوە کە هەر خودا خۆی دروستکەر و بەڕێوەبەری کاروباری ئەم گەردوونەیە، بەتوانا و دانایی خۆی، بەلام کاتێك ویستی خۆی بهاوێژێتە نهێنی دروست بوون توشی سانمە و خلیسکان بوو، هەروەك چۆن (ئەرستۆ)ی قوتابیشی دووچاری بۆوە، کە بەپێشەوای هەموو فەیلەسوفەکانی، کە لەبوونی خودایان کۆڵیوەتەوە دەژمێرێ.

حەیران: من ئەزانم کە (ئەرستۆ) پێشەوای هەموو فەیلەسوفە سەرەتاییەکانەوە هەرخۆشی دانەری زانستی (لۆژیکە: المنطق) بەجۆرێك کە نازناوی مامۆستای یەکەمیان پێبەخشیوە، چۆن دووچاری هەڵەدەبێتەوە؟ .

شێخ: بەڵێ ڕاستە کە ئەرستۆ گەورەترین فەیلەسوفی سەرەتاییەکان بووە کەلەدۆزینەوەی بوونی خودا کۆڵیوێتەوە، یەکێك بووە لەوانەی کەباوەڕیان بەبوونی

خودا هەبووە، بەڵام کاتێك ویستی بکۆڵێتەوە لەنهێنیەکانی دروستکردنی ئەم گەردوونە دووچاری هەڵەبوو وەك ئەوانی دیکە کە دووچاری هەڵە هاتن، گەر گوێبیستی بیرۆکەکانی ببین سەبارەت بە (زانست) (المعرفه)، سەرت سوڕ ئەمێنێ کەچۆن ئەم عەقڵە بەرزە، دانایە دووچاری ئەو هەڵانە بۆتەوە، کاتێك کەدەڵێت: دەرك کردنی هەستی (الادراك الحسی) یەکەم هەنگاوە کەبیرکردنەوە ئەینێت بەرەو زانین.

گەر کۆمەڵێك لەدەرك کردنە کەمایەتیە هەستیەکان لەمێشك کۆببنەوە بیرەوەریەکان پارێزگاریان لێ بکەن ئەوە بیرکردنەوە دەچێتە قۆناغی دووەمیدا لەئەزموونندا (التجربه) کەپابەندە بەبەراوردکردنی شتەکان، وەزانینی پەیوەندییەکان و هۆکان و هۆکارەکانی، پاشان بیرکردنەوە دەچێتە قۆناغی سێهەمی کەبریتییە لە (بیرکردنەوەی بیرۆکەیی: التأمل النظري) بۆ گەیشتن بەتوێژینەوە و وەرگرتن و وەرێگای خۆرسکی کەعەقڵ پابەندیتی لەم قۆناغەدا لەدەرك کردنی هەستی بۆ ئەزموون پاشان بۆ بەراوردکردن و بیرکردنەوە و هۆکار. پێوەر و توێژینەوەی وەرگرتن و فەرمان دەرکردن، کەئەمانە هەمووی بەگشتی لەلۆژیکەکانی (منطق) ئەرستۆ دادەنرێ، کەئەرستۆ بنەماکانی لە سەرداڕشت و کردی بەزانستێك، کەشایستەی ئەوە بوو لەمێژووی فەلسەفەدا بەمامۆستای یەکەم ناوبرێت، بەڵام ئەم مامۆستا یەکەمە، خاوەنی ئەم لۆژێکە (المنطق) پوختەبێ گەردەیە، کاتێ ویستی بکۆڵێتەوە لەپێکهاتنی گەردوونِ لەبیرۆکەی ماددەدا کەوتە هەڵەوە، کەعەقڵمان دەستەمۆیەتی، کەبەپێوەری نموونەیی هەڵخەڵاتاوە کە مرۆڤ لەسەری ڕاهاتووە و بەرجەستەی کرد، بەبەکارهێنانی شتە ماددیەکانی ژیان.

رەحمەت بوو لای ئەندێشە کردنی پێکهاتنی ماددە لە نەبوو، باوەڕی وای هێنا کە ماددە دێرین ترین شتە پاشان عەقڵی ژێری پاڵپێوەنا کە باوەڕ بهێنێت کەوا هەرگیز نابێت ماددە لەشتێکی تایبەتیەوە پەیدا بووبێت، چونکە بێ وێنەیە لەبەر ئەوە سەرسام بوو لەپێناسەکردنی، تاگەیشتە ئەو ئەنجامەی کەبڵێت ماددە بریتییە لەنەبوون.

حەیران: عەقڵم، نایبڕێت، ئەی گەورەم بۆمی ڕوونبکەرەوە چۆن ماددە بریتییە لە توانای پێکەوەلکان.

شێخ: تۆ لێبوراویت، ئێستا بیرو ڕای ئەوت بەوتەیەکی کورت و ساکار بۆ ئاشکرا دەکەم.

(هنری برگسۆنی) فەیلەسوفی هاوچەرخمان ئەڵێت: (بەشێك لەعەقڵمان دروستبووە بۆ بەکارهێنانی دەرك کردن بەجەستە ماددیەیەکان، لەم چواردەورە ماددیەیدا زۆربەی ئەندێشەکانی بەدەست هێنا)ئەمە ڕاستە هەربۆیە ژیرترین عەقڵ ناتوانێت لێی دەربازبێت، تاعەقڵی ئەرستوش، کاتێ ویستی تۆژینەوە لەسەر پێکهێنانی گەردون بکات، بەوێنەی ئەو لێکدانانەوەی کەلێکدانەوەی ئامرازێك دەیکات کە مرۆڤ بەدەستی خۆی دروستی کردبێت لەماددەیەکی تایبەتی لەسەر شێوازێکی تایبەتی و بۆ مەبەستێکی تایبەتی....

هەروەها ئەڵێت: هەموو شتێك پێکدێت بە کاریگەری چوار هۆ، هۆی ماددیی (العلة المادية) (La causemateriell)ئەو ماددەیە کەشتی لێ دروست دەبێت.

هۆی وێنەیی (العلة الصورية) (La caus for maned) شێوازێکی تایبەتی ئەدات بەمادە.

هۆی کاریگەر (العلـــة الفاعلـــة) (La cause eff icient) ئەو هۆیەیە کەشت پێکدەهێنێت و شێواز و وێنەی پێدەبەخشێت. هۆی مەبەستی (العلة الغائية)( Lacaus finele) ئەو مەبەستەیە کەبەهۆیەوە، هۆی کاریگەر هەڵدەسێت بەدروستکردنی شت لەسەر ئەو شێوازە.

بۆ نموونە (هۆی ماددیی) لە جێنوستنێکدا، دارەکەیەتی و (هۆی وێنەیی) تیایدا، ئەو وێنەیەیە کەلەدارەکە تاشراوە، خستۆتیە قاڵبی جێنووستنێك نەك شێوەی خوانێك، ( هۆی کاریگەری )دارتاشەکەیە کە جێنووستنەکەی دروستکردووە و (هۆی مەبەستی) نووستن و حەوانەوەیە، ئەرستۆ هەستا بەتێکەڵکردنی هۆکانی (وێنە و مەبەست و کاریگەری ) کۆکردنەوەیان لەیەك هۆدا کە ناوی نا وێنە( الصورە) و ووتی: هۆی وێنەیی کە ماهیەتی شتە و جێگیر بووە لەخودی (هۆ مەبەستیدا) و لێشیەوە هەڵقوڵاوە، شت کاتێك ئامانجەکانی بەدەسدێت کەوێنەکەی لەخۆگرتبێت، واتە بەپێی هۆ مەبەستیەکە یەك بن، وەك باسکرا کەهەردووکیان لەهۆکاریگەرەوە کەوتوونەتەوە، چونکە هۆکاریگەر لەمەبەست و وێنەدا بەدەردەکەوێت، ناتوانرێت جێنووستن دروست بکرێت بەبێ پێشکەوتنی مەبەست دروستکردنی و هەروەها مەبەست ئاشکرا نابێت، لەتوانا (القوە) بۆ کار (الفعل) پاش دروستکردنی جێنووستنەکەوە بەخشینی وێنەیەکی تایبەتی پێی و. کاریگەری کەدارتاشەکەیە بەکاریگەری کارەکە نەبوو بەبێ دروست نەکردنی جێنووستنەکە، بەلام پێش ئەوە دارتاشەکە کاریگەرە بەتوانا.دوای بایەخ دانی

بەو سێ هۆیە، وێنەی، مەبەستی کاریگەر لە (وێنەدا) تەنها (هۆی ماددیی) مایەوە کەماددەیە، یا.... هەیوولایە[1].

حەیران: وادەزانم ئەرستۆ ڕێبازێکی پەسەندی گرتبێت لەشیکردنەوەی پێکهاتنی شتە جۆرا و جۆرەکانی ئەم گەردونە، بەڵام نموونەی جێنووستن و دارتاش ناگونجێت لەگەڵ کێشەی پێکهاتنی ئەم گەردونە چونکە داری جێنوستنەکە لەبووندا هەیە، نەك دارتاش دروستی کردبێت، بەڵکو ئەو تەنها وێنەی جێنوستنەکەی لەسەر کێشاوە بەڵام کێ ئەم دارەی دروست کردوە؟ بەڵکو کێ ماددەی بنەڕەتی دروست کردوو هێنایە کایەوە، ئەم وێنەیە کێ بە هێولای بەخشی.

شێخ: ئەرستۆ مەبەستی ئەو مادده هیولایە نییە کە ئێمە تێگەیشتووین، چونکە ووشەی مادده بەلایەنی کەمەوە لەلای ئێمە شێوازوو قەوارەو کێشی هەیە، بەڵام لەلای ئەرستۆ هیولا ڕووتە لەهەموو سیفاتێك و، سیفات وەرناگرێت بەبێ وەرگرتنی وێنەکەی، پێش وەرگرتنی سیفاتی شتێك نەبوو کەبتوانرێت پێناسە بکرێت و سنوری بۆ دابنرێت، واتە هیولا لەلای ئەرستۆ شتێك بووە لەتوانادا (Enpuiss ahce) بەڵام پاش وەرگرتنی وێنە دەبێتە شتێکی تایبەتی لەکاردا (Enacte): کەواتە هیولا لەلای ئەرستۆ بریتیە لەتوانای پێکەوەلکان و هەر ئەمەش بوو وای لێکردم کەبڵێم ئەو ماددەیەی کەئەرستۆ باسی دەکات بریتییە لەنەبوون.

حەیران: بەڵام گەورەم ئەمە شتێکی ڕوون و ئاشکرا نییە؟

شێخ: بەڵێ نەڕونەو نەئاشکرایە، تەنانەت ئەرستۆش دەرك بەوە ئەکات، هەر لەبەر ئەوەیە کەئەیبینین، بنەڕەتی گەردوون دابەش ئەکات بۆ (مادده و وێنە)، وتی: بوونی وێنە بەبێ مادده ئەندێشەناکرێت و هەروەها بوونی مادده بەبێ وێنە ئەندێشە ناکرێت. کەواتە وێنە ناتوانێت بەبێ مادە بەدەرکەوێت و، مادەش ناتوانێت بێ وێنە بەدەرکەوێت و، ئەم جودایییەی کەباسی ئەکەین تەنها لەمێشکدا هەیە، ئەمەش کورتەی بنەماکانی فەلسەفە

---

[1] (هەیبولا) بە بۆچوونی شارەزایانی ئەم بوارە شتێکە قابیلی گشت (وێنەکان) و بەتەنها تایبەت نەکراوە بۆ وێنەیەکی دیاریکراو نە کتێبی (کشف اللغات)دا هاتووە کە (هەیبولا) لە لایەن سۆفیەکان واتە وێنەی ناوەکانی خوا و، لە لایەن وتەبێژ ەکان (متکلمون) واتای شتە ڕاستەقینەکان (حقائق الاشیاء) دەگەیەنێ و لە لایەن حەکیمەکانیش بە مانای ماهیەتی شتەکان (ماهیة الاشیاء) هاتووە. سەرچاوە: کشاف اصطلاحات الفنون، بەرگی چوارەم. -لێکۆڵەر-

میتا فیزیکیەکەیەتی کەئەڵێت گەردون دێرینەوە لەمادده و وێنە و جولە و بزوێنەرەکەی پێکهاتووە.

حەیران: کەواتە، ئەو بزوێنەرە کێیە، کەوێنە و جولەی بەم گەردوونە بەخشیوە؟

شێخ: ئەرستۆ ئەڵێت، ئەوە، خودایە، هەر خۆی هۆی وێنە و مەبەست و بزوێنەرە.

حەیران: کەواتە خودا هۆی وێنە و مەبەست و بزوێنەرە کەواتە، هەر خۆی بەخشێنەری وێنەیە بۆ هیولاکە تەنها بریتیە لە (توانایی بۆ پێکەوەلکانن) بەگوێرەی باوەڕی ئەرستۆ، لەئاکامدا خودا خۆی دروستکەری ئەم گەردوونەیە بەمادده و وێنەیەوە، ئیتر چۆن گەردون کۆنە بەماددەو وێنە و جولەکەیەوە.

شێخ: ئەرستۆ ئەیەوێت خۆی دەربازبکات لەکێشەی ئەم(کۆنایەتیە) (قدم) و، ئەڵێت ئەم جیهانە یەکەم نیە لەچەرخدا (زمن) بەڵکو خودا پێش گەردوونە، هەر وەکو چۆن پێشەکی پێش ئاکامە و، پەیوەندی خودا بەگەردونەوە پەیوەندی هۆنیە بەهۆکارەوە ، تا... بڵێین چەرخ دەستی تایبەتی هەیە تیایدا بەڵکو پەیوەندی یەکی لۆژیکیە (منطقية)، خودا بوونی بەخشیووە بەم گەردوونە، هەروەك چۆن پێشەکی بوونی ئاکام دەبەخشێت و پێشخستنی پێشەکی لە ئاکام، لەبیروباوەڕدایە نەك لەچەرخدا.

ئەوەی پاڵی پێوە نا کەباوەڕبهێنێت بەکۆنێتی گەردون لەباوەڕ بونێتی بە کۆنێتی جوولە و ئەڵێت: یەکەمین هۆی جوولە، خودایە، چەسپاوە و هەمان توانای ئەزەلی هەیە، گەر، گریمان کاتێکمان کرد جوولەی تیانەبێت واپێویست ئەکات کەهەرگیز جوولەنەبێت، گەر بڵێین جوولە پەیدا بووە، پاش ئەوەی کەنەبوو بووە، واتە ڕاستیەکی بەدی هێناوە، کە جوولە پێویستە، کەواتە جولێنەری یەکەم چەسپاوە ، هەمان توانای هەیە و ئەندێشەی پەسەندکراوێك ناکرێت کەجوولەی پەسەند بکات.

ئەم هەڵەیە لەبەڵگە هێنانەوە کەوتۆتەوە، لەهەڵوێستمان بۆ سیفاتی (توانایی) (القدرة) و لە یادکردنی سیفاتی (ویست) (الارادە)، ئەو هەڵەیە کەزۆر خەڵکی هەڵخەڵەتان.

ئیمامی غەزالی[1] بە وەڵامێکی بڕەندەیی ئەم بیرۆکەیەی پووچەڵ کردۆتەوە کە ئەڵێت: ئەم گەردوونە پێکهاتەی ویستێکی کۆنە کەبوونی پێویست بوو لەو کاتەی کەپەیدا بوو

---

١ ئیمامی غەزالی ڕەحمەتی خوای لێبێت لە کۆتایی ژیانیدا کەوتە گێژاوی سەر سوڕمان لە باسە فەلسەفیەکان و زانستی (کەلام)دا، لە پاشان پشتی لەم ڕێباز و ڕێچکۆلانە کرد بەرەو سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ هات کاتێك کۆچی دوایی کرد، سەحیحی ئیمامی بوخاری لەسەر سنگ دانابوو. سەرچاوە (تهذيب شرح العقيدة الطحاوية). -لێکۆڵەر-

و، نەبوون بەردەوام بوو بۆ ئەو مەبەستەی کەبەردەوام بوو بۆی و، کۆنێتی هۆ ناکەوێتەدوی کۆنێتی هۆکار (المعلول)، مەگەر هۆکار لەخوودی خۆیدا لەهۆیەکەوە پەیدا بوویەکی پێویستی لێ دروست بێت.

پەیدا بووە کە پێویست نابێت، تاهۆ و هۆکاری گونجا و نەبن،و لەنێوان خودا و گەردون (گۆڕرا و) یەك بوون نی‌یە، تا گەردونێکی پێویستی لێ بکەوێتەوە، کەواتە وتنی کۆنێتی جوولە پێویست ناکات، وەك بیرۆکەکانی ئەرستۆ، چونکە عەقڵ بەپێویستی نازانێت و، پێویست بەووتنی نوێکردنەوەی پەسەند ناکات، وەك بۆ چوونەکانی ئەرستۆ، چونکە ویستەکانی کۆن کاتی جوولەیان دەست نیشانکردووە....

حەیران: ئەم شیکردنەوانە لەوپەڕی ڕوونیدان، چۆن مامۆستای یەکەم لەیادی کردوون؟

شێخ: جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە ئەم هەڵە بیر وباوەڕی‌یە سەرەتایی‌یانەی کەئەم هەموو هەڵەو فەرمانانەی لێکە وتۆتەوە، نەتوانایە لەعەقڵماندا بۆ ئەندێشەکردنی پەیدا بوون لەنەبوون، هۆی دوودڵی لەدەرك کردنی مانای چەرخ و ڕاستیەکانی و، نەدیار بوونی نهێنی‌یەکانی لە (ماوەی وازهێنانی) پێش دروست بوون و، لەوتەکانی (ئیمامی غەزالی و ئیبن طوفەیل و عەمانوئیل کانت)دا وەڵامی ڕاست بۆ هەمووی گوێبیست دەبیت.

گەر، بەردەوام بیت لەخوێندنەوەی هەموو وتەکانی ئەرستۆدەبینیت ئەم پیاوە لەگەڵ گەورەیی عەقڵ و فراوانی زانستەکانی کەوتۆتە گێژاو و تێکەڵ کردن و خەیاڵی چڕ و دوور لەڕاستیەکان، کاتێ هەوڵی‌دا بەعەقڵ دەرکی نهێنی پێکهاتووەکان بکات.

هەروەها کەوتە هەڵە زانستی‌یە جۆراو جۆرەکانەوە لەبەرئەوە لەپلەی پیرۆزەکان و بێ هەڵەکانی مەژمێرە، وەك ئیبن ڕوشدی خۆشەویستی کەلەو پلەیەي دانابوو.ئەم نمونەیە گوێ بیست بە کەئەڵێت لەڕستەیەکدا کەلێی دەگێڕنەوە: خودا جولەی گەردوون بەجوولەی پاڵپێوەنەر ناکات، چونکە ئەمە واپێویست دەکات کەجولەیەکی سنوردار لەخۆبگرێت.

بەڵام جیهان بەرەو مەبەستەکەی ڕادەکێشێت، وەك چۆن ئێمە بەرەو چاکە و جوانی ڕادەکێشرێین بەبێ کارێك لەهەردووکیانەوە و، لەلایەکی تردا ئەڵێت، خودا گەردونی جولان بەجولە بازنەییەکەی، لەپاشدا وازی لێهێنا بەدەوری خۆیدا بسوڕێت و، نازانم سەبارەت بەخوداوە ئەو جیاوازیی‌یە چی‌یە لەنێوان جولەی پاڵپێوەنەر و جولەی بازنەیی

و، ئەلێت ئەم جولە بازنەیی‌یە ئەوە هۆی سوڕاندنەوەی خۆرە بەدەوری زەویدا... و هۆی بەدەرکەوتنی بوون و تێکدانە (الكون والفساد) لەگەردووندا.

لەکاتی گۆڕینی توخمەکان و تێکەڵ بوونیان، جەستەی لێ دەکەوێتەوە، گەشەدەکاو لەپاشان لەناو دەچێ، بەلێك کارکردنی دوو هێزە کاریگەرەکە، کە گەرمی و ساردیی‌یە، دوو هێزە کارلێکراوەکە تەڕی و ووشکی‌یە و، ئەلێت زەوی وەستاوە و، چەقی هەموو گەردوونە، دەربارەی خودا ئەلێت: خودا تەنها ئاگای لەخۆیەتی، ئاگای لەغەیری خۆی نی‌یە دەناسەر بۆ ئەوە دەکێشێ کەئاگای لەشتێکە کەگەلێ کەمترە لە زاتی خۆی و، هەروەها چەندەها بڕیار و ووتەی پووچەڵی تر، کەپێچەوانەی ووتەکانی پێشوویەتی کەدەڵێ خۆی هۆی کاریگەری و بزوێنەرە و، پێچەوانەی زانست و عەقڵ و ئەو لۆژیکەیە کەمامۆستای یەکەم داینا، هەرلەبەرئەوە وای بەڕاست ئەزانم ئەو یاسایانەی کەلەو ئەگێڕنەوە هەمووی ڕاست نەبێت.

گرنگ لەوەدایە ئەرستۆ ئینکاری بوونی خودای نەکردوە، بەڵکو سوور بووە لەسەری، بەڵام کاتێ ویستی باسی سیفاتی خوداو چۆنێتی دروست بوونی بکات، عەقڵی تووشی ماندبوون بوو، وەك چۆن ئەوانەی وتەکان و شیکردنەوەکانی ئەرستۆیان باسکرد دووچاری ئەو ماندوو بوونە بوون.

لەپاشدا لەبیرۆکەی بوونی میتافیزیکی تووشی نوشوستی ماددی دەبێت لەلایەن رواقیەکان و ئەیبقوریی‌یەکان، کە بووە هۆی پەیدا بوونی (گوماندارانـالشكاك) تا هاتنی (فەلسەفەی ئەفلاتۆنی نوێ) کە تأکید لەسەر بوونی خودایەکی دروستکەر ئەکات.

---

١ هەر شتێك کە لە ناو ئەو گەردونەدا هەیە بە گشتی لە مرۆڤ و ئاژەڵ و گژ و گیا و دار و بەرد.. هتد، هەرچی بووە و دەبێت و ڕودەدات تیایاندا تەنانەت چریکەیەك یان جولەیەك بێت ئەوە خوای پەروەردگار پیێ عالمە و دەیزانێت هیچ شتێکی لێ ون نابێت هەروەکو فەرموویەتی: (وَعِنْدَهُ مَفاتِح الغَيْب لا يَعْلَمُها الا هُوَ وَ يَعْلَمُ مافي البرِ وَ البَحْرِ وَما تَسْقُطُ مَنْ وَرَقَةٍ الا يَعْلَمُها ولا حَبة في ظلمات الارضِ وَلا رَطْب وَلا يابسٍ الا في كتاب مُبين) الانعام:٥٩، واتە خوا زانستی غەیب و پەنهانی لەلایە هیچ کەسێك نایزانێ تەنها ئەو نەبێت، هەرچی هەیە لەناو دەشت و دەریاکاندا دەیزانێ هەر گەڵای دارێك بوەرێ پیێ ئاگادارە و هەر دانەوێڵەیەك کە لەناو تاریکیەکانی زەوی دا هەیە و هەر تەڕی و وشکانیەك هەبێت ئەوە لە (اللوح المحفوظ) و علمی خوادا هەیە.. لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئەوپەڕی گەورەیی و توانا و دەستەڵات و پاکی و بێ گەردی و زانایی و کاربەجێیی خوا دەردەکەوێ. -لێکۆڵەر-

کە ئەمەش دووپاتی خولی یەکەم ئەکاتەوە کە بە مادده دەستی پێکرد، لەسەر زمانی فەیلەسوفە سەرەتاییەکان، پاشان سەفسەتە بە گومانە پووچەڵەکانیەوە هاتنە ناوەندەوە، باوەڕهێنان بە بوونی خودای دروستکەری گەردون بە زمان حاڵی فەیلەسوفە ناوەندەکان: (سوکرات، ئەفلاتون، ئەرستۆ) کۆتایی هات.

حەیران : ڕەواقیەکان و ئەبیقوریەکان چی ئەڵێن؟

شێخ : سەبارەت بە ڕەواقیەکان، لە بیرۆکەی زانست (المعـــرفة) دەگەڕێتەوە بۆ بیرۆکەی (گومان) لە توانایی عەقڵ لە جیاکردنەوەی ڕاستیو چەوتی، کە ئەڵێن زانست لە شتە هەستدارەکانەوە ئەکەوێتەوە و، بە هۆی هەستەوە پێمان ئەگات، (دەرك کراوە گشتییەکان) بریتین لەو بیروڕایانەی کە عەقڵ پێکی هێناوە، ئەو شتانەی کە لە ژیان وەریگرتووە لە هەستە کەمایەتیەکان، لەبەرئەوە دروست نییە وەك پێوەرێك وەریبگرین بۆ جیاکردنەوەی ڕاستی لە چەوتی.

کورتەی تۆژینەوەکانیان بەو وتەیە کۆتایی دێت کە ئەڵێت : ڕاستیەکان لە ڕێگای (هەستەوە) پێدەزانرێن شتی ڕاست هەستێکی بەهێزمان لا دروست دەکات، هیچ ڕێگایەك نییە بۆ ئینکاری کردنی.

بەڵام لە دروست بوونی گەردوندا، دەبینی ڕەواقیەکان باوەڕدارن بە خودا و لە هەمان کاتیشدا بێ باوەڕن پێی. کاتێ کە ئەڵێن: مادده تەنها لە بووندا هەیە و، هەموو بوونێك لە دوو توخم پێکهاتووە : (کارلێکراو) (منفعل) (Passif) بێ جوولەیە. و (کاریگەر) (فاعل) (actif) ئەو هێزەیە کە جوولە و هەموو شێوازێك بە مادده دەبەخشێت و، ئەم هێزەش تەنها بریتییە لە ئاگر و، ئەڵێن: خودا ئاگری یەکەمە، تەنها خۆی لە بنەڕەتدا هەبووە، لەسەر شێوەی ئاگر لە پاشدا ئەم ئاگرە جوڵاوە کە بەشێکی گۆڕرا بۆ هەوا و، بەشێکی ئەو هەوایە بۆتە ئاو و بەشێکی ئەو ئاوەش بۆتە خاك.

سەرچاوەی هەموو شتێك ئاگرە و، هەموو شتێکی بۆ دەگەڕێتەوە، خودا خودی گەردونە و گەردونیش جەستەی خودایە..

حەیران : بە ڕاستی سەرسوڕهێنەرە باوەڕی ئەم فەیلەسوفانە، ئەی نابێت بیروباوەڕیان لە تۆژینەوەی بوونەکان (الوجود) پابەندبێت بە ڕێچکەکانی (زانینەوە) (المعرفة)؟ ئەی کوا بیروباوەڕیان سەبارەت بە (هەست)ی (الشعور) بەهێز، کە بە بنەمای زانینی

راستەقینەیان ئەزانی؟ ئەی چۆن توانرا ئەم هەستە دەرك و ئەندێشەی ئەو خواوەندە ئاگرینە سەرسوڕهێنەرە بکات؟

شێخ : ڕەوایە ئەم سەرسوڕهێنەرەت و، لە بەدەرخستنی بیرۆکەکانیان بۆت، تەنها مەبەستم ئاماژە و ڕێنمایی ئەو پەیوەندیی‌یەت بکەم، کە لە نێوان پوچەڵی بیروباوەڕی ئەمان و وڕێنەی هەندێ لە فەیلەسوفەکانی دوای ئەواندا هەیە.

بەڵام ئەبیقۆریی‌یەکان، بیرۆکەکانیان لە زانستدا (المعرفة)، دوورنی‌یە لە بیرۆکەکانی ئەرستۆ، کە ئەڵێن : ئەو بیروباوەڕانەی کە بە دەستمان هێناوە، بریتین لە زجیرەیەك لە دەرك کراوە هەستیەکان، کە بیرەوەریی‌یەکانمان هەڵیگرتوون، لە پاشدا بە مەزەندەو بەراورد هەڵدەسەنگێنرێ بۆ گەیشتن بە بڕیارە گشتی‌یەکان.

دەرك کردنی هەستی پێوەرێکی ڕاستە و، هەموو دەرك کراوو بڕیارەکانی بە هەمان شێوە ڕاستن.

(ئەبیقور)ی پێشەوای ڕێبازەکەیان لە بیروباوەڕە بەرزەکانیدا ئەڵێت: ئێمە کاتێ تووشی هەڵە دەبین کە دەرچین لە دەرك پێکراوەکانی هەست، هەوڵ ئەدەین گەلاڵەی ئەو بیروباوەڕانە بکەین کەلە هۆکارە ڕاستەقینەکاندا هەیەو شارراونەتەوە لە پشت ڕووکەشەکاندا (الظواهر).

بەڵام ئەم عەقڵە ژیرە، دان دەنێت بە نەتوانامان بە دەرك کردنی شتەکانی پشت سروشت (ما وراء الطبیعة)، لەم ڕێبازە دانا و بە ئاگایە دەردچێت کە بۆ زانین نەخشەی کێشاوە دەگاتە ئەو ڕادەیەی ئەو بیروباوەڕانەی کە بە دەستی هێناوە سەبارەت بە دروست بوونی گەردون هەمووی پێشبینیو خەملاندن بێت.

باوەڕ بە بیرۆکەکانی (دیموکریتس) دێنێت، وا دەبینێت کە سەرچاوەی بوون (الوجود) گەردیلە بێت، کە لە خۆیدا بزوێنەرە و ئەڵێت : هۆی جوڵەکەی لە خودی خۆیدایە، کە قورسایەکەیەتی و، لەبەر قورسایەکەی لە سەرەوە ئەجوڵێت بۆ خوارەوە لەگەڵ لادانێکی کەم، لە کاتی کەوتنیدا پێکەوە لکانن ڕوودەدا، بەمەش شتێك پەیدا دەبێت.. و ژیان هەمووی لەم پەیدابوونەوە دروست بووە جا بە ڕێکەوت بێت یا..؟ بە ڕێکەوتن.

حەیران : تێناگەم، بۆچی گریمانی جوڵەی گەردیلە کراوە لە سەرەوە بۆ خوارەوە بە هۆی قورسایی‌یەکەی، لە کاتێکدا کە قورسایی‌یەکەی ئاکامی ڕاکێشاندنە (جاذبیة).

شێخ : ئەبیقۆر لێبوردراوە لەم ئەندێشەیەیدا، چونكە یاسای ڕاكێشاندن لە سەردەمی ئەودا نەزانراوە وەك خۆت ئەزانی، تەنها ڕووكەشی ئەوەیان زانیوە كە لە هەستەوە پەیدابووە لە كەوتنی جەستەكاندا بە هۆی هێزی قورسایییەوە، لە سەرەوە بۆ خوارەوە و مایەوە لەسەر مەرجەكەی كە ئەویش دەرنەچوونمانە لەو زانیاریانەی كە لە هەستەوە دەكەوێتەوە، بەڵام لێبوردراو نابێت كاتێك لە مەرجەكەی دەردەچێت و گومان دەبات كە ژیان لە ڕێكەوت و ڕێكەوتنەوە پەیدابووە.

لە پاشان ئەم دەرچوونەی لە مەرجەكەی سەرسوڕهێنتر نییە لە وتەكەی كە باوەڕ بە بوونی خواوەندێك دەكا كە لەسەر شێوەی مرۆڤ، دەخۆن و دەخۆنەوە و بە یۆنانی گفتوگۆ دەكەن، جەستەیان لە توخمی ڕۆشنایی دروست بووە، لە بەختیارییەكی هەمیشەییدان و، دوورەپەرێزن لە كێشەكانی جیهان، بیركەرەوە؟ ئەی.. حەیران.

بەڵام سەبارەت بە بیروباوەڕەكانی لە دروست بوونی گەردون و ژیان بە ڕێكەوت و ڕێكەوتن، ئێستا كاتی موناقەشە نییە و، لە تۆژینەوەی فەیلەسوفەكانی سەردەمی نوێدا باسی دەكەین.

حەیران: گومانداره نوێكان كێن؟ ئایا شتێكی نوێیان خستەوە، بێجگە لە بیروباوەڕەكانی سوفسەتائیەكان تا.. شێخی گەورەمان بۆم بەدەربخات.

شێخ: گەر گومانداره نوێكان شتێكی تازەیان نەخستایەوە، منیش باسیانم بۆ نەدەكردی و، وتەكانم سەبارەت بە تۆژینەوە فەلسەفەیەكان لە بیرۆكەی (زانست) تا مەبەست، لەگەڵتدا بەردەوام ئەبێت.

گومانداره نوێكان خاوەنی چەند بیرۆكەیەكن كە ئەبێت زانیاری تەواوت هەبێت دەربارەیان، گەر بەبێ شارەزایی بیانخوێنیتەوە، دووچاری گەلێك گومان و شك ئەبیتەوە.

گومانی تیادا نییە، ئەو ڕێكەوتنەی كە لە نێوان سوفستائیە كۆنەكان و گومانداره نوێكاندا هەیە، بریتییە لە بیرۆكەی گومان (شك)، بەڵام جیاوازی نێوانیان لە ڕێبازو شێوازو ئاكامیاندا ئاشكرا ئەبێت وەك بۆم بە دەرخستی سوفستائیەكان خاوەنی ڕێبازێكی فەلسەفیی نین، بەڵكو مامۆستای پیشەیی بەرهەمی بوون، بەڵام گومانداران ئامانجیان ڕێبازێكی لەخۆگرتبوو كە دوور بوو لە پیشەیی و بەرهەمی و كۆمەڵێكی خاوەن بیروڕا بوون.

ئەندێشـەیان وابـوو کە گەیشتن بە ڕاستیەکان کارێکی مەحاڵ و ئەستەمە، (گومانیان) (شـك) کـردە ڕێبازێك و دروشمیان ئەوەبوو دەیـانگوت: (نازانین). و (نازانم)یان کردە ڕێبازێکی فەلسەفەی سەربەخۆ لە خودی خۆیدا.

کورتـەی ڕێبازەکەیان ئەڵێت: ئێمە شتەکان تەنها ڕووکەشیان ئەزانین کە بە جۆرەها ڕووکەشـی جۆراوجـۆر خـۆی بـەدەردەخات و، هـیچ ڕێگـا چـارەیەکمان نی‌یـە بـۆ جیاکردنەوەی بیرۆکـە ڕاستەقینەکان لەوانـەی کـە لە خەودا ئەیان بینین و یان ئەندێشەی ئەکەین بـە هـۆی هەسـتە هەڵخەڵەتێنەرەکانەوە، هـەندێ جـار هەسـت ڕێ ون ئەکات. و دەرك کـەرە هەسـتیەکان ئـەگۆڕێن بـە گۆڕانـی بـارودۆخ و حاڵـەتی کەسـایەتیە دەرك کەرەکەو شتە دەرك کـراوەکە و زۆر شـتی تـریان وت: بـە جۆرێـك کـە ئینکاری یاسای (هۆکاری‌یـان) (علـــیة) دەکـرد و، وتـیان: ئـەو خەڵکـە بـە هـۆی ڕووکەشـی شـتەوە هۆکارەکـەی دیـاری دەکـەن، بەڵام ئەو ڕووکەشانە بە جۆرەها شێواز لێك دەدرێنەوە کە مـەودا نامێـنێ بـۆ ئـەوەی بـاوەڕ بـە هـیچ کامێکـیان بکـرێ و، هەندێکـیان ئیـنکاری ڕاستینەکانی پێوەر و هەڵسـەنگاندنیان (استقراء) کـرد و، تەنانەت هەندێکیان بە درێژایی گومانیان مانـەوە بـە جۆرێك کە باوەڕیان وابوو کە بنەما سەرەتاییەکانی فەلسەفە بریتی‌یە لـە گریمانی بێ بەڵگەیی، گەر بمانەوێت خۆمان گێل بکەین لە بیرۆکەی زنجیرەی بەڵگەیی (برهان تسلسل) دەکەوینە بیرۆکەی (خولی بەڵگەیی) (برهان الدوري) کە پێشەکی پێش ئاکام دەخات و، ئاکامیش پێش پێشەکی، کە ئەمەیش پووچەڵە.

کەواتە ئەم بەڵگەیە ڕێ پێ نەدراوە.

(مـام ناوەندیی‌یـە گوماندارەکـان) ئەوانـەن کە پێیان ئەڵێن (خاوەنە پێشبڕیاریی‌یەکان) الاحتمالـیین) چـونکە ئـەیان وت: پێویستە پەسـەندکردنی هـەندێ لـەو ڕاستیانەی کـە ئاشـکرا بـووە بۆمان، ناکرێ لە پەسەند کردنی ڕاستی‌یەکان لا بدەین بۆ هێنانەوەی بەڵگە لەسـەر ڕاستی‌یەکان، ئەبێـت ئەزموونەکان ڕەچـاو بکـەین گـەر ڕووکەشـی سروشتمان بـەدی کـرد لەگـەڵ پەیوەستی هۆکارەکـانی، چاوەڕوانی بەدەرکەوتنی ئاکام ئەبین. بەبێ ئەوەی باوەڕبهێنین کە ئەم ئاکامانە پابەندە بە بنەماکانی (یاسای هۆکان: قانون العلية).

حەیـران: بـە ڕاسـتی قولـبونەوەی کۆمەڵـەی گومـانداران لـە ئینکاری ڕاسـتیەکان ترسناکترە لـە وڕێنەی سەفسـەتائیەکان کـە ئیـنکاری ڕاستیەکان دەکەن لە هەمان کاتدا دان بـەوەدا ئەنـێن کـە ئیـنکارکردنەکەیان پەیوەسـتە بە بنەماکانی ژیریانەوە لە (جەدەلدا)،

بەڵام گوماندارەکان (ئینکاریان لە بنەماکانی عەقڵدا) بە ڕاست گرتووە کە دوورە لە گاڵتە.

شێخ: بەڵێ، قوڵبونەوەکەیان زۆر دژوار و پوچەڵە هەروەکو باست کرد لە ئینکاری بنەما عەقڵیە سەرەتاییەکان کە باوەڕیان وابوو کە ئەم بنەمایانە بریتین لە گریمانێکی بێ بەڵگە. بەڵام (خاوەن پێشبڕیارەکان) (الاحتماليون) کە دوربین بوون لە هەندێ تێڕوانینیانەوە بۆ ڕوو کەشەکانی سروشت، وە لە لایەن هەڵکەوتە نوێکانی زانستەوە پشتگیری گونجاندنی وتنی (پێشبڕیار) (الاحتمال) کراوە لە کاتێکدا کە بەڵگە عەقڵییە بێ گومانەکان نەیان سەلماندوە.

گەر بەراورد بکەیت لە نێوان فەیلەسوفە کۆنەکان سەبارەت بە زەوی‌و خۆرو ئەستێرەکان و ماددەو ڕاستیەکانی و نێوان ڕاستیە زانستیەکانی ئەم سەردەمەی کە تیایدا ئەژین.

جاوازییەکی زۆرت بۆ بە دەردەکەوێت کە ڕێنمایی کردنت بە وتنی (پێشبڕیارو پەسەندی) (الاحتمالات و الترجيح) زۆر قوڵبونەوەی تیادا بەدی ناکرێت.

قوڵبونەوەیان کاتێك بەدەردەکەوێت وەختێك کە باوەڕیان وایە کە هەموو بنەما عەقڵیە سەرەتاییەکان پێویستیان بە بەڵگەیە. بۆ نموونە: ئەگەر ئێمە داوای بەڵگەمان کرد لەسەر ئەوە کە گشت (كل) گەورەترە لە بەش (جزء) و دوو شتی دژ بەیەکەوە کۆنابنەوە و، یەك نیوەی دووە، ئەوکاتە مەعنای وایە عەقڵمان بەرەڵاکردوە و وا ڕامان هێناوە و داوای پێوەرێکی بیرۆکەیمان کرد بە عەقڵێکی جیاواز لە عەقڵی مرۆڤ، کە ئەمەیش دەرچوونە لە بابەتەکەمان، چونکە ئێمە بە عەقڵی خۆمان سەرنج ئەدەینە ڕاستیەکان کە لە خودی خۆیدا بنەما زانستیە سەرەتاییەکانی لەخۆ گرتووە، کە عەقڵ داوای بەڵگەی بۆ ناکات، سەرچاوەیەکە کە بڕیارە دەرك کراوە عەقڵییەکان پەیوەستە پێوەی و ئینکار کردنی وەستانی کارەکانی عەقڵە.

لەگەڵ ئەوەیش کە هاودژی تیادا بەدی ئەکرێت و، ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی دووچاری گاڵتەپێکردن دەبنەوە، گەر ئەم پرسیارانەیان لێ بکرێ: زانست (المعرفة) لەلای ئێوە مەحاڵە، چۆن زانیتان کە مەحاڵە؟ و چۆن زانیتان کە کێشە سەرەتاییەکان بەڵگەدار نین؟ و هەستەکان هەڵخەڵەتێنەرن؟ و عەقڵ هەڵە دەکات؟ و چۆن زانیتان کە (بەڵگەی زنجیرەیی) (التسلسل) پووچەڵە و، بەڵگەی خولی (البرهان الدوري) ڕاست

نیه؟ ئەوەتا ئەم جۆرە وتانەتان بەڵگەن لەسەر ئەوە کە ئێوە دان بە زانستدا دەنێن گەر ڕاست بێ (زانین) مەحاڵە لاتان بەمە ڕاستی دەرك دەکەن، ئەوکاتە وتەتان بۆ زانین مەحاڵە وتەیەکی پووچەڵە و ئەگەر وتەکەشتان ڕاست نەبوو ئەوا زانین مەحاڵ نی‌یە و، ئەگەر بڵێین پووچەڵی خولی (الدور) و زنجیرەیی (التسلسل) ئاسایی‌یە لە عەقڵدا.

گەر باوەڕتان هێنا بە بوونی کێشە عەقڵی‌یە سەرەتایی‌یەکان کەوا عەقڵ خۆی دانی پیادەنێ. و گەر ئینکاری ئەم سەرەتایی‌یانەتان کرد بەڵگەکانتان لە بنچینەوە هەرەس دینێ..).

حەیران: چۆن، بیرۆکە ئەفلاتۆنیە نوێیەکان لە نێوان درکە ماددیی‌یە ڕەواقی و ئەبیقۆریەکان و گومانە وەستێنەرەکانی ژێریدا دەڕوێت؟

شێخ: ئایا سەرت سوڕما، لەم گەشە خولی (الـدوري) هەمیشەیی‌یە بۆ کێشەی باوەڕهێنان، هیچ کەسێك هەڵناسێتەوە لە دوای کەوتنی و یا بە ئاگا نابێتەوە لە بێ هۆشی بە هۆی ڕێبازی عەقڵ و نیگاوە ئەبێت تێپەڕ بێت بە گێژاوەکانی گومان و بێ‌باوەڕی بە خودا.

دوو فەرمان بۆ ئەفلاتۆنیە نوێیەکان کۆبووە: (عەقڵ و پەیام) کە ئەمەیش تێکەڵەیەکە لە ڕێبازی ئەفلاتونی‌و نەسرانیەکان کە لە (فلیونی ئەسکەندەرەوە) دەستی پێکردو و لە پاش ئەو (ئەفلوتین) نوێی کردەوە. و (فیلون) پێش مەسیح بە (٢٠) ساڵ لە ئەسکەندەری‌یە پەیدابوو و، لە ٥٤ ی زاینیدا کۆچی دوایی کرد، واتە لەو سەردەمەوە کە ئەسکەندەریە بووە جێنشینی زانستەکانی شاری (ئەثینا) کە بووە مەڵبەندێکی زانستی گەورەی نێو جیهانی و ڕێبازی باڵادەستی ئەو سەردەمە ڕێبازی ئەفلاتون بوو.

تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەی زۆر پەیدابوو لە بارەی سەرچاوەی گەردون و، ئایا کەوتۆتەوە بە (حادثا) و یان بوونی کۆنە (قدیم) (فیلونی ئەسکەندەری) شیکردنەوەیەکی چڕی کرد لەسەر بیرۆکەکانی ئەفلاتون و، لە پاش ئەو ئەفلوتین پەیدابوو لە نێوان ساڵەکانی (٢٠٧-٢٤٠) پ. ز و ئەم ڕێبازەی نوێ کردەوە کە لە دوایی‌دا ناوی دەرکرد بە ئەفلاتوونی‌یەتی نوێ و کورتەی بیروڕاکانی ئەفلاتونێتی نوێ سەبارەت بە بیرۆکەکانی بوون و دروست بوونی گەردون، ئەم گەردونە خاوەنی ڕوکەشێکی زۆرە کە هەمیشە لە گۆڕاندایە، مەحاڵە لە خودی خۆیدا پەیدابووبێ، بەڵکو پێویستی بە دروستکەرێکی لێهاتوو پەیداکەر هەیە، ئەم دروستکەرەش خودایە، یەکەو تەنهایە، ئەزەلی‌و هەمیشەیی، لە

خۆیدا پەیدابووە و لە سەروی ماددەو ڕوحەوەیە و، لەبەرئەوەی لە وێنەی ئەو نی‌یە لە شتەکانی گەردوندا، دەبێت هەموو نیشانەو سیفەتەکانی سەلبی بن کەواتە ئەو ماددە نی‌یە و، وەسف ناکرێت بەوەی کە جولاوە یا.. وەستاوە و[2] ناوترێت هەیە لە شوێنێکدا یا.. کاتێکدا[1] و، ناتوانرێت هیچ سفەتێکی بدرێتە پاڵ ، چونکە ئەم زیادکردنە لە یەکچوونێکە لەگەڵ شتە دروستکراوەکانی خۆی، گەر پێناسەی خودا بکەین بێ کۆتایی‌و تەواوە، پێویستی بە هیچ شتێك نی‌یە هەموو زانینێکمان دەربارەی خودا ئەوەندەیە کە دروستکەری هەموو شتێکە، کە هیچ عەقڵێك دەرکی حەقیقەتەکەی ناکات، ئەم وتانە هەرچەندە ڕاستی‌یان لەخۆگرتووە، بەلام زیادەوڕی زۆریان تیادایە، سەبارەت بە بێ گەردی خوا کە بوونی خودا دەچەسپێنێت بەبێ ماهیەت.

پەنابردنمان بە سیفاتەکانی پێچەوانە (صیفات سەلبی) ڕاست نی‌یە. هەرچەندە باوەڕهێنان و دان پیانانی تایبێت بە سیفاتەکانی بوون (وجود) و کۆنایەتی (القدم) و مانەوە (البقاء) و پێچەوانەی پەیدابووەکان (مخالفة الحوادث) و بەردەوامی (قیام) بە نەفسی خۆی، بەلام ئەمانە هەمووی داد نادات بۆ چەسپاندنی بوونی سیفاتی زانست و توانایی (القدرة) و (ویست) (الارادة) بۆ خودا لەگەڵ ئەوەی بە گوێرەی عەقڵ ئەمانە هەموویان پێویستن هەبن ئەم ڕێبازە دان بە بوونی خوداو دروستکەرێتی بۆ گەردون دەنێت،، نامانەوێت ڕەخنەگرتنمان لە سەری درێژە بکێشێت هەرچەندە بێ ئاگایە لە بەدەرخستنی چەند سیفاتێکی خودای بەخشندە کە عەقڵ بە پێویستی دادەنێت، بەلام ئەمەوێت چەند هەڵەیەکی تری ئەفلۆتینی خاوەنی ئەم ڕێبازەت بۆ بەدەر بخەم، کاتێك ویستی وەسفی چۆنێتی دروستکردنی گەردون بکات، ئەندێشەکانی سەریان لێ شێوان و خستیانە

---

١ خوای گەورە لە ئاسمانە لەسەر عەرشی گەورە و پیرۆزی هەروەکو فەرموویەتی: (الرحمن علی العرش استوی) طه ٥، بەبێ ئەوەی چۆنیەتیەکە (کیفیة)ی بزانرێ و دەرکی پێ بکرێ یاخود بە دروستکراو(مخلوق)ەکانی بچێت و یان بچوێنرێ، چونکە هیچ شتێك وەکو ئەو نی‌یە و بەو ناچێت، هەروەکو فەرموویەتی: (لیس کمثله شیئ وهو السمیع البصیر) الشوریٰ ١١. -لێکۆلەر-

٢ پێشینە چاکەکانمان و ئیمامە پاشینە بەرێزەکان ڕەزای خوایان لێ بێت یەك دەنگ و کۆکن لەسەر سەلماندن و بڕواهێنان بەگشت ئەو سیفەتانەی خوای گەورە کە لە قورئاندا یان لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە و هەر سیفەتێك کە خوا بۆ خۆی بڕیاری داوە یان پێغەمبەرەکەی بۆی داناوە ئەوە پێویستە ئێمەش بڕیاری بۆ بدەین و باوەڕی تەواومان پێ‌ی هەبێت، سەرچاوە (لمعه الاعتقاد، الهادي الی سبیل الرشاد- لإبن قدامه). -لێکۆلەر-

گێڕاوەوە، کاتێ کە ئەڵێت: ناگونجێت خودا یەکسەر گەردونی دروست کردبێت، چونکە گەر وا بوایە بێچار دەبوو بە پەیوەندی پێوە بکا، چونکە خۆی تاك و تەنهایە، نابێت جۆرەها گەردونی لێ بکەوێتەوە.

حەیران: کەواتە، دروستکردنی گەردون چۆن بوە؟

شێخ: ئەفلوتین پێمان ئەڵێت: بیرکردنەوەی خودا لە نەفسی خۆیدا بەخشندەیی زۆر (فیض)ی لێکەوتەوە، کە گەردون بوو و، یەکەم شت کە لە خوداوە پەیدابوو (عەقڵە)[1] کە ئەم عەقڵەش دوو کاری هەیە، بیرکردنەوە لە خوداو، بیرکردنەوە لە خودی خۆی و، لە عەقڵیشەوە خودی گەردون پەیدابوو و، لە خودی گەردونەوە خودی مرۆڤ کەوتەوە و، لە وێشەوە خودی دووەم پەیدابوو کە سروشتە و، خودی ئەم گەردونە بیریتییە لە گەردونێکی ڕوحانی، بەڵام مەڵبەندەکەی لە ڕۆخیایەتی و، نزیکە لە جیهانی هەستەوە، کە نێوەندێکە لە نێوان جیهانی هەست و عەقڵدا..

بە دەرخستنی ئەم ئەندێشانە بۆت سەبارەت بە چۆنێتی دروستکردن و بەخشندەیی زۆر (فـیض) و (دەرچوون) (انبثاق) و عەقڵ و خود، تەنها ئەمەوێت ئاماژەی ئەو پووچەڵیانەت بۆ بکەم کە فەیلەسوفە ئیسلامیەکان تێی کەوتوون کە پەیڕەوی زۆربەی بیرۆکەکانی ئەفلاتۆنیە نوێکانیان دەکرد کە بە ڕێبازی (ئەسکەندەریەکانیان) ناودەبرد و، (ئەفلۆتینیان) بە شێخی یۆنان ناودەبرد.

---

١ یەکەم دروستکراو(مخلوق) کە خودا دروستی کرد پێنووس(قەڵەم)، بوو هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان أول شیئ خلقه الله تعالى القلم و أمره أن یکتب کل شیئ یکون) السلسلة الصحیحة. واتە لە ڕاستیدا یەکەم شت کە خوای گەورە دروستی کرد قەڵەم بوو فەرمانی پێ کرد کە هەر شتێك دەبێت بینووسێت. سەرچاوە (تهذیب شرح العقیدة الطحاویة). -لێکۆڵەر-

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت: لە وتەکانی شێخ بۆم دەرکەوت کە ئەم شەو باسی، فەیلەسوفە ئیسلامیەکانم بۆ دەکات، کتێبێکم لابوو دەربارەی ڕازی و فارابی و ئیبن سینا ئەدوا، کە لە گەنجینەکەی باوکمدا دیتمەوە بە ڕۆژ دەمخوێندەوە، کاتێك باسکردنیان هاتە پێشەوە خستمە ژێر باڵم و چوومە خزمەت شێخ، کاتێك بینیمی وتی: حەیران، ئەو کتێبە چی یە؟

حەیران: وام زانی باسی فەیلەسوفە ئیسلامیەکانم بۆ ئەکەیت، ئەم کتێبە وتەکانی ڕازیو ئیبن سیناو فارابی تیادایە.

شێخ: ئایا.. خوێندووتەتەوە؟

حەیران: بەڵی هەندێکم لێ خوێندۆتەوە، کەمێکی تێگەیشتم ئەویترم لە یادکردوە، لە خوێندنەوەی هەندێ ڕستەی گران و ئاڵۆزی کەوتمە گێژاوەوە، لە ڕستە کرچ و کاڵەکانی ئەفلاتونی یە نوێیەکان کە شێخی گەورە، باسیان کردووە بۆم، جا ئایا

حەیران: ئایا.. ئەم سێ فەیلەسوفە ئیسلامی یە باوەڕیان بە خودا بێ هێز بوە وەك لێیان دەگێڕنەوە؟

شێخ: خوا نەکا، ئەی حەیران، ئەمانە لە گەورە باوەڕدارەکانن بە خودا و، خاوەنی ڕاستترین بەڵگەن بە بوونی، چۆن وا نابن! کە توانیویانە وەك فەیلەسوفە ئیسلامی یەکانی تر، باوەڕهێنانی نیگای ڕاستەقینە و باوەڕهێنانی عەقڵی ساغ و بێگەرد کۆك بکەن، واتە ڕوناکی لەگەڵ ڕوناکی.

بەڵام لە پلەکانی دروستکردنی گەردون و پەیوەستەکانی، پووچەڵیەکان و ئەندێشەکانی بیرۆکەی ئەفلاتۆنە نوێیەکانیان بەسەردا سەپا.

وتەکانی ئەفلاتونیان تێکەڵ بە وتەکانی ئەرستۆ کرد بە چەشنێك کە کارەکانی ئەفلاتۆن درایە پاڵ ئەرستۆ بەمەش پیرۆزیان بەبێ لێکۆڵینەوە زیادی کرد بۆ مامۆستای یەکەم کە (ئەرستۆیە).

لەبەرئەوە پێویستە ئەوانەی تۆژینەوە لەسەر ئەم فەیلەسوفانە ئەکەن، تیشك بخەنە سەر وتەو بیرۆکەکانیان بۆ جیاکردنەوەی ڕاستی ڕووناك لە چەوتی تاریك، چونکە ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردون، ئەم جیاکردنەوەیەیان بە دەرنەخەستووە، لەبەر نەبوونی توانایان، یا.. پەیڕەوی کردنی زۆریان بۆ سەرکەوتنی باوەڕهێنان، یاخود بە پێچەوانەوە. ئیمامی ڕازی بە ڕاستگۆترین باوەڕدار دەژمێررێت گەر هیچ بەڵگەیەکمان نەبێت بۆ ڕاستی باوەڕهێنانەکەی لەو وتەیەیدا ئەیسەلمێنێت کە ئەڵێت: (بوونی عەقڵ لە هەندێ لە گیانەوەران و توانایان بۆ بەڕێوەبردنی کارو فەرمانیان، بەڵگەیەکە بۆ بوونی دروستکەرێك کە لەو پەڕی کارامەو لێهاتووانە جوانترین پەیدابووی خستۆتەوە).

ئەم وتانەی ڕازی بەسەندترین بەڵگەیە بۆ ڕاستی باوەڕهێنان لەلای من لە گشت ئەو بەڵگە تێڕوانینیە ئاوێتەییەکانی تر، چونکە پەنا ئەباتە بەر بەڵگە ساکارە ڕوونەکان کە هیچ گومانێکی لێ ناکرێت نە لە بێژەرییەوە نە لە گوێبیستیەوە.

ئەوەی بەم چەشنە ڕێ پشاندەر بێت، خاوەنی باوەڕی لاواز نابێت ئەی حەیران.

حەیران: بیروڕای شێخمان چییە سەبارەت بە فارابی؟

شێخ: ئەی حەیران، فارابی یەکێکە لە گەورە فەیلەسوفە باوەڕدارەکان و خاوەنی ڕاستترین لۆژیك و بەڵگەیە بۆ بوونی خودا، بە بەرگری کردن لە عەقڵ دەستی پێکردو بڕیارە سەرەتاییە ئاشکراکانی چەسپاند کە هەموو بەڵگەکان پەیوەستن پێوەی، لەمەوە ڕێبازی چەسپاندنی بوونی خودای گرتەبەر، (تا ئێستاش، وتەکانی لە زانین و بووندا هەموو عەقڵی زاناو، فەیلەسوف و، وتەبێژەکانی پێوە بەندە).

فارابی ئەڵێت: زانست دوو بەشە، (ئەندێشەی ڕەها) (تصـــور مطلق) و (ئەندێشە لەگەڵ باوەڕ) (تصور مع تصدیق)، ئەندێشەی شتێك ناکرێت بەبێ ئەندێشەکردنی پێش خۆی و، ئەندێشەی جەستەیەك ناکرێت بەبێ ئەندێشەی درێژیو پانیو قوڵاییەکەی و، ئەمەش ئەندێشەیەك ناگرێتەوە، بەڵکو دەبێت کۆتایی بە ئەندێشەیەك بهێنرێت کە بوەستێت لە ئەندێشەکردنی، ئەندێشەی پێش خۆی، وەك (بوون) الوجود) و (پێویستی بوون) (الوجوب) و (گریمان) (ممکن) کە ئەمەش پێویست بە ئەندێشەی پێش خۆی ناکات، بەڵکو چەند مانایەکی ڕاست و دەرکەوتوون و جێگەی خۆیان گرتووە لە مێشکدا.

بەڵام (باوەڕ) بەبێ دەرك کردنی شتەکانی پێش خۆی دەرك ناکرێت.

(گەر بتەوێ بزانیت، گەردون لێکەوتەیە (مُحَـدث)، پێویست ئەکا، یەکەم شت باوەڕبهێنێت کە (گەردون پێکەوەلکاوە) (العالم مؤلف) و، هەموو پێکەوەکاوێك لێکەوتەیە (مؤلف مُحَـدث) کە ئەمەش (بڕیارە سەرەتاییەکانە) (أحکام اولیە) و لە عەقلدا دیارە هەروەك دوو سەری دژ بەیەك بە هەمیشەیی سەرێکیان ڕاستەو ئەوی تریان هەڵەیە. و هەروەها گشت گەورەترە لە بەش ئەم مانایانە هەمووی بە گشتی چەسپاون لە مێشکدا و، بە ئاگابوونەوەیەك بە دەردەکەون و، هیچ شتێك لەمانە ئاشکراتر نییە، پێویستی بەڵگە هێنانەوە ناکات بۆیان و خۆیان ڕون و ئاشکران، بۆ بەڵگە هێنانەوەش لەسەر هەر کێشەیەك ناتوانین لە یادی بکەین، چونکە بنەما و بنچینەییە ئاشکراکانن).

حەیران: ئەم وتانە لەوپەڕی پلەی ڕاستیدان.

شێخ: ئەمە بەس نیە ئەی حەیران کە بڵێیت ئەم وتانە لەوپەڕی پلەی ڕاستی دان. بەڵکو لە دڵی خۆتدا دەرخیان بکە و مەهێڵە کەسانێکی موناقەشەگیر لەسەر بوونی خودا بەبێ زانست و ڕێنمایی، بێ ئاگات بکەن و سەرت لێ بشێوێنن. لەوەو دوا دەبینیت، کە چۆن ئەم بەڵگە زاڵ بووە بەسەر عەقڵەکاندا، تاکو (لایبنز)ی گەورە هات و نۆژەنی کردەوە و دوای حەوت سەد ساڵ پاك و پیرۆزی کرد، لەسەر ئەم ڕاستیانە فارابی بەڵگەکانی بۆ بوونی خودا دانا و ئەڵێت: هەموو بوونەکان دوو جۆرن، یەکێکیان (بوونی شیاوە) (ممکن الوجود) دوومیان (پێویستەبوونی) (واجب الوجود)، گەر گریمانی نەبوونی (بوونی شیاو)مان کرد، ئەوە ناگەیەنێ کە مەحاڵە و گەر هەرکاتێ پەیدابوو بەبێ هۆی تایبەتی خۆی دروست نابێ. کاتێ کێش پەیدابوو لە ممکن الوجودەوە دەبێ بە واجب الوجود، بە خودی خۆی نا بە بێ خودی خۆی بەڵام (پێویستە بوون) هەرکاتێ گریمان کرا کە نەبووە، مەحاڵ ڕوودەدات و، بوونەکەش بێ هۆیە و، دروست نیە بوونەکەی بە هۆی شتێکی ترەوە بێت. و شتە شیاوە بوونەکانیش (الممکنة) نابێ بێ کۆتایی بن، سەبارەت بە هۆیان و بە هۆداریان (علة و معلولا) چونکە سەردەکێشێ بۆ ڕێبازی خولی (الدوري) بەڵکو پێویستە بە (بوونە پێویستێك) کۆتایی پێ بێت. ئەمەش بوونی سەرەتایە کە تاکە هۆکارێکە بۆ دروست بوونی شتەکانی تر. ئەم بوونە پێویست و بێ کۆتاییەش خودایە.

حەیران: کەواتە شێخی گەورەم! چۆن دەفەرموێت (فارابی) پووچەڵییەکانی ئەفلاتونە نوێیەکانی وەرگرتووە؟

شێخ: من لەوباوەڕەدام کە وەرگرتنی بیروڕاکانی (ئەفلاتۆنە نوێیەکان) لەسەر پەیدابوونی نهێنی گەردون و گەشەو پلەکانی، لە لایەن فارابی‌یەوە تەنها بە زوبانی بووە، نەك لە ناخیەوە، بۆ مەبەستی شانازیو خۆبەدەرخستن لە بواری داناییو فەلسەفەدا.

(ئەو عەقڵەی کە بنەماکانی زانینی بەو چەسپاویی‌یە داناوە و بە دڵنیاییو باوەڕەوە خۆی ناهاوێتە ئەم جۆرە ئەندێشانەوە، گەر گوێبیستی ببیت کە چۆن دان ئەنێت بە نەتوانایی عەقڵ بۆ دەرك کردنی خودی خودا و سیفات و نهێنی‌یەکان، ئەوکاتە بۆت بەدەردەکەوێت کە چەند بە ڕەوشت و داناو سەنگینە بەرامبەر خودا، ئەوکاتە هەموو وڕێنەکانی کە خراونەتە پاڵی لە پلەکانی دروست بوون و گەشەکردنی، بە درۆیان دەخەیتەوە.

ئەوەتا ئەڵێت: (کاتێك چەسپا کە خودا کامڵترین بوونەکانە پێویستە کە بە کامڵترین زانیاری بی‌ناسین. هەروەك چۆن زانیاریمان بۆ ماتماتیك تەواوترە لە زانیاریمان بۆ زانستی سروشتی‌یەکان، چونکە زانیاریی‌یەکانمان سەبارەت بە بابەتی یەکەم زیاترە لە زانیاریمان سەبارەت بابەتی دووەمو، زانیاریمان بەرامبەر (بوونی یەکەم) (الموجود الاول) کە خودایە، وەك ئەوە وایە کە بەرامبەر ڕۆشنترین ڕوناکی بوەستین.

لە بەر نەتوانایی بینایی چاومان نەتوانین خۆمانی لەبەر ڕابگرین، چونکە ڕاهاتنی چاومان بە ماددەوە، زانستمانی کۆت و لاواز کردووە).

بەم شێوەیە ئەی حەیران، بۆت بەدەردەکەوێت چەند بەرزە ئەم پیاوە لە ڕووی ڕەوانبێژیو سەنگینیو دان پیانانی بە نەتوانین (عەجز) کە هەموو مرۆڤێکی ژێر دان بەمەدا دەنێ. کەچی کاتێ ویستی لاسایی ئەفلاتوونە نوێ‌یەکان بکاتەوە لە بارەی چۆنێتی دروست بوونی گەردوونەوە، بۆنی خۆبەدەرخستن و گەورەیی لە زیرەکیو فەلسەفەدا لێ دەکرێ و، پووچەڵی ئەفلاتۆنە نوێ‌یەکانی بە زیادەوە وەرگرتووە. ئەوەتا بەوەوە نەوەستاوە کە ئەوان بڕیاریان داوە، سەبارەت بە عەقڵەکان و گەردوونەکان و خودەکان (عقول و افلاك و نفوس) بەڵکو لێ‌ی پتر کردبوون، تەنانەت مرۆڤ وا هەست دەکات خاوەنی ئەم بۆچوونە پووچەڵانە، کەسێکی ترە غەیری فارابی.

حەیران: ئایا ئیبن سینا کە بیستوومە ئەو بەرزترە لە فارابی وەك ئەو کەوتۆتە هەمان گێژاوەوە؟

شێخ: ئیبن سینا کە یەکێکە لە بەرزترین فەیلەسوفە باوەڕدارەکان، لە هەموو کەس زیاتر لە فارابی مامۆستای دەچێت، لە کاتی توێژینەوە سەبارەت بە زانست و پەیدابوون، بەڵام دەکەوێتە هەمان هەڵەوە، بگرە بە زیادەوە.

کاتێ قسە لە لێکەوتنەوە (الصدور) و عەقڵەکان و گەردوونەکان دەکا گوێبیست بە لە توێژینەوەی (زانست: المعرفة)دا کە ئەڵێت:

دەرکردنی زیندەوەری (الادراك الحیواني) یا ئاشکرایە یا لە ناخدایە.

دەرك کردنی ئاشکرا بە پێنج هەستیارەکە وەردەگیرێ بەمەش هەستکردنی ڕووکەشی دروست دەبێ، دەبێتە توێژ و کەمەند و داو بۆ ڕاوکردنی هێنراوەکانی هەست کە لە وێنەوە ئەکەوێتەوە، لە مەشەوە هێزێکی (وێنەگر) (المصورة) وێنەی هەستپێکراوەکان دەچەسپێنێت، لە پاش لە ناوچوونی و، هێزێکی تر هەیە، پێی دەوترێ: خەیاڵ، هەستێك ئەکات کە لە پێنج هەستەوەرەکە نییە، وەك ئەو هێزەی کە لە مەڕێکدایە، گەر تارمایی گورگێکی بەدی کرد، دەرکی دوژمنەکانی دەکات، چونکە هەستی بینین بە تەنها دەرکی ئەم دوژمنایەتیە ناکات.

هێزێکی (چاودێر) (محافظـــة) کە بریتییە لە گەنجینەیەك ئەوەی بە خەیاڵ دەرکی دەکات، لەو دەپارێزرێ هەروەکوو چۆن، ئەوەی بە هەست دەرك دەکرێ، هێزی وێنەگر، هەڵی دەگرێو دەیپارێزێ. و هێزێکی (بیرەوەری: مفکـــرة) کە سەرپەرشتی دانراوەکانی گەنجینەی وێنەگرو پارێزراو ئەکات، کە ئەمەش هەندێکیان پێکەوە تێکەڵ ئەکات و هەندێکیشیان لێك جیادەکاتەوە، هەروەها لە بەرزترین وتەیدا ئەڵێت: هەست واتای تەواوی مانا دەرك ناکات و، وێنەیش دەرك ناکا بەبێ ماددەو پێوەلکاوەکانی، لە چەندو چۆن و لە کوێو وەضع و ڕۆحی مرۆڤایەتی بە تەنها ئەتوانێت ئەندێشەی مانا لە سنوورو حەقیقەتی خۆیدا بکا و جەستە نامۆکان لە خۆی دووربخاتەوە کە لە نێوەندە هاوبەشە زۆرەکانەوە وەرگیراوە، ئەمەش بە هێزێك کە پێی ئەڵێن عەقڵی تیۆری (العقل النظري).

لە کاری هەست نییە، لەو ڕووەوەی کە هەستپێکراوە، بە عەقڵ دەرك بکرێ و هەروەها لە کاری عەقڵ نییە، لەو ڕووەوە کە عەقڵی پێکراوە هەست بکرێ چونکە هەست کاتێك کاری ئەبێت گەر لە جیهانی دروستکراودا هەبێت و، هەروەها عەقڵیش

کاتێك کاری دەبێت گەر لە جیهانی فەرماندا هەبێت و، هەر شتێك لە سەروی دروستکراوم و فەرمانەوە بێت شارراوەیە لە هەست و عەقڵ. و زاتی خودای تەنها هیچ ڕێگایەك نی یە بۆ دەرك کردنی حەقیقەتی، بەڵکو تەنها بە سیفاتەکانی ئەناسرێت. و عەقڵمان ناگونجێ ببێتە دادوەرێك هەتاوەکو کارەکانی خودا، لە نهێنی دروستکراوەکان و (ڕێگاچارەو بڕیارە نوسراوەو ڕێژەییەکانی) (تدبیرە، وقضائە وقدرە) پێداد بکەین.

حەیران: خودا، پاداشتت بداتەوە بۆ ئەم ڕەوانبێژیی‌یە دڵڕفێنە، بەرزە!

شێخ: لەوەش بەرزتر بەڵگەکانێتی بۆ بوونی خودا، هەمان ڕێباز دەگرێت کە فارابی گرتبووی و هەمان بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ چەسپاندنی بوونی خودا، کاتێك کە ئەڵێت: نابێ شتێ لە دروستکراوانی خودا بکرێ بە بەڵگە لەسەر بوونی خودا.

بەڵکو پێویستە لەوەی بە گریمان هەبوونی هەبو لەوەی کە عەقڵ بە ڕەوای بزانێ دەرکی مەوجودی یەکەم بکەین (کە پێویستە بوون- واجب الوجود)ە، ئەم گەردوونە کە بوونی شیاوە- واتە ممکنە، پێویستی بە (هۆ) (علە) هەیە، هەتا وەکو لە نەبوونەوە بیهێنێتە ناو بوون، چونکە بوونی لە خودی خۆیەوە نی‌یە.

بە بیرکردنەوەی تەنهامان لە بوونەکانی گەردون ئەتوانین بوونی (یەکەم) کە (پێویستی بوونە) (واجب الوجود) بچەسپێنین، بەبێ ئەوەی پێویستمان بە بەڵگەیەك هەبێت کە لە دروستکراوەکانی خۆی وەرگیرابێت. لەگەڵ ئەوەی بوونەکان بەڵگەن بۆ بوونی، بەلام بەڵگەی (یەکەم) پتەوترو چەسپاوترە و، ئەم دوو بەڵگەیەش لە فەرمودەکانی خودای بەخشندە دەبینری، وەك ئەفەرموێت: ﴿**سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ**﴾فصلت/ ٥٣.

ئەمە کەمێك لە بەدەرخستنە دڵڕفێن و بەڵگە ڕازاوەکانێتی لەسەر (عەقڵ و زانین و بوون)، دەرخیان بکە ئەی حەیران.

هەندێ لەو فەیلەسوفە گەورە نوێیانەت بۆ باسدەکەم کە چۆن بەڵگەکانی خودایان لەسەر بوونی خودا لە فەرموودەکانی خودا وەرگرتووە، بە جۆرێك نزیکە ببێتە وەرگرتنێکی (دەق بە دەق) یا (پیت بە پیت).

حەیران: لە خوێندنەوەکانم سەبارەت بە ئیبن سینا دەبینم زۆر پەیڕەوی بیروڕای ئەرستۆ ئەکات لە ڕووی کۆنێتی گەردوونەوە؟

شێخ: ڕوو کەشی وتەکانی ئیبن سینا وا بەدەردەکەوێت کە پەیڕەوی بۆچوونەکانی ئەرستۆ بکات. بەڵام ناوەڕۆکی باسەکانی دەردەچێت لە وتەکانی ئەرستۆ و، مانای کۆنێتی بە شێوەیەکی زۆر ژیرانە لێکدەداتەوە، کە دووربینیو بێگەردی بیرکردنەوە و ڕاستی باوەڕی بەدەرئەخات، کە ئەڵێت: کۆنێتی (القدم) بە چەند ڕوویەك لێکدەدرێتەوە: کۆنێتی دوو شت لە چاو یەکدا (قدم بالقياس) واتە شتێکە، چەرخەکەی لە ڕابووردودا زۆرترە و، گەر بەراوردی بکەین لەگەڵ شتێك کە چەرخەکەی نوێ ترە ئەوا لەو کۆنتر ئەبێت، بەڵام (کۆنێتی ڕەها) (قدم المطلق) بە دوو ڕوو لێکدەدرێتەوە، واتە بە گوێرەی چەرخ (الزمن) و خودێتی (الذات). کۆنێتی بە گوێرەی چەرخ واتە سەرەتایەکی چەرخی نییە. و کۆنێتی بە گوێرەی خودی، واتە بنەمایەك نییە پێوەی پەیوەست بێت.

کە ئەویش خودای ڕاست و تەنهایە کە بەرزترە لەوەی بێباوەڕەکان بە لووت بەرزیەکەوە ئینکاری بوونی بکەن.

لە وتەکانی سەبارەت بە مانای کۆنێتی، کە بەمە ئاماژەی مانای چەرخ ئەکات، هەروەك چۆن ئیمامی غەزالی دوای ئەو زیاتر ڕوونی کردەوە. بۆت بەدەردەکەوێت کە ئەم گەردونە لە خودی خۆیدا کۆن نییە کە دروستکراوی خودایە و، ئەویش ئەمە دەڵێ. بەڵکو ئەیەوێت بڵێت: کۆنێتی ئەم گەردونە بە کۆنێتی ڕەها ناوئەبرێت، چونکە خودا پێش چەرخ دروستی کردوە لەبەرئەوە سەرەتایەکی چەرخیانەی نییە. و هەروەها (کۆنێتی ڕەهایی) چەرخی) بە کۆنێتی ڕەهایی خودێتی ناپێورێت کە وەسفی خودای کۆن و ئەزەل و ڕاستی پێدەکرێت[1].

نە گەردون هەبووە نە چەرخ، بەڵام خودا هەبووە، (خودا گەردونی دروستکرد، چەرخیشی لێکەوتەوە) گەر وەسفی گەردون بکەین بە کۆن، ئەڵێین بە گوێرەی چەرخ کۆنە نەك بە گوێرەی خودێتی.

---

١ ناوی (القديم) واتە کۆن یەکێك نییە لەناوە هەرە جوانەکانی خوای گەورە چونکە وشەیەکە و ناوێکە وتە بێژەکان (المتكلمون) و فەیلەسوفەکان بەکاریان هێناوە و بە یەکێك لە ناوەکانی خوایان داناوە، ئەگەر نا پێشینە چاکەکان (السلف الصالح) ئەم زاراوەیان بەکار نەهێناوە. سەرچاوە تهذيب شرح العقيدة الطحاوية. -لێکۆڵەر-

حەیران: مێشکم بە ئەندێشەکردنی ئەم چەرخە بەبێ بوونی لە وەوپێش گرژو ئالۆز ئەبێت.

شێخ: ئەی حەیران نائومێد مەبە، بۆت بە دەردەکەوێت کە زۆربەی گەورە فەیلەسوفەکان لە نموونەی غەزالی و ئیبن توفەیل و عەمما وئیل کانت ئاماژەی ئەم گرژییان کردووە کە عەقڵ دووچاری ئەبێتەوە.

حەیران: گەورەم بۆچی باسێکی غەزالیم بۆ ناکەیت، چونکە تۆ زۆر ناوی ئەبەیت.

شێخ: بە گوێرەی ئەو بەرنامەیەی کە بۆم هەڵبژاردویت باسیت بۆ ئەکەم، لە پێشدا باسی ئیبن مەسکەوەیە ئیبن خەلدون و ئیبن توفەیل ئەکەین.

حەیران: من ناوبانگی ئیبن مەسکەوەیم بەم جۆرە نەبیستوە کە فەیلەسووف بێ.

شێخ: توژینەوە فەلسەفەیەکانی سەبارەت (ڕەوشت و زانست و بوون) کەمتر نی‌یە لە بەرزیتی و ڕەوانی توێژینەوەی گەورە فەیلەسوفەکانی تر بەشێك لە بیروراکانی سەبارەت بە زانست و بوون بۆت باسدەکەم، بەڵام باسەکانی فەلسەفەی ڕەوشت کە لە هەموو بابەتەکانی تر زیاتر تیایدا بەناوبانگ بوە بۆت بەدەرناخەم تەنها ئامۆژگاریت ئەکەم بیانخوێنیتەوە، چونکە دەربارەی (فەلسەفەی بەها) (فلسفة القيم) بە تامترین و بەچێژترین بابەتی لەسەر نووسیوە ئیبن مەسکەوەی سەبارەت (زانست) پاش ئەوەی لەسەر (دەروون) ئەدوێت بە دەریدەخات کە دەروون نە جەستەیەو نە دەرخەرەکەی (دەرخەر : عەرەض) دەسگای هێزەکانی جەستە بە هۆی (پێنج هەستەوە) دەرکی زانست ئەکات و بەس، بەڵام دەروون گەرچی گەلێ لە بنەماو ڕێساکانی زانستەکان لە هەستیارەکان وەردەگرێت، بەڵام لە خودی خۆیدا کۆمەڵێ بنەماو ڕێساو کرداری تری هەیە، کە هەرگیز لە پێنج هەستەکان وەریان ناگرێ، کە بریتین لە بنەماو ڕێسا مەزنەکان، کە یاساو ڕێسای پێوەرە دروستەکانیان لەسەردا دادەڕێژرێ. چونکە دەروون گەر بڕیاربدات کەوا لە نێوان دوو دژەدا نێوانێ نی‌یە، ئەوە لە شتێکی ترەوە وەری نەگرتووە. چونکە خود زانە، واتە ئەوەڵی‌یە. گەر لە شتێکی ترەوە وەربگیرایە، خود زان نەدەبوو. پێنج هەستەکان تەنها هەست پێکراوەکان دەرك ئەکەن، بەڵام دەرون هەموو هۆکارەکانی ڕێکەوتنەکان و هەموو هۆکارەکانی جیاوازی‌یەکان -کە لە هەست پێکراوەکاندا هەن- دەرك ئەکات، بەمەیش دەگوترێ بە عەقڵ وەرگیراوەکانی، یا بە هۆشزانراوەکانی، کە دەروون لەم دەرك کردنەدا هیچ یارمەتی‌یەك وەرناگرێ، نە لە جەستە خۆیو نە لە ئاسەوارەکانی.

هەروەها کاتێ دەروون بڕیار دەدا کەوا هەست لە شتێکا ڕاستی کردووە یا بە هەڵەداچووە، ئەوەی لە هەست وەرنەگرتووە چونکە هەست دژایەتی خۆی ناکا.

ئەوەتا ئەو دەروونە هۆشیارەی کەوا تیاماندا دەرکی هەڵەی زۆری هەستیارەکان دەکا. و دەروون گەر زانی خۆی دەرکی بە عەقڵ دەرك کراوەکانی ئەکات ئەوا ئەم زانستیەی لە زانستێکی ترەوە وەرنەگرتووە. گەر وابوایە ئەو زانستەش پەنای دەبرد بۆ زانستێکی تر کە ئەمەش بەبێ کۆتایی بەردەوام ئەبوو.

کەواتە زانستی بۆ فێربوون لە خود و کرۆکی خۆیایەتی کە ئەویش عەقڵە. بۆ دەرککردن بە خودی پێویستی بە هیچ شتێکی تر نابێت بێجگە لە خودی خۆی نەبێت، بەم چەشنە ئیبن مەسکەوەی زۆر بە وردی ئەچێتە قوڵایی تیۆری زانینی هەست و عەقڵەوە و یەك ئەبێت لەگەڵ گەورە فەیلەسوفە نوێیەکان لە نمونەی، دیکارت و لوك و کانت بەڵکو پێش ئەوانیش ئەکەوێت.

ئەم لەیەکچوونەش لەوانەیە لە ئاکامی لە یەکچوونی بیروڕاو ئەندێشەکانیان بێت و، من وای بۆ ئەچم زۆربەی بیروڕای فەیلەسوفە نوێیەکان بە بیروڕای فەیلەسوفە ئیسلامیەکان گۆش کرابێت هەرچەندە کە دان بەوەشدا نانێن.

سەبارەت بە (بوون) ئیبن مەسکەوەی باوەڕ بەوە دەهێنێ کە گەردوون دروست کراوە، خودای بەخشندە لە نەبوون دروستیکردوە و، ئەڵێت: دروستکەری ئەم گەردونە ئاشکراو نادیارە، کە ئەڵێین ئاشکرایە واتە ڕاستیەکانی لێوە هەڵقوڵاوە و ڕاستیش پرشنگدارەو، کاتێ ئەڵێین: نادیارە لە نەتوانایی عەقڵمانەوەیە، بە هۆی زۆری داپۆشەرە هیولاکانی سەر ناوەڕۆکی عەقڵ.

خودای تەنهاو ئەزەلی هەموو شتێکی لە نەبوونەوە دروستکردوە و، هیچ مانایەکی دروستکردن نابێت گەر لە بوونەوە پەیدابووبێت.

ئیبن مەسکەوەی لە وەسفی زنجیرەی دروستکردنی گەردون و نماو گەشەکردنیدا بیروڕایەکی ژیرانەی خۆی هەیە، کە تیایدا ئاماژەیەکی ئاشکرای ڕێبازی (پەیدابوون و گەشەکردن) (مذهب النشوء والارتقاء) ئەکات. کە فەیلەسوفە نوێیەکان هیچ زیادەیەکیان نەخستۆتە سەری، تەنها لە قوڵایی باسەکانیاندا نەبێت. وەك ئەڵێت: بوونەکان بە قۆناغ بووە، هەمووی بە گشتی زنجیرەیەکی پێکەوە لکاوە.. هەموو جۆرە بوونێك بە ساکاری (بساطة) دەست پێئەکات و تا ئێستاش لە گەشەو ئاڵۆزیدایە.

هەتا دەگاتە ئەو ئاسۆ جۆرایەتیەی کە بە دوایدا دێت، ڕووەك لە ئاسۆی بێگیانەکانە لە پاشدا گەشە دەکات تا ئەگاتە بەرزترین پلە وەگەر زیاتربوو لەو پلەیەی خۆی، وێنەی گیاندار لە خۆئەگرێت و هەروەها گیانداریش بە هەمان شێوە لە ساکارییەوە دەسپێدەکات و گەشەدەکات تا ئەگاتە پلەیەکی نزیك بە مرۆڤ.

کورتەی باسەکانی ئیبن مەسکەوەی لەم وتەیەدا ڕەنگ ئەداتەوە، کە ئەڵێت: مرۆڤ خۆشی بەردەوامە لە گەشەکردندا، بە زیادبوونی ژیریو دانایی و پوختەیی فەرمان و بیروباوەڕی، تا ئەگاتە ئەو ئاسۆ بەرزەی کە لەیەکێ لەم دوو شێوازەدا خۆی ئەبینێتەوە. یا.. بەردەوامە لە سەرنج دانی بوونەکان بۆ تێگەیشتنی ڕاستیەکان بەمەش فەرمانەکانی خودا بەرجەستە ئەکات. و یا.. ئەم فەرمانانەی لە خوداوە بۆ دێت بەبێ هیچ تێکۆشانێك، خاوەنی پلەی یەکەم (فەیلەسوفە) و خاوەنی پلەی دووەم (پێغەمبەرە) کە پەیامی لە خوداوە وەرگرتووە.

بە یەك گەیشتنی فەیلەسوفێك کە لە زەوییەوە فەلسەفەکانی سەری کێشاوە بە پێغەمبەرێك کە پەیامی لە سەرەوە بۆ هاتبێ، لەسەر بیروڕایان یەکدەبن و باوەڕ بە یەکتری ئەهێنن کە بە یەکگەشتنیان پێویستە بۆ بەدەرخستنی ڕاستیەکان).

حەیران: ئەبینم شێخی گەورەم وتەکانی (ئیبن مەسکەوەی) لەسەر (پەیدابوون و گەشەکردن) زۆردەهێنێتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەکی لەسەر بڵێت و وتەکانی سەبارەت بە یەکسان بوونی پێغەمبەرو فەیلەسوف باسدەکات بێ ئەوەی ڕەخنەی لێبگیرێت، ئایا شێخی گەورەم باوەڕ بە وتەکانی ئەهێنێت؟

شێخ: سەبارەت بە بیرۆکەی (پەیدابوون و گەشە) وەڵامەکەی بۆ شێخ جسری) خوالێخۆشبوو بەجێئەهێڵین. و گەر کاتی هات، باسی لەسەر ئەکەین کە چۆن وتەکانی دەربارەی فەلسەفەی (پەیدابوون و گەشە) کە بەرزترین نیشانەی بیرکردنەوەکانی مرۆڤە و مێشکی کۆمەڵێکی وەك ئێوەی تازە پێگەیشتووی مەشغوڵ کردووە.

بەڵام وتەکانی ئیبن مەسکەوەی کە ئەڵێت: یەك بوونی بیروڕاکانی فەیلەسوفان و پەیامی پێغەمبەران لە توێژینەوەکانیان لە دوی ڕاستیدا.

چۆن شێخی گەورەم زانی کە ئیبن مەسکەوەی ئەیەوێت مانای یەکسانی بەدەربخات لە (نووسراوە ڕیژەییەکان) (القدر) و نرخایەتی و مەردایەتی بێ هەڵەیی و زانستیەکان لە فەلسەفەی فەیلەسوفان و پەیامی پێغەمبەراندا؟

شێخ: لە یەکچوونیان بۆ ڕاستیەکان تەنها لە شتێکدا ڕەنگی ئەدایەوە ئەویش باوەڕهێنان بە بوونی خودا بێجگەلە فەرمانەکانی پێغەمبەران و بڕیارەکانی شەریعەت کە فەیلەسوفێکی خاوەن بیرێکی ساغ ئامادەیە بۆ باوەڕپێهێنانی، خودی خۆی ناتوانێت دەرکی ئەو ڕاستیانە بکات بەبێ نیگا و پەیامی خودا، گومانی تیانییە باوەڕهێنان بە خودای تاك و تەنهاو ئەزەلی و هەمیشەیی و بە تواناو دروستکەرو بەرزی بێهاوتاو وینەگر. کە هەموو سیفاتێکی تەواوی تیائەبینرێ لەوانەیە مرۆڤ بە هۆی عەقڵییەوە لە ڕێگەی بیرکردنەوەیەکی کورتی ڕاست و دروست باوەڕ بە بوونی خودا بێنێت، ئەم باوەڕهێنانە بە هۆی عەقڵێکی ڕووتەوەیە کە لە شەرعدا لەسەر هەموو باوەڕدارێك داواکراوە و، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پێویستمان بە پێغەمبەران نەبێت. و باوەڕداران بە بوونی خوداو سیفاتی تەواوی لە ڕێگای بیرکردنەوەوە، هەندێکی بەڵکو کەمێکن لەبەرئەوە پێویست بە پێغەمبەران ئەکات بۆ بڵاوبوونەوەی ئەم باوەڕهێنانە پاکە لە نێوان گشت خەڵکدا.

من بەم چەشنە لە وتەکانی ئیبن مەسکەوەی ئەگەم و زۆر شادمان و شانازم پێی، چونکە پشتگیری بیروڕایەکی بەرزدەو بێ گومان ئەکات وەك چۆن پێم ناسرا، پاش تەمەنێکی درێژو بیرکردنەوەیەکی قووڵ بەرجەستەی ڕاستیەکانم کرد (ئەویش ئەوەیە بەرهەمی فەلسەفەیەکی ڕاست، هەرگیز دژایەتی ئاینێکی ڕاست ناکات، چەسپاندنی بوونی خوداو تەنها پەتیەکەی، بەڵکو پشتگیری ئەو چەسپاندنە ئەکات کە نیگا تیۆر کردنەوەی عەقڵی ڕووتی خستۆتەوە) ئەبینین، ئیبن توفەیلیش پشتگیری ئەم بیروڕایە ئەکات لە داستانی، باوەڕ و عەقڵ.

حەیران: ئیبن توفەیل چی ئەڵێت و داستانی عەقڵ و باوەڕیش چییە؟

شێخ: لە ڕاستیدا ئیبن توفەیل لێهاتوو بوە لە بەدەرخستنی ئەم لە یەکچوونانە، لە نێوان تیۆری عەقڵی ڕووت و نیگادا لە داستانە بەناوبانگەکەی کە (حي بن يقظان)ە. لە شەوی ئایندەدا بە کورتی بۆت ئاماژە ئەکەم چونکە ئەمشەومان نزیکەماڵئاوای بکات، نامەوێت بەچاوپیاخشانێك وتوێژی لەسەر بکەین.

حەیران: بۆچی شێخی گەورەم باسی ئیبن خەلدون ئەکات کە مێژوونووسە نەك فەیلەسوف؟

شێخ: زانای گەورە ئیبن خەلدون شارەزاییەکی فراوان و بیرکردنەوەیەکی ڕەسەنی هەبووە، کۆششی زۆری داوە لە مەیدانی فەلسەفەی کۆمەڵناسی و مێژوودا.

یاداشتای (مقدمە) کە پێشەکی نوسراوە مێژووە گەورەکەی خۆیەتی، دەشێ بۆ زاناکانی ڕۆژئاوا بیکەنە بنەماکانی فەلسەفەی شارستانێتی. ئەبینیت کاکڵەی فەلسەفەی بەرزی بێ هاوتای لە (مێژوو، کۆمەڵناسیدا) کورتم کردۆتەوە لە ناملیکەکەیدا کە پێش ۲۰ ساڵ نووسیومەتەوە.

بەلام گرنگی تایبەتیم نەداو بە توێژینەوە فەلسەفیەکانی تر. و بە (پێشەکیەکەی) کۆمەلێك بیروڕای بەرزی لەخۆگرتووە لە باسەکانی زانین و بووندا، دلشاد ئەبم گەر هەردوکمان لێی بکۆلینەو هەتاوەکو بزانیت کە گەورە زانایان و فەیلەسوفە بەنرخەکان سەبارەت بە ڕاستی‌یە بێ‌گومانەکان یەك دەگرن.

لە بابەت (زانینەوە) وتەکانی لەوپەڕی پلەی بەرزی‌و جوانیدان، باوەڕی وایە کە سەرچاوی دەرك کردن بە هۆی هەستەوەرەکانەوەیە (هەموو عاقڵ بوو بێ عەقڵەکان، هاوبەشن لەم دەرکردنە هەستیەدا بەلام مرۆڤ بە دەرك کردنە گشتی‌یەکانی جیادەکرێتەوە کە ڕووتە لە هەستەوەرەکان) هەروەها دەربارەی بنەما سەرەتایی‌یە چەسپاوەکانی عەقڵ کە بە خۆڕسکی خودایی پەیدابوون، ئەلێت: (ئەندێشەکانی بیرکردنەوە هەرچۆنێك بگێڕرێتەوە بۆ ئەندێشەکانی پێش خۆی مەرج نی‌یە بەئاگابین لە ئەندیشەکانی کە لە دەروونمان ئەکەوێتەوە، چونکە کەس شارەزای تەواوی نی‌یە سەبارەت بە بنەماو کەوتەوەکانی دەروون و قۆناغەکانی بەلکو بریتین لە چەند شتێك کە دەروون دەیانهاوێتە بیرەوەرییەکانەوە کە دوابەدوای یەك دێن و مرۆڤ بێدەسەلاتە لە زانینی بنەماو ئاکامەکانی و زاناکان بە زۆری لە هۆکارە سروشتی‌یە ڕووکەشەکان ئەکۆلنەوە).

ئیبن خەلدون دان بە نەتوانای عەقڵ دێنێت لە دەرك کردنی ناوەڕۆکی شتەکان لە خودی خۆیدا، دەلێت: باوەڕمەهێنن بە لێکەوتەکانی بیرکردنەوە بەوەی کە لە توانایدایە بالادەستی هەموو بوونەوەر و وردەکاریی‌و هۆکارەکانی بێت.

لێرەدا بیروڕاکانی تۆ پووچەڵ دەکاتەوە بەوەی کەوا بە فەیلەسوفی دانانێیت.

دەرك کردنی هەموو بونێك پەنگی خواردۆتەوە لە قەوارەی دەرك کراوەکەیدا. و هەچ شتێکیش پێچەوانەی ئەمانە بێت ڕاستیەکانی لەدوایە.

ئەمانە ئەلێت و لە هەمان کاتدا ئەترسێت کە عەقڵ تاوانبار بکرێت بە نەتوانینی بەردەوامی.

هەروەك چۆن (گومانداران) و (سەفسەتائیەکان) ئەڵێن بۆیە ئیبن خەلدونیش دەسپێشکەری ئەکات و ئەڵێت: (ئەمە لە عەقڵ و دەرك کراوەکان کەم ناکاتەوە، بەڵکو عەقڵ پێوەرێکی ڕاستە و، بڕیارەکانی ڕاست و بێ گومانە.

بەڵام لەو باوەڕەشدا مەبە کە بتوانێت پێوانەی کاروباری تەنهایی‌و دواڕۆژی مەردوم و ڕاستیەکانی پێغەمبەرایەتی و ڕاستی سیفاتی خواوەندی و هەچ شتێکی تر کە پێوەی پەیوەستە، بکات.. کە ئەمەش داواکردنێکی مەحاڵە، بە نموونەی ئەو مرۆڤە وایە کە ئەیەوێت بەو تەرازوەی کە خشڵی پێ ئەکێشن، چیایەکی پێ بکێشێ، کە ئەمەش مەحاڵە و ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم تەرازوە بڕیارەکانی هەڵەیە و عەقڵ لە ئاستیدا دەستەوەستان ئەبێت و لە مەودای خۆی تێپەڕ نابێت.

تا.. زانا بێت بە خوداو سیفاتەکانی و سیفاتی هەموو گەردیلەکانی ئەم گەردونە.

بەم چەشنە ئیبن خەلدون لەگەڵ غەزالی‌و زۆربەی فەیلەسوفە ژیرە کۆن و نوێیەکاندا یەك دەبن.

بۆت بەدەردەکەوێت کە ئەمانە لە تواناو نەتواناکانی عەقڵ تێنەپەڕیوون.

بەڵام بیروراکانی سەبارەت بە بوون پەنا ئەباتە بەڵگەیەکی بەناوبانگ کە (بەڵگەی لێکەوتەیە) (دلیل الحادث) و ئەڵێت: (هەموو لێکەوتەکانی جیهان خودیی، بن.. یان کرداری، پێویستیان بە هۆکارێکی پێش خۆیان هەیە.

هەموو یەکێك لەم هۆکارانە لێکەوتەن، کە پێویستیان بە هۆکارێ ترە. و تا ئێستاش ئەم هۆکارانە لە گەشەکردندان هەتا بە هۆکاری هۆکارەکان و دروستکەری بوونەکان کۆتایی دێت کە خودای پاك و بێگەردو تەنهایە).

حەیرانی کوڕی ئەزعەف ئەڵێت: بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی مجێورە پیرەکەی مزگەوت ناميلكەيەكی بچووكی پێدام و پێی وتم: ئەباسیم ناميلكەيە بدە بە شێخ كە دوو ڕۆژە بەدوايدا وێڵە. ناميلكەكەم لێوەرگرتوو چوومە خزمەت شێخ، هەر بە بينينی نامياكەكە بە دەستمەوە خۆشحاڵ بەدەركەوت.

شێخ: ئۆخەی، ديتيانەوە.. بۆم! هەرچەندە تاوانی ئەوانيشی تيادا نی‌يە، ئەی حەيران باوەڕدەكەيت (دە) ساڵ لەمەوبەر ئەم كورتكراوە فەلسەفەييەم دانا و لە پاش ئەوەی بە ڕەزامەندی من بڵاوكرايەوە، تەنها يەك دانەم بۆ مايەوە كە تا ئێستا نەمدەزانی لە كوێيە؟

حەيران: هۆی گرنگی‌ی ئەم كورتكراوەيە چيە كەوا شێخی گەورەم بە دوايدا وێڵ بوو؟

شێخ: هيچ گرنگيەكی تيادا نی‌يە. تەنها ئەمەوێت داستانی (حي بن يقظان)ت بۆ باسبكەم كە لەم نامياكەيەدا كورتكراوەتەوە، بە چاكم زانی لە خۆمی بەدووربخەمەوە ماندوويی كورتكردنەوەی جارێكی تر بۆ تۆ.

حەيران: لە شێخی گەورەم تێگەيشتم كە داستانەكەی (ئيبن طوفەيل) خەياڵی‌يە، ئايا ئەشێت فەلسەفە كە تۆژينەوەيە لە دوی ڕاستی لەدووتۆی داستانێكدا بێت كە لە ئەفسانە پێكهاتبێت.

شێخ: داستانەكە ئەندێشەی تيادا نيە تەنها ناوی پاڵەوانی داستانەكە و شانۆگاكەی ئەفسانەيە.

ئەی حەيران، گەرهاتوو وشەی (حـــي بن يقظان) مان گۆڕی بۆ وشەی (عەقڵ) و دوورگە دوورەكەشمان بەو زەوی‌يە دانا كە تيايدا ئەژين ئەوكاتە داستانەكە مێژوويەكی ڕاست لەخۆئەگرێت و هيچ شوێنەوارێكی ئەندێشاوی تيادا نامێنێت مەگەر عەقڵ كە پاڵەوانەكەيەتی واز لە ڕۆڵی خۆی بهێنێ.

حەیران: چۆن ئەمە ئەبێت؟

شێخ: بیروڕاکانی ئیبن طوفەیل لە زانین و بوون و باوەڕ بەخودا و، ڕەوشتی بەرز ئاشکرایە لە ناوەڕۆکی داستانەکەیدا گەر پەیڕەوی وڕێنەکانی (ئیبن سینای) نەکردایە لە (قۆناغەکانی دەرچوون) (مراتب الصدور) ئەوکاتە داستانێکی ڕاستەقینەی فەلسەفەیی دەبوو بەڵکو داستانی عەقڵ دەبوو، کە چۆن پلە بە پلە لە ڕێبازی زانین گەشە ئەکات بۆ قۆناغەکانی فەلسەفەو ناسینی خوداو، ڕاستیو چاکەو جوانی.. هتد).

پێش ئەوەی کورتکراوەکەت بۆ بخوێنمەوە.

ئەمەوێت تیشك بخەمە سەر گرنگترین بیروڕاکانی کە خوازیاربوو دایڕێژێت لە داستانەکەیدا تا.. لە مەبەست و بیرۆکە ڕاستەقینەکانی (ئیبن طوفەیل) ویستوویەتی لە داستانەکەیدا ئەم ڕاستیانە بەدەربخات.

أ-ئەو پلانەی کە عەقڵ لە پلیکانەی زانستدا : (سُلّم المعرفة) : پێیدا سەردەکەوێت لە (هەستەکەمیەکانەوە) دەست پێدەکات بۆ (بیروباوەڕە گشتیەکان) (الأفكار الكلية).

ب-لە توانای عەقلی مرۆڤدایە دەرکی بوونی خودا بکات بەبێ فێربوون و ڕێنمایی کردنی کەسێ، بەڵکو بەنیشانەکانی خودا لە ناو دروستکراوەکانیدا و، هێنانەوەی چەندەها بەڵگەی ڕاستەقینە لەسەر ئەمە.

جـ-ئەم عەقڵە کاتێك ئەیەوێت ئەندێشەی ئەزەلی و نەبوون و بێ کۆتاییو چەرخ (الزمن) و کۆنیتی (القدم) و لێکەوتنەوە (الحدث).. هتد بکات، دووچاری کولبون و نەتوانایی ئەبێتەوە لە ڕێبازی بەڵگەکاندا.

د-گەر عەقڵ پەسەندی کرد کەوا گەردون کۆنە یا.. لێکەوتەیە ئەوا هەردوو بیروباوەڕەکە بۆ یەك شت سەرئەکێشن کە ئەویش بوونی خودایە.

ه-عەقلی مرۆڤ لە توانایدایە دەرکی بنەماکانی سەرچاوە ڕەسەنەکانی ڕەوشتە پەیڕەوکراوە کۆمەڵایەتیەکان بکات و خۆشی پێ برازێنێتەوە.

ئارەزووەکانی جەستە مل کەچ بکات بۆ فەرمانەکانی عەقڵ بەبێ پشتگوێخستنی مافەکانی و زیادەڕەوی کردن تیایدا.

و-یاساکانی ئیسلام و دەرك کراوەکانی عەقلی ساخ سەبارەت بە چاکەو ڕاستیو جوانی لە یەك خاڵدا بەبێ جیاوازی یەك دەگرن.

ز-دانایی‌و ژیری بەرزی یاسای ئیسلام لە وەدایە کە وتوێژ لەگەڵ خەڵکدا دەکات بە گوێرەی عەقڵیان بەبێ سەرهەڵماڵینی ڕاستی‌و نهێنی‌یەکانی و هەموو چاکەیەکی مرۆڤ لەوەدایە کە پەیڕەوی سنورەکانی ئیسلام بکەن بێ چوونە ناو قوڵاییەکانی.

حەیران: ئای.. چەند پەرۆشم بۆ زانینی ئەم داستانە سەرسوڕێنەرە.

شێخ: فەرموو کورتکراوەی داستانە کە گوێبیست بە. (ئیبن طوفەیل) ئەندێشەی منداڵێکی شیرەخۆرە ئەکات کە ناوی ناوە (حي بن يقظان)، فڕێ دراوەتە دورگەیەکی چۆڵ و دوور لە خەڵك. ئاسکێکی بەچکە مردووی جەرگ سووتاو، سۆزی بۆی بزواو، شیری دایەو بەخێوی کرد تا بووە لاوێك و دەنگی ئاژەڵەکان فێربوو.

بینی ئاژەڵەکان پۆشتەو خاوەن هێزن و، خۆشی ڕووت و بێ چەك. ئەویش لە گەڵای درەخت جل و بەرگی بەدەست هێنا و لە داریش چەك.

بەڵام ئاسکەکە مرد، بە نەمان و خامۆشی ئاسکەکە (حي بن يقظان) زویرو دڵتەنگ بوو، خوازیاری زانینی هۆی مردنەکەی بوو، لە ڕواڵەتی لاشەی ئاسکەکەدا هیچ گۆڕانێکی نەبینی، وا بۆی بە دەرکەوت کە هۆکەی لە ئەندامێکیدایە کە بە چاو نایبینێت.

سنگی ئاسکەکەی بە بەردی تیژو پارچە قامیشی وشك هەڵدڕی تا گەیشتە سەر دڵی، لە ڕواڵەتی دڵەکەدا دووبارە هیچ دەردێکی بەدی نەکرد، کە دڵەکەی لەت کرد بینی سکۆڵەی چەپی بۆشە، وتی: کەواتە بە ڕۆیشتنی ئەو شتەی لەم جێگایەدا بووو ڕۆیشتووە، ئاسکەکە ژیانی لە دەست داوە.

بیری کردەوە لەو شتە، دەرکی کرد کەئەم ئاسکە لە ڕاستیدا ئەو شتەیە کە ڕۆیشتووە، دڵنیابوو لەوەی کە لاشەکەی تەنها ئامێرێکە و کاتێ جەستەی ئاسکەکە بۆگەنی کردووە گومانی لە بۆچوونەکەی خۆیدا نەما ئەوسا قەلەڕەشێکی چاوپێکەوت قەلەڕەشێکی تری مردوو ئەنێژێت، ئەویش بە هەمان شێوەی قەلەڕەشەکە، ئاسکەکەی ناشت.

لە پاشدا ئاگری دۆزیەوە و بەکاری هێناو تاقیکردەوە بەوەی کەوا ئەو ئاژەڵانەی کە لە دەریاوە دەرئەچوون دەیخستنە ناو ئاگرەکە بەمەش تام و چێژێکی خۆشی بەرجەستە دەکرد، باوەڕی بە ئاگر هێناو بە شتێکی سەرسوڕهێنەرو بەرز هاتە بەرچاوی.

وا بە خەیاڵیدا هات ئەو شتەی کە لە دڵی ئاسکەکەدا بووە و نەماوە لەوانەیە ناوەڕۆکی ئاگر بوو بێت، بۆ ئەم مەبەستەی دەستیکرد بە توێکاری ئاژەڵەکان زۆر لە فەرمان و کاری ئەندامەکانی ئاژەڵەکان فێربوو بە چاکی زانی ماڵێك بۆ خۆی دروست بکات و تیایا بژیی و چەکیش دروست بکات بۆ بەرگری کردن لە خۆی و ڕاوکردنی ئاژەڵ.

لە تەمەنی (٢١) ساڵیدا بوو بیری ئەکردەوە لە گەردون و ئەوانەی کە تیایەتی لە ئاژەڵ و ڕووەك و کانزاکان، زۆر سیفات و کرداری جیاجیای بینی، کە لە هەندێ سیفاتدا یەك دەگرنەوە و لە هەندێکی تردا جیاواز دەبوون، بەمەش بیرۆکەی (زۆری) (الکثرة) لای دروست بوو.

پاشان سەرنجی ڕووەك و ئاژەڵی‌دا، تاکو بزانێت ڕووەکانی لە یەکچوون و پێچەوانە چی‌یە لە نێوانیاندا، بەمەش بیرۆکەی (جۆر) (النوع)و بیرۆکەی (ڕەگەز) (الجنس) لاپەیدا بوو، بینی ئاژەڵ و ڕووەك دوو ڕەگەزن لە هەندێ فەرماندا یەکدەبن وەك خۆراك، باوەڕی هێنا کە یەك شتن، پاشان سەرنجی هەردووکیانی دا لەگەڵ بێ گیانەکاندا، بینی کە هەرسێکیان لە یەك شتدا لە یەکدەچن کە ئەویش (جەستەیە) بەڵام لە هەندێ تایبەتی تردا جیاوازن، دووبارە باوەڕی هێنا کە هەرسێکیان یەك شتن گەرچی زۆری کردوونی بە گشت.

پاشان بە گشتی لە هەموویان بیری کردەوە و بینی لە ڕووی (جەستەوە) بە گشتی یەکدەگرنەوە و لە (وێنەدا) (الصورة) جیاوازن، بۆی بەدەرکەوت کە ڕوحی زیندەوەر شتێکی جیاوازە لە (جەستەکەی)، هەر ئەو ڕوحەشە کە شیاوە بۆ کردەوەی سەرسوڕهێنەر و، زانینی جۆرەکانی دەرك کردن، بەمەش کارەکانی (ڕوحی) لا گرنگ و گەورە بوو و، بۆی بەدەرکەوت کە زۆر گرنگ و بەرزترە لە جەستەی لەناوچوو.

دەستیکرد بە بیرکردنەوە لە سەرچاوەی شتەکان وا باوەڕی هێنا کە بنەڕەتەکەی، ساکارەکانی ئاو، خاك، هەواو ئاگرە، خوازیار بوو وەسفێکی گشتی بۆ هەموو جەستەکان بدۆزێتەوە، تەنها مانای (کشاندنی) (امـتدادي) دیتەوە، بەڵام لە پشت ئەم (کشاندنەوە) مانایەکی تر هەیە کە ئەویش وێنەو فۆرمی شتەکانە، کە هەمیشە لە گۆڕاندا. بەمەش بیرۆکەی (ماددەو وێنە)ی لاپەیدا بوو کە توانی سەرپەرشتیاری سنورەکانی (جیهانی عەقڵ) بکات. دووبارە گەڕایەوە بۆ جەستە ساکارەکان؛ بینی

شێوازەکانی ئەگۆڕێت، وەك ئاو کە دەبێتە هەڵم و پاشان ئەگەڕێتەوە بۆ ئاو. (دەرکی کرد کە جیاوازی شێواز ئەوە ناگەیەنێت کە لە جیاوازی شتی سەرچاوەکەیەوە بێت) و بۆی بەدەرکەوت کە هەموو لێکەوتەیەك (حـــادث) پێویستی بە پەیداکەرێك (محدث) هەیە، لەمەوە بۆی بەدەرکەوت ئەو کارانەی کە ئەدرێتە پاڵ شتەکان لە ڕاستیدا لە شتەکانەوە نین، بەڵکو بکەرێك هەیە، ئەو کارانە بە هۆی ئەو شتانەوە ئەنجام دەدا، ئارەزوویەکی لا دروست بوو بۆ زانینی ئەم بکەرە لە بەشە هەستپێکراوەکاندا گەڕا، بەڵام هیچ شتێکی نەدیتەوە کە ڕووت بێ لە (لێکەوتە)و بێ پێویست بێ لە بکەر، بەمەش وازی لە هەمووی هێناو ڕوویکردە هەسارەکان بیری لێکردنەوە و، وتی: ئایا ئەمانە بەبێ کۆتایی درێژبوونەتەوە؟ عەقلی کەوتە گومان و سەرسامیەوە و، بە بیرکردنەوەی قوڵی باوەڕی هێنا کە ئەمانە چونکە جەستەیەکی بێ کۆتایین پوچەڵ و بێماناو نەگونجاون و، بیری لە گەردون بە گشتی کردەوە، ئایا ئەمە شتێکی لێکەوتەیە، پاش ئەوەی کە نەبوو بووە و هاتوتە بوونەوە یا.. بوون بوە و نەبوونی پێش نەکەوتووە، گومانی بۆ پەیدابوو و، هیچ بیروڕایەکانی پەسەند نەئەکرد، ڕوانی گەر باوەڕبێنێ بە بیرۆکەی (کۆنێتی) گەلێك کۆسپ بەرەنگاری دەبێت، وەك مەحاڵی بوون بە بێ کۆتایی، وەك ئەم بوونە بێبەش نییە لە لێکەوتەکان، دووبارە ئەویش لێکەوتەیە، و گەر باوەڕ بە بیرۆکەی (لێکەوتە) (الحدوث) بهێنێت چەند کۆسپێ جیاواز دووچاری ئەبێتەوە، سەیری کرد مانای ئەوەی کە بڵێین گەردوون لێکەوتەیە فەهم ناکرێ مەگەر بەو مانایە بێ کە چەرخ لێی پێشکەوتووە، بەڵام چەرخیش خۆی بەشێکە لە گەردون و لێی جیانابێتەوە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە گەردون دواکەوتووتربێت لە چەرخ، کێشەیەکی تریشی بۆ دروست بوە: دەیگوت: بۆ ئێستا لێکەوتەکە لە لایەن پەیداکەرەکەوە پەیدابووە و، لە پێشتر دروست نەکردووە، ئایا دروستکەر تووشی شتێکی تازەی کوتوپڕ بووە.. گۆڕانێك لە ناخیدا ڕووی داوە؟ دیارە ئەم دوو بۆچوونە سەبارەت بە پەیداکەر، هەردووکیان پووچەڵن.

بە بەردەوامی کێشەکان بەرەنگاری دەبوونەوە، سەرەنجام داماو و سەرسام دەبوو و بیری لەوە کردەوە چی ڕوودەدا، لە هەریەکێ لەم دوو بیروباوەڕە، لەوانەیە هەردوو بیروباوەڕەکە سەر بۆ یەك شت بکێشن، باوەڕی هێنا گەر بڵێین بیرۆکەی لێکەوتەی گەردون هاتنی بۆ بوون پاش نەبوونی ئەمە ڕاستە، ئەوە بە ناچاری سەردەکێشێت بۆ ئەم ئەنجامە:

یەکەم: ناگونجێت لە خۆیەوە پەیدابووبێت، کەواتە: پەیداکەرێ پەیدای کردووە، دووەم: دەبێ ئەو پەیداکەرە جەستە نەبێ، چونکە گەر جەستە بوایە پێویست بە پەیداکەر دەبوو و، گەر پەیداکەری دووەم جەستە بوایە پێویستی بە پەیداکەرێکی سێهەم دەبوو و، سێهەم بۆ چوارەم و چوارەم بۆ پێنجەم.. لەمەوە زنجیرەی بێ کۆتایی دەکەوێتەوە کە ئەمەش پووچەڵە.

گەر باوەری هێنا بە کۆنێتی گەردوون، سەردەکێشێ بۆ ئەمە: پێویستە جوولەکەیشی کۆن بێ وەك خۆی و، هەموو جوولەیەکیش دەبێ جوولێنەرێکی هەبێ، ئەمەیش بریارێکی ناچارییە، کە جوولە بەبێ بزوێنەر نابێ، دەی جوولێنەریش لەم دوو حاڵە خالی بەدەر نییە؛ یا هێزێکی پەخشە لەناو جەستەیەکا، وەك تەزوو تیادا بڵاودەبێتەوە، یا شتێکی ترە جگە لەمە، دیارە هەموو هێزێکیش کە لەناو جەستەدا بێ، بە قەد بەشەکانی ئەو جەستەیە، ئەویش بەش بەش، سەرەنجام هێزەکەیش وەك جەستەکە هەتا دێ بچووك دەبێتەوە و بەرە بەرە بێهێز دەبێ، وەکی تریش بە ناچاری هەموو دەزانرێ کە هەرچی جەستەبێ کۆتایی دێ، کەواتە هێزەکەی ناویشی وەك خۆی کۆتایی دێ، سەرەنجامی ئەمەیش ئەوەیە کە ئەم بۆچوونە هەڵەیە، کەواتە دەبێ بزوێنەر دووربێ لە ماددەو لە نیشانەکانی جەستەکان. ئاوا بەم شێوەیە (حي بن يقظان) کۆتایی بە لێکۆڵینەوەکەی هێنا، سەبارەت بە کۆنێتی گەردوون و پەیدابوونی و، هیچ لایەکیان بۆ ساخ نەبۆوە، ئیتر لەوەدوا ئەو گومانەی کە هەیبوو لەم بارەیەوە، لە پاش ئەم هەوڵ و کۆششە زیانی نەبوو بۆی.

باوەری هێنا کە عەقڵ بە پێویستی ئەزانێ کە ئەم بکەرە گەورەیە هەموو سیفاتێکی بەرزو تەواوی لەخۆگرتبێت، لە زانست و تواناو ویست و هەڵبژاردن و بەزەیی و کتر بەجێ‌ی.. هتد.

کاتی ناسینی ئەم پەیداکەرە گەورەیە خوازیار بوو بزانێت چۆن دەرکی پێکردوە؟ لە هەستەوەرەکاندا هیچ رێگایەکی نەدیەوە بۆ دەرك کردنی، چونکە ئەوان تەنها جەستە دەرك ئەکەن، کە پەیدا کەریش رووتە لە سیفاتی جەستە بۆی بەدەرکەوت خودی خۆی کە دەرکی ئەم پەیداکەرەی کردووە رووتە لە جەستە بۆی روون بۆوە، خودی رووت لە جەستە دووچاری نەمان نابێتەوە و نەمر دەبێت لە ژیانێکی بەردەوامدا، یا.. بە خۆشی یان بە ئازارو ئەشکەنجەوە بە گوێرەی ئەو بەختەی کە هاتۆتە رێگای لە ژیانی دونیایدا بە چاودێری و ئاگایی پەیداکەری گەورە.

ئەم بیرۆکەیە وای لێکرد کە ڕێبازێکی تایبەتی بگرێتە بەر بۆ ڕێکخستنی ژیانی و تەرخانکردنی خۆی بۆ بیرکردنەوە لەم دروستکەرە، کاتێك سەرنجی خودی خۆیدا، شتێکی تیادا بینی کە لە هەموو ئاژەڵێکدا هەیە ئەویش بەشێکی بەدیێتی کە لاشەیەکی تاریکی چڕە و داوای هەستەوەری لێدەکات، بۆی بەدەرکەوت ئەم لاشەیە بێهوودە بۆی دروست نەکراوە، پێویستە لە سەری کاروباری ڕێك بخات و ئەمەش بەکارێك ئەبێت کە لە کاری ئاژەڵەکانی تر. و لە ڕوویەکی ترەوە بینی لە ئەستێرەکان ئەچێت بەوەی کە خاوەنی جەستە و گەردیلەن کە بە هۆیانەوە (بوون) (الموجود) و (پێویستە بوون) (واجب الوجود) دەناسرێت و، لە ڕووی سێهەمەوە بینی بە بەشە شکۆدارەکانی کە بە هۆیەوە (پێویستە بوون) زانی لێکچوونێك هەیە لەگەڵ لاشەکەیدا، لە ناخیدا چەسپا کە هەریەکەی لە ڕوویەکەوە لەم سێ شتە دەچێ، لە ئاژەڵ ئەچێت لە کردارێکدا کە سەلامەتی لاشەکەیی و مانەوەی بە گوێرەی پێویست پێببەخشێت و خۆراك لە ڕووەك وەرئەگرێت و گەر دەستگیری نەبوو پەنا ئەباتە خواردنی ئاژەڵ بە مەرجێك پارێزگاری تۆوی ڕووەك بکات و لە ئاژەڵیش جۆرێك هەڵئەبژێرێت کە بوونی زۆر بێت بنەبڕی نەکات.

لە هەسارە ئەچێت بەوەی کە بێگەردو پاك و ڕووناکە و جووڵەی بازنەیی هەیە و، ڕووناکیو گەرمی دەبەخشێتە خوار خۆی.

لەبەر ئەوەی کە لە (پێویستە بوون) دەچێت و بە دانایی ئەو پەیداکەرە هەڵسوکەوت ئەکات و بەبێ ویستی ئەو ناجوڵێنەوە.

(حـــي بن يقظان) پێویستی کرد لە سەرخۆی گەر هەر دەردو زەرەرێکی لە ئاژەڵ و ڕووەکدا بینی لە توانایدا بوو لایببات و، چ کاتێك ڕووەکێکی بینی کە ڕێگرێك خۆری ێ بەدوور کردبێت یاخود ڕووەکێکی تری پیاهەڵواسراوە و ئازاری ئەدا، یا بە هۆی تونێتیەوە سیس بووبێت، بە گشتی هەموویانی چاك ئەکرد.

کاتێك چاوی بکەوتایە بە ئاژەڵێك، دڕندەیەك ئازاری ئەدا، یا.. پەلاماردەرێك پەلاماری ئەدا، یاخود دڕکێك پێوەی نووساوە و، یا دووچاری برسێتیو تونێتی بۆتەوە، نەمانی هەموو ئەم شتانەی بە گشتی لە ئەستۆی خۆی دەگرت، خۆراك و ئاوی ئەدانێ گەر بینی ئاوەڕۆیەك کۆسپێك ڕێڕەوەکەی گرتبێت لە ئاودانی ڕووەك و ئاژەڵ، لای ئەبرد.

نـە یەکچوونی لەگەڵ ئەستێرەکاندا لـە ڕووی بێگەردو پـاکی لاشـەو پۆشـاکی و، خـودی خـۆی کـە جـۆرە هـاوجوڵاندن و خولانـەوەی وەك ئـەوی هەیـە، لـە دوورگەکەدا ئەسوڕایەوە و دەگەڕا لە کەنارەکانیدا یاخود لە ماڵەکەیدا دەخولایەوە بە شێوەی ڕۆشتن و ڕاکردن.

بـەردەوام بـوو لـە یەکچـوونەکانیدا وە بیرکـردنەوە لـە (بـوون) و (پێویسـتی بـوون)، هـەوڵی ئـەدا بەدووربێـت لـە جـیهانی هەسـتەکان و بـە قوڵـی بیربکاتـەوە بـە یارمـەتی پشتگوێخستنی هەستەکان و خولاندنەوە بە چواردەوری خۆیدا، تا.. بێئاگا بێت لە هستەکانی و ڕزگاری بێت لە پێچ و پەناکانیەوە بە دیتنی هەبووی پێویستە بوون شادمان ببێت. بەڵام لە یەکچوون لەگەڵ خودادا، (حي بن يقظان) لای وایە ناگونجێت لەگەڵ سیفاتە پەسەندەکانیدا (صفات الايجاب) تەنها لە (سیفاتی زانستدا) نەبێت، ئەویش ئەوەیە کـە بیناسـێت و هـاوەڵی بـۆ پـەیدا نـەکات، بـەڵام لـە (سـیفاتە دژوارەکانـیدا) (صـفات السلبية)، ئەو سیفاتانەی کە بێگەردو دوورە لە جەستەیی.

(حـــي بـــن يقظـــان) هەوڵیدا ڕووت بێت لـە جەستەییەکەی و دابڕاو بێت بۆ بیرکردنەوە لە خودا، ڕۆژانی لە بێئاگایو داواکردنی نەمانی خودی خۆی و پەرۆشی بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکان دەبردەسەر.

بەم جۆر مایەوە، تا.. مەبەستەکەی بەرجەستەکردو خودی خۆی لە یادکرد لە نێوان کۆمەڵێك خودی تردا.

هیچ نەمایـەوە تـەنها خـودای تـەنهاو ڕاسـت و ئـەزەلی نەبێـت چێژو خۆشیەکی بە دەسەت هێنا، نە هیچ چاوێك بینیویەتیو نە هیچ گوێیەك بیستوویەتی و نە بە خەیاڵی هیچ کەسێکدا هاتووە، (حـــي بـــن يقظـــان) ئەڵێـت ئـەم حاڵەتـە نـە وەسـف دەکرێت و نە دەردەبڕرێت و، هەر کەسێك خوازیاری ئەو ئامانجە بێت وەکو ئەو کەسە وایە کە چێژی ڕەنگەکان بکات و داوای ترش و شیرینی ڕەنگی ڕەش بکات.

شێخ: ئەی.. حەیران، ئیبن طـــوفەیـــل بە زمان حاڵی (حي بن يقظان) وەسفێکی ئەندیشەی سەرسوڕهێنەری ئەو گەردونە بەرزەو فەلەکەکانی تر کە بینیوویەتی دەکات بە وتەکانی خۆی دان بەوەدا ئەنێت، کە ناتوانێت لێیان تێبگات و ئەڵێت: ماوەی دەربڕین نەماوە هیچ وشە و ڕستەیەك نییە وەسفی ڕاستیەکان بکات.

پاشان ئیبن طـوفەیـل لـە داستانەکەیدا دەچێتە سەر وەسفی دورگەیەکی نزیك بە دورگەکەی (حـي بـن يقظـان)، کـە میللەتێکی تیائەژیا هەڵگری ئاینی هەندێ لە پێغەمبەرانی مەبەستی (میللەتی محەمەدە).

دوو لاو لـە کۆمـەڵی موسـڵمانەکان، کـە یەکێکیان ناوی (ئەبسال) بوو، ئەوی تریان نـاوی (سـەلمان) بـوو، رێبازی شـارەزاییان لـە ئاینە تازەکە گرتەبەر، هەوڵیان ئەدا دەرکی مەبەستی شـارراوەی ئـەو شـەریعەتە لـە سیفاتی خـودا و فریشتەکان و هەواڵی دوارۆژی دیاریکـراو بـزانن، (ئەبسال) زیاتر دەچووە ناخی باسەکان و شیکردنەوە و لێکدانەوەیان، بـەڵام (سـەلمان) زیاتـر پەیوەسـت بـوو بـە ڕواڵەتەکانـەوە و، بە دوور بـوو لە شیکردنەوە و لێکدانەوەکان.

(ئەبسـال) ڕێگـای دابڕانی لـە خـەڵك و تەنیایی گرتەبەر پەیڕەوی وتەکانی شەریعەتی کرد لە ئارامگریی (تەنیایدا) بەڵام سەلمان بە پێچەوانەی ئەوەوە، تێکەڵاوی خەڵکی دەبوو و پەیڕەوی وتـەکانی شـەریعەتی دەکـرد لـە سۆزو خۆشەویستی کۆمەڵ، ئەم پێچەوانەییە هۆکارێك بوو بۆ جوداییان.

(ئەبسـال) ڕووی کـردە دورگەکـەی (حـي بـن يقظـان) بـۆ دابڕان لـە خەڵك و خوداپەرستی.

(حـي بن يقظان) چاوی پێکەوت، کاتێك گوێبیستی خوێندنەوەکەی بوو و، نوێژ و زیکـرو پاڕانەوەکانی دەبیـنی دەرکـی کـرد کـە یەکێکە لـە زانایـان، لەگـەڵ ئـەوەی کـە تێنەئەگەیشت لە وتەکانی.

(ئەبسال) ناوی هەموو شتێکی بە (حي بن يقظان) ناساند، تا.. فێری قسەکردن بوو.

پاشـان (حـي بن يقظان) بەسەرهاتی ژیـانی بۆ هاوڕێ تازەکەی باسکرد و، چۆن بە هۆی بیرکردنەوەوە گەشەی کردووە و لە ئاکامدا گەیشتۆتە ناسینی خودا.

کاتێك (ئەبسـال) گوێبیستی وەسفەکانی (حي بن يقظان) بوو سەبارەت بە خودای ڕاسـت، بـۆی بەدەرکـەوت کـە هەموو ئەو شتانەی بە هۆی شەریعەتەوە فێری بووە هەمان شتە کـە (حـي بن يقظان) بە هـۆی عەقلیەوە دەرکی پێکردوە، لێرەدا (عەقلی و نەقلی) (معقـول و مـنقول) یـەك دەگـرنەوە، بەمـەش نـزیك بـۆوە لـە ڕێچـکەکانی لـێکدانەوە و شیکردنەوە، کاتـێك (ئەبسـال) زانیارییەکانی شـەریعەتی بـۆ (حي بن يقظان) باسـکرد.

(حــي بن يقظان) هیچ جیاوازییەکی ڕەچاو نەکرد لەگەڵ ئەو زانیاریانەی کە بە خودی خۆی ناسینی، ئینجا حەی بۆ دەرکەوت، ئەو کەسەی کە ئەم شەریعەتەی هێناوە و بەم شێوە جوانە ڕوونی کردۆتەوە، لە باسەکەیدا هەق بێژەو لە فەرمایشتەکانیدا ڕاست گۆیەو، کەواتە پێغەمبەرو فروستادەی پەروەردگاری خۆیەتی، ئیتر ئەویش باوەڕی پێ هێناو بوە بە یەکێ لە پەیڕەوانی پەیامەکەی.

پاشان فێری پەیامی ئەم پێغەمبەرە بوو لە فەرمانەکانی (کردن و نەکردن) (امر و نهي) و پەیڕەویی هەمووی کرد بە گشتی تەنها دوو فەرمانیان نەبێت کە ڕووەکانی (دانایی) تیادا بەدی نەئەکرد:

یەکەمیان: بۆچی ئەم پێغەمبەرە لە وەسفی جیهانی خواوەندیدا پەنا دەباتە بەر پەندو نموونەیی بۆ خەڵك و، دوورە لە ڕوو هەڵماڵینی نهێنییەکان کە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە جەستە بۆ خودا دابنێین و باوەڕ بە هەندێ شت بهێنین کە خودا بێگەردو پاکە لێی؟؟

دووەمیان: بۆچی ئەم پێغەمبەرە پەیوەستە بەم دەقانەوە؟ و کۆکردنەوەی سامانی حەڵاڵ کردوە و دەستکەوتەکانی فراوان کردووە بۆ پووچەڵیو گەندەڵی و بەدوورن لە ڕاستیەکان؟

(حــي بــن يقظان) لەگەڵ خۆیدا دوواو بڕیاری دا، پەیوەندی بکات بە خەڵکەوە و گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات و ئەو ڕاستیانەی کە لای ئاشکرابووە بۆیان باسبکات، لەسەر ئەمە لەگەڵ (ئەبسالی) هاوڕێیدا ڕێکەوت، خودا بۆی ڕێکخستن ڕۆیشتنی کەشتیەك بەلای دورگەکەدا، گەیاندنیە دورگەکەی (ئەبسال).

(ئەبسال) بە هاوڕێکانی کۆبۆوە و (حــي بــن يقظان) و جێو شوێنی پێناسانن، بەڕێزلێنان و گەورەیییەوە بەرەو پیری چوون.

(حي بن يقظان) دەستیکرد بە فێرکردنیان و ڕوونکردنەوەی نهێنی دانایییەکان بۆیان، تەنها هەندێکی کەمیان لە هۆگری ڕواڵەت دەرچوون، تا وایان لێدەهات دڵتەنگ دەبوون بە وتەکانی (حي بن يقظان).

(حــي بــن يقظــان) نائومێد بوو لە دڵسۆزیان و ئەیوت، ئەمانە هەڵبژێرراوی میللەتەکەن، ئەبێت تێکڕای میللەت چۆن بن کە هەموو سەرقاڵی سامانی دونیان و نوقمن لە نەزانیدا؟

(بۆی ئاشکرابوو کە لە ڕێگای ڕوو هەڵماڵینی نهێنییەکان سوودمەند نابن و، مەحاڵە داواکردنی کارێك کە لە سەروی توانایانەوە بێت. و بۆی بەدەرکەوت هەموو دانایی و ڕێنمایی (هدایـــة) و سەرکەوتوی لە پەیامی پێغەمبەران و هاتووەکانی ناو شەریعەتدان. و هەموو کارێك پیاوی خۆی هەیە، چونکە هەرکەسێ لە ئەزەلدا بۆچی دروست کراوە، ڕێگەی ئەوەی بۆ ئاسان دەکرێ ڕووی کردە (سەلمان) و هاوەڵەکانی کە هەڵگری بیرۆکەی ڕواڵەتن (الظاهر)، داوای لێبوردنی لێکردن سەبارەت بەو وتانەی کە وتبووی و، پێی ڕاگەیاندن کە گەڕاوەتەوە سەر ڕێبازی ئەوان.

(ئامۆژگاری کردن کە لە سنوری شەرع دەرنەچن و باوەڕ بەو ئایەتە (مشتابهاتانە) بهێنن و دووربکەونەوە لە قووڵبوونەوەی ئەو شتانەی کە مەبەست نییەو، خۆیان بپارێزن لە (دروستکراوە ئارەزووەکان) (بدع) و، پەیوەستی بوون بە پیاوچاکانی پێشوو (السلف الصالح)، هیچ ڕزگارییەك نییە، تەنها لەم ڕێبازەدا نەبێت و گەر بەرز بڕواننە ئەو شتانەی کە لە بینایی چاوەوە دوورە، تێکدەچێت لایان کاروباری ئاینیان دووچاری نوشستی و زەرەرمەندی دواڕۆژیان دەبنەوە، بەڵام گەر مانەوە لەسەر پەیڕەوییەکەی خۆیان بەرامبەر ئاینەکەیان ئەوا سەرکەوتوو دەبن، لە پاشدا لەگەڵ (ئەبسالی) هاوڕێیدا خواحافیزی لە خەڵکەکە کردو گەڕایەوە بۆ دورگەکەی خۆی، تیایدا مانەوە بۆ خواپەرستی، تاکو مردن.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت : ئەو ڕۆژەم وەك سەرخۆشێکی بێ ئاگا بردە سەر بەهۆی ئەوەی کەدوێنێ شەو گوێبیستی داستانی (حی..) بووم تا.. شەوی تاریك باڵی کێشا چەندەها جار ئەم خوێندەوەم دووبارە دەکردەوە، بیرم دەکردەوە، چۆن (ئیبن طـــوفەیل) ئەو ڕاستیانەی بەدەرخستووە لەکۆنێتی و لێکەوتنەوەدا بەتایبەتی کولبون و سەرسامی عەقڵ لەئەندێشەکردنی ئەم دووانەدا نابێتە هۆی لاوازکردنی باوەڕ بەخودا، چونکە گەر عەقڵ باوەڕی بەلێکەوتنەوەی گەردون هێنا، باوەڕیش بەخودا ئەهێنێ کەدروستکەرەکەیەتی و گەر عەقڵ لاواز بوو لەئەندێشەی لێکەوتەدا ئەوکاتە گومانی ئەبێت لەکۆنێتی‌دا و، پێویستە کۆتایی ئەمە باوەڕهێنان بەخودا بێت کەجوولەی بەردەوامی بەخشیووە بەمادده. پاش نوێژی شێوان چوومە ژوورەکەی شێخ سەرنجی نیشانەکانی شادمانیم بەدی کرد لەسەردەم و چاوی شێخ بەزەردەخەنەیەکەوە وتی :

ئەی حەیران.. ئێستا، کازیوەی بەیان بەدەرکەوت.

حەیران : چ کازیوەیەك، شێخی گەورەم؟

شێخ : کازیوەی باوەڕت بەوەی کە (فەلسەفەو ئاین) پێچەوانەی یەك نین لەلای خاوەن عەقلی ساغ، هەر لەبەر ئەمەشە ئەو هەموو شادیەت تیا بەدی ئەکەم.

حەیران : بەڵێ، ئا.. ئەمەیە ڕاستیەکان گەورەم.

شێخ : ئەمڕۆ باسی غەزالیت بۆ دەکەم کەدەمێکە چاوەڕوانیت گوێبیستی لێکۆڵینەوەکانی بیت.

حەیران : چەند تامەزرۆی باسەکانتم سەبارەت بەغەزالی

شێخ : منیش وەك تۆ تامەزۆری باسکردنی غەزالیم بۆت.

حەیران : هۆکانی ئارەزومەندی تۆچی‌یە بۆ باسکردنی غەزالی.

شێخ : لەبەر ئەوەی غەزالی لەلاویدا، وێنەیەك بووە وەك تۆو نموونەی تۆ لەگومان و سەرسامی و هۆگربوونی بۆ فەلسەفە و ئارەزووی زۆری بۆ زانینی ڕاستیەکان. هیوادارم

دڵنیا بیت بەگوێبیستی بارودۆخی غەزالی و، بۆت بەدەردەکەوێت، ئەم گومانەی کەتۆی تیایدای دووچاری گەورەترین عەقڵی سەنگینی دڵ پڕ لە باوەڕ بۆتەوە. ئەمەیە هۆی تامەزرۆیی من، ئەی هۆکانی تامەزرۆیی تۆ چییە؟

حەیران: ناوبانگی غەزالی ئاگادارم کەچۆن رۆژهەڵات و رۆژئاوای گرتۆتەوە، بەجۆرێك کە بە (حجة الاسلام) ناوبراوە. بەڵام دەبینم زۆر لەزانایانی ئیسلام رێبازەکەی پەسەند ناکەن.

شێخ : ئەوانە، زانایانی رێبازی (سەلەفین) بەراستی، حەز ناکەن بچنە ناو قووڵاییەکانی فەلسەفەوە بۆ هێنانەوەی بەڵگە لەسەر بوونی خوداو لێکۆڵینەوە لە سیفاتی تەواوی لەبەرئەوە خۆشحاڵ نابن بەموناقەشەگیری لەگەڵ فەیلەسوفەکاندا هەر چەندە بۆ رەتدانەوەشیان بێت نەلە غەزالی و نەلە زانایانی (کلام)، بیروڕایان چۆن دەبێت گەر زانایەکی ئاینی بەهۆی چوونە ناو قووڵاییەکانی فەلسەفەوە کتێبێکی تایبەتی بەتێروچڕی لەبابەت بیروڕای فەیلەسوفەکان و بەڵگەو گومان و بەهانەکانیان دابنێت وەك یەکێك لەخۆیان.

حەیران : ئایا شێخ رای وایە کە (سەلەفیەکان) لەسەر حەقن کە لەگەڵ فەیلەسوفەکان رۆناچن گەر هاتوو ئەم رۆچوونەش وەڵامێك بێت بۆ گومانەکانی فەیلەسوفەکان؟

شێخ : بەڵێ پێش ئەوەی ئەم بەڵایە سەربکێشێ رەوابوو، موسڵمانەکانی سەرەتای ئیسلام نەیاندەزانی موناقەشەی فەلسەفەگیری لەسەر بوونی خوداو سیفاتەکانی. پاش ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی وەرگێڕدرا بۆ سەر زمانی عەرەبی زۆر لەزانا ئیسلامیەکان چوونە ناخیەوە و نوسراویان لە سەر نووسیوە بڵاوبۆوە لەگەڵ گومانی فەیلەسوفەکاندا، بەمە بەڵاکە سەری کێشاو پەرەی سەند لەناو گشت ئیسلامدا و، زۆر لەزانایانی ئاینی بەرامبەریان وەستان بۆ وەڵامدانەوەی گومانەکانیان لەچوونە ناو قوڵاییەکانی فەلسەفە رزگاریان نەدەبوو، بەچەشنێك بوە کارێکی پێویستی بەتایبەتی لەئەستۆی زانایانی ئاینی تابتوانن بەئاسانی بانگەوازی باوەڕهێنان بەخودا بکەن.

حەیران : بەڵام شێخی گەورەم ئەڵێت : غەزالی دانەری کتێبێکی تایبەتمەندە بەبیرۆکەی فەیلەسوفەکان هەروەك یەکێك بێت لەوان، بێئەوەی هیچ وەڵامێکیان بداتەوە.

شێخ : غەزالی چەند راستگۆیە کاتێك کە ئەڵێت : (وەڵامدانەوەی رێبازێك پێش تێگەیشتنی و چوونە ناو ناخیەوە، وەڵامێکی کوێرانەیە). هەر لەبەرئەمە بیروڕای وابوو بچێتە ناخی بیرۆکەی فەیلەسوفە خواوەندییەکانەوە، تا زانیارییەکی تەواوی هەبێت لەسەریان پێش وەڵامدانەوەیان، لەبەرئەم مەبەستەی کتێبی (مقاصد الفلاسفه) ی دانا کەتیایدا بیروڕاو گومان و بەهانەکانیان بەتێروچڕی بەدەردەخات وەك خۆی (یەکێك بێ لەوان کەخاوەن هێزێکی چەسپاوی سەقامگیری لەسەر بەردی راستی، نەك وەك یەکێکی لاوازی دوو دڵ کەترسەکەی زۆری لێدەکات هەندێ لەگومانی بەرامبەرەکەی بشارێتەوە و بەپەردەیەکی نادیارو تاریك چواردەوری بتەنێ، تا.. بەدەریبخات کەئاگادارییەکی تەواوی هەیە لەوتەی فەیلەسوفەکان و چوونە ناخی گومانەکانیانەوە. ئنجا کتێبە بەناوبانگەکەی دانا بەناوی (تهافت الفلاسفة) کە توانی وتەی ئەو فەیلەسوفە خواوەندییانە پووچەڵ بکاتەوە کەددانیان دەنا بەبوونی خودادا و بەپێچەوانەی عەقڵ و ئاینەوە دەیان وت : کۆنێتی خوداو گەردون پێکەوەیە. بەڵام رێبازی مادديیەکانی پشت گوێ خست، بەتێکڕایی ئینکاری بوونی پەیداکەری ئەم دروستکراوە دەکەن. غەزالی لەسەر رێبازی مادیيەکان ئەڵێت (ئەوانەی باوەڕیان بەم رێبازە مادییە هێناوە، هەندێکی کەمن و خاوەنی عەقڵێکی نوشستی و باوەڕێکی پێچەوانەیین کەپشتگوێخراون و هیچ گرنکیەکیان پێنەدرا بوو لەلایەن روونا کبیرەکانەوە).

حەیران: گەورەم چۆن ئەمە ئەبێت و، من دەبینم رێبازی ماددییەکان لەهەموو رێبازێکی تر، ترسناکترن بۆ باوەڕ؟

شێخ : تۆ لەم سەردەمەدا وا دەبینیت کەترسناکترین رێبازبن، بەڵام لەسەردەمی غەزالیدا باوەڕ بەبوونی خودا زۆر لەوە گەورەتر بوو کەگومان بتوانێ بەلایدا بچێت. لەڕاستیدا ئەمانە هەندێ نیمچە گومان بوون کە خەڵك تووشی هاتبوو پاش وەرگێڕانی نووسراوەکانی فەیلەسوفە خواوەندییەکان بەتایبەتی ئەرستۆو ئەفلاتۆنییە نوێیەکان لەچۆنێتی دروستکردن و چەرخ و کۆنێتی گەردون و.. هتد. لەناو خەڵکدا سەری کێشا، غەزالی کەپیاوێکی ئاینی بوو ویستی خۆی تەرخان بکات بۆ لەناوبردنی ئەم بەڵایەو پووچەڵکردنەوەی ئەم نیمچە گومانانە.

حەیران : شێخی گەورەم لەباسکردنی ئەرستۆدا هەندێك لە وەڵامەکانی غەزالی بەدەرخست لەچۆنێتی دروستکردنی گەردووندا، هیوادارم روونکراوەیەکی کورتکراوەم گوێبیستبکات کە لەنووسراوی (تهافت الفلاسفة)دا هاتووە.

شێخ : لێکەوتنەوەی گەردون بەوەی کەدروستکراوەی خودایە و لەکتێبی (تهافت)دا باسکراوە بۆت باسدەکەم لەگەڵ وەڵامدانەوەی بۆ فەیلەسوفەکان کە لەم بەشەدا هاتووە، بەڵام وەڵامەکانی لەبەشەکانی‌تردا لێیان نادوێم چونکە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بەشە گرنگە گەورەیە. چ کاتێك کە باوەڕی تەواو بەخودا هێنرا بەوەی کەخۆی دروستکەری ئەم گەردونەیە، ئەوکاتە موناقەشەگیری بابەتەکانی تر ئاسانە، بەڵام لەسەرەتادا باسی بیروڕاکانی دەکەم سەبارەت بەزانست، تا ببینیت، گومانی چۆن بووە سەبارەت بەهەست و عەقڵ و چۆن بە بەڵگە عەقلی‌یە سەرەتاییە ئاشکراکان ئەم گومانانەی نەهێشتووە وەك چۆن دیکارت کەشەش سەدە پاش غەزالی هات ئەم گومانانەی نەهێشت.

غەزالی لە وەسفی گومانەکەیدا دەڵێت : تونێتیم بۆ دەرك کردنی راستیەکان بوە داب و نەریتم و هەوڵم ئەدا راستی ئەو خۆرسکی‌یە بزانم کەمرۆڤ پێش کەوتنەوەی باوەرەکان پابەند بووە لەسەری.. تا بەهۆیەوە بگەمە زانستی تەواوی راستیەکان و هیچ گومانێك لەدڵمدا نەمێنێت. کاتێك زانیاریی‌یەکانی خۆمم تاقیکردەوە بۆم بەدەرکەوت کەهیچ زانستیەك نامگەیەنێتە پلەی باوەڕی تەواو تەنها هەستەکان و عەقڵەکان نەبێت. بەڵام بەبیر کردنەوەم لەهەستەکاندا دڵنیایم بەدەست نەهێنا. چونکە چاو هەندێ‌جار هەڵدەخەڵەتێت (سێبەر بە نەجووڵاوی دەبینیت لەگەڵ ئەوەی کە دەجولێت) و (ئەستێرە بەبچووکی دەبینێت کە لەزەوی گەورەترە) و بینیم ئەوەی هەست بەدرۆ ئەخاتەوە و بەهەڵخەڵەتێنەری دائەنێت، (عەقڵە) و، کاتێك باوەڕم بەپووچەڵی هەستەکان هێنا، تەنها عەقڵم بۆ مایەوە، هەوڵم دا گومانیش لەم بکەم، پاش دڵنیا بوونم لەهەستەکان، عەقڵ بەدرۆی خستەوە و گەر عەقڵ نەبوایە بەردەوام دەبووم لەسەر باوەڕهێنانم بەهەستەکان، لەوانەیە لەپشت عەقڵیشەوە بڕیاردەرێکی‌تر هەبێت، گەر بەدەرکەوت ئەوکاتە بڕیارەکانی عەقڵ بەدرۆئەخاتەوە. وەك چۆن بەدەرکەوتنی عەقڵ، بڕیارەکانی هەستی‌ی بەدرۆخستووە. لێرەدا عەقڵم لە وەڵامدانەوە وەستا، وگومان و دوو دڵیم تیادا چەسپا بەوەی کە نووستوویەك خەودەبینێت وا دەزانێت راستی‌یە بەڵام کاتێك بەخەبەر دێت بۆی بەدەردەکەوێت تەنها خەوبووە. و ئەم گومانەم دوو مانگی خایاند) و هەروەها وەسفی خۆی دەکات لەسەر رێبازی سەفسەتەکە پابەندە بەبڕیارەکانی بارودۆخی ئەو سەردەمەوە نەك بڕیارەکانی نوسراوو لێدوان.

بە بەردەوامی بیری دەکردەوە تا.. لەخودیدا جێگیر بوو کە تەنها بەڵگە رزگاری دەکات.. و (عمانوئیل کانط) پاش شەش سەدە دەرکی بەوە دەرك کردنەی غەزالی کرد (ئەویش بوونی بیروباوەڕە خۆڕسکیەکانە کەسەرەتاو پێویست و ئاشکران و بەڵگە راستەقینەکان پابەندن لەسەریان و بەهۆیانەوە عەقڵ دەگاتە تەواوی باوەڕەکان هەروەك چۆن فارابی پێش ئەم باوەڕی هێنا کە ئەم سەرەتاییانە، تەنها ئەو واتا ئاشکرایانەن کە جێگیرن لەمێشکدا و هیچ شتێکی تر نی‌یە لەمانە ئاشکراتر بێت و، هیچ بەڵگەیەکیان پێویست نی‌یە چونکە لەخودی خۆیانا ئاشکراو باوەڕی تەواویان پێدەهێنرێت و لەوپەڕی پلەی باوەڕی تەواودان و ناتوانرێت وازیان لێبهێنرێت لەدروستبوونی بەڵگەدا چونکە بنەماو بنچینەی ئاشکران و هیچ گومانێکیان تیادا نی‌یە لەلای عاقڵ و ژیر.

پاشان غەزالی سەرنجی لەو ووتانە دا کە لەدەرك کردنە هەستیەکان و دەرك کردنە عەقڵیەکاندا وتراوە، بینی هەست، دەرك کراوە هەستیەکان بەکۆمەڵی دەبینی و، عەقڵیش بەتیرو چڕی وەریدەگرێت و بەراوردی پێدەکات بەڵام دەرکی کرد وەك چۆن ئیبن سینا پێش ئەو دەرکی کرد کە ئەم عەقڵە بەچەسپاندنی بەئاماژەپێکردن و جێگاکەی شت و بوونی بڕیار دەدا، بەبێ ئاماژەکردن بۆ جێگەو کاتی و بەبێ بڕیاردانی بارودۆخ بۆی. کە ئەمەیش رێك خودی مەعقوولی رووتە، واتە: ئەو زانیاریەیە، کە تەنها هۆش دەرکی دەکا بەبێ یارمەتی وەرگرتن لەهەستەکان و ماددەکان، واتە دەرکی ئەمەی کرد وەك چۆن (عما نوئیل کانط) دوای ئەو دەرکی پێکرد کەعەقڵ خۆڕسکیەکی تایبەتمەندی هەیە، کەبەهۆی هێزەکەیەوە بڕیاری پێکهێنەری نوێ دەردەکات کە مەڵبەندەکەی هەست نی‌یە و هەروەها لەماددەشەوە نی‌یە، بەم چەشنە باوەڕی تەواوی بەعەقڵ و بەبڕیارەکانی عەقڵ هێنا. وەك چۆن (دیکارت) بەهەمان رێگاو بەهەمان وتە گەل گەرایەوە بۆ سەر بڕیارەکانی هۆش و عەقڵ.

گەر غەزالی پێشکەوتووتر نەبێت لەدەرککردنی ئەم سەرەتایی‌یە ئاشکرایانە کەوا مەڵبەندیان هەست نی‌یە. لەتۆژینەوەکانیدا بەرزتر دەژمێررێت لەو فەیلەسوفانەی کەپێش خۆی و دوای خۆی هاتوون، بەوەڵامدانەوەی بۆ ئەرستۆ لەمانەی (چەرخ و شوێن)دا کەوەسفی لاسەنگی عەقڵ لەئەندێشەکردنی چەرخ دەکات بەوەی کەهیچ چەرخێکی‌تر پێشی نەکەوتووە و، لەشوێندا کەهیچ شوێنێك نی‌یە لەدوایدا بێت. بۆت ئاشکرا دەبێت، ئەی حەیران، (کانط) کە بەچەند نەوە پاش ئەو هاتوە، لەکێشەی (چەرخ و شوێندا) و لاسەنگی عەقڵ تیایدا بەگشتی لەوتەکانی غەزالی وەریگرتووە.

حەیران : چەند شانازم بەم پێشکەوتنەی و چەند پەرۆشم بۆ گوێبیستی ئەم بەشەی.

شێخ : بەنرخترین بەڵگەی غەزالی بۆ وەڵامدانەوەی ئەوانەی باوەڕ بەکۆنێتی گەردون دەهێنن، لەوتەکانیدا سەبارەت لە (سیفاتی ویستدا) کۆدەبێتەوە کە ئەرستۆو هاوەڵەکانی بێئاگابوون لەدەستنیشانکردنی واتاکانی و، هەروەها سەبارەت بەوتنیان لەراستی ماناکانی چەرخ.

غەزالی بەئەرستۆو فەیلەسوفە خواوەندەکان ئەڵێت: ئێوە دان بەبوونی خودادا دەنێن و باسی تەواوی سیفاتی دەکەن. بەڵام باوەڕ بەکۆنێتی گەردون دەهێنن و دەڵێن لەسەرەتاوە تائێستا لەگەڵ خودادا بووە، کە خودا هۆکاریەتی و ڕێڕەویشیان پێکەوەیە و بەگوێرەی چەرخ لەیەکتر دوانەکەوتوون. وەك (هۆ) کە پاشکۆکەی هۆکارەکەیەتی و بوونی خودا پێش بوونی گەردونە، وەك پێشکەوتنی پێشەکی وایە لەئاکام، واتە پێشکەوتووە بەخودو پلە نەك بەچەرخ. و لێکەوتنەوەی گەردون لەلایەن خوداوە، لێکەوتەیەکی پێویستە و، ئەوەی کەپاڵی پێوەنان بۆ ئەم باوەڕە، وتەکانی ناشێ کەلێکەوتە (حادث) لەکۆن (قەدیم) پەیدا بێ، چونکە حاڵ بەیەکێ لەم بۆچوونانە بەدەر نییە: چونکە ئەگەر بڵێین: لەپێش دا کۆن هەبوە و گەردوون نەبووە، بەڵام لەپاش دا پەیدابووە لێی، دەبێ بۆ ئەم پەیدا بوونە نوێیە، مورەجیحێ هەبێ، واتە: هۆیەکی تایبەت کەلایەنی نەبوونی لەوە پێش و بوونی لەوە پاش بخوازێ، دەی باشە کێ پەیداکەری ئەو هۆیە تایبەتەیە؟ بۆچی لەوەو پێش گەردوونی دروست نەکردووە. ناتوانین نەتوانایی بخەینە پاڵ کۆن بۆ نەبوونی لێکەوتنەوە لێی.. و هەروەها ناتوانین بڵێین بوونی لێکەوتنەوە مەحاڵە و ناتوانرێت بووترێت پێش (کۆن) هیچ مەبەستێك نەبووە و، لەپاشدا مەبەستێ هاتۆتە کایەوە و، بەهۆی ونبوونی دروستکەرەکەیەوە نییە، هەروەها ناتوانرێت بوترێت ویستی لەخۆگرتووە پاش ئەوەی کە نەویستراوبووە، چونکە لێکەوتنەوەی ویست لەخودی خۆیدا مەحاڵە. و گومانیان لە (ماوەی وەستان) (مدة الترك) ئەو ماوەیەی لەنێوان خوداو بڕیاردانی لێکەوتنەوەکەیدا هەیە، ئێوە وتتان : خودا پێش بڕیاردانی دروستکردنی گەردون لەتوانایدا بووە دروستی بکات، وەك ئارامی گرتبێت لەم دروستکردنە و، پاشان دروستیکردبێت و، ماوەی ئەو ئارام و وەستاننە گەربێ کۆتایی بووبێت، بوونی خودای بەخشندەر بێ کۆتایی یەکەم دەبێت و بەگوێرەی عەقڵ ڕەوا نییە کۆتایی هەبێت.

دوای ئەوەی غەزالی لەوتەکانی فەیلەسوفەکان دەکۆڵێتەوە و بەڵگەکانیان ئەخاتەڕوو بەبێ زیادو کەم، وەك خاوەن هێزێکی بێگومان لەتوانای خۆی بۆ پووچەڵکردنەوەی

وتەكانیان بەساكارترین و ئاسانترین ڕێگا بۆ وەڵامدانەوەیان بەكورتە وەڵامێك لەخودی وتەو بەڵگەو بڕیارە لۆجیكەكانی خۆیان كەدایناوە و بەدان پیانانیان بەبوونی خوداو سیفاتی تەواوی لەم كورتكراوەیەدا ڕەنگ دەداتەوە:

ئێوە لێكەوتەی لێكەوتنەوەتان لەكۆن بەدوورخستەوە بەڵام كاتی ئەوە هاتووە باوەڕی پێبهێنن، چونكە گەردون لێكەوتنەوەیەو هۆكانیشی دیارن، گەر بڵێین ئەم لێكەواتنەوانە دەگەڕێنەوە بۆ لێكەوتنەوەیتر بەبێ كۆتایی، ئەمە مەحاڵەو باوەڕی مرۆڤی ژیر نی‌یە، گەر وابوایە پێویستان نەئەبوو بە دان پیانانتان بەبوونی دروستكەرو چەسپاندنی (پێویستە بوون)، گەر ئەم زنجیرە بێ كۆتایی‌یە لێكەوتنەوانە لایەنێكی هەبوایە كۆتایی تیادا بهاتایە ئەوا ئەو لایەنە (كۆ نی‌یە). كەواتە پێویستە، باوەڕ بەپێویستی لێكەوتنەوە لەكۆنی بهێنن.

بەڵام وتەتان سەبارەت بەلێكەوتەی گەردون لەخوداوە كەوا (لێكەوتەیەكی پێویستە) ئەوا ئەم لێكەوتە پێویستەو پێی ناوترێت (كردار). گەر یەكێك بڵێت چرا ڕۆشنایی دروست ئەكات و ئەو شتەی ڕووناكی‌یەكەی لێدەدا، سێبەرە وە پێی لێهەڵبڕیوە لەبڕیارداندا. بكەر پێی ناوترێت بكەر تەنها لەبەرئەوەی كە هۆیە بەڵكو كاتێك پێی دەوترێت بكەر كەهۆكارو هۆ بێت لەكارێكی تایبەتمەندا.. ئەویش پەیدابوونی كردارە لەڕووی (ویست و هەڵبژاردنەوە) (الأرادة والأختـــيار)، پەیدا بوونی هۆكار لەهۆكەی لێكەوتەكەیان پێویست نابێت، بەبێ هاوسەنگی هۆو هۆكار و، هەروەها لەنێوان خوداو ئەم گەردونە گۆڕڕاوەدا هیچ هاوسەنگیەك نی‌یە، تا.... پەیدابوونی ئەم گەردونە بەلێكەوتەیەكی پێویست بزانرێت.

ئێوە باوەڕ بەبوونی خودا دەهێنن و بەخاوەن سیفاتێكی تەواو و بەرز وەسفی دەكەن. یەكەم سیفەتی تەواوی خودا (توانایی‌و ویستە) (القدرة والأدارة)، (ویست) سیفەتێكە كەدوو شتی پێچەوانەی یەكتر دەست نیشان دەكاو یەكێكیان دەخاتەگەڕ. گەروا نەبوایە تەنها سیفەتی (تواناییمان) دەخستەپاڵ سیفەتی خودا بەڵام كاتێك ڕێژەی توانا بۆ دوو دژە پێچەوانەكە كە (بوون و نەبوونە) (الأيجاد والعدم) یەكسان بوو، وا پێویستی كرد سیفەتێكی تایبەتی هەبێت كە ئەو دوو دژە لەیەكتر جیابكاتەوە و تایبەتمەندیان بكات ئەویش سیفەتی (ویستە).

لەبەرئەوە وامان بۆ بەدەركەوت كەویست لەكۆمەڵەی سیفاتە تەواوەكانە كەعەقڵ پێویستی دەكات بەسیفاتی خودا دابنرێت و، دروستكردنی لەدوای نەبوون، تەنها بەهۆی تواناوە نابێت بەڵكو پێویست بە (ویست) دەكات بۆ جیاكردنەوەی سەپاندنی بوون

بەسەر نەبووندا، کەواتە بۆچی باوەڕ بەو کەسانە ناهێنن کەدەڵێن: گەردون پەیدا بووی (ویستێکی کۆنە) و پێویستی بوونی لەوکاتەدا بوە کە کەوتەوە و، (نەبوون) بەردەوام بوو، تا.. ئەو ئاکامەی پێی گەیشت. و (بوون) لەوکاتەوە دەستپێکرد کە کەوتەوە. هەبوون پێش پەیدابوونی، مەبەست نەبوو، لەبەرئەوە نەکەوتەوە، کەواتە کۆسپ چی‌یە بۆ باوەڕ نەهێنانتان بەم بیرۆکەیە؟ و دوای ئەم بیرۆکەیە چ راستیەك هەیە؟..

حەیران: بەڕاستی، ئەم وتانە لەوپەڕی ئاشکراییدان، فەیلەسوفە خوداوەندی‌یەکان وتویانە کە گەردون هەمیشە لەگۆڕڕاندایە، هەر ئەوانیش وتویانە گەردون (لێکەوتەیە) و هۆکارو هۆی هەیە و، هەر خۆشیان وتویانە (زنجیرەی بێ‌کۆتایی) مەحاڵە، هەروەها باوەڕیان هێناوە بەبوونی خوداو گشت سیفاتی تەواوی کە عەقڵ بەپێویستی دەزانێت و، دیارترین سیفاتی تەواو (ویستە) واتە، خودا (ویستخوازو هەڵبژێنەرە) (مرید ومختار) یا.. دروستی دەکات، یا.. دروستی ناکات. گەر بڕیاری دروستکردنی‌دا، کاتی بۆ دیاری دەکات، بەچەسپاندنی ئەم (ویستە کۆنە)، هەموو نیمچە گومانێك کەوتراوە لەسەر نوێکردنەوەی هەڵسەنگاندن و مەبەست، دوورخرایەوە.

ئەمە رواڵەتەکانە، بەڵام غەزالی چۆن توانی وەڵامی گومانەکانیان بداتەوە سەبارەت بەبیرۆکەی (ماوەی وەستان) (مدة الترك) کەڕوویداوە پێش پەیدابوونی گەردون؟ مێشکم نەتوانایە لەئەندێشەکردنی (ماوەی وەستان) کە کۆتایی پێبێت، ئەمە وا ئەگەیەنێت کەبوونی خودا یەکەم (کۆتایی بوبێت) لەچەرخدا و، ئەگەر بڵێیت بێکۆتایی‌یە لەچەرخدا، کەواتە چۆن ئەم گەردونەی خستەوە؟.

شێخ: ئالێرەدا بەرزی بیروباوەڕی غەزالی بەدەردەکەوێت کەچەند گوزارشتێکی رازاوە دەهێنێتەوە کەبەهۆیەوە پێش فەیلەسوفە پێشینەو پاشینان بکەوێت. و واتای چەرخ بەدەردەخات کەپێش دروستبوونی گەردون بوونی نەبووە.

حەیران: چەرخ، پێش دروستبوونی گەردون بوونی نەبووە؟!!

شێخ: بەڵێ، بەڵێ چەرخ پێش دروستبوونی گەردون بوونی نەبووە و، ناتوانرێت ئەندێشەی بوونی پێش دروستبوونی گەردون بکرێت، کەواتە چەرخ چییە ئەی حەیران؟ ئایا ئەو شتە تەنها ئەو بیرکردنەوەیە نی‌یە کەئێمە ئەندێشەی دەکەین؟ بەهۆی دوابەدواکانی پەیدابوون لەگەردوندا گەر گەردون و پەیدابووەکان دوا بەدوای یەك نەبن چون ئەندێشەی چەرخ دەکرێت، بەڵام لێبوردراویت لەنەتوانایی مێشکت لەئەندێشەکردنی چەرخ وەك لێکەوتنەوەیەکی سەرەتایی کەلەپێشیەوە هیچ چەرخێك

نەبوو بێت. هەر ئەمە بوو کە غەزالی دەرکی پێکرد و دوای ئەویش (عما نوئیل کانط) دەرکی پێکرد.

حەیران/ غەزالی چی دەڵێت؟

شێخ غەزالی وەڵامی ئەوانە ئەداتەوە کە لەعەقڵیاندا نیمچە گومان پەیدا بوو لە (ماوەی وەستان) بەوەی کە کۆتایی هەیە، یا.. کۆتایی نییە. و چەرخ لێکەوتنەوەیە و دروستکراوە، پێش خۆی هیچ چەرخێك نەبووە. و گەر وتتان : چەرخ بوونی هەبووە ئەوا لەنەتوانایی وێڵی ئەندێشەکانتانەوەیە (الوهم). چونکە وێڵی ئەندێشە نەتوانایە لەتێگەیشتنی بوونی سەرەتایەك بەبێ بڕیاردانی (پێشبوونێك) بۆی، بیرۆکەی (پێشبوون) (قبل)، تائێستا باوەڕی وایە وێڵی ئەندێشە شتێکی بەرجەستەکراوی راستەو لەبووندا هەیە کە (چەرخە)، ئەم نەتواناییە لەوێڵی ئەندێشە وەك نەتوانایی بڕیاردان و وتنی کۆتایی لاشە لەلای بەشێکی سەردا واتە وەك ئەندێشەکردنی رووتەختێك و وازهێنان لەبەشێك کە لەڕوتەختەکە بەرزبوو بێتەوە. (وێڵی ئەندێشە، لای وایە لەپشت ئەم گەردونەوە جێگایەکی تر هەیە، یا.. بۆشاییە، یا.. بوونە، گەر پێی وترا لەسەرو رووتەختی گەردونەوە بەرزایی تر نییە و، هیچ دوورییەك نییە لێی دروورتر بێت، لێرەدا وێڵی ئەندێشە دووچاری کولبوون دەبێتەوە لە باوەڕپێهێنانی).

گەر وێڵی ئەندێشە لای وابێت کەلەسەرو گەردونەوە بۆشایی هەیە، ئەوە هەڵەیە، چونکە بۆشایی دووریەکەی بێ کۆتاییە و، بۆشایی لەخودی خۆیدا دورە لەتێگەیشتنەوە و، دووری پەیوەستە بەجەستەوە، گەر جەستە کۆتایی هات ئەوا دوورییە پەیوەستەکەشی کۆتایی دێت. بەمەش بۆشایی نامێنێت) چەسپا کەلەسەرو گەردونەوە نە بۆشایی هەیە نەبوون. (بەڵام وێڵی ئەندێشە ملکەچی ئەم راستییە نابێت وەك شیاوە کەوێڵی ئەندێشە هەڵە بێت لەبڕیاردانی (دووری جێگایی) هەروەها، هەڵە دەبێت لەبڕیاردانی (دووریی چەرخ). (دووریی جێگا) پەیوەستە بەجەستەوە، (دووریی چەرخ) پەیوەستە بەجوولەوە، چونکە دووری جێگا بریتییە لەکشاندنی تیرەکانی جەستە و، دووری چەرخ بریتییە لەکشاندنی جوولە، وەك چۆن بەڵگە هەیە لەسەر کۆتایی تیرەکانی جەستە کەئەمەش ئەبێتە کۆسپ بۆ باوەڕهێنان بەدووری جێگا لەپشت گەردونەوە، وە هەروەها بوونی بەڵگە لەسەر کۆتایی جوولە بڕیاری دووری چەرخ لەپشت گەردونەوە ڕەتدەکاتەوە).

بەم چەشنە غەزالی هەردوو بیرۆکەی (چەرخ و جێگا) سادەو ساکار دەکات، وەوا باوەڕ دەهێنێت کە هەردوو کیان لێکەوتەی گەردونی دروستکراو جولەکانیەتی وە هەروەها وا دەبینێت کەناگونجێت کێشەی چەرخ بنەمایەك بێت بۆ بەڵگە لەسەر بیرۆکەی کۆنێتی گەردون و لێکەوتنەوەی. ئەی حەیران، بۆت بەدەردەکەوێت، بیرۆکەکانی سەبارەت بەکاریگەری وێڵی ئەندێشە لەسەر ئەندێشەکردنی دووری جێگاو دووری چەرخ زۆر بەرزترە لەبیرۆکە هاوچەرخەکانی خۆی. و توانی بەدووربینی و ژیری خۆی بگاتە ئەو ڕاستیەی کەعەقڵی (عمانوئیل کانط)، پاش ئەو بەشەش سەدە پێی گەیشت کەنزیکە هەردوو کیان لەگوزارشتدا یەك بگرنەوە بێجگە لەواتا و ماناکان... ئایا کانط لەغەزالی وەرگرتووە یا... (ئەم ڕاستیە هەموو عەقڵێکی ساغ و بێگەرد پێی دەگات ئەی حەیران... ؟)

پاشان غەزالی ئاوڕ لەوانە ئەداتەوە کەهەڵگری بیروڕای ئەفلاتۆنیە نوێیەکانن لەپلەکانی دروستکردندا و لێکەوتەدا، گاڵتەی پێیان دێت کاتێك دەڵێت : گوایە یەك تەنها یەك لێکەوتەیەتی: (بەووتەکانتانا وابەدەردەکەوێت چەند شتێك لەگەردووندا نییە پێکهاتەی یەك شت بن بەڵکو هەموو بوونەکان لای ئێوە پێکهاتەی تاکە، کەواتە ئەم پێکهاتانەی لەگەردووندا دەیانبینین چۆن درووست بوون؟ ئایا ئەم هەموو شتە جیاجیایە کەلەگەردووندا هەیە لەتاقە هۆیەکەوەن؟ بەمەش ووتەکانتان پووچەڵ دەبێتەوە کەئەڵێن یەك تەنها یەکی لێدەکەوێتەوە.یا... لەهۆیەکی ئاوێتەوە کەوتوونەتەوە کەلێرەدا هەمان کێشە دروست دەبێ کەلەباسی... هۆی ئاوێتەدا دروست دەبێ.

سەبارەت بەووتەتان کە دەڵێت: لەبنەمای یەکەم عەقڵی یەکەمی لێکەوتۆتەوە، عەقڵی یەکەمیش کەبەژیری خۆی لەهۆکاری دروستبوونی تێ دەگا و دەزانێ، عەقڵی دووەم و سێیەم و فەلەك و نەفسی لێ دەکەوێتەوە هەروەها پێیان دەڵێت: (ئەوانەی کەباستان کردووە، بێ گومان تاریکی لە دوای تاریکیە. وەك کەسێك خەونێك بگێڕێتەوە پێ ی دەگوترێ کەسرووشت لەکاتی ئەو خەونەدا تەواو نیە و، بەپێی بیروڕای ئێوە، هۆکاری شکۆدارترە لەهۆ سەبارەت بەوەی کە (هۆ) تەنها یەك لێکەوتەیەتی بەڵام لەمەی ئێوە (سێ شتی لێکەوتۆتەوە: عەقڵ و نەفس و گەردوون) و یەکەم لەخودی خۆیدا عەقڵی هەبووە و، دووەم لەخودی خۆیدا عەقڵی پەیداکرد... بە هەمان بنەما و هەمان هۆ... دەی ئەگەر کەسێ باوەڕ بەم ووڕێنەی ئێوە بکا کە لەبارەی خودای گەورەوە دەیڵێن، کەلەو پلەو بەستەی خوار دروستکراوانی خۆی وادایدەنێن، ئەوە مەعنای وایە خودای بەبێ

نرختر و داناوە لەهەموو کەسێکی‌تر کەهەم خۆی بناسێ و هەم غەیری خۆشی، ئەوەتا ئەوا سەرتان لەخۆتان شێواندووە، ئەوەندە پێتان لەمەزنی هەڵبڕیوە، ئەوەی پێی بڵێی مەزناهی لەمەزناهیدانەتان هێشتۆتەوە، خواتان نزیك كردۆتەوە لە مردوو، دەی ئەمە سزای ئەو کەسانەیە لەلای خوا کەلەڕێگەی ڕاست دەردەچن.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف ئەڵێت: لێرەدا شێخ مەوزون خامۆشی گرتی و چاوەکانی نووقاند و سەری دانەواند بە چەشنێك چوە ئامێزی خامۆشیەوە، وا بەخەیاڵمدا هات کەدووچاری ئازارێك بوو بێت، بەڵام ڕێزی بێدەنگیەکەم گرت و ئارامم گرت، پاش ماوەیەکی کەم سەری بەرزکردەوە. لێم پرسی:

ئایا..شێخی گەورەم هیچ ئازارێکی هەیە؟

شێخ: نەخێر.. حەیران، هیچ شتێکم نی‌یە و، کۆتایمان بەباسکردنی غەزالی هێناوە و دەچینە سەرباسی (ئیبن ڕوشد)، بەڵام بەچاکی دەزانم لەشەوی داهاتوودا باسی لەسەر بکەین.

حەیران: تکام وایە شێخی گەورەم زنجیرەی باسەکانی ئەم دوو فەیلەسوفە ناکۆکە لەیەك نەپچڕێنێت.

شێخ: چ... ناکۆکیەك؟! ئەمە ناکۆکی باوەڕدارانە.

حەیران: شێخی گەورەم مەبەستی لەناکۆکی باوەڕداران چی‌یە؟

شێخ: ئیبن ڕوشد لەهەموو بیروڕاکانی سەبارەت بەبوون و دروستکەرو دروستکراوەکان، لەگەڵ غەزالیدا ڕێدەکەوێت.

حەیران: چۆن وادەبێت، لەکاتێکدا دەبیستم کەئیبن ڕوشد دوژمنی غەزالي و پێچەوانەی بیروڕا و ڕەخنەگرێتی.بەچەشنێك کەلەڕەخنەکەیدا، کتێبی (تهافت التهافت) داناوە و، هەروەها بیستوومە (ئیبن ڕوشد) یەکێکە لەوانەی کەباوەڕیان بەکۆنێتی گەردوون و ئینکاری روح و عەقڵ و کەسێتی مرۆڤایەتی هەیە. لەبەر ئەم هۆیانە بەلاوازی باوەڕ ناوی دەرکرد و، دووچاری نوشوستیەکی گەورە بۆوە لەم ڕێبازەدا.

شێخ: ئیبن ڕوشد، زانایەکی گەورەی ئاینی و فەیلەسوفێکی خاوەن فکرە، بەراستگۆترین فەیلەسوفی باوەڕداران دەژمێرێت، ئەی حەیران باوەڕی تەواوت بەمە هەبێت و بەهیچ جۆرێك باوەڕ بەو تاوانانە نەهێنێت کەزانایانی (لاهوت)[1] و زانایانی

---

[1] لاهوت یان (الالهیات) زاراوەیەکە ئەهلی کەلام و فەیلەسوف و ڕۆژهەڵاتیەکان لە جیاتی زانستی (عەقیدە و یەکتاپەرستی) بەکاریان هێناوەلە زانکۆکانی ڕۆژئاوا چەند بەشێکی هەیە و ناسراوە بە

(زانستی کەلام) خستویانەتە پاڵی، یاخود بە ووتە دژوارانەی کەلەناو خەڵکدا بەگشتی بڵاوە، چونکە هەموویان بەگشتی هەڵەن لەتێگەیشتنی ئەم فەیلەسوفە دانا و باوەڕدارەدا.

ئەوەی کەوای لەخەڵك کرد، دوو چاری گومان بێتەوە لێی، بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، کەهەندێکیان (ڕووکەشین) (عرضـــــــــي) و هەندێکی تریان (ناوەرۆکین)(جوهـــري) سەبارەت بە (ڕووکەشی)، ئیبن ڕوشد هۆگری فەلسەفەی ئەرستۆیە و، سێ لێکۆڵینەوەی لەسەر نوسیوە؟ یەکەم لێکۆڵینەوە/ کەبە (شرح مختصر) ناودەبرێت کەتەنها ووتەکانی ئیبن ڕوشدی تیادایە. دووەم لێکۆڵینەوە/ (شرح متوسط) کە ئیبن ڕوشد لەسەرەتای بەشەکانی کتێبەکەدا، چەند بڕگەیەك لە ووتەکانی ئەرستۆ وەردەگرێت و شیان دەکاتەوە. سێهەم لێکۆڵینەوە/ (شرح مطول) کەدووبارە ووتەکانی ئەرستۆ وەردەگرێت و بڕگە بە بڕگە لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەیەکی تێرو چڕی لەسەر دەکات. و لێت ناشارێتەوە ڕێگای هەردوو لێکۆڵینەوە کورتە، وا لەخوێنەر دەکات کەباوەڕ :بهێنێت کەئەم نووسینانە تایبەتە بەئیبن ڕوشد خۆی بەڵام لەڕاستیدا ئیبن ڕوشد لەهەموویاندا ووتەکانی ئەرستۆ شیکار و تۆژینەوەی لەسەر دەکات.

هەروەها هەڵەی وەرگێران، چونکە ئیبن ڕوشد فەلسەفەکانی ئەرستۆ لەکتێبە یۆنانییەکانەوە وەرنەگرتووە بەڵکو لەعەرەبییەکی تێکەڵکراو بەنوسراوەکانی ئەسکەندەری ئەفرۆدیسی و نامسطیوس ئەسکەندەری وەرگرتووە، کاتێك فەرەنسیەکان فەلسەفەی ئیبن ڕوشدیان وەرگرت، لەعەرەبیەکەیەوە وەریان نەگرت بەڵکو لە وەرگێراوەکانی لاتینی و عیبریەکانیەوە وەریان گرتووە و، سەرەڕای ئەو هەموو هەڵانەی کەدووچاری دەبێتەوە لەناکامی وەرگێران و بەعەرەبی کردن و وێنەگرتنەوە لەسەری نووسینەوەی بۆ چەندەها زمانی تر. و هەروەها تێکەڵکردنی بیرو ڕاکانی ئیبن ڕوشد تایبەتمەند بەبیروڕاکانی ئەرستۆ ئەفلاتۆنە نوێیەکان ، وای لەفەیلەسوفی لاهوتی تۆماس ئەکویناس کرد کە ئیبن ڕوشد بەکافرو بێ باوەڕ بەخودا ناوببات، هێرشێکی ناڕەوای بەربڵاوی بکاتە سەر لەنێوەندی خەڵکدا لەئەوروپا دەنگ بداتەوە تەنانەت یەکێك لەوێنە کێشەکانی ئەوروپا وێنەیەکی گەورە بکێشێت، تیایدا ئەکویناس لەسەر کورسیەکی بەرز دابنێت و ئیبن ڕوشدیش لەبەردەمیدا کەوتبێت، ئاماژەیە بۆ سەرکەوتنی ئەکویناس بەسەر

بەشەکانی (الدراسات اللاهوتیه). سەرچاوە عقیدة أهل السنة و الجماعة. لە دانانی محمد بن إبراهیم الحمد. -لێکۆڵەر-

ئیبن ڕوشددا و، لەهەمووی سەرسوڕهێنتر ئەوەیە لەم وێنەیەدا وێنەی ئەرستۆ و ئەفلاتۆن نزیك بەئەكویناس كێشراون و بەدەستی هەریەكەیانەوە كتێبێك هەیە كە تیشكێكی لێدەكەوێتەوە و ئاراستەی سەری ئەكویناس كراوە، بەواتای كاریگەری فەلسەفەكانیان لەسەر فەلسەفەكانی ئەكویناس و چ ڕوناكیەكی لێ بەدەست هێناوە، بەلام ئیبن ڕوشد كەتەنها فەلسەفەكانی ئەرستۆی شیكار كردوە، كەبەهۆی كتێبە تایبەتمەندەكانیەوە بۆمان بەدەردەكەوێت كەچەند باوەڕدار بووە بەبوونی خودا و دوارۆژ. وێنەكێش ئەم فەیلەسوفەی وەك ڕوخێنراوێكی بێزار وێنەكێشاوە. لەحالەتێكدا گەر ئەكویناس سەركەوتنی بەدەستهێنا بێت لەچەسپاندنی باوەڕ بەبوونی خودا و تەنهایی و لێكۆڵینەوەی گەردون لێی ئەم سەركەوتنە بەسەر ئەفلاتۆن و ئەرستۆدادەبێت كەوێنەكێش ئاماژەی ئەوە دەكات كە ئەكویناس ڕوناكی لەم دوانەوە وەرگرتووە. بەلاّم ڕاستیەكەی لەوەدایە كەبەهۆی بەلگەكانی ئیبن ڕوشد و غەزالیەوە كەهاوبیرن ، سەركەوتنی بەدەستهێناوە.

یەكێك لەهۆكانی نوشوستی ئیبن ڕوشد زۆر هۆگر بوونێتی بەئەرستۆ تا.. ئەو پەڕی بە پاكگرتنی و، لەمەوە سوربوو لەبەرگری كردن لەبیرو ڕاكانی و لێكدانەوەی بیرۆكەكانی. كاتێك غەزالی نوسراوی (تهافت الفلاسفة)ی دانا. كەتیایدا وەلاّمی ئەرستۆو كەسانی تری دایەوە، لەكێشەكانی كۆنێتی گەردوون و دروستكردنی. ئیبن ڕوشد مەبەستی ولاّمدانەوەی غەزالی بوو بەنووسراوێك ناوی نا (تهافت التهافت)، لەناو خەلكدا بلاّوبووەوە (حجة الأسلام) كەغەزالیە بەرگری لەئاین دەكات و ئیبن ڕوشدیش بەدرۆی دەخاتەوە، بەلاّم لەڕاستیدا ئەم پیاوە نەغەزلی بەدرۆخستۆتەوەو نەپێشەوایانی ڕێبازی ئەشعەری، لەبنەماسەرەكیەكاندا بەلاّم خودا بیبەخشێت زۆر دلسۆز نەبوو لەدانانی ئەم كتێبەو ناولێنانەكەی و بێبەریش نەبوو لەخۆ بەدەرخستن و پێشەوایی و گەورەیی لەبواری فەلسەفەدا، موناقەشە و موجادەلەی ئیمامی دەكرد لەهەموو وەلاّمێكدا بۆ فەیلەسوفەكان، موجادەلەیەكی ئەوتۆ كەمەبەستی نەبوو ئەو ڕاستیانەی پووچەلْ بكاتەوە كەئیمام بەرگری لێدەكرد، بەلكو خوازیار بوو ئەو هەلاّنە بەدەربخات كەلە ڕێبازی بەلگەكاندا كردبووی و بەدەرخستنی هەولندانی بۆ تێگەیشتنی مەبەستی ڕاستی فەیلەسوفەكان، چونكە خوالێخۆشبوو، پێویستی نەبوو بەدەرخستنی ئەم هەموو زانست و زانینە لەگەلْ كابرایەك كە بەرگری لەئاین بكات و، تەنها لێكدانەوەی كێشەگەورەكان لەبوونی خودا و دروستكردنی گەردوندا بەس بوو بەشێوازی زانایەكی دلسۆزی زمان پاك بەدەربخات كەفەیلەسوفەكان ئینكاری بیرۆكەكانی غەزالیان

نەکـردوە و، چ کاتـێك وچ ووتەیەکـیان بوویسـتایە بـۆی لـێکدەدانەوە لەووتـەی پـێچ و پـەنا... بـەبێ ئـەوەی کتێـبەکەی غـەزالی، کەسـتەم و کـەم بیـنی تـیابەدی دەکرێـت، کەناگونجێت لەگـەڵ ڕاستیەکان و دانـایی و دڵسـۆزی و ڕێـز بەرامبەر بـەخودا. غـەزالی بەناونانی کتێبەکەی (تهافـــت الفلاسفة)باوەڕی وای هێـنا کەئەتوانێ وتـەی کۆمەڵێك پوچـەڵ بکاتـەوە کـە نـزیك بـوو ئـینکاری بوونی خودا بکەن بەوەی کەبڵاویان دەکردەوە لەکۆنێتی گەردون و بوونی خودا و ویستەکانی، جا... ئەگەر غەزالی ڕاست بێت یاخود هەڵەبێـت وەك ئـیبن ڕوشـد گومـانی لێدەکات، هەرچۆنێك بێت مرۆڤێکی دڵسۆز بووە و بەرگری لەبوونی خودا کردوە و داوای باوەڕپێهێنانی دەکات و هەروەها دەرگای نیمچە گومانەکان لەخـەڵك دادەخات، چ پێویست دەکات ئەم کارەی بەووڕێنە ناوببرێت بەبێ بیرکـردنەوە لـەئاکامی ناونـانی ئـەم کتێبە کەچی لێدەکەوێتەوە لەنزم کـردنەوەی نـرخی کتێبەکەی غـەزالی. بەدوورخستنەوەی خـەڵك لـێی و دروستبوونی گومان لایان بەهۆی شاردنەوەی ڕاستی و چاکیەکانی.

بـەڵێ حەیران، ئالێرەوە نوشستیەکەی ئەبا وەلید هات و، ڕێگا خۆشبوو بۆ دوژمنان و ناحـەزانی تادووچاری نەگبەتی و ئازاری بکەنەوە و، لەناوخەڵکدا ووتەی دژوار و بەدی بـەبێ لێکۆڵینەوە ئاراستە بکەن، بەڵام لێکۆڵەرەوە دڵسۆزەکان کە داب و نەریتی زانست بـەرزی کـردونەتەوە کەڕاستی بشارنەوە، دەیانزانی کە ئیبن ڕوشد ڕاستگۆترین باوەڕدارە و خـاوەنی بەرزتـرین بیرۆکەیـە و شـارەزاترین کەسـە لەهێـنانەوەی بەڵگـە خـوازی لەسەر بوونـی خـودا، بـەڵام بەداخـەوە ئـەی حەیـران ئـەم پـیاوە (زانستەکەی گـەورەتـر بـووە لەعەقڵی).

حەیران: هۆی ئەوتاوانانە چی‌یە کەشێخی گەورەم ئەڵێت، ناوەرۆکی‌یە؟

شـێخ: هـۆی ناوەرۆکـیەکان، مەبەسـتم لەپەیوەسـتەکانی نـاخی فەلسـەفەکانی ئـەم پیاوەیە، لەڕاستیدا ئـیبن ڕوشـد بەڵگـە تیۆرە ئاوێتەییەکان (وەك بەڵگەی لێکەوتنەوە و بەڵگەی پێویستی ) (کدلیل الحدوث ودلیل الوجوب) لـەخۆی و خـەڵك ئاڵۆز دەکات. ئەو بەڵگانـەی کەفەیلەسـوفەکان ووتوویانـە و هەڵگرانی ڕێبازی کەلام پەنایان بۆ بردووە زیاتـرە لەپـەنایان بـۆ بەڵگە خوازیی‌یەکانی بوونی خودا. ئیبن ڕوشد (بەڵگەی یاسا) (دلیل الـــنظام) بەچاکتر دەزانێ لـەدو بەڵگـەی تر کەبـە (بەڵگـەی چاودێری و داهێنان) (دلیل العـــنایة والاختراع) ناویان دەبات. لەوانەیە ڕاست بوو بێت لەم بە چاکتر دانانەی، بەڵام

بەمەشەوە نەوەستا، بەڵكو تانەی ئەدا لەڕێبازی فەیلەسوفە بەڵگە خوازییە سەرەتایەكان ، باوەڕی وابوو كەهەردوو بەڵگەكانیان هەڵەیە. و سەبارەت بەمانای لێكەوتنەوە و كۆنێتی و مانای (ویست) دەدوێت و درێژە بەموجادەلەكانی ئەدا. و لەهەندێ وەڵامەكانی بۆ هەڵگرانی ڕێبازی كەلام پەنادەباتە لاوازی ڕووەكانی بەڵگە خوازییەكانیان، دەركی لاوازی ووتەكانی خۆیی دەكرد، هەروەك بازرگانێك چۆن نرخی كەل و پەلی بازرگانێكی تر دادەشكێنێت، بۆ بەرزكردنەوەی بەهای كەل و پەلەكانی خۆی و، ئەمە پیشەی ئەو بازرگانانە نیيە كەڕەزامەندی خودایان مەبەستە و لەپێناویدا تێدەكۆشن و هەوڵیسەركەوتنی ڕاستیەكان دەدەن بەهەموو شێوازێك كەبۆی بچێت. تەنها ئەیتوانی ئاماژەی ئەو ئالۆزییيە بكات كەمێشك لەتێگەیشتنی دوو ڕێبازە بەڵگە خوازییە كەدووچاری ئەبێتەوە و بەس. و ئامۆژگاری خەڵكانی نەزان بكات بۆ دوور كەوتنەوە لێی، پەیرەوی ڕێبازی بەڵگە خوازی ساكارە شكۆدارەكان بكات، بۆ گفتوگۆكردن لەگەڵ گشت خەڵكدا، بەبێ هەوڵدانی پوچەڵكردنەوەی ئەو بەڵگە عەقڵییە تەواوانەی كەلەلایەن ژیرەكانەوە بڕیاری ڕاستی لەسەری دراوە.

حەیران: ئایا... ئیبن ڕوشد لەو فەیلەسوفانەیە كەباوەڕی بەكۆنێتی گەردون هەبێ و لەهەمان كاتدا ئینكاری سیفاتی ویستی خودایی پەروەردگار بكەن؟

شێخ: نەخێر... باوەڕی بەكۆنێتی گەردوون نەبووە و، هەرگیز ئینكاری سیفاتی ویستی خودای گەورەی نەكردووە بەڵام ئەم پیاوە فەلسەفە چێتی دەكرد بۆ ڕونكردنەوەی مانای كۆنێتی و ویست، لەپێناوی هیچ شتێكدا نەبوو تەنها دەیوویست دەریبخات كەئەرستۆو فەیلەسوفەكانی تر... ئینكاری بوونی خودا و سیفاتی ویستیان نەكردووە، ئایا ئەگونجێت ئەی حەیران ئیبن ڕوشد باوەڕی بەكۆنێتی مادە بوو بێت بەواتای ئەوەی لەلایەن خوداوە دروست نەكراوە بەڵكو لەخودی خۆیدا پێكهاتووە و، پێویستی بەهیچ دروستكەرێك نەبووە، تەنانەت ئەرستۆش ئەم باوەڕەی نەبوو، بەڵكو باوەڕی بەكۆنێتی هەیەبەوەی كەخودا لەئەزەلەوە و تائێستاش دروستكەرێتی.

لەوتەیەكیدا لەكتێبی (فصل المقال) ئەم ڕاستیانەت بۆ دەردەخات ئیبن ڕوشد كە دەڵێت : (سەبارەت بە كێشەی كۆنێتی گەردون و لێكەوتنەوە، جیاوازی تیایاندا لەنێوان خاوەن فكرەكانی ڕێبازی ئەشعەری و دانا پێشكەوتوخوازەكان (الحكماء المتقدمين) لەباوەڕی مندا ئەو جیاوازییە تەنها دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ناو لێنانەكانیان، بەتایبەتی لەلای هەندێ لەفەیلەسوفە كۆنەكان بەوەی كە ڕێكەوتوون كەوا سێ جۆر بوونە هەیە،

دوولایـەن و نـێوەندێك لەنێوانیاندا، لەناولێنانی دوولایەنەکـەدا ڕێکـەو تـوون، بـەڵام لەناولێـنانی نـێوەندەکەدا جـیاوازن، لایــەنی یەکــەم کەلەبوووندایــەو لەشـتێکی تـر کەوتۆتـەوە، واتـە (لـەهۆکاری کـرداری مـاددەو چـەرخێك کەبوونـیان پـێش بوونـی کەوتبێـت) ئەمـە سیفاتی هـەموو جەستەیەکە کەبەهۆی هەستەوە دەرکی دروستبوونی دەکرێـت، وەك بوونـەکانی، ئـاو، هـەوا، زەوی، ئـاژەڵ، ڕووەك... هتد، ئەم پۆلە بوونە، کۆمەڵـێك لەفەیلەسـوفەکانی کـۆن و ئەشـعەری‌یەکان ڕێکـەوتن کەبـە (پەیداکـرا) و (مُحدثْ) ناوبەرن، بەلام لایەنی بەرامبەرەکەی تر، لەخودی خۆیدا بوونە و لە هیچ شتێکی تـر نەکەوتۆتـەوە و، هـیچ چـەرخێکیش پێشـی نەکـەوتووە بەکۆن (قدیم) لەلایەن هەردوو کۆمەڵەکەوە ناودەبرێـت. ئـەم بوونە سەلمێنراوە بەبەڵگە کە خودای بەخشندەیە هەرخۆی دروستکەرو هێنا نـەبوون و پارێزگاری هـەموو شـتێکە. بەڵام بەجۆرێ نێوەندی هەردوو لایەنەکـە، بوونـە و لەهـیچ شـتێك نەکەوتۆتـەوە و چەرخیشـی پـێش نەکـەوتۆتووە، واتـە لەکـردارێکەوە کەوتۆتـەوە کەئەمـەش بـنەمای گـەردون بەگشـتی دەگرێـتەوە. بـەڵام ئـەم بوونـەی تـر کەلـەخودی خۆیـدا ئاشـکرایە بەوێنەی ئەم بوونە درووستکراوە ڕاستەقینانەی کەبەچـاودەبینرێت، کەهـەمووی بەگشـتی (جـیهانی بیـنراو) دەگرێـتەوە و، مەبەسـت لـە بوونـی کـۆن خودایـە دووشـێوەیە ناونـراوە ئەو فەیلەسوفانەی بەبیری ئەوان و لوڕوانگەی ئەوانـەوە لەبوونی یەکەم زیاتر دەچێ، لەبەر ئەوە پێ‌ی دەڵێن :( قدیم، کۆن) ئەوزانایانەی بـەبیروباوەڕی ئـەوان لەلایـەن دووەمەوە جێ‌بەجێ دەبێت و لە (پەیداکەر) دەچێـت ناویان ناوە پەیداکەر (مُحدثْ).

لــەم ووتانەیــەوە بـۆت بەدەردەکەوێــت ئــەی حەیــران، کەچــۆن دان دەنێــت بەلێکەوتنەوەی گـەردوون بـەوەی کەدروستکراوی خودایـە بەماددەبنە ڕەتیەکەی و وێنە هەبووەکـەی. هـەروەها ئیبن ڕوشد هەوڵی نزیك کردنەوەی بیرۆکەکانی ڕێبازی کەلام و بیرۆکـەکانی ئەرسـتۆ ئـەدات. لــەم ووتانەیـەوە بـۆم بەدەردەکەوێـت کەبیرۆکـەکانی دووچـاری هەڵدێـری بـۆ تـەوە وەك ئیبن طــــوفـەیــــل و هـەندێ لەفەیلەسوفەکانی تـر، لەئەندێشەکردنی واتـای دروسـتکردن لەنەبوونەوە و، واتای چەرخ لەبەر ئەمە پەنا دەباتە بـەر قورئـان و، لـێوەی تـێدەگات کەخودای زانا و دانا ئەزانێت کەعەقڵ کولبوون و کەم توانایی لەخۆ گرتووە لەئەندێشەکردنی ئەم بابەتانەدا و، خودا بۆ ئاسانی باوەڕهێنان لەلای مـرۆڤ بەگوێـرەی توانـای عەقڵـیان گفـتوگۆیان لەگــەڵدا دەکـات. و ئەباوەڵــید دەریدەخـات کەدروسـتکردنی ئەم گەردونـە بینراوە لەماددەیەکی تری پێش خۆی‌لەلایەن

خوداوە كەوتۆتەوە، خوالێخۆشبوو لەكتێبی (فصـــل المقـــال)دا دەڵێت: فەرموودەی خودای پەروەردگار لەقورئاندا ﴿وَهُـــوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ: هەر خودا خۆی ئاسمان و زەوی لەشەش ڕۆژدا دروست كرد و عەرشەكەی لەسەر ئاو بوو﴾ لەڕواڵەتی ئەم ئایەتەدا بۆمان دەردەكەوێت كەبوونی تر پێش ئەم بوونە بینراوە هەبووە، كە ئەویش، عەرش و ئاوو چەرخە و، فەرموودەی خودای پەروەردگار ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ: لەئاسماندا وەستایەوە كەدوكەڵ بوو﴾ لەڕواڵەتی ئەم ئایەتەدا واتێدەگەین لەئاسمان لەشتێكەوە كەوتۆتەوە.

خوالێخۆشبوو هەروەك بترسێت لەوەی كەنەتوانایی عەقڵ بۆ ئەندێشەكردنی ئەم بابەتە ئاڵۆزانە ببێتە تاوانێك و بخرێتە پاڵ خۆی و فەیلەسوفەكانی تر لەبەر ئەوە بیانوو بۆ خۆی و ئەوانی تر دەهێنێتەوە كاتێك كەدەڵێت : (لەوەدەچێت جیاوازی بیروڕاكان سەبارەت بەم بابەتە ئاڵۆزانە لەلایەن فەیلەسوفەكان، یان ڕاست و پاداشت دراون، یان هەڵەو لێبوردراون، بەڵام باوەڕ هێنان بەشت بەهۆی بەڵگە هەبوون لە خودەوە، شتێكی دووچاری یە نەك هەڵبژێردراوی، مەبەستم ئەوەیە بۆمان نی یە، باوەڕ پێكردن و نەباوەڕپێكردن وەك چۆن بۆمان هەیە بوەستین و نەوەستین گەر هاتوو مەرجی ناچاركردن. هەڵبژاردن بێت لەلایەن گومانێكی پەیدا بۆوە بوو بێت، ئەوا ئەو باوەڕ پێكردنە هەڵەیە گەر لەلایەن زانایانەوە بێت ئەوا لێبوردراون).

ئەی حەیران ئەم بیانووەی ئیبن ڕوشد وتەكانی (شێخ محمد عەبدەی میسر)م بیردەخاتەوە كەلە پەراوێزی كتێبی (شرح العقائد العضدیة)دا، ئاماژەی بۆ كردوە پاش ئەوەی بەڵگە بۆ لێكۆڵینەوەی گەردون و چەرخ دەهێنێتەوە دەست دەكات بە بیانوو هێنانەوە بۆ نەتوانایی عەقڵیان لە ئەندێشە كردنی مانای لێكەوتنەوە و چەرخدا كاتێك كە ئەڵێت: ( باش بزانە، پاش ئەوەی بەڵگەم هێنایەوە لەسەر لێكەوتەی گەردون و لێكۆڵینەوەم لەدوای ڕاستیەكان بەگوێرەی بیروڕاو بۆ چونەكانم لەنگەر گرتنی بینایم لەسەری و، ناڵێم ئەوانەی باوەڕیان بەكۆنێتی گەردون هەیە، بەم ڕێبازەیان لەباوەڕ بەبوونی خودا دەرچوون و ئینكاری پێویستی ئاینیان نەكردووە. بەڵام دەڵێم، لەم تیۆرەدا هەڵەن، چونكە بەپوختی بیروڕاكانیان دەرنەبڕیوە، ڕوون و ئاشكرایە هەركەسێك ڕێبازی لێكۆڵینەوە بگرێتە بەر بەبێ لاسایكردنەوەی بیروباوەڕەكان و، پارێزراو نەبێت نەهەڵە وەك پێغەمبەران. ئەوا بەئاسانی دووچاری هەڵە دەبێتەوە و، لەلایەن خوداوە ئەم

هەڵانەی لێگیراوە، چونکە مەبەست و ئامانجی لەم ڕێبازەدا تەنها گەڕانەوە بەدوای ڕاستی و تەواوی ڕاستیەکان).

ئەمە هەندێك لەووتەکانی شێخ عەبدەیە، وادەردەکەوێت تەنها بیانوویەك بێت، بەتایبەتی بۆ ئیبن ڕوشد، کە دووچاری هەژاندن دەبێتەوە بەهۆی ئەندێشەکانی مانای کۆنێتی و چەرخ و شوێن و چەندەهاشتی تر کەغەزالی و ئیبن طوفەیل و فەیلەسوفەکانی دوای ئەوان باسیان تیادا کردوە.

ئەی حەیران لەوتەکانی ئیبن ڕوشدا، بیستووتە بڵێت کەوا ماددە بنەڕەتیەکان گەردوونی لێکەوتۆتەوە دروستکراوی خودا نیيە!! و ئایا هیچ شتێکت بەرجەستە کردوە لەووتەکانی کەلاوازی بێ باوەڕی خۆی دەربخات.

حەیران: نەخێر گەورەم بەپێچەوانەوە شتی وای تیادایە کە پتەوی باوەڕی بەدەردەخات و ئارەزوو مەندە بۆ ئاسانکردنی باوەڕو بەدەرخستنی بۆ گشت خەڵك و، دوورخستنەوەیان لەو ئاڵۆزیانەی کەعەقڵ تووشی دەبێت.

شێخ: ئەو ئینکارییەی کەلەسیفەتی وویستدا دەخرێتە پاڵ ئیبن ڕوشد هەڵەیە و ڕاست نی‌یە، بەڵام کاتێك موناقەشەگیری مانای وویست لەگەڵ غەزالی و زانایانی ڕێبازی کەلامدا دەکات، هەروەك پیشەی ئاسایی خۆی کەدەیوویست فەلسەفەچێتی و یان فەقێ‌گیرێتی بکات، بەوەی مانای وویست بەدوو شێوە لێکدراوەتەوە، (ویستی کردار) (ارادة بالفعل) و (ویستی توانا) (ارادة بالقوة). پاشان پووچەڵی و ئینکاری ئەوەی کرد کە فەیلەسوفە کۆنەکان ووتبێتیان، گەردوون لێکەوتەی خودایە بەهۆی خودێك تیایدا نەك بەهۆی وویستی خوداوە لەئاکامدا گەیشتە چەسپاندنی وویستی خودا و بەڵگە لەسەری، هەروەك بەڵگەکانی غەزالی. ئیبن ڕوشد لە وەڵامدانەوەی فەیلەسوفەکاندا دەڵێت:(ووتەکانی، بەرامبەر فەیلەسوفەکان کەگوایە لایان وایە لێکەوتنەوەی خودای پەروەردگار لەڕێگای سروشتیەوە لەبوونەکەدا هەیە، ووتەیەکی پووچەڵە بەرامبەر فەیلەسوفەکان، لەڕاستیدا بیروڕاکانیان بەلێکەوتەی بوونەکان لەلایەنێکەوەیە کەزۆر بەرزترە لەسروشت و ویستە مرۆڤایەتیەکان. چونکە ئەم دوولایەنە دووچاری کەموکوڕی دەبنەوە، گەربەڵگە لەسەریان بهێنرێتەوە، بەوەی کەنابێت لێکەوتەی کردار لەلایەن خوداوە لێکەوتەیەکی سرووشتی بێت و لێکەوتەیەکی ویستی نەبێت (ئەو ویستەی کەلەناوخەڵکدا بڵاو بۆوە و تێگەیە نراوە)، لێکەوتەی لایەنێکە کەزۆر شکۆدار ترە لەم ویستە و، هیچ کەسێك ئەم لایەنە پێ نازانێت تەنها خودا نەبێت، (بەڵگەمان

بەوەی كەخاوەن ویستە و، زانای دووشتی دژ بەیەكە گەر تەنها بكەرو زانای لایەنێك بوایە، دووشتی پێچەوانەی پێكەوە دەكرد، كەئەمەش هەرگیز نابێت واپێویستی كرد، شتێك لەو دو دژ بەیەكە دروست بكات بەهەڵبژاردن).

لەمەوە، ئەی حەیران، دەزانیت، كەئەم پیاوە بەمەبەستی بەدەرخستنی زیرەكی خۆیەتی، بەرگری لەفەیلەسوفەكان دەكات بەڵام لەئاكامیشدا دەگاتە ئەو بیرۆكەیەی غەزالی هاوڕێی، یا... ناكۆكی، لەچەسپاندنی مانای وویست و هێنانەوەی بەڵگە لەسەر دەرك كردنی پێویستی عەقڵ بۆ بوونی جودا كردبو و هەمان پیشەی هەبوو لەموناقەشە گیری غەزالی سەبارەت بەپەیوەندی هۆكار بە هۆكانیەوە.

حەیران: ئایا... غەزالی ئینكاری هۆ و هۆكاری كردوە... تا..ئیبن ڕوشد موجادەلەی لەگەڵدا بكات؟

شێخ: نەخێر... غەزالی هەرگیز ئەم ئینكاریەی نەكردوە و ڕەوانییە ئینكاری پەیوەندی هۆ بەهۆی كارەكەیەوە بكات یا... ئینكاری ئەو تایبەندمەندیە بكات كەخودا بە شتێكی بەخشیوە، بەڵكو غەزالی خوازیار بوو بیرو باوەڕەكانی مرۆڤ تەنها ئاراستەی دروستكەری بوون و تایبەندمەندیەكان و یاساكانی سروشت بكات. تا بیرۆكەی بێباوەڕی ماددییەكان بەدوربخات. كەدەڵێت: دروست بوونی جۆراو جۆرەكانی بوون بەڕێكەوت بەهۆی شیكارە توخمەكانی ماددە لەخودی خۆیدا، بووە بەهۆی توانایەكی سروشتی تیایاندا، (ئینكاری ئەو بۆ چوونە عەقلێەی كرد، كەدەڵێت: پێویستە ئەم بوونانە لەخودی خۆیاندا ئەم تایبەتمەندیانەیان تیادا بێت. دەگاتە ئەو باوەڕەی كەدەڵێت: ئەم شتانە پێویستی بەیەكێكە.. تا... بوون و تایبەمەندی و سیفاتی بداتێ، هەر لەبەر ئەمە وتی: ئەو بەراووردییەی كەلەنێوان هۆ و هۆكاردا دەیبینێت ناتوانین دانی پیادا بنێین بەوەی كەهۆیەكی ڕواڵەتییە لەبەر ئەوەی لەپشت زانیاریی یەكانمانەوە نهێنییەكی زۆری نادیار هەیە، كەدەگونجێت هۆیەكی ڕاستەقینە بێت بۆ بەدەركەوتنی ئەم ڕواڵەتانە. غەزالی بۆ ڕاستی ووتەكانی چەند نموونەیەك دەهێنێتەوە وەك بەردی ئازاد (حجر الطلق) هیچ شتێكی لەخۆ نەگرتبێت بیهاوێژێتە ئاگرێكەوە، ئاگرەكە دەكوژێنێتەوە. هەروەها كوێرێك تارماییەكەی سەرچاوەی لابچێت چاوی دەبینێت، واباوەڕ دەكات، لابردنی تارمایەكە تەنها هۆیەكە بۆ بینینی چاوەكانی و، كاتێك خۆر ئاوا دەبێت و تاریك دادێت. دەرك دەكات كەلەپشت ئەم چاوە بینەرەوە هۆیەكی تر هەیە كەئەویش ڕووناكییە، كەڕێدەدات بەبینین و بەنەمانی چاو نابینایی دەبێت.

بەڵام ئیبن ڕوشد هەرگیز دەرنەچووە لە لۆژیکی ساغ و باوەڕی تەواو، کاتێك کە ئەڵێت: ئایا... کردارە لێکەوتەکان لەبوونێکی (پێویستی، کردارێکە) یا... (پێویستی زۆربوونە) یاخود هەردوو پێویستیەکەی تیایە، ئەم بۆ چوونانە داوای پشکنین و لێکۆڵینەوە دەکەن. لەنێوان بوونەکان (کارو کارلێکراو) وەك یەکە یا... بەهۆی زیادەیەك کەخراوەتە سەری لەو زیادە بێ کۆتاییانە، لەوانەیە زیاد کردنەکە پەیوەست بێت بەزیادکرنێکی ترەوە، بەڵام گەر ئاگرێك نزیك جەستەیەکی هەستدار بکرێت، ئاگرەکە کاری خۆی دەکات، دووریش نی‌یە بوونێك هەبێت زیادە بێت لەسەر جەستەی هەستدارەکە کەڕێگربێت بۆ زیاد کراوە کاریگەرەکەی ئاگرەکە وەك نموونەی بەردە ئازادە هیچ لەخۆ نەگرتەکە، بەلام ئەمە پێویستی‌یەك نی‌یە بۆ لابردنی سیفەتی سوتاندن لەئاگر،... تا ناوی ئاگری لەناودا مابێت. پاشان دەڵێت و، چەند دانایە لەم ووتەیەییدا: (عەقڵ تەنها بەهۆی هۆکانیەوە دەرکی بوونەکان دەکات و، بەهۆی ئەم سیفەتەیەوە لەهەموو ئەو هێزانەی تر کەدەرکیان پێدەکرێت جیاکراوەتەوە، هەرکەسێك ئینکاری هۆکان بکات بەمە ئینکاری عەقڵ دەکات، زانستەکانی لۆژیك ڕێسمانێك دادەنێت کەدەڵێت:هەموو بوونێك هۆ و هۆکاری هەیە و، زانیاریمان سەبارەت بەهۆکارەکان ناتەوا و دەبێت بەبێ زانیاری هۆکان، کەواتە وازهێنان لەهۆکان دەبێتە پووچەڵکردنەوە و نەهێشتنی زانستی، لەم ووتەیەوە واپێویست دەکات کەهیچ شتێك زانراوی بنەڕەتی ڕاستەقینەی نی‌یە و، ئەگەر هەشبێت تەنها (بۆچونە) نە پێناسە دەکرێت و نەبەڵگەی هەیە، (هەرکەسێك، باوەڕی وابێت کەهیچ زانستی‌یەکی پێویست نی‌یە، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەوتەکەی پەسەند نەبێت و، هەرکەسێك بیسەلمێنێت کەلێرەدا چەندشتێك هەیە ئەم سیفەتانەی لەخۆ گرتووە و، چەند شتێکی تر کەپێویستی نی‌یە و، خودی خۆی بڕیارە بۆ چوونی لەسەر بدات و، یان لای وابێت کە پێویستە و لە هەمان کاتدا پێویستیش نی‌یە، فەیلەسوفەکان ئینکاری ئەمە ناکەن....).

لەکۆتاییدا دەڵێت کە چەند بەپێزە ووتەکەی و چەند ڕاستگۆیە ئەو ڕێکەوتنە ئاکامی‌یەی نێوان ئیبن ڕوشد و مەبەستەکانی غەزالی لەبەردەوامی ئاراستەکردنی خودیان بەرەو دروستکردنی خودیان بەرەو دروستکەری بوونەکان کەسروشتی و تایبەتمەندێکانی بەبوون بەخشیوە-(پێویست ناکات گومان هەبێت لەسەر بوونەکان بەوەی هەندێکیان کاردەکەنە سەر هەندێکی تریان و، ئەم بوونانە بەتەنها ئەم کردارانە ناکەن، بەڵکو بەهۆی

بكەرێكی دەرەكی‌یەوە مەرجە بۆ كردارەكەیان، بەڵكو بۆ بوونی نیشانەیەك تەنها هەر بۆ كردارەكەیان.

حەیران: بەڕاستی ئیبن ڕشد لەئاكامی بیرۆكەكانیدا هیچ جیاوازییەكی نی‌یە لەگەڵ غەزالی‌دا و، باوەڕیشی لەباوەڕی ئەو كەمتر نی‌یە، باسی ئەو ڕێبازەم بۆ بكە كەهەڵیبژاردوە لەبەڵگە هێنانەوە دا بۆ بوونی خودا؟

شێخ: ئیبن ڕوشد هەروەكو بۆم باسكردی باوەڕی وایە، كەڕێبازی بەڵگە خوازیی‌یەكان بەهۆی بەڵگەلێكەوتەو بەڵگەی پێویست (دلیل الوجوب) ڕێبازێكی پڕ باوەڕ و شەرعی نی‌یە، چونكە پێكهاتەیە و پێشەكیەكانی زۆرە و ڕێبازی پڕباوەڕە شەرعیەكان بریتی‌یە لەڕێبازە بەڵگە خوازیيەكان كەبەهۆی بەڵگەی سیستەمەوە بەرجەستە دەكرێت و، بە بەڵگەی (بایەخدان و داهێنان) (العنایة والأختراع) ناوی دەبات، ئەمەش ئەو ڕێبازەیە كەقورئان گرتۆتیە بەر، چونكە ئەم بەڵگەیە دوو سیفاتی لەخۆ گرتووە. یەكەمیان:- پڕباوەڕیی‌یە، دووەمیان :- سادەیەو پێكهاتە نی‌یە، واتە پێشەكی‌یەكانی كەمە، بەمەش، ئاكامەكانی ساكارەو پێكهاتە نی‌یە.

حەیران: ئایا، ڕاستە گەورەم، ڕێبازە بەڵگە خوازییەكانی تر پڕ باوەڕنین؟

شێخ: ئەمە هەرگیز ڕاست نی‌یە و، قورئان هیچ كاتێك ئەو دوو ڕێبازەی كەباسمان كرد، پشتگوێی نەخستووە بەڵكو بەپێچەوانەوە، خودا لەقورئاندا ئاماژەمان بۆ دەكات چونكە خودای پەروەردگار پێش ناردنی قورئان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئاگادار بووە لەمجادەلەو موناقەشەگیری نێوان فەیلەسوفەكان سەبارەت بەبوونی خوداو پێكهێنان و دروستكردنی گەردون و لێكەوتنەوەكانی و بیرۆكەی كۆنێتی و، زانیار بوو، كەوا ئەم موناقەشەگیریەی فەیلەسوفەكان بەردەوام دەبێت.. تا لەسەرگۆی زەوی خاوەن هۆش و فكر هەبێت، چونكە خودای دروستكەر، سیفەتێكی بەئادەمیزاد بەخشیوە، ئەویش ئەوەیە كەلەهەموو كائیناتێك زیاتر هۆگری موناقەشەو موجادەلەیە. (بەڵام قورئان، بەووردی ئاماژەی ئەو ڕێبازە بەڵگە خوایی‌یە تیۆرە پێكهاتنەی كردوە و، لەلایەن ئەوانەی كەئەم كارەیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان وەك فەیلەسوفەكان و هەڵگرانی ڕێبازی كەلام، دەركی پێكراوە و، خودا لەگفت و گۆكردنی‌دا لەگەڵ گشت خەڵكدا گرنگی داوە بەبەڵگەكانی سیستم و بایەخدان و داهێنان، كەهیچ جیاوازییەكی نی‌یە لەگەڵ بەڵگە عەقلی‌یە تیۆرە پێكهاتەیی‌یەكانی‌تر و، جیاوازییەكەی تەنها ئەوەیە بەڵگە خوازییەكانی قورئان سادە و ساكار و ئاسانترن بۆ گەیشتن بەتەواوی باوەڕ).. و خوالێخۆشبوو گەر

تەنها گرنگی بدایە بەبەڵگە خوازییە ساکارەکان و تەنها وەسفی ئاڵۆزی بەڵگە پێکهاتەییەکانی بەدەربخستایە تانەی لەڕاستیەکانی نەدایە. ئەوکاتە هیچ لەووتەکانی نەدەگیرا، هەموو ئەوبەڵگانە لەلایەن گەورە فەیلەسوفەکان و خاوەنی ڕێبازی کەلام لەکۆن و نوێ، ڕێڕەوی هەموویان بەگشتی بەرەو باوەڕی تەواو دەچێت، بەوێنەی ئەو بەڵگانەی کەلەچەند ڕوویەکەوە دەهێنرێنەوە بۆ کێشەیەکی ماتماتیکی ڕاست، گەردروستبێت بۆ مامۆستایەك ئاسانترین و نزیکترینیان بۆ مێشکی قوتابی هەڵبژێرێت، بۆی ڕەوانییە تانە بدات لەڕاستی بەڵگەکانی تر و، پووچەڵیان بکاتەوە باگرانیش بن. چونکە ئەم پووچەڵکردنەوەیە زەرەر مەندە بۆ خودی عەقڵ بەڵکو بۆ باوەڕ هێنانیش، کەعەقڵ تەنها پایەیەکە بۆی.

ئەمە هەڵەکانی ئەبو وەلیدە، بەڵام گەر گوێبیستی بین کەچۆن درێژە بەبەڵگە خوازییە دروستکراوەکان ئەدات و لێکیان ئەداتەوە، ئەوکاتە ئەبینین کە چەند بە توانا و دڵسۆزو ڕاستگۆیە لەباوەوڕیدا هەروەك موسوڵمانێکی ڕاستگۆیە و، گەورەترین فەیلەسوف و زیرەکترین زانا و ئاگادارترین کەس بە دەردەکەوێت.

حەیران: باسی هەندێ لەووتەکانی ئیبن روشدم بۆ بکە لەڕێبازی بەڵگە خوازیدا، کەبەئاسانترین و ساکارترین ڕێبازی دادەنێیت و کە زیاتر باوەڕی تەواوی تیایە بۆ بوونی خودا؟

شێخ: ئەو ووتانەیت بۆ باسدەکەم کەلەکتێبی (الکشف من مناهج الأدلة)دا هاتووە: گەر ووتراو ئاشکرا بوو کەئەم ڕێبازانە هەموویان بەگشتی یەك ڕێبازنین و یەکێك لەو ڕێبازانە، ڕێبازی شەریعەتە کەداوا لەگشت خەڵکانێك دەکات. باوەڕ بەبوونی خودا بهێنن، لەگەڵ جیاوازی خۆرسکیاندا (واتە: لەگەڵ جیاوازی سروشتیدا) کەواتە ئەو شەریعەتە چییە کەقورئان ئاماژەی بۆ کردووە و هاوەڵەکانی پێغەمبەر پەیرەویان کردووە؟ ئێمە وتمان: ئەو شێوازەی کەقورئانی پیرۆزپێی ئاگادارمان دەکاتەوە وبانگێژی گشت لایەك دەکاتەوە ئەگەر بەشێوەیەکی ئیستقرائی شیکاری بکەین لەدوو رەگەزی سەرەکیدا پەنگ دەخواتەوە، یەکەمیان: بایەخدانێکی زۆرە بەمرۆڤ و دروستکردنی گشت بوونەکان لەپێناویدا. ئەم ڕێبازەش بە (بەڵگەی بایەخدان) (دلیل العنایة) ناوبراوە. دووەمیان: لەداهێنانی ناوەرۆکی شتەکانی ناو بوونەوە دروست دەبێت، وەك دروست بوونی ژیان لەشتێکی بێ گیان وەك دەرکە هەستارەکان و عەقڵ... ئەم بەڵگەیەش بە (بەڵگەی داهێنان) (دلیل الأختراع) ناودەبرێت. بەڵگەی یەکەم لەسەر دوو بنەمای

ڕەسەن بنیاتنراوە: یەکەمیان بوونەکانە بەگشتی شیاون لەگەڵ بوونی مرۆڤدا. دووەمیان ئەم شیاوییە، پێویستیە کە لەلایەن بکەرێکی ئارەزوومەندە (ویستخوازەوە) (مرید) و گونجاو نییە ئەم شیاوییە لەرێگەی (رێکەوتەوە بوو بێت) و، ئەم شیاوییە بوون لەگەڵ بوونی مرۆڤدا، باوەڕی تەواومان بەم بیرۆکەیە دەچەسپێت بەوەی کەبەهاتنی بەدوایەکی شەو و ڕۆژ و خۆر و مانگ لەپێناو بوونی مرۆڤدایە و، هەروەها شیاوی بوونی چوار وەرزەکە لەگەڵ مرۆڤدا و، ئەو جێگایەی کەتیایدا دەژی. و هەروەها شیاوی زۆربەی ئاژەڵ و ڕووەك و بێ گیانەکان و بەشێکی زۆر لەباران و ڕووبار و دەریا و، بەشێوەیەکی گشتی زەوی و ئاو ئاگر، هەروەها (بەڵگەی بایەخدان) لەئەندامی لەشی مرۆڤ و ئاژەڵدا بەدەردەکەوێت. بەمەبەستی شیاویش لەگەڵ ژیانی و بوونیمرۆڤدا بەکورتی زانیاریمان بۆ سوودمەندی بوونەکان لەم ڕەگەزەدا ئاشکرا دەبێت، هەر لەبەر ئەمە پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی کەخوازیاری ناسینی خودای بەخشندەن بەتەواوی، پێویستە لەسەریان سوودمەندی بوونەکان بپشکنن.

سەبارەت بە (بەڵگەی داهێنان) بوونی گشت ئاژەڵ و ڕووەك و ئاسمانەکان دەگرێتەوە... و لەم ڕەگەزەدا بەڵگەی زۆر هەیە لەسەر ژمێرەی داهێنان. لەبەر ئەوە پێویستە ئەو کەسەی خوازیاری ناسینی تەواوی خودای بەخشندەیە، (پێویستە ناوەرۆکی هەموو شتەکان بزانێت تابە هۆیانەوە توانای داهێنانی ڕاستەقینەی هەبێت لەگشت بووندا)، چونکە گەر ڕاستی ناوەرۆکی شت نەزانێت، ڕاستی داهێنان پێنازانێت. لەم فەرموودەی خودادا ئاماژەیە بۆ ڕاستی ئەم بیرۆکەیە کەدەفەرموێت: ﴿**أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ**﴾... دەبینین ئیبن ڕوشد ئاماژەی چەند ئایەتێکی قورئانی دەکات کە (بەڵگەی بایەخدان و داهێنان)یان لەخۆ گرتووە و، دەڵێت: ئەم بەڵگانەی کەلەم دووڕەگەزەدا پەنگی خواردۆتەوە (بەڵگەی بایەخ و داهێنان) تیایاندا بوونی دروستکەرێك بەدەردەکەوێت و ئەم دوو ڕێبازە یەکەم ڕێبازی تایبەندمەند ناسەکانە کەپێیان دەوترێت (الخواص) کەبریتین لەزانایان. دووەم ڕێبازی جەماوەر (طـريقة الجمهـور) دەگرێتەوە و جیاوازی زانیارییەکانی ئەم دوو ڕێبازە لەقوڵبوونەوەیاندا بەدەردەکەوێت. ڕێبازی جەماوەر لەسەر بەڵگەی بایەخدان و داهێنانەکە زانیارییە سەرەتاییەکان کەپەیوەستە بەزانستی هەستەکانەوە بەهۆی ئەو دوو بەڵگەیەوە دەرك دەکرێت، بەڵام زاناکان لەپاڵ زانستی هەستەکانەوە داوای زانستی بەڵگەش دەکەن.

لەجێگایەکی تری کتێبەکەیدا ئاماژەی کردووە کەمەبەست و دانایی بوونەکان بەڵگەن بۆ بوونی خودای بەخشندە هەر بۆیە دەڵێت: (مرۆڤ گەرسەرنجی شتێکی هەستداریدا دەبینێت بە چ شێوەیەك و چ ڕێژەیەك و لەچ حاڵەتێکدا دانراوە کەدەگونجێن لەگەڵ هەموو سوودمەندەکانی بوونەکە لەگەڵ شتە هەستدارەکەو مەبەستە خوازیارەکەیدا، بەچەشنێك گەربەو شێوەیە و بەو حاڵەتەو بەو ڕێژەیە دانەنرێت، ئەو سوودمەندییەی تیادا بەدی ناکرێت. لای ئاشکرا دەبێت و هیچ گومانێکی نامێنێت کەئەم بوونە دروستکەرێك دروستی کردووە. هەر لەبەر ئەمەیەئەم شیاوی‌یە لەنێوان شێوە و حاڵەت و ڕێژەی شتەکە لەگەڵ سوودمەندیی‌یەکەیدا بەدی دەکرێت. ڕەوانی‌یە کۆبوونەوەی گونجاندنی ئەم شتانە لەگەڵ یەکدا بۆ مەبەستی سوومەندی، بە (ڕێکەوت) بێت..

پاشان ئیبن ڕوشد پەنادەباتە هێنانەوەی چەند ئایەتێکی قورئانی کەبەڵگەی (بایەخدان و داهێنانی) لەخۆ گرتبێت و ڕوونی دەکاتەوە هەندێ لەوزانستیانەی کەلەسەردەمی ئەودا بەدەستهاتووە سوودیان لێوەر گیراوە... تادەگاتە ئەم وتەیەی (گەردەستمانکرد بەژمێرەی ئەو ئایەتانەی کەلێکدانەوەی ئەو ئاگادارییانەی کەبەڵگەی بایەخدانیان لەخۆ گرتووە کەچۆن ئاماژەی دروستکەر و دروستکراو دەکات، ئەوەندە زۆرن چەندەها بەرگی فراوانی نووسراو بەشی ناکات و، ئەمانەش مەبەستمان نین لەم کتێبەدا، گەر خودای پەروەردگار لەچارەماندا نووسیبێت و کاتێکی بۆ ڕەخساندین... تا وەکو کتێبێك بنووسین دەربارەی بەڵگەکانی بایەخدان (العنایە) کە قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە).

حەیران: بەراستی ئەم پیاوە لەگەورەترین باوەڕدارەکانە بە خودا، ئایا شێخی گەورەم ئاگادارە کەچەند شانازی بەدانانی کتێبەکەیەوە دەکات؟

شێخ: نەخێر، ئاگادارنیم کەکتێبێکی تایبەتی دانابێت لەم بابەتەدا، بەڵام بەهۆی بەخشندەیی خوداوە ڕێگای ڕاستی دۆزیی‌یەوەو، زۆربەی ئایەتەکانی قورئان کەبەڵگەکانی سیستەم و مەبەست و دانایی و بایەخدانی لەخۆ گرتووە. بەگوێرەی زانیاریی‌یەکانی خۆم سەبارەت بەو زانستی نوێ و ڕووەکانی بەراوردی نێوان ئەم ئایەتانەوە زانستی نوێ سەبارەت بەنهێنی‌یەکانی گەردوون و دروستکردنی بۆت ئاشکرادەکەم.

حەیران: تەنها پرسیارێكم ماوە، لەو كتێبانەی كەخوێندوومەتەوە ئیبن ڕوشد ئینكاری بوونـی (كەسایەتی تاكەكەسی مرۆڤایەتی) (الشخصية الفردية الأنسانية) دەكا و، دەڵێت: بەنـەمانی جەستە لەناودەچێت... و هـەر ئـەم بیرۆكەیـەی كـەوای لـەدژەكانی كردووە تاوانی بێ باوەڕی و ئینكاری زیندوو بوونەوەیی بخەنەپاڵ. ئەم وتە دژبەیەكانە كەخراونەتە پاڵ پیاوێك كەبەم چەشنە باوەڕدارە بەخودا و قورئان تاچ ڕادەیەك ڕاستە؟

شێخ: ئەوكەسەی كەتاوانی بێ باوەڕی و ئینكاری زیندوبوونەوەیی خستەپاڵ، توماس ئەكویناسی فەیلەسوف بوو كـەخۆی دوودڵ بـوو لەكرداری ڕۆح. و مـن ئـەم تاوانـەی بـەڕەوا نـازانم، لـەئاكامی سـەرنجدانێكی قـووڵ لەوتـەكانی ئـیبن ڕوشـد گەربـێدەنگی لەئەرستۆ كردبێـت لـەو وتانـەی كەدەڵێـت: نـەفس بریتی‌یە لـەكارەكانی جەستە و، هیچ بوونـێكی نابێت بەبێ جەستە عەقڵ تاكە كەسی كەسایەتیكە كە بریتی‌یە لەئامادە و توانایی مـرۆڤ بۆ بیركردنەوە و بەنـەمانی لەناودەچێت و لـەم وتانـەیدا بەگشتی‌هیچ مانایـەكی تیـادا نی‌یـە كەبێ باوەڕی بخرێنە پاڵ چونكە ڕاستیەكانی ڕوح و عەقڵ تائێستا بەشاراوەی ونهێـنی ماونەتـەوە و، بەئەندێشـەي مـن هـەتا... هەتایـە بەنهێـنی دەمێنـێتەوە و هـیچ زەرەرمـەندێكی لەسـەر بـاوەڕی نی‌یە، گەر باوەڕدار ئینكاری ئەو نەكات كەڕۆح و عەقڵ لـەكاری خـودان. و سـەبارەت بەوتـەی (بەنـەمانی جەسـتە كەسـایەتی‌تاكە كەسـێتی مـرۆڤایەتی لـەناو دەچـێت) بەمـە ئـیبن ڕوشـد ئیـنكاری (زیـندوبوونەوەی) نەكـردووە. كەزیندووبوونەوە و دروستكردنێكی نوێیە بەتوانا و فەرمانی خودا، كەهەرخۆی یەكەم جار جەستە و خودەكانی دروستكردووە و ڕۆحی پێبەخشیون.

گـەر سـەرنجێكی بیرۆكـەكانی تۆمـاس بدەیـت سـەبارەت بـە (نـەفس) دوو دڵـی و نەئاشـكرایی تـیادا بـەدی دەكەیـت، لەكاتـێكدا پێناسـەی كەسـایەتی دەكـات بـەوەی كەپێكهاتەی تێكەڵ جەستەو ڕوحـە لەلایەكی تـرەوە دەڵێـت: نـەفس و جەستە تەنهایەك (بـوون)ن. و لەهـەندێ شـوێنی تـردا دەڵێـت: نەفس ڕاستیەكەو جەستەیی نی‌یە و، شتێكی ڕۆحی‌یـە و خـودا پێمانی بەخشیوە. لەهەمان كاتدا دەڵێت: ئەم توانایی ڕۆحە تیاماندایە و پاش نەمانی جەستەش هەردەمێنێتەوە، درێژەی پێئەدات و دەڵێت: خود خاوەنی كەسایەتی نی‌یـە چـونكە بەتـەنها توانـای هەسـت و خواست و بیركردنەوەی نی‌یە، بەڵكو تارمایەكی بێ هـێزە ناتوانێـت هـیچ كـارێك بـەبێ جەستە بكات و، بەبێ یەكگرتنی لەگەڵ جەستەدا نابێتە كەسایەتی‌یەكی تاكە كەسی نەمر.

لەم وتەیەدا کەدەڵێت: خود پابەندە بەجەستەوە و بەجودابیان هەست و خواست و بیرکردنەوە دەوەستێت، ئەم ووتەیەی... یا... ڕاستە..یا..هەڵەیە. و ئێمە وەك پێراگەیاندنی سەبارەت بەرۆح زانیاریمان هەیە کەکاری خودایە. گەر بیرۆکەکانی تۆماس دەربارەی (نەفس) بەم چەشنەبێت،بەچ ڕەوایەك ئەم هێزە بێویژدانیانە دەکاتە سەر ئیبن ڕوشد و، چۆن ووتەکانی لێکدەداتەوە بەوەی کەئینکاری زیندوبوونەوە دەکات؟

گەر چاوێك بخشێنینەوە بەنووسراوەکانی ئیبن ڕوشد خۆیدا. کەوان لەبەر دەستماندا بۆت بەدەردەکەوێت کەهەرگیز ئینکاری زیندوو بوونەوەی نەکردوە بەڵکو باوەڕی تەواوی پێیەتی تەنانەت ناوی ئەوانە بەبێ باوەڕ بەخودا ناو دەبات کەئینکاری زیندوو بوونەوە دەکەن. مووجادەلەکانی ئەکویناس لەگەڵ غەزالیدا لەسەر شێوەی زیندووبوونەوە و چۆنیەتیەکانی بوون، دەڵێت: زیندووبوونەوە بەدرووستبوونی جەستەیەکی نوێتر دەبێت و، ئەمە هیچ پێچەوانەی (ئاین)نی‌یە. بەڵام سەبارەت بە (نەفس) ئیبن ڕوشد پاش بگرە و بەردەیەکی زۆر لەگەڵ غەزالیدا لەبەر نهێنی نەفس وتی (زانیاریمان سەبارەت بە خود زۆر نادیارە و خود ئەو تێگەیشتنەی بەو کەسانە بەخشیوە کە لە زانستدا ڕۆچوون) و، نازانین ئایا... ئەبو وەلید خۆی بەیەکێك لەوکەسانە دائەنێت... لەوانەیە یەکێك بێت لەوان تەنها لەبیرۆکەکانی ڕۆح و خودو ئەوانەی لەوانە دەچن، ئەو لە یەکچونانەی کەماونەتەوە، بەنهێنی شاراوەکان(أسرار) دەمێنێتەوە، کەکەس زانیاری نی‌یە دەربارەیان تەنها خودا نەبێت.

بەڵام خاوەن باوەڕە بەهێزەکان ئەو کەسانەن کە تەسلیم بوون پەسەند دەکەن لەسەر ئەو جۆرە ئایەتانە و دەڵێن: ﴿آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلاَّ أُوْلُوا الأَلْبَابِ﴾.

حەیران: ئەوا بیرۆکەکانی ئەکویناس سەبارەت بەنەفس زانی،... ئایا شێخی گەورەم بیرۆکەکانیم بۆ باسدەکات سەبارەت بەبوونی خودا و گەردوون؟

شێخ: گەر، گوێبیستی وتەکانی بیت سەبارەت بەبوونی خوداو دروستکردنی گەردوون، هەروەك گوێبیستی ووتەکانی غوزالی و ئیبن سینا و ئیبن ڕوشد بییت وایە. دەڵێت: (عەقڵمان زانیاریەکان لەهەستەوە وەردەگرێت بەڵام ئەم عەقڵە، کەخودا پێی بەخشیوین.... بریتی‌یە لەتوانایەکی ڕێکخراوی ئەوتۆ کەئەتوانێت ئاگاداریە هەستیەکان ڕێکبخات و بیانگۆڕێت بۆ بیرۆکە گشتی‌یەکان و بیرۆکە ڕووتەکان. بەڵام، زانیاریی‌یە عەقڵیە ڕاستەو خۆکان تەنها پابەندن لەسەر جیهانی هەست وەلەتواناباندا نی‌یە بەڕێگای ڕاستەوخۆوە جیهانەکانی سەر و عەقڵ و پشت سروشتەوە دەرك بکەن. و گەر

لەتواناياندا بێت بەهۆی بەراوردو پێوەرەوە زانیاریی‌یە ناڕاستەوخۆكان بۆ بوونی خودا وەردەگرێت و دەركی دەكات كەتەنها خودا دروستكەری هەموو گەردوونەو یەكەو تەنهایەو بێ هاوالەو ناگۆڕێ و، بەچەرخ دەور نەگیراوە. چونكە نهێنی‌یەكانی ئەم گەردوونە یەگرتووە و، بۆمان بەدەردەخات كەتەنها یەك عەقل و یەك یاسا هەیە و، هەرچیەك لەپشت ئەمانەوە بێت بەنهێنی یە شاراوەكان دەژمێرێت و عەقڵ نەتوانایە لەدەرك كردنیدا، هەروەها زۆر زەحمەتە ئەندێشەی كارە ڕۆحیەكان بكات بێجگە لەمادده. چونكە ئەزموونە دەرەكیەكان بەگشتی پابەندن لەسەر بوونە ماددیەكان، عەقڵ زۆر نەتوانایە لەدەرك كردنی زۆری ڕاستیەكانی ژیان، هیچ زانایەك نی‌یە تائێستا ڕاستی پێكهاتەی مێشك پێبزانێت.

حەیران: بەخودائەمەزۆر گەورەیە؟

شێخ: لەئەمەش گەورەتر ڕێبازی بەڵگەكانە، كەئەكویناس ئەم ڕێبازەی لەچەسپاندنی بوونی خودادا گرتۆتەبەر و پەنادەبات بۆ ئەو سێ بەڵگەیەی كەغەزالی و ئیبن ڕوشد و ڕێبازانی كەلام پابەندی بوون... و لە بەڵگەی لێكەوتنەوەدا (دليل الحدوث) دەڵێت: ئەتوانرێت بەهۆی بەڵگە سروشتی‌یەكانەوە بوونی خودا بچەسپێنرێت: هەموو جوولەیەك بەگشتی پەیدا دەبێ لەجولەی پێش خۆی و، ئەم جولەیەش دروست دەبێ لەیەكێ‌تر پێش خۆی، ئیتر هەروا دەڕواو بەبێ كۆتایی، ئەم دەورو تەسەسولە مەحاڵە وەیا ئەم زنجیرە جوولانە كۆتایی‌یان دێ وەدەگەنە جوولێنەری یەكەم كەئەویش خودای گەورەیە. و سەبارەت بە (بەڵگەی پێویست) (دليل الوجوب) دەڵێت: هەچ شتێك لەم گەردونەدا هەیە بریتی‌یەلە (بوونە شیاو) (ممكن الوجود) واتە هەندێ جار بوونی پێویستە بەڵام بوونەكەی هەمیشەیی نییە و، ئەم (گریمانە) پابەندە بەگرنگی‌یەكەیەوە كەپێویستە بوونی هەبێت، واتە لەلایەن عەقڵەوە (بوونی پێویست) (واجب الوجود) كەخودایە و، هەروەها دەربارەی بەڵگەی (سیستم: النظام) دەڵێت: لەم گەردونەدا بەڵگە بینراوەكان (الشواهد) زۆرن لەژمارە نایەن و هەموویان وابەدەریدەخەن كەپابەندن بەسیستەمێكەوە، تەنانەت لەبێ‌گیانەكانیشدا كەبە شێوازێكی ڕێكخراو دەجولێن. چۆن بوونی ئەم سیستم و كردارانە بەبێ هێزێكی ژیر دروست دەبێت؟ (ئێمە لەتوانامانداپە بەهۆی تێگەیشتنێكی سروشتی بوونی خودا و تەنهایی‌یەكەی بچەسپێنین، چونكە بوونی خوداو تەنهاییەكەی لەشتە سەرسوڕهێنەرەكانی گەردون و جوانی ڕێكخراویاندا دەدرەوشێتەوە).

لەگەڵ ئەوەی ئەکویناس لەبیرۆکەکانیدا دوو دڵە کاتێك دەکۆڵێتەوە لەدروستکردنی گەردون لەلایەن خوداوە لەچەرخێکی دیاریکراودا و، گومانی فەیلەسوفەکان بە (ماوەی وەستان) (مـــدة الـــترك) وادەبینێـت کەعـەقڵ لاواز و نەتوانایەلـە ئەندێشـەکردنی ئـەم تۆژینـەوەیەدا، پاشـان دەگەڕێـتەوە بـۆ بیرۆکـەکانی غـەزالی و یـەك دەگرێـتەوە بەیـەك گەیشـتنێکی ئـەو تـۆ کەوەختە بلـێین تـەنها یـەك دەقن هـەروەك دەڵێـت: (لێکۆڵینەوە لەم باسـانەدا بێ مانایـە چـونکە چـەرخ پێش بوونـی گـەردون بوونـی نـەبووە و چـەرخ بەبێ جووڵـەو گـۆڕان ئەندێشـە ناکرێـت). هـەروەها هاوبەشـی غـەزالی دەکـات لـەم ووتەیەیدا کەدەڵێـت گـەردون لەو کاتـەدا دروسـتکراوەکە (ویسـتی کـۆن)ی خـودا بـووە، لەبـەر ئەوەدەڵێـت: (کرداری دروستکردن گەر ئەزەلیش بێت (ویستی) هەرلەخۆ گرتووە). (لە ویستیشەوە ئەو کاتە دیاریکراوە، کەخودا گەردونی تیا دروستکردووە).

حەیـران: ئەمـە زۆر گـرنگە.... چـاوەڕوانی گوێبیسـتی نـەدەبووم چـونکە مـن وام خوێـندۆتەوە کـەتۆماس ئەکویـناس نووسـراوەکانی غـەزالی و ئـیبن سـینای خوێندبێـتەوە ورەخـنەی لـێگرتبێ چـۆن ڕەخـنە لـەبیروباوەڕێك دەگرێـت کەوابەدەردەکەوێـت دەقـی نووسراوەکانی ئەوانی وەرگرتبێت؟

شێخ: تۆماس ئەکویـناس هەندێ جار موناقەشەی فەیلەسوفە ئیسلامیەکان لەهەندێ لێکۆڵیـنەوەیاندا دەکـات و بەتـەواوی دان دەنێـت کـەوا لەغـەزالی و ئـیبن سـینا و ئـیبن ڕوشـدی وەرگـرتووە. و ئـێمە لـێرەدا ئـەی حەیـران.. ئەم پیاوە وەك فەیلەسوفێك وتەکانی بـاس ئەکـەین کەلەگـەڵ ئەم سێ فەیلەسوفەدا چەسپاندنی بوونی خودا و تەنهایەکەیدا یەك دەگـرنەوە، بەهـەمان بەڵگـەی ئەوانـیش بەڵگـە دەهێنـنەوە بـەڕێگای عەقڵـێکی سـاغەوە، کـەتۆماس زۆر پابـەند بـوو بێ ئـەوەی تیشـك بخەینە سەر ڕووەکانی درێژەی ئەم پابەندیە، گەرشتێك لەکتێبە گەورەکەی بخوێنـیەتەوە دەبینیـت چەند بێ پێچو پەنایە لەدیاریکردنی ئـەو شـتانەی بەعـەقڵ دەشـێن و ئـەو کـردارانەی بەعـەقڵ ناشێن ئەم بیرۆکـەی وای لێکرد کەلەلایـەن هاوەئاینـانی خۆیـەوە دووچـاری هێرش ببێتەوە. ئێمە لەم ووتانەماندا بەرەویەك ئامانج دەڕۆین، ئەویش ئەوەیە کەئەمەوێت بۆتی بەدەربخەم کەهەموو عەقڵە ساغەکان لای گشـت خـاوەن ئاییـنەکان وەك یەکن لەبواری سەرنجی عەقڵی ساغی دوور لەخواست و ئارەزووەکـان، لەسـەردانان بەبوونی خـودا وەبـەبێ پێچ و پەنا دان بنێت بە تەنهایی خودا بەوەی کـەبێ هـاوەڵ و نـەگۆڕە و لـە ڕێبازی بەڵگە خوازیدا یەك دەگرنەوە بەوەی کەئەم ڕێبازە هیچ گومانێکی تیادا نییە.

حەیران: شێخی گەورەم باسی هەموو فەیلەسوفە ئیسلامیەکانی بۆکردم، تەنها (معرری) نەبێت، ئایا ئارەزووت نی‌یە باسی (ئەبوو عەلاء)م بۆ بکەیت؟

شێخ: چۆن باسی (ئەبو عەلاء)ت بۆناکەم لەکاتێکدا مەبەستی گەورەم، باسی وتەکانی (معەرری)یە بەلام وەك فەیلەسوفێك لێکۆڵینەوەی لەسەرناکەم چونکە ئاگادارنیم کەخاوەنی بیرۆکەیەکی فەلسەفەیی ئاشکرای شیکراوە بێت لەبابەت کێشە فەلسەفەیی‌یە گەورەکانەوە،... هەتاکو بۆتی ئاسان و سادە بکەم. گەر لایەنە دەقی‌یە زمانەوانی‌یەکەی وەربگرین، بۆمان هەیە بەفەیلەسوف ناوی بەرین.

چونکە مانا زمانەوانی‌یەکەی فەیلەسوف بریتی‌یە لە (خۆشەویستی بۆ دانایی) (محب الحکمـــة) گومانی تێدا نی‌یە معەرری یەکێك بووە لەخۆشەویستانی دانایی و هەرچەندە خزمەتێکی ئەو تۆی پێشکەش بەم خۆشەویستەی نەکردوە، کەهەقی تەواوی لەسەرێتی.

گەر بە واتای زاراوەییە ڕاستەقینەکەشی وەریبگرین بۆمان نی‌یە (عەلاء) بخەینە ناو کۆمەڵی فەیلەسوفەکانەوە چونکە ناوی فەیلەسوف بەسەر یەکێکدا دەبڕێت گەر خاوەنی تیۆری عەقلی پوختی داڕێژراو لەسەر بنەمای زانیاری‌یەکان بێت... یا تۆژینەوەی هەبێت لەسەر کێشەی فەلسەفی‌یە گەورەکان و دەستکەوتێکی بالای هەبێت لەداڕێژراندنی بیرۆکە فەلسەفەیی‌یە شیکراوەکان.

گەر ئارەزوو مەندانی فەلسەفە توانیان هەموو ئەم کارانە بەگشتی جێبەجێ بکەن ئەو کاتە لەپیاوانی فەلسەفە دەژمێرێن و گەر تەنها خاوەنی بیرۆکەی پرش و بلاو و پچڕپچڕ بوو لەهەندێ لەکێشە فەلسەفی‌یەکاندا باشتر وایە بەنیوە فەیلەسوف دابنرێت.

معەرری بەلای منەوە بەیەکێك لەو نیوە فەیلەسوفانە دادەنرێت، خاوەنی تیۆری عەقلی داڕێژراوە لە سەر زانیاریەکێ پتەو و هەروەها چەند تیۆری پرش و بلاوی هەیە

لەزۆر لەکێشە فەلسەفی یەکاندا، کەئەمانش لەناو هۆنراوە و پەخشانەکانیدا ناڕێك و پچڕ پچڕ و بێ بەڵگەو بێ پێز بەدەردەکەوێت.

یەکێك بو لەوانەی کەوازیان لەدونیا و خۆشی و چێژەکانی هێنابوو.

بێ بەختیەکەی لەژیاندا زۆر لەدودڵی و سەرسامی و گومانی تیادا دروست کردبوو و، غەم و پەژارەکانی زۆریان لێدەکرد بەبەردەوامی گلەیی و ناڕەزای و گاڵتەی لەژیان بیێتەوە.

ئەم هەموو ترس و کۆسپ و نەگبەتیانە لەهۆنراوەکانیدا ڕەنگ ئەداتەوە و، هۆنراوەکانی ڕازندۆتەوە بەجۆرەها هونەری شاکار و جوانکار، تەنها بۆمەبەستی تێر کردنی ئارەزووی خۆ بەدەرخستن، کەئەمانە وادەگەیەنن تێگەیشتنێکی زۆری هەبوو بێت لەزمانەوانی ئەدەبدا و شارەزاییەکی کەمی هەبوو بێت لەفەلسەفەدا و دیوانەکی ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینەی ژیانی تیادا بەدەردەکەوێت لەنەگبەتی و غەم و هەژاری و تاریك بینی و گاڵتە پێکردنی بەژیان.

وازهێنان لەدونیا تەی دەهێشت گەش بینیەکەی سەردەربکا و، بەپێچەوانەوە گەشبینیەکەی وازهێنانەکەی لەدونیا دەشاردەوە.

باوەڕەکانی بەگومان ناوخن کرابوو و، گومانەکەشی بەرەو باوەڕ ملی دەکێشا لەمانەوە بۆمان بەدەردەکەوێت کەزانست و فەلسەفە و ڕۆژانەی ژیانی تێکەڵ و هەڕەمەکی بوون...

هەرگیز ڕەوا نی‌یە هەرکەسێك چەند ووشەیەکی گومانی بەزماندا هات بیخەینە ڕیزی فەیلەسوفەکانەوە و بەزمانحاڵی هۆنراوە، ئەندێشەو بیرو ڕاکانی دەرببڕێت کەبەهیچ شێوەیەك ناگونجێن وەك تۆژینەوەیەکی ڕێکخراویی پابەند لەسەر بەڵگەکان مامەڵەی بکرێت. چونکە ئەم گومانانە لەناوجەرگەی ژیان و ئازارەکانیدا هەن کەبەرەو زۆربەی خودەکانی مرۆڤ دەکشێن و پەرژین بۆ عەقڵ دەکەن.

نەك هەرکەسێك دووچاری گومان بوو، یا.. تووشی کۆستێك بو... یا هەورێکی تاریك ئاسمانی دڵی گرت بەزمان حاڵی هۆنراوە خولیاکانی دڵی دەربخات، بەبێ تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەو بیر کردنەوە و بەبێ بەڵگە و هۆکارەکانی بیکاتە بنەمایەکی بیروڕا بۆ ڕاستیەکان گەردوانی فراوان و گەر یەکێك بەدڵتەنگی بینرا، غەم و گومانەکانی وەك هۆنراوەیەك بهۆنێتەوە و بەنیوە گومان و نیوە باوەڕ بۆ خەڵکی بخوێنێتەوە، ئایا شیاوی ئەوەیە بخرێتە ڕیزی ئەو کەسانەی کەژیان و تەمەنیان بە تیۆری پوختی ڕێکخراو بردۆتە

سەر و لەئاکامدا فەلسەفەیەکی ئاشکرای بێ پێچ و پەنا و پتە و ئاکام گونجا و یەك ئاراستەیی بێت و، بنەماکانی پابەندی بەڵگەکان بێت. گەر ئێمە سەرنجێك لەدیوانی (عەلاء) و کتێبی (رسالة الغفران) و وەلامدانەوەکانی بۆ (داعي الدعاة) بدەین، لەمانەوە دەتوانین بیروراکانی (عەلاء) بەدەربخەین کە هیچ تۆژینەوەیەکی ئاشکراو رێکخراو و گونجاوی تیا نابینین کە پابەندبێت بەهۆکار و بەڵگەکانەوە نەلەتۆژینەوە زانیارییەکاندا و نە لەتۆژینەوەکانی بووندا و نە لەخودو رەوشت و کۆمەڵناسیدا، بەڵکو رەش بینی و ناڵەی دەروون و رق و کینە و ستەمەکانی بەدەردەکەوێت، کە ئەم پیاوە لەنێوان گومان و پرباوەڕیدا دووچاری بۆتەوە.

درێژە نادەم بەهۆکانی بەدەرخستنی ئەم رەش بینانەی کەخودی ئەم پیاوەی گەمارۆداوە.

چونکە ئەی حەیرانِ خۆت دەزانیت کەزۆر لە لەش ساغان و چاوساغان و دەوڵەمەندان و ژیان ئاسوودەییەکان دووچاری ئەم دەردی گومانە بون و، بەهۆی کۆستێکی یاخود بەهۆی رمانی هیواکانیان.

ئایا ووتەت بەرامبەر پیاوێك چی دەبێت کەسنگی پربێت لەگەش بینیەکانی زانا و داناکان و خودی گەورەکان کەلەسەرەتایی ژیانییەوە خۆی دەبینیەوە بەکوێری.و دژواری دەم و چاوی و دوور لەخەڵکی و بی بەش لەچالاکیەکانی جوڵەو بەد خواردنی، وازهێنان لەدونیا و بەدووری لەبەرزوو دارایی و، نائومێد بوون لەخەڵکی و بەزەیی خودا؟

زۆر سروشتییە ئاکامی ئەم هەموو رووداو نەگبەتیانە گومانی لای ئەبی علاء دروست کردبێت.

ئەم گومانانەش لەژیاندا تەنها لە (جیاوازی بەختەکاندا) سەردەکێشێ... و تەنها دوو جۆر هاورێ دەربازیان دەبێت، یەکێکیان ئەوەیە کە بەبەردەوامی بیر لەنهێنییەکانی قەدەر دەکاتەوە، چونکە هەموو بوونەکانی گەردوون ئاماژەی بوونی خودا دەکەن و، گومان لەئازارەکانی ژیانەوە دەکەوێتەوە و، جیاوازی بەختمان لەمانەوە بەدەردەکەوێت: تەندروستی و نەخۆشی و هەژاری و دەوڵەمەندی و ئاسودەیی و نوشوستی و تەمەن درێژی و تەمەن کورتی... هتد.....

ئەی حەیران ئەمانە هەرگیز لەیاد مەکە و جارێکی تر گەر توانیمان دەگەڕێینەوە سەری بۆ دەرخستنی دروستکردنی بوونەکان لەلایەن خوداوە بەهۆی بەڵگەکانەوە.

حەیران: بەڵام... ڕادەی گومان چەند بوو لەلای (ئەبی علاء)؟.

شێخ: لێرەدا پاشماوەی نهێنی ووتەکانم سەبارەت بە (عەلاء) بۆت بەدەردەخەم.

هۆکارەکانی گومانەکانی معەرریم بۆ بەدەرخستنی کەدووچاری هەموو کەسێکی نەگبەت و نائومێد دەبێتەوە و باسی ئەو باوەڕانەیت بۆ دەکەم کەهۆگری هەموو عەقڵێکی ساغە.

معەرری گومانی لەهەموو شتێك دەکرد تەنها بوونی خودا نەبێت کەهیچ کاتێك گومانی بۆ بوونی خودا بەلای عەقڵیدا نەدەچوو... جگە لەم ڕاستییە بەهیچ وتەیەکی تر باوەڕ مەکە، هەرچەندە معەرری سەرسام و دوو دڵ بوو بەرامبەر بەقەزا و قەدەر و ئازادی ویست و هێز داناییەکانی دروستکردن و خودی ڕۆح و چۆنێتی زیندوبوونەوە بەڵام هەرگیز باوەڕی بەبوونی خودا نەترازاوە، بەهۆی عەقڵی ساغی کەبەبەڵگە ڕێنمایی کردبوو بۆ بوونی خودا.

هەرگیز باوەڕی پتەو نەدەترازا هەرچەندە عەقڵی دووچاری لاوازی و کولبونی ببوایە لەدەرك کردنی خودی تەنهایی خودا، یا لەئەندێشەکردنی لێکەوتنەوەی گەردون لەنەبوون و بیرۆکەی کۆنێتی و چەرخ و جێگا و چەند گومانەکەی زۆر بوایە کەئەمەش جیاوازی بەختەکان و نهێنی نادیاری نووسراوە ڕێژەییەکان (القدر) لەلامانی دروست دەکەن.

ئەمە ڕاستی نوسراو و بیروڕاکانی معەررییە، کەبە (فەلسەفەی معەرری) ناوی دەبەن، گەر خوازیاری بەخودی خۆت بەرجەستەی بکەیت، ئەوا دیوانەکەی جارێکی تر بخوێنەرەوە و ووتەکانی کۆبکەرەوە و پاشان پۆلێنی بەراوردیان بکە و، بەووردی سەرنجی بدە ئەم ڕاستییەت بۆ بەدەردەکەوێت کەهیچ گومانێکی تیادا نییە.

حەیران: ئەمە سەیرە، شێخی گەورەم چەند گوێبیست بووم لەوانەی کە هۆنراوەکانی دەخوێننەوە و ئەوانەی کەباس و لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن، بەهیچ شێوەك لاوازی باوەڕهێنانیان نەدەخستە پاڵ معەرری.

شێخ: ئەم هۆگری زۆرییەی خەڵك بەهۆنراوەکانی (ئەبیعەلاء)ەوە بەتایبەتی ئەو هۆنراوانەی گلەیی و سەرسوڕمانی تیادایە بۆ قەدەر، یا... گومان لە کاربەجێی

بوونەکانی خودا دەکات، ئەمانە بەگشتی بەهۆی کاریگەری (جیاوازییەکانی بەختەوەیە لەژیاندا).

هەموو مرۆڤێك لەژیانیدا دووچاری ئەم نەگبەتیانە دەبێتەوە، یا... لەخودی خۆیدایە... یا.. بەهۆی کەسانی دەوروبەری لەدۆست و خزم و کەس و کاری و بەگلەیی لەبەدبەختی خۆشحالْ دەبێت. بەوتنەوەی چەند بەیتە هۆنراوەیەك لەم ڕووەوە.

کاتێك شاعیر بۆ لابردنی بێزاریێتی دژوارییەکانی ژیان ئەم هۆنراوانە دەهۆنێتەوە، هیچ شیاو نییە ببێتە بنەمایەك بۆ بڕیاردانی بێ باوەڕی و باوەڕی ئەم شاعیرە بۆ بوونی خودا.

سەرنجێکی وورد لەهەندێ لەووتەکانی معەرری ئەدەین تابگەینە ڕاستی بیروڕاکانی.

گەر خوازیاربین... ئەی حەیران معەرری بخەینە ڕیزی فەیلەسوفەکانەوە و تۆژینەوەی لەسەر ڕاستی بیروڕاکانی بکەین لەزانیاریی و بووندا لەدووتوێی هۆنراوە و بابەتەلەخۆگرتووەکانی، بۆمان بەدەردەکەوێت ئەم پیاوە لەگەلْ ئەوەی کە.

ڕەش بینییەکانی سەرسامی و دوو دلّی لادروست کردوە، هەرگیز نەیتوانیوە دەربچێت لەباوەڕی بەعەقلّی و باوەڕی بەخودا و تەنها لەرێبازی ئەم عەقلەوە بەڕاستیەکان گەیشت.

ولیس یظلم القلب وفیه للب جذوة

واتە: هەر دلّێ ترۆسکەی ژیری لەناویدابێ، هەرگیزاو هەرگیز تاریك تابێ.

بەلێ- ڕاستە- ئەی حەیران- سوێندبێ بەخودا گەر پیاوێك خاوەنی عەقلێکی ساغ بێت هەرگیز دلّی ڕەش بین نابێت. معری زۆر باوەڕی بەم عەقلە هەبووە و، هەمیشە پابەندی بووە، یاخی دەبوو لەهەموو بیروڕاو هەوالّێك کەپێچەوانەی بڕیارە داڕێژراوەکانی عەقلْ بووایە.

وەك چۆن لەم ووتەیەدا بەدەردەکەوێت:

فلا تقبلن مایخبرونك ضلة — إذا لم یؤید، مأتوك به العقل

واتە: باوەڕ بەبیرۆکەیەك مەکە، گەر لەلایەن عەقلەوە پەسەند نەکرابێت.

وماتریك مرائي العین صادقة — فاجعل لنفسك مرأة من الفکر

واتە: باوەڕ بەبینراوەکانی چاو مەکە، باخودت ئاوێنەی فکرەکانت بێت.

و وتەی:

سأتبع من يدعو الى الخير جاهداً وارحل عنه، ما إمامي سوى عقلي

واتە: لەدوی ئەو کەسە دەکەوم کەبانگەوازی چاکە بکا و تێبکۆشێ بۆی، هەروەها جاری واهەیە لێشی دوور دەکەومەوە، چونکە من تەنها عەقڵ بەپێشەوای خۆم دادەنێم.

تەنها بەم عەقلە، ئەم پیاوە ژیرو دانایە کەبێ بەش بوو و ئارامگر بوو، باوەڕی بەبوون.و تەنهایی خودا هێنا، ئەو خودا بێگەردەی کەتەنها و ئەزەلی و هەمیشەیی وبەئاگاو بەتوانا و وێنەگرو سەرەتا و زیندو کەرەوەیە و هیچ شتێك وێنەی ئەو نی‌یە، ئایا گومانێك لەباوەڕی معەرری بەدی دەکرێت لەم ووتانەیدا؟

سەبارەت بەباوەڕە پتەوە بێ هاوتاکەی دەڵێت:

بوحدانية العلاء دنا فدعني أقطع الأيام وحدي

واتە: بەتەنهایی خودای زانا باوەڕم پێهێنا بهێڵن ڕۆژگارم بەتەنها بەسەربەرم.

هەروەها ئاماژەی باوەڕ بەبوونی خودا و تەنهایی‌یەکەی بکات وایە و چۆن هاوەڵێتی لەتەنهایی و بێکەسی و ڕەش بینیەکانیدا.

يموت قوم وراء قوم ويثبت الأول العزيز

واتە: کۆمەڵ لەدوای کۆمەڵ دەمرن بەس خودای بەتوانا دەمێنێ.

يجوز أن تبطي المنايا والخلد في الدهر لايجوز

واتە: - لەوانەیە هەندێ تەمەنی درێژبن بەڵام نەمری بۆ هیچ کەس نی‌یە.

سەبارەت بەتوانایی خودا لەدروستکردنی زیندوو لەمردودا و بەپێچەوانەوە مردوو لەزیندودا و لەشتە مردووەکانەوە ناوەرۆکی ژیان دروست دەکات و دەیرازێنێتەوە، هەرکاتێ ویستی بەتوانای خۆی لێی دادەماڵێ و دەیکاتەوە بەڕووکەشە (عرض) بێ گیانەکەی.

وەك دەڵێت:

جواهر ألفتها قدرة عجب وزايلتها فصارت مثل إعراض

واتە: ناوەرۆکە بنەماییەکان پێکهاتەی توانایەکی سەرسوڕهێنەرن و بەجوودایان بوونەکەی گەردوون وەك ڕووکەشی لێدێت.

حەیران: - بەڵام گەورەم من ئەم ووتەیەی معرریم لەیادە کەدەڵێت: -

قلتم لنا خالق عليم قلنا صدقتم كذا نقول

واتە: پێتان ڕاگەیاندین، خودا دروستکەرو زانایە.ووتمان ڕاستەکەن ئێمەش هەروا دەڵێین.

زعمتموه بلا مكان ولازمان ألا فقولوا

واتە: باوەڕتان وابوو بێ جێگاو چەرخە، بەئاگابن و بڵێین [1].

هذا كلام له خبيءٌ معناه ليست لنا عقول

واتە: ئەم ووتەیە نهێنییەکی تیادایە بەواتای ئێمە عەقڵمان نییە.

ئایا ئەم ووتەیەی ئاماژەی لاوازی باوەڕی ئەبی عەلا بەخودا بەدەرناخات؟

شێخ: بەڵامەوە سەرسوڕێنەرنییە، کەتەنها ئەم سێ بەیتە هۆنراوەیەت دەرخ کردبێت و بێ ئاگابیت لەم بەیتە هۆنراوانەی تری.

کەدەڵێت:

والله اكبر لايدنو القياس له ولايجوز عليه كان أوصار

واتە: خودا گەورەیەو هیچ پێوەرێك نزیکی نابێتەوە،بۆ ئێمە نەهاتووە کەبڵێین خودا وادەبێ یاوا بووە.

ئێوەی کۆمەڵی گەنجان هەمیشە هۆگری گومان و ئەو ڕێگایانەن کەبۆی دەچێت. بەڵام سەیرە کەچۆن تائێستا دەرکی ڕاستیت نەکردووە، لەو ووتە دوورو درێژانەی کە بەسەردا تێپەڕی لەوێڵی ئەندێشەي عەقڵ و کولبونی لەئەندێشەی مانای چەرخ و جێگا.

مەبەستی مەعەرری لەم بەیتانە ئەوەیە، ئاماژەی کولبونی عەقڵ بکات لەئەندێشەی مانای چەرخی لێکەوتە کەهیچ چەرخێك پێشی نەکەووتووە و، هەروەها گەردوونیش کەهیچ بونێکی پێش بوونی دروست نەبووە، هەروەك غەزالی دەڵێت: ئاماژەکانی مەعەرری بۆ کولبونی عەقڵ هەرگیزمانای ئینکاری بوونی خودا ناگەیەنێت کە مەعەرری دەرکی کردووە (گەورەترە لەوەی کەپێوەر نزیکی ببێتەوە و، بووە و ئەبێت دروست نییە بۆی.

واتە بوونە ئەزەلییەکەی خودا بەبوونە جەستەییە لێکەوتنەکانییەوە پێوەرناکرێت کەلێکەوتنەوەیان پەیوەستە، بەجێگاو چەرخەوە و، گەر ئەم لێکەوتنەوانە نەبوایە (چەرخ و جێگا) نەدەبوو و، هیچ مانایەك نەدەبوو ئەندێشەی بکرێت ئەی حەیران، ئەوانەی گومانیان لەباوەڕی مەعەرری هەیە ئەم چەند بەیتەیان نەکردۆتە بەڵگە وەك دەڵێت:

---

[1] بڕوانە پەراوێزی یەکەم لاپەڕە ()

تحطمنا الأيام حتى كأننا زجاج ولكن لايعادلنا سبك

واتـه: ڕۆژگـار دامـان دەڕزێـنێ هـەروەك، شووشـەیەك کـەپاش ووردبونـی خـۆی ناگرێتەوە.

ئەو وتەی کەدەڵێت:

لو كان جسمك متروكاً بهيئته بعد التلاف طمعنا في تلافيه

واتـه: گـەر جەسـتە لـەناو چـوونی لەسـەر شێوەی خـۆی بمێنێتەوە، هـەر لـەزووەوە خوازیاری لەناو چوونی دەبووین.

هەرگیز ئەم ووتەیەی دەرخ ناکەن:

إذا ما أعظمي كانت هباء فإن الله لايعييه جمعي

واته: گەر ئێسکەکانم پرش و بڵاو بێت ، لەلای خودا ئاسانە کۆکردنەوەی.

و وتەی:

متى شاء الذي صورنا أشعر الموت نشوراً فأنتشر

چ کاتێك ئـەوەی ئـێمەی بـەم وێـنەیە دروسـتکرد ویستی لەناوچـوونمان بـوو، دەمـان مرێنێت و لێپرسینەوەمان لەگەڵ دکات.

وتەی:

قد يمكن البعث إن قال المليك به وليس منا لدفع الشر إمكان

واته: گەر خودا وویستی زیندوبوونەوەی هەیە و هیچ توانایەکمان نی‌یە بۆ بەرەنگاری بەڵاکان)

وتەی:

وأعجب مانخشاه دعوة هاتف أتيتم فهبوا يانيام الى الحشر

واته: ترسناکترین شت ئەو بانگەوازەیە کەدەڵێت نوستوان ڕاپەڕن بۆ لێپرسینەوە

و وتەی:

ياليتنا عشنا بلاردي يدالدهر أومتنا مماتا بلانشر

(خۆزگە لەژیاندا مردن نەبوایە گەر هەش بوایە لێپرسینەوە نەبوایە)

وتەی:

إن كان نقلي من الدنيا يعود الى خير وأرحب فأنقلني على عجل

(گەر گواستنەوەم لەم دنیایە بەرەو خۆشی بێت ئەوا خوازیارم زوو بگوێزرێمەوە بەخۆشی‌یەوە پێشوازی لێدەکەم)

وإن علمت مآلي عندي أخرتي شدأ وأضيق فأنسأرب في الأجل

واتە:(ئەی خودا گەر دەزانیت لێپرسینەوەم دژوارو تەنگە، خودایە چارەنووسم و مردنم دوابخەیت)

سوێند بێ بەگیانم، ئەم پێشوازیی‌یەی خەڵك بۆ دەرخ کردنی ئەو بەیتانەی کە گومانو دوو دڵی تیادایە، وەکودوورکەوتنەوە لەو بەیتانەی پڕ باوەڕو بەڵگەن.ئەمە کاری مرۆڤی بەوویژدان نی‌یە کەبیەوێت بەئاگا بێت لەڕاستیەکانی باوەڕی ئەم پیاوە بەڵام ڕێبازی ڕاست ئەوەیە بەقوڵی سەرنجی بدەین، لەپاشدا ووتەکانی بەبەڵگەوە بەراوردێك بکەین ئەو ووتەیەی کەدەڵێت (شووشە کە شکا خۆی ناگرێتە)و ووتەکانی تری کەلەم ووتەیەی دەچن، دروست نی‌یە بیکەیتە بەهانە بۆ نەبوونی باوەڕی معری بەزیندوبوونەوە و، هەر چۆنێك بێت ناگاتە باوەڕی هەندێ لەو زانایانەی کەدەڵێن بەدروستکردنەوەیەکی نوێ زیندووبوونەوە دەبێت.

بەڵام لەم بەیتەدا کەدەڵێت

ومتى شاء الذي صورنا أشعر الموت نشورا فأنتشر

(چکاتێك ئەوەی ئێمەی لەم وێنەیەدا دروستکرد، گەر ویستی لەناوچوونمان بوو دەمانمرێنێت و لێپرسینەوەمان لەگەڵدا دەکات)

لەدوو توویێی ئەم ووتەیەدا، بەڵگە عەقڵی‌یەکانی تیادا ڕەنگ دەداتەوە لەتوانای زیندو بوونەوەی جەستەکان بەهەمان توانای ئەوەی دروستکردنەوەی کەهێنایانە بوونەوە، بەئاگابە... ئەی حەیران...

هەروەها ووتەکانی سەبارەت بەڕۆح.

أما الجسوم فللتراب مآلها وعييت بالأرواح أنىّ تذهب

واتە: (جەستەکان چارەنووسیان بەرو خاك و خۆڵە، بەڵام نازانم ئەم ڕۆحانە بەرەو کوێ دەچن)

روح اذا أتصلت بجسم لم يذل هو وهي في مرض الفناء المكمد

واتە:(گەر ڕۆح چووە جەستەیەکەوە بەبەردەوامی پێکەوە دەمێننەوە، هەتا هەردووکیان لەنەخۆشی لەناوچووندا جیادەبنەوە).

أن كنت من ريح فيا ريح اسكني أوكنت من نارفيا نار أخمدي

واتە:(ئەی ڕۆح گەر ڕوسکاوی..با یت..ئەی با..خامۆش بەو، گەر لەئاگری...
ئەی.. ئاگر دامرکێ)

أن يصحب الروح عملي بعد مضعنها للموت عني، فأجدر أن ترى عجبا

وأن مضت في الهواء الرحب هالكة هلاك جسمي في تربي فواشجبا

واتە: (گەر ڕۆح هاوەڵێتی عەقڵم بکات پاش مردنم، شایەتی سەر سورهێنەرە وەك
لەناو چوونی جەستەم لەخاك وخۆڵدا، هاوار بۆ خۆم ).

ئەم ووتانەی هەرگیز لەباوەڕی ئەم پیاوە کەم ناکاتەوە و ئەمان هەمووی بەگشتی
ئاماژەیە کە ڕۆح جیاوازە لەجەستە و، تەنها بۆ چێژی ئازارەکان پێوەی لکاوە و،
جەستەش ئازارەکانی ژیان دەچێژێ و معرری ئاگاداری ڕۆح نی‌یە بەوەی کە ئایا...
بوونێکی سەربەخۆی لەجەستە هەیە یاخود فەرمانێکی جەستەیە لە ژیانیدا بە مردنی
جەستە ڕۆحەکە لەناو دەچێت، معەرری مانای ڕۆح دەرك ناکات و، خۆشەویستی
زۆری بۆ هۆنراوە و دژواری ژیان زۆریان لێدەکرد کەئەم ڕۆحە بە..با..یاخود بەئاگر...
ناوبەرێت و ئارەزووی خامۆش و دامرکانی بکات و ئەم وتانەی چەندەها ووتەی تری
لەباوەڕی معرری کەم ناکاتەوە کەدەیان خستە پاڵی، چونکە ئێمە هیچ شتێك لەڕاستی
ڕۆح نازانین و زۆرمان لێنەکراوە هیچ شتێك دەربارەی بڵێین تەنها ئەوەنەبێت ئەم ڕۆحە
لەکاری خودایە. گەر سەرنجی ووتەکانی معەرری بدەیت، بۆت بەدەردەکەوێت کەچەند
پیاوێکی باوەڕدارو مل کەچ بووە بەرامبەر خوودا، لەگەڵ ناهەمواری ژیان و سەر
سوڕمانی بۆ نهێنی‌یە چارەنووسەڕێژەیی‌یەکان، باوەڕی ئەم پیاوەی کەم نەکردۆتەوە،
بەڵکو بەپێچەوانەوە بەڕاستگۆترین و باوەڕدارترین و ئارامترین کەس دەژمێردرێت

لەكاتێكی دیاریكراودا پاش نوێژی شێوان گەیشتمە خزمەتی شێخ، دەبینم پەڕەیەكی گەورەی لەبەردەستایەو، بۆ چەند خانەیەك پۆلێن كراوە و چەند بڕگەیەكی بەرامبەر یەكتری لەشێوەی ڕاست و چەپی تیادا نووسرابوو، چاوم ناوی غەزالی و ئیبن طوفەیل و هەندێ ناوی تری عەرەبی و بەرامبەریان چەند ناوێكی تری فەرەنسی بەدی كرد. لە جێگاكەی خۆم دانیشتم بەرامبەر شێخ بەبێ دەنگی تاكو كارەكەی لێ ئاڵۆز نەكەم و پەڕاوگەكەم لەسەر خوانە بچووكەكە دانا و پاش كەمێك شێخ مەوزونی سەری بەرز كردەوە و بە زەردەخەنەوە گۆتی: حەیران بەخێر بێیت، منیش وتم: شێخی گەورەم مەبەستی لەم پێناسەیەدا چی‌یە؟

هەرچەندە هەندێ جار فكرم لەهەندێ ئەندێشەدا، دووچاری ئاڵۆزی دەبێتەوە بەڵام نەوە ناگەیەنێت كەمن حەیرانەكەی یەكەم جار بم.

شێخ: ئەزانم، بەڵێ ئەزانم و، ئەم ئاڵۆزییەش دەربازمان نی‌یە لێی، بەڵام بەحەیران پێشوازیم كردی هەستم كرد كە سەرسامی لەم كارەم.

حەیران: بەڵێ بەبینینی ئەم خشتەیە سەر سام بووم، ئایابا سەكانمان بەرەو غەزالی و ئیبن طوفەیل دەگەڕێتەوە؟

شێخ: نەخێر، تەنها بەراووردێكە بۆتی ئامادەدەكەم لەنێوان بیرۆكەكانی موسڵمانەكان و بلیمەتە فەیلەسوفەكانی ڕۆژئاوا كەبە (٥٠٠) ساڵ پاش ئەوان هاتوون.

حەیران: گەر بەهەڵەدا نەچووبم شێخی گەورەم ئەمڕۆ باسی گەشەی فەلسەفەم بۆ دەكات، لەكاتی خوێندا كتێبێكم بینی بەم ناوە لەگەڵ هەندێك لە هاوڕێكانم لە بارەی فەیلەسوفەكانی سەردەمی نوێ وەرمگرت و بردم بۆ زانكۆ، كە گەورەترین هۆكاری نوشوستی هەبوو لەسەرم، لێیان وەرگرتم دڕاندیان، دەیان ووت: -ئەم كتێبە هەمووی بەگشتی بێ باوەڕیی‌یە بەخودا.

شێخ: -مەڵێ گەشەی فەلسەفە، چونكە فەلسەفە پێش ئەمانیش پێشكەوتوو بووە،

بەڵکو بڵێ گەشەی رۆژئاوا لەمەیدانی فەلسەفەدا.

حەیران:- تێنەگەیشتم لەجیاوازی نێوان ئەم دوو وتەیە.

شێخ:- سەبارەت بە و تاریکیەی کەباڵی بەئەوروپادا کێشابوو، ئەتوانین بڵێین گەشەیەکی فەلسەفەیی بوو بەڵکو بەئاگابوونەوەیەك بوو پاش نووستنێکی قوڵ، چاوی ئەو بلیمەتانە کرایەوە بەو رووناکیەی کە لەرۆژهەڵاتەوە سەری کێشا بوو، بەدوور نییە گەر بڵێیت بەیەك گەیشتن کە لەرۆژ هەڵات ناسەکاندا لەسەر ئەم راستیە بەیەك گەیشتن وەیا... لەگەڵ مندا بڵێت ئەم رووناکیە دەقا و دەق لەرۆژهەڵاتەوە وەریان گرتووە...و ئەم ووتەیە نزیك ترە،

حەیران: کەواتە شێخی گەورەم نایەوێت باسی ئەم فەیلەسوفە رۆژئاواییانەم بۆبکات.

شێخ:چۆن باسیانت بۆ ناکەم و من دەزانم کەتەنها باسکردنی ئەوان راتدەکێشێت.

حەیران:-دەبینم شێخی گەورەم دەفەرموێت کەرۆژئاواییەکان هەموو راستییە فەلسەفەییەکانیان لەرۆژهەڵاتییەکانەوە وەرگرتووە، وام دەزانی کەلەتوانا و نرخیان کەم دەکاتەوە بۆ ئەوەی بەدوورم بخاتەوە لەووتەکانیان کە بێباوەڕی و گومانیان لەخۆ گرتووە.

شێخ:- چ.. کاتێك منت بینیوە بیروڕای گومانداران و بێباوەڕانت لێ بشارمەوە؟

حەیران: شێخی گەورەم زیاتر باسی ئەو گەورە فەیلەسوفانەی بۆدەکردم کەلەباوەڕداران بوون بەتەنهایی خودا.

شێخ: گوناهم چییە گەر گومانداران و بێ باوەڕان کەمێك بن لەفەیلەسوفە کەم تواناکان، بەگوێرەی زۆرینەیی باوەڕداران لەگەورە فەیلەسوفەکان، لەمەولا بۆت بەدەردەکەوێت ئەم رێژەیە هەرگیز ناگۆڕێت سەبارەت بەهەموو ئەوانەی کەباسیانت بۆ دەکەم.

ووتت سەبارەت بەوی کەمن لەنرخ و کێشیان کەم دەکەمەوە و وەرگرتنی بیروڕای رۆژهەڵاتیان دەخەمە پاڵ، نازانم ئەم گومانانەت لەکوێوە هێناوە و، مێژووی فەلسەفە بریتییە لەزنجیرەیەکی پەیوەست بۆ وەرگرتن لەبیرۆکەکانی پێش خۆیان وەردەگرن و ئەوانەی دوای ئەمانیش گەلاڵەی دەکەن لەچ ووتەیەکدا عەقڵ باوەڕی پیهێنا بەوەی کەبەرەو راستیان دەبات، باوەڕی پێدەهێنێت و پوچەڵی دەخاتە پاڵ ووتەکانی تر، بەڵام لەبەر ئەوەی راستی هەمیشە رۆشنە و کەم جار عەقڵ جیاواز دەبێت تیایدا و، ئەمەش نهێنی ئەو بەیەك گەیشتنەمان بۆ بەدەردەخات لەسەر راستی بوونی خودا و تەنهاییەکەی

لەنێوان زۆربەی فەیلەسوفە موسڵمانەکانی رۆژ هەڵات و فەیلەسوفە نەسرانیەکانی رۆژئاوا.

ئەم بەیەك گەیشتنە گەر لەرێگای وەرگرتنەوەبێت یاخود بەهۆی لەیەکچوونی بۆ چوونیانەوە بێت لەسەر راستیەکان و، ئەم بلیمەتانەی کەباسکردنیان دێتە پێشەوە، هەموویان بەگشتی بەرگریان لەعەقڵ و لەچەسپاندنی بوونی خودا و سیفەتی تەواوی کردووە بەشێوەیەك کەعەقڵ سەرسام دەکات و دڵیش دەگەشێتەوە..

حەیران:-ئەمە، سەیرە!

شێخ:-نەسەیرەو نەنامۆیە، باسی (دە) فەیلەسوفی گەورەی بەناوبانگیانت بۆ دەکەم کەهەموویان باوەڕیان بە بوونی خودا هەیە، تەنها دووانیان نەبێت کەیەکێکیان گومانی هەیە، ئەوی تریان سەرسامە و باوەڕی بەبوونی خودا هەیە، بەڵام نازانێت چۆن وەصفی بکات، بەم جۆرە دەبینیت رێژە لەنێوان ئەم باوەڕداران و گوماندارانادا تەنها (یەکە).

حەیران:- ئەوانە کێن کەشێخی گەورەم دەیەوێت باسیانم بۆ بکات؟

شێخ:- تۆ..پێم بڵێ ئەوانە کێن کەشەیدای ناویان بوویت؟

حەیران:-بەدرێژایی تەمەنم گوێبیستی ناوبانگی باکون و دیکارت و کانط و سپینوزا و برگسون و داروِن بووم و، شتێکی کەمم سەبارەت بەهەریەکێکیان خوێندۆتەوە.

شێخ:- بەکورتی باسی (باکون و دیکارت و باسکاڵ و مالبرانش و سپینوزا و لولك و لیبنز و هیوم و کانط و برکسون)ت بۆ دەکەم، بەڵام داروِن باسێکی تایبەتی هەیە.

دەبینیت (هەشتیان) لەم (دەیە) لەگەڵ ئەو فەیلەسوفە موسڵمانانەدا بەیەك دەگەن لەسەر باوەڕهێنان بەگرنگی عەقڵ و بوونی خودا و تەنهایی‌یەکەی.

هەروەها بەیەگەیشتنیان لەسەر بەڵگە خوازیی‌یەکاندا بەیەگەیشتنێکی ئەو تۆ کەوەختە بیێتە دەقا و دەقی.

شێخ:- فرەنسیس باکون هەرگیز بنەماکانی لۆژیکی پووچەڵ نەکردۆتەوە و ناشتوانێت پوچەڵی بکاتەوە چونکە ئەمانە بنەماکانی عەقڵی پوختن.

رێگای هاوناوی خۆی (رۆجەر باکۆن)ی گرتە بەر لەو وتەیەیدا کەدەڵێت:-ئەزموونەکان تەنها بەڵگەن بۆ زانیاریی‌یە سروشتی‌یەکان و هەروەها هاوشانی رۆجرباکونی کرد لەهێرشەکانیدا بۆ سەر ئەرستۆ.

حەیران:- ئەم رۆجەر باکۆنە کێ‌یە؟

شێخ:-گوێبیستی نەبوویت؟ ئەو قەشە فرەنسیسکانە ئینگلیزیی‌یە کە بەناوبانگترین

زانای سەدەکانی ناوەڕاستە کەبەماوەیەکی زۆر پێش فرەنسیس باکۆن هاتۆتە دنیاوە و ئەم دوو پیاوە لەبیرو ڕاکانیاندا لەیەکدەچن وەك چۆن لەناو نیشتمانیاندا لەیەك دەچن.

رۆجەر هێرشی زۆری دەبردە سەر ڕێبازانی فەلسەفە پەیڕەوکراوەکانی هاوسەردەمی خۆی.

بانگەوازی ئەوەی دەکرد کەئەزموونەکان تەنها بەڵگەیەکن بۆ زانیارییە سروشتییەکان و خۆی وابەدەردەخست کەلۆژیکەکانی ئەرستۆ ڕەت دەکاتەوە و خوازیاری ئەوە دەبوو گەر لەتوانایدا بێت هەموو کتێبەکانی بسووتێنێ لەگەڵ ئەوەی کەهەمیشە پێویستی بەو لۆژیکە عەقڵیانەی بووە لەووتەکانیدا و، ئاماژەی هەمان هۆکاری کردووە کەفرەنسیس باکون ئاماژەی بۆ کردووە و دەڵێت (ئەم هۆکارانە بەرەو هەڵەمان رادەکێشن).

بەڵام فرەنسیس باکون کە دوو سەدە زیاتر دوای ئەو هاتووە بۆ داهێنان... یا... بۆ وەرگرتنی هەمان بیروڕاکانی رۆجەر، بەهەمان شێوەی ئەو باوەڕ بە ئەزموونەکان دەهێنێت لەزانیارییە سروشتییەکاندا و گاڵتە بە لۆژیکەکانی ئەرستۆ دەکات، بەچەشنێك کەمامۆستای یەکەم بەفەیلەسوفی سەفسەتائی بێ نرخ ناودەبات، لەگەڵ ئەوەی کەهەمیشە بێ پێویست نەبووە لەوەرگرتنی ئەو لۆژیك و هۆکارانەی کەدەڵێت بەرەو هەڵەمان رادەکێشن وەبە (بت) ناویان دەبات کەدوورمان دەخاتەوە لەخوا پەرستی کەوەختە بێتە هەمان ئەو هۆکارانەی کەرۆجەر پێش ئەو ناوی دەبات.

بەڵام ئەو ڕێبازەی کە فرەنسیس باکون گرتۆتیەبەر بۆ لێکۆڵینەوەکانی لەسەر ئەم بنەمایانە بەندە.

ئەو ئەزموونانەی کەداڕێژراون لەسەر تاقیکردنەوە پتەوەکانی و سەرنجدانە ووردەکان.

پەیڕەو کردنی ڕێبازی (ئیستقرا Induction) کەبەهۆیەوە عەقڵ لەبەشییەکانەوە (الجزئیات)بۆ گشتییەکان (الکلیات)واتە لەئیجابیاتی ئەو ڕێبازەی کە عەقڵ لەکارە گشتییەکانەوە دادەبەزێت بۆ کارە بەشییەکان (Deductior) و ئەمەش شتێکی نوێ نییە، چونکە بەڵگە بەرەو ژوورەکان (الصاعد) و بەڵگە بەرەو خوارەکان لەلای فەیلەسوفە سەرەتاییەکان ناسراون و هەروەها ئەزمونیش یەکەم شتە کەمرۆڤ زانیویەتی لەتوژینەوەکانی سروشدا.

ئەوە کەشایەنی باسە باکون ئەم ئەزموونەی خستە قالبی فەلسەفەوە، ڕێکخست و

وێنەی بۆ کێشان و قۆناغەکانی دیاریکردن و خشتەی بۆ دانان ئەم ڕێکخستنەی بۆ ڕێبازە تۆژینەوەکانی بووە پایەیەك بۆ ناسینی لەجیهانی فەلسەفەدا.

حەیران:- گومانی تیادا نییە ئەم ڕێبازەی ڕێکخستنە بەرەوژووریییە لە بەشییەکانەوە بۆ گشتییەکان زووتر دەمانگەیێنێتە ڕاستییەکان بەهۆی کارە سرووشتییەکان و شتە هەستیەکانەوە، بەڵام چۆن بەکاریان بهێنن لەزانیاری ئەو کارانەی کە لەپشت سروشتەوە هەن؟

شێخ:- باکون وادەبینێت یەکەم هەنگاو لەلێکۆڵینەوە فەلسەفەییەکاندا بەتۆژینەوەی سروشتییەکان دەستپێدەکات پاش ئەوەی تێگەیشتنی تەواومان لەڕواڵەتە سروشتییەکان بەدەستهێنا و ئاگاداری یاسا تایبەتییەکانی بووین، ئەوکاتە بۆمان هەیە بچینە سەر یاساگشتییەکان کەیاسا تایبەتییەکانی لەخۆ گرتووە و، تائێستاش بەرەو گەشە دەڕۆین تادەگەینە ئەو یاسا گەورە گشتییەی کەهەموو یاساکانی لەژێر چنگدایە، ئینجا دەگەینە کارە ئاشکراکان کە لەهەموو زانستەکاندا هەیە و گومانی تێدا نییە.

بەهۆی ئەم کارە ئاشکرایانەوە دەتوانین تۆژینەوەی هۆکارە بەرزەکان بکەین کە گەردونی لێکەوتۆتەوە و، گەیشتن بەکارەکانی لێکەوتەوە و، تێگەیشتن بەکارەکانی پشت سرووشت (میتافیزقی).

هەروەك چۆن باکۆن بەهۆی ئەم بیرۆکە فەلسەفەگشتییەوەی بەئیبن روشد دەگات و بەهۆی ڕێبازە (تۆژینەوەی بەشەکان) خودا دەناسێت و هەروەها بەهۆی ئەو بەڵگە دیارانەی کەلەدروستکراوەکانی خودادا هەیە و بەهۆی ڕێکخستن و یاسا تەواوە گشتییەکانی کەلەگەردووندا بەدی دەکرێت بەهەمان شێوە لەگەڵ ئیبن طوفەیل و مەسکەوەییەك دەگرێت لەو ووتانەی کەدەڵێت: دەتوانرێت بەهۆی عەقڵیەوە دەرکی خودا بکرێت لە تیۆرە فەلسەفەییە پوختەکاندا.

باکون وتە بەپێزە بەنا وبانگەکەی کەدەڵێت:(گەر کەمی فەلسەفە لەخودا بەدوورمان بخاتەوە ئەوا زۆریی فەلسەفە دەمان گەڕێنێتەوە بۆ لای خودا).

هەروەها رۆجەر باکۆن لەگەڵ تۆماس ئەکویناسی هاوسەردەمی خۆی لەگەڵ قورئاندا یەك دەگرێت لەسەر باوەڕ بەبوونی خودا و، بەبێ توانایی دەرك کردنی زاتی تەواوی خودا و، سەبارەت بەڕاستی دروستکردنی (مێشك) دەڵێت.

(هیچ زانایەك نییە لەزانا سرووشتییەکاندا بتوانێت هەمووشتێك بزانێت سەبارەت بەمێشك و تایبەتمەندیەکانی، کەواتە چۆن دەرکی خودی خودا دەکات) هەروەك دەقی

ئەم ئایەتە بخوێنیتەوە وایە ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئاً لا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ﴾الحج:٧٣... ئەی حەیران بیرکەرەوە...

حەیران:-بەڕاستی شێخی گەورەم ئەم باسە زۆر بەنرخە.

شێخ.... لەباسەکانی دیکارت و فەیلەسوفەکانی تردا و لەو بەیەکگەیشتنەیان لەسەر حەقدا بەرزی و ئاشکرای زیاترت بۆ دەردەکەوێت.

حەیران: دیکارت ناوبانگێکی گەورەی هەیە لەجیهانی فەلسەفەدا، چەند خوازیاری زانینی ڕووە بەیەکگەیشتنەکانی دەکەم لەگەڵ فەیلەسوفە موسڵمانەکان و قورئاندا.

شێخ:- دیکارت زۆربەی پڕ باوەڕی لەگومانەوە بەدەستهێناوە و هەروەها (خودی گومانی) کردە ڕێبازێك بۆ چەسپاندنی بوونی خودا و زانینی سیفەتە تەواوەکانی،

لەگومان و پڕ باوەڕیی‌یەکەیدا لەیەکچوونێکی زۆری هەیە لەگەڵ غەزالیدا بەڵکو بڵێین لەهەموو وتەو هەڵسوو کەوتێکیدا..

سەرنجی شێوازە زانیاریەکانیدا بۆی بەدەرکەوت کەبریتی‌یە لەپێنج هەستەوەرەکە، کەبەهۆیانەوە کاریگەری هەستەکانمان بەدەست دەکەوێت و، هەروەها بەهۆی عەقڵیشەوە دەرکی کارە ڕەواکانی عەقڵ (المعقولات) دەکات، بینی کەهەستەوەرەکان زۆر جار هەڵخەڵەتێنەرن و عەقڵیش زۆر جار هەڵە دەکات، بەچەشنێك ئەوەی بەخەو دەیبینین وا دەزانین لەکاتی هۆشیاریدا بینیومانە، لەبەرئەوە عەقڵ هەڵە دەکا و هەستەوەریش هەڵخەڵەتێنەرە.

هیچ لە شێوازەکانی زانیاریمان بەدەستەوە نەما... تا.. متمانەو پەنای بۆ بەرین لە زانینی ڕاستیەکان و پڕ باوەڕییەکان.

دیکارت بەهۆی گومانەوە هەموو ڕێبازەکانی زانیاری دەرك کرد و گەڕایەوە بۆ پڕ باوەڕی هەروەك چۆن غەزالی لەپێش ئەو گەڕایەوە بۆ پڕ باوەڕی بەشێوازێکی ڕەوان بێژی سەرسوڕێنەر و بەڵگە پتەوی سادەو ئاشکرا، کەوا لەبەڵگەی گومان دەکات بێتە بەڵگە بۆ پڕ باوەڕی.

دیکارت ، دەڵێت:-چەند بەگومان بم لەهەستم و لەعەقڵ ولەبوونی گەردوندا تەنها ڕاستیەکم بۆ دەمێنێتەوە کەناتوانم گومانی لێبکەم و، چەندە گومان زۆربێت ئەوەندە پڕ باوەڕییەکەم زۆر دەبێت ئەم ڕاستیسەش ئەوەیە (من بەگومانم) بەواتای من بەگومانم،

کەواتە من بیر دەکەمەوە، چونکە گومان، بیرکردنەوەیە و، بیر کردنەوەش تەنها لەخاوەن بیر کردنەوە دەبێت و، ئەم خاوەن بیرکردنەوەیە بریتی‌یە لە(من) و هەرچەندە هەوڵی گومان بدەم لەبیرکردنەوەکەم ئەوا گومان لەخودی خۆیدا بەڵگەیە بەوەی کەمن بیر دەکەمەوە.

لێرەدا وتە بەنرخە بەناو بانگەکەی وتووە، کەدەڵێت: (من بیر دەکەمەوە، کەواتە من بوونم هەیە).

لەسەر ئەم وتەیەی ڕێسایی بەڵگەکانی لەسەر ڕاستی هەستەکان و عەقڵ دانا و، گەیشتە چەسپاندنی بوونی خودا و زانینی گشت سیفاتی تەواوی، کەئەعەقڵ بەپێویستیان دادەنێت و هەرئەم بنەمایانەش بوو، دیکارتی گەیاندە چەسپاندنی بوونی ئەو شتانەی کەلای عەقڵ ئاشکرایە پاشان گەشەی بەبیرۆکەکانی دا، تاگەیشتە بەڵگە خوازیی یەکانی بوونی خودا بەهۆی بەڵگە (لێکەوتنەوە و پێویستی‌یەوە) (الحـــدوث والوجوب)، وەك دەڵێن:- بۆچی مەحاڵە ئینکاری ڕاستی ئەم وتەیە بکەم (من بیر دەکەمەوە، کەواتە من بوونم هەیە) ناتوانم هەرگیز ئینکاری بکەم، چونکە زۆر روون و ئاشکرایە و، زۆر کێشەی‌تر هەیە لەم ئاشکراترە لەلای عەقڵ وەك ئەم وتەیەی کەدەڵێن:- شت لە نەبوونەوە پەیدا نابێت ئاکام گەورەتر نابێت لەپێشەکی و، هەروەها هۆکار لەهۆکەی گەورەتر نابێت.

پاش ئەوەی دیکارت دەگاتە ئەو ڕاستەقینەیە لەچەسپاندنی کێشەی ئاشکرا جێگیرەکانی ناو عەقڵ بیرکردنەوە دابەش دەکات بۆسێ بەش.

یەکەم:- بیر کردنەوە بەرێکەوت، یان.. ڕاستەو خۆ (adveritons)، ئەمەش ئەوەیە کەبەهۆی شتە دەرەکی‌یەکانەوەی دروست دەبێت بەبێ کارەکانی مێشك.

دووەم:-(بیر کرنەوە دروستکراوەکان) (Factices) بەهۆی بیر کردنەوە جیاوازەکانەوە دروست دەبێت.

سێهەم:- (بیر کرنەوە خۆڕسکییەکان) کەلەعەقڵماندا جێگیرن.

وەهەروەها دەڵێت:- پێویستە بەئاگا بین لەدوو بەشی یەکەم..تاوەکو..هیچ شتێك لە (هەڵەو وێڵی ئەندێشەیی‌یەکانی هەست) دزە نەکات بۆیان.بەڵام بیرو ڕای خۆڕسکییەکانی لەحاڵەتی تەواوی عەقڵدا لە هەڵە دوور دەبێت، چونکە ئەم بیرو ڕا خۆڕسکیانە بەشێکی سەرەکین لەپێکهاتەی عەقڵدا و، هەروەها لەوانیشەوە فەرمانی پڕ باوەڕیی‌یەکان بەگشتی وەردەگرین و، دەیکەینە بەڵگە بۆ بوونی خودا.

پاشان دیکارت ڕوودەکاتە چەسپاندنی بوونی خوداو دەڵێت:- من بوونم هەیە، کێ منی دروستکردوو کێ منی هێنایە بوونەوە؟

من دروستکەری خۆم نیم، کەواتە ئەبێت دروستکەرێکم هەبێت و ئەم دروستکەرەش دەبێت (بوونی پێویست) بوو بێت و پێویستی بەیەکێکی تر نییە.. تا..بیهاوێتە بوونەوە..یا..بوونی بپارێزێت.

هەموو سیفاتێکی تەواوی لەخۆ گرتبێت.و ئەم دروستکەرەش تەنها خودایە کە هەموو شتێکی دروست کردووە و پاش ئەوەی بوونی خۆی و گەردون دەکاتە بەڵگە بۆ بوونی خودا، هەمان ڕێبازی ئیبن سینا دەگرێت کەچوار سەددە پێش ئەم هاتووە.

هەروەها دیکارت بوونی خوداو سیفاتی تەواوی دەکاتە بەڵگە بۆ ڕاستگۆیی عەقڵ و دروستی فەرمانەکانی و دەیکاتە بەڵگە لەسەر بوونی خودی خۆی و گەردون، هەر بۆیە دەڵێت:- ئەو سیفاتە تەواوانەی خودا کەئەقڵ پەسەندی دەکات سیفەتی ڕاستگۆیییە کەخودا پێمانی بەخشیوە و کارێکی دوورە لەخودا کەعەقڵێکی کوێرانەی هەڵخەڵەتێنەرمان پێببەخشێت، کەواتە دەبێت متمانە بەو عەقڵەبدەین کەوا خۆرسکیانە پێی بەخشیوین، چونکە عەقڵێکی ڕاستگۆ و شیاوە کەبۆ دەرکردنی ڕاستیەکان و هەر شتێك عەقڵ دەرکی بکات روون و ئاشکرا دەبێت هەروەك (شتە سەرتاییییە ئاشکرایییەکان) کە ڕێنمایی ڕاستی بێگومان دەکات.

ئەم عەقڵە کەبڕیارماندا ڕاستگۆیە و ڕاستییە سەرەتاییەکان دەرك دەکات هەر خۆشی ڕێنمایی بوونی خودا و سیفاتی تەواویمان دەکات کەخودا هەرخۆی دروستکەری گەردون و سەرپەرشتارێتی.

بەم چەشنە دیکارت پلەپلە ڕێبازی بەڵگە خوازی گرتەبەر، خودی خۆی و بوونی گەردونی کردەبەڵگە بۆ بوونی خودا، هەروەها بوونی خودا و سیفاتی تەواوی کردە بەڵگە بۆ ڕاستگۆیی عەقڵ و بوونی گەردوون، خودای کردە بەڵگە (شاهد) لەسەر دروستکراوەکانی پاش ئەوەی دروستکراوەکانی کردە بەڵگە بۆ بوونی خودا.

وەك تێبینی دەکەین هەمان ڕێبازی ئیبن سینای گرتۆتە بەر وەئەم ئایەتە پیرۆزەی بەسەردا دەچەسپێ کەخودای بەخشندە دەفەرموێت **﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ﴾**فصلت/٥٣.

لەم ووتەیەی دیكارتدا، بۆمان بەدەر دەكەوێت كەخودا نیشانەكانی خۆی خستۆتە بەرچاوی دیكارت و ڕێنمایی ڕاستیەكانی كردوە، وەك دەڵێت:- (من دروستكەری خۆم نیم، كەواتە ئەبێت دروستكەرێكم هەبێت)..تا..دەگاتە ئەو بەڵگە پتەوەی ئەم ئایەتە قورئانی‌یە كەخودا تیایدا دەفەرموویت:- ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾الطور/٣٥... بەئاگابە.. ئەی..حەیران.

كاتێك ڕەخنەگران هێرشیان بردەسەری بەوەی كەبۆ گەیشتن بەبەڵگە خوازی یەكەم، ئاكامی كردۆتە بنەما بۆ ئەو پێشەكی‌یەی كەئەو ئاكامەی لێكەوتۆتەوە.دیكارت وەلامی داونەتەوە وتی:- عەقڵ لەبەڵگە خوازی یەكمدا پەنای بردە كێشە ئاشكرا سەرەتایی‌یەكان كەبەبێ بیركردنەوە، ڕوون و ئاشكراییان لەخۆگرتووە و، بوونی خودی خۆم كێشەیەكی ئاشكرایە،

بەلام لەبەڵگە خوازی دووەمدا، عەقڵ بۆ بەڵگەكان پەنای بردە بەر ئاكام،

لەكاتێكدا كە دیكارت توانی ئەو هۆكارانە بكاتە بەڵگە بەهۆیانەوە عەقڵ بووە ڕێبازێك.. تاكو بۆ دەرك كردن و بڕیارەكان پەنای بۆ دبەرن،

هەروەك ئەوە وایە كەدەڵێت :- نیشانەكانی خودا، لەخودی خۆمدا بەئاشكرا دەبینم، هەروەها خودام بەسیفاتی تەواوی دەرك كرد كەبەڵگەیە بۆ ڕاستی و دروستی عەقڵم كەبەهۆیەوە دەركی ڕاستیەكانم كرد.

خودام كرد بەتەنها بەڵگەیەك بۆ بوونی هەموو شتێك، ئەمەیە ناوەرۆكی ئەو ئایەتە قورئانی‌یە ئەی حەیران..بیركەرەوە.

حەیران:- بەخودا ئەم ووتانە زۆر بەنرخن..

ئەی شێخی گەورەم ئاماژەی ڕاستیەكانم بۆ بكە!

شێخ: لەمە زیاتر چیت بۆ باس بكەم؟

چونكە زۆرینەیی هەرگیز ڕەزامەندت ناكات و ئەو وێنە جوانانەی بەرچاوت لێ دژوار دەكات كەلە عەقڵی گەورە و بەرزەوە بەدەستت هێناوە.

حەیران :- چۆن؟

شێخ:- ئەم عەقڵە ساغە هەر بەلۆژیكی دەمێنێتەوە.. تاكو هێرشی دەباتەسەر لایەنەیە جگە لەلانەكەی خۆی و ئەو بەئاگابوونەی لەیاد دەكات كەعەقڵ خۆی پێی ڕاسپاردبووین لەڕێبازە بیركردنەوەكانی (ڕاستەوخۆ) و (دروستكراوەكاندا) لێرەدا عەقڵ هەڵدەكەوێت، وەك چۆن ئەسپێك لەشیوو دۆڵێكدا دەگلێت.

کاتێك دیکارت ویستی چۆنێتی دروستکردنی گەردوون و ژیانی لێك بداتەوە و چۆن (عەقڵی رۆحی) دەبەسترێت بەجەستەیی ماددییەوە.

باوەڕی وابوو کەخودا: ماددەی بەش، بەش کردووە، گەورەی تێدایە و بچوکیشی تیایە.

ئاراستەی پێچەوانە لەیەکتر جوولەی پێبە خشیوون و بەهۆی ئاراستەی پێچەوانەی جوولەیان، بەریەك دەکەون و، هەندێکیان یەك دەگرن و کۆ دەبن و پارچەیەکی گەورە دروست دەکەن و، هەندێکی تریان پەرش و بڵاودەبنەوە و دەبنە گەردیلە و وورشە (أثیر).

لەپارچە گەورەکانی خاك دروست بووە و، لە گەردیلەش هەوا پیدا بوو و لە ورشە شەوە ئاگر و خۆر و ئەستێرەکانی لێکەوتۆتەوە.... چەندە جوانە ئەم ئەندێشانەی!

گومانی وایە کەسەرچاوەی ژیان خوێنە و باسی چۆنێتی گەیشتنی خوێن بۆ دڵ دەکات، بەهۆی گەرمایی دڵەوە خوێنەکە گەرم دەبێت و دەبێتە هەڵم و بەرەو سییەکان بەرز دەبێتەوە لەوێوە سارددەبێتەوە دووبارە دەگەڕێتە و بۆ دڵ چەند بەجوانی سوڕی خوێنی شیکار کردووە، هەرچەندە هاوسەردەمی خۆی (ولیەم هارڤی) بەم وەسفە ڕازی ناکات کەهەشت ساڵ پێش دیکارت لەدایك بووە و حەوت ساڵ پاش ئەو کۆچی دوایی کردوە.

لەوانەیە دیکارت رەش بین بوو بێت بەرامبەر بەسەرهاتی (میشال سەرڤێ) نەی دەوویست ڕاستی ئەم خوێنە هەمیشەییە بلێت کەیەکێکە لە کارە سەر سوڕهێنەرەکانی خودا، یەکەمین بەڵگەیە بۆ بوون و توانای خودا بەڵام لەچۆنێتی بەیەك گەیشتنی (عەقڵی رۆح و جەستەی ماددە)دیکارت وادەبینێت کەنێوەندێك هەبێت لەچۆنێتی ئەم بەیەك گەیشتنەدا (کە (ڕژێنەرە سنەوبەرییەکانە) (الغدة الصنوبرية) بەڵام پاش مەلەکردنێکی زۆر لەخەیاڵ و ئەندێشەکانیدا ئەم پیاوە دەگەڕێتەوە سەر هۆشمەندی خۆی و ئەو بەئاگابونەوانەی کەپێی ڕاسپاردین لە پشکنینی بیروڕا ڕاستەوخۆکان و دروستکراوەکان.

(ئێمە ناتوانین چۆنیەتی بەیەك گەیشتنی عەقڵی رۆح و جەستەی ماددە دەرك بکەین و، هیچ شتێکمان بۆ نامێنێتەوە تەنها ئەوەندە نەبێت بڵێی، نیشانەیەکە لەنیشانەکانی خودا)ی بەتوانا و کاربەجێ.

باسکاڵ و مالیبرانیش کەسەر بەقوتابخانەی دیکارتن، باوەڕیان بەبوونی خودا لەمامۆستاکەیان کەمتر نییە بەڵام مالیبرانیش ئەندێشەکانی گەیاندنییە ئەو ڕادەیەی کە

باوەڕ بە (زۆر لێکردنی ڕووت یان بەبێ ئارەزوومەندیی خۆیی ) (جبر المحض) بهێنێت.

بەڵکو پێش هاوسەردەمانی خۆی کەوتووە کە(لایبنزە) و، باوەڕی بە گونجاندنی شتەکان لەگەڵ یەکتردا، هەیە پێش چەسپاندنیان لەبووندا.

حەیران:- ئەم گونجاندنەی پێش چەسپاندن لەبووندا چییە؟

شێخ:- لەکاتی خۆیدا، باسکردن و ڕوونکردنەوەی لەسەردەکەین، بەڵام ئێستا گوێبیستی ووتەکانی باسکاڵ بە کەلەڕوونکرنەوە و بەڵگەکانیدا لەدیکارتکەمتر نییە.

سەبارەت بە (زانست) (المعرفة) باسکاڵ دەڵێت:-

هەستەکان هەڵخەڵەتێنەرن و عەقڵیش هەڵە دەکات،

هەر بەدڵ بنەماییە سەرەتاییەکان و مانای چەرخ و جێگا و جوڵە پێدەزانین.

عەقڵ دەرك کراوەکان لەسەر ئەم زانینانە.دادەمەزرێنیت کەئەمانە بەگشتی (کێشە سەرەتاییەکانن) گەر ویستمان بەڵگە لەسەریان بهێنینەوە وا پێویست دەکات گریمانی بوونی کێشەکان پێشخۆیان بکەین، گەر باوەڕمان بەمانە هەمووی هێنا ئەوا دەمانهاوێتە گێژاوی (زنجیرەییەکانەوە) کەئەمانەش نامان گەیەنێتە (کێشە سەرەتاییەکان).

تەنها بەدڵ دەرکی ڕاستیەکان و بوونی خودا دەکەین.

حەیران:- مەبەستت چییە، تەنها بەدڵ؟

شێخ:- ئەو بیرو ڕا خۆرسکیانە دەگرێتەوە کەلەعەقڵماندا چەسپاوە.

بەشێوەیەکی ئاشکراو ڕۆشن دەبینرێت و هیچ جیاوازییەك نابەخشێت گەر بڵێین ئەم بیرو ڕایانە لەدڵماندا یە، یان لەمێشکماندایە و یاخود لە ڕۆحماندایە ، بەڵام ووشەی دڵ لەکۆندا مانای مێشکی بەخشیوە و، هەر بەم چەشنە عەرەب بەکاریان هێناوە.

حەیران:- کەواتە باسکاڵ باوەڕی وایە کەمرۆڤ بەعەقڵی..... یان.... بەدڵی دەرەکی هەمووو ڕاستیەکانی بون دەکات؟

شێخ:- نەخێر ئەی حەیران.. باسکاڵ زۆر لەوە داناترە کەئەم وتەیەی بخرێتە پاڵ لەگەڵ فارابی و ئیبن سینادا یەك دەگرێتەوە و دەڵێت:- عەقڵ بەهۆی ئەو بیرورا خورسکییە سەرەتاییانەی کەهەیەتی دەتوانێت دەرکی ئەو ڕاستیانە بکات کە پەیوەندیان بەبنەما سەرەتاییەکانەوە هەیە و بەهۆیانەوە دەرکی بوونی خودا دەکات.

هەرشتێك لەپشت ئەمانەوە بێت لەنهێنی بوون ودروستکردن و دروستکەر هەموویان بەگشتی نادیارو شاراوەن و، باسکاڵ وادەبینێت کەئێمە زۆر نەتوانا بین لەزانینی ناوەڕۆك و ڕاستیەکانیدا، چونکە هەست ئامانجی هەموو شتێك دەرك ناکات...بۆ نمونە

دەنگ گەر زۆر بێت، گوێمان (کەڕ) دەکات و ڕووناکی زۆر، دوو چاری شەو کوێرمان دەکات و نزیك بوونەوەی زۆر لێی بینینمان ناهێڵێت و هەروەك چۆن دووری زۆر بینینمان ناهێڵێت وەك ئەوە وایە ئامانجی ئەم شتانە لەلای ئێمە بوونیان نەبێت..

لەپاشدا باسی نەتوانایی مرۆڤ دەکات، سەبارەت بەم گەردوونە و ئەو گەردوونانەی لەپاش ئەمەوەن و ئاماژەی کولبونی عەقڵ دەکات لەبیر کردنەوە لەئامانجی جێگا و چەرخ، هەروەها وەسفی ئەو ترسناکی‌یەی مرۆڤ دەکات کەتووشی دەبێت، گەر خۆی بینیەوە بەهەڵواسراوی لەنێوەند گێژاوی بێ کۆتایی و نەبووندا بەوەسفێکی سەرسوڕێنەر....تا.... دەگاتە ئەم ووتەیەی (با.... ڕادەی توانایی خۆمان بزانین، کەئێمە هەندێ شتین نەك هەموو شتێك لەڕاستیدا هۆش و عەقڵمان ئەوەندە لەمەعقولات دەرك دەکات، بەجێگەی جەستەمان لە گەشە سەندن و درێژبوونەوەدا.

حەیران:-ئەو وتەیە زۆر گەورەیە.

شێخ:- لەم وتەیەی گەورەتر، ئەو بەیەك گەیشتنەیەتی لەگەڵ ئیبن سینا و فارابی‌دا کەدەڵێت:- دەرك کردنمان بۆ بوونی خودا لەدەرك کردنە سەرەتایی‌یەکانە کە پێویستی بەموناقەشە گیری بەڵگە عەقڵیەکان نی‌یە (لەوانەیە من نەبوومایە، گەر دایکم پێ شلەدایك بوونم بمردایە، بەڵام ئێستا بونی پێویستە) و هەمیشەیی و بێ کۆتایی نیم کەواتە پێویستە بوونێکی (بوون پێویست) و هەمیشەو بێ کۆتایی هەبێت کە بوونم پەنای بۆ بەرێت، ئەویش خودایە کەدەرك کردنی بونی بەهۆی بەڵگە سەرەتایی‌یەکانەوە دەزانین بەبی ئەوەی بکەوینە گێژاوی موناقەشەی بەڵگە عەقڵیەکانەوە بەڵام ئەوانەی بەهۆی باوەڕی دڵەوە ناگەن بەدەرك کردنی ناگەن بەدەرك کردنی بوونی خودا پێویستە بەڵگە عەقڵیەکان بەکار بهێنن بۆ باوەڕ هێنان.

ئا...لێرەدا باسکاڵ دانایی‌یە کۆمەڵناسی‌یە ڕەوانەبێژییەکەی خۆی بەکار دەهێنێت کەزۆر لەوتەی زاناکان دەچێت، دەڵێت:( دوو جۆر خەڵك هەن کەدەتوانین بە ژێر ناویان بەرین، جۆرێك لەوانە، ئەوانەن کە لەپێناوی خودادا تێدەکۆشن لەبەرئەوەی دەرکی بوونی خودایان کردووە و، جۆرێکی تریان ئەوانەن کەلێکۆڵینەوە بۆ بوونی خودا دەکەن، چونکە دەرکی بونیان نەکردووە.

حەیران :- بەڕاستی ووتەیەکی بەنرخە، بەڵام باسکاڵ لەبەڵگە خوازیی‌یەکانی بۆ بوونی خودا پەنا دەباتەبەر هەمان بەڵگەی پێویستی پێکهاتەی عەقلی کە لەبەڵگە سەرەتایی‌یە ئاشکراکان دامەزراوە.

شێخ:- ئەمە راستە، بەڵام باسكاڵ وا دەبینێت كە ئەم بەڵگە پێویستیيانەی عەقڵ لەبەر زۆری كاریگەری بەدەركەوتنیان لەدەروغاندا، بەسەرەتاییەخۆرسكیيە عەقڵیەكانی دادەنێت.

دەركی كرد ئەم بەڵگە ئاشكرایانە بۆ هەموو كەسێك ڕێناكەوێتە، واتە زۆر كەس بەئاسانی پێی ناگات، هەر بۆیە ئاماژەی پەنابردنی بەڵگە عەقڵیەكان دەكات بۆ گەیشتن بەڕاستیەكان كەئەم بەڵگانەی پشتگوێخست و بەكورتی باوەڕی بەخودای هێنا بەهۆی پەیامی دڵیەوە، كەئەویش (مالبرانش) بوو و، تیۆری (بینین بەهۆی خوداوە) (الرؤية بالله) دانا.

حەیران:- مانای ئەمە چیيە؟ ئایا دەیەوێت وتەكەی دیكارت دووبارە بكاتەوە كەدەڵێت:-لەهەموو شتێكدا بوونی خودا دیارە، یادەیەوێت بڵێت ئێمە بەو عەقڵەی كەخودا پێی بەخشیوین دەركی بوونی دەكەین.

شێخ:-نەئەمیانە و نەئەویان؟

حەیران: كەواتە ئەم پیاوە وا خۆی بەدەردەخات كەباوەڕدارە بەبوونی خوداو لەهەمان كاتدا دەیەوێت گومان دروست بكات.

حەیران:-نەخێر... نەخێر..باسكاڵ دڵسۆزترین باوەڕدارە بۆ بوونی خودا، بەڵام عەقلی وەك هەموو فەیلەسوفەكانی تر لەبابەتێكی ئاڵۆزدا كول دەبێت كەتەنها بەبابەتێكی ئاڵۆزتر ڕزگاری دەبێت.

وەك چۆن ئەفلاتۆن لەبیرۆكەی (نموونەییەكەیدا) (مثلة) دووچاری دەبێت.

مالبرانش سەرنجی ئەو وتانەی دیكارتیدا كەلەپەیوەندی نێوان عەقلی ڕۆحی و جەستەی ماددیدا وتوویەتی:-عەقڵ لەدەرك كردنی توانای ئەم پەیوەندییە دووچاری نەتوانایی دەبێت. تاگەیشتە ئەو باوەڕەی بڵێت تەنها بیرو باوەڕە خواوەندیەكان چێژی بوون دەكەن، ئێمەش هەمان باوەڕمان هەیە[1]، كەواتە هیچ بیرو باوەڕێكی خۆرسكی چەسپاونییە لەعەقڵماندا .

---

[1] هەموو كەسێك بە بیروباوەری یەكتاپەرستی و یەكخواناسی لە دایك دەبێت، (فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفاً فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لاتَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لايَعْلَمُونَ: ڕوت لە دینی خوا بكە بە دڵسۆزی و خۆت یەكلابكەوە بۆی ئەمەش خۆرسكی (فطرة)يكە خوا خەڵكی لەسەر دروست كردووە گۆڕانكاری لە دروستكراوەكانی خوادا نییە، ئەمەیە دینێكی

هیچ بیروباوەڕێکی دروستکراوی عەقلّی نی‌یە، یاخود هیچ دەرك کردنێکی هەستی نی‌یە کەعەقلّمان لەشتەکانەوە دەستگیری بوو بێت کەواتە..تەنها بوونەکان بریتین لەبیرو باوەڕە خواندیی‌یەکان.

ئێمە بەخودی خۆمان دەرکی جیهانی دەرەکی ناکەین بەلّکو بەهۆی خوداوە کەزانایە بەهەموو شتێك، ئەمەي تیۆری (بینین بەهۆی خواداوە) (الرؤية بالله) وەك من دەبینم گەورەترین پەیوەندی هەیە لەنێوان ئەم تیرۆی (نموونەیی) ئەفلاتۆن و، بەهۆی ئەم پەیوەندیی‌یە بەتینەوە، مالبرانش بەلّگە خوازی بەپێویست نازانێت لەسەر بوونی خودا و، نامانەوێت بەهۆی ڕێبازی بیروباوەڕە خۆرسکی‌یە سەرەتایی‌یە ئاشکراکانەوە بیناسین کەبەبەلّگەوە دەمانگەیەننە سەلماندنی بوونی خودا.

بەلّکو ئێمە بەهۆی بینین و ئاشکرا ڕاستەو خۆکانەوە دەرکی بوونی خودا دەکەین، کەهیچ پێویستی بەبوونی بەلّگە خوازیی‌یەکان ناکات.

حەیران:-ڕای شێخی گەورەم چی‌یە سەبارەت بەم باوەڕە؟

شێخ:- ئەم ووتانە دەگونجێت لەگەلّ وتەی سۆفیەکاندا نەك لەگەلّ وتەی فەیلەسوفان و هەلّگرانی ڕێبازی کەلام کەتەنها پەنا دەبەنە بەر تیۆرە عەقلّی‌یە ساغەکان و بەلّگە تەواوەکانی عەقلّ و، مەحالّ نی‌یە لەلای خودا کەهەندێ لەبەندەکانی تەنها بەهۆی (بینینی ڕووتەوە) باوەڕ داربن کەخودا پێی بەخشیوون، بەلّام بنەما (القاعدة) دەلّێت:- باوەڕداری تەنها بەهۆی عەقلّ و بەلّگەکانی‌یەوە کەخودا پێی بەخشیووین و بە هۆیانەوە ئەتوانین ئەو پێشەکییانە پێك بهێنین کەئاکامی دروستیان لێدەکەوێتەوە و، گەر ئەمانە نەبوونایە بەهۆی ئەو کتێبانەی کە بەزمان حالّی پێغەمبەرانەوە پێمان گەیشتوون ئاماژەی ئەو بەلّگانەی نە ئەکردین، گەر مالبرانیش لەم باوەڕە سۆفی‌یەیدا بوەستایە زۆر باش دەبوو، بەلّام زیاتر لەمە تێپەڕی کرد تا گەیشتە ئینکاری ڕاستی ئەو پەیوەندیی‌یەی نێوان ڕۆح و جەستە.

بیر وباوەڕەکانی گەیاندە ئەوەی کەباوەڕ بەبیرۆکەی جەبر ڕووت بهێنێ کەدەلّێت:-

---

ڕاست و دروستە بەلّام زۆرینەی خەلّك نایزانن.)الروم/٣٠.. هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (ما من مولود يولد الا يولد على الفطرة فأبواه يهودانه او ينصرانه او يمجسانه: هەموو منداڵێك بە موسلّمانی لە دایك دەبێت بەلّام دایك و باوكی دەیکەنە جوو یان گاور یان ئاگرپەرست، نەیفەرمووە دەیکەنە موسلّمان چونکە ئیسلام لەگەلّ خۆرسکی (فطرة)دایە) بوخاری گێڕاویەتیەوە.. -لێکۆڵەر-

هەموو کارێك لەخواوەیە، نەرۆح بەکارەو نەجەستەش و ئەم یاسایانەی کەدەی بینین وادەزانین لەپەیوەندیەکی نێوان ڕۆح و جەستەیە و، هیچ شتێك نی‌یە تەنها گونجاندنێکە لەنێوان ئارەزووەکانی ڕۆح و جوڵەکانی جەستەدا و ئەم کارانە بەگشتی لەکاری خودان کەئارەزووەکانی ڕۆح، جەستە دەجوڵێنێت و بەتەنها وتەیەك کۆتایی بەبیرۆکەکانی دێنێت کە دەڵێت :- تەنها خودا دروستکەرمانە و، دروستکەری کردەکانیشمانە و ئەمەش ئەو پەری چوونە ناو قوڵاییەکانی بیرۆکەی جەبری‌یە کەپوو چەڵی ووڕێنەی کەمتر نی‌یە لەبیرۆکەی (یەکێتی) (وحـــدة الوجـــود) کەهاو سەردەمانی خۆی لەنموونەی (سپینوزا) باوەڕیان پێهێناوە.

حەیران:- مانای (یەکێتی)بوون چی‌یە؟

شێخ:- باوەڕداران بەبیرۆکەی (یەکێتی بوون) ئەوانەن کەئەندێشەکانیان زاڵە بەسەر عەقڵیاندا کەئەمانەش دوو بەشن، بەشێکیان دەڵێن:- خودا ڕۆحی گەردوونە و گەردوونیش خودایە کە بەمەش خودا لەلایان هەموو شتێکە. بەشەکەی تریان، دەڵێن: هەموو شتەکانی سرووشت تەنها یەك ڕاستیان هەیە کەئەویش بوونی خودا خۆیەتی:- و ئەمانیش هەموو شتێك لەلایان خودایە.

حەیران:- چۆن سپینوزای فەیلەسوفی بەناوبانگ باوەڕ بەم وڕێنەیە دەهێنێت و، چۆن شێخی گەورەم دەڵێت سپینوزا باوەڕی بەبوونی خودا بووە؟.

شێخ:- پێم ڕاگەیاندی باوەڕی بەبوونی خودا هەیە بەڵام نازانێت چۆن وەصفی بکات، مەبەستم ئەوەیە سپینوزا یەکێك نی‌یە لەوانەی ئینکاری بوونی خودا بکەن تا... بژمێرێت لەو سروشتی خوازانەی کەدەڵێن:- گەردون لەڕێگای ڕێکەوتەوە دروست بووە و هەرچۆنێك بێت وڕێنەکەی وای لێنەکردووە کەبڵێت:- گەردون جەستەی خودایە، بەڵام دەڵێت خودا خۆی، تەنها بوونێکە و گەردوون ڕووەگەشە سیفاتەکانێتی.

حەیران:- بۆچی شێخی گەورەم خودی خۆی ماندوو دەکات بۆ باسکردنی ئەم ڕێبازە و وەڵامدانەوەیان؟

شێخ:- ڕاستە ڕێبازێکی پووچەڵە-و هیچ لەو فەیلەسوفە گەورانەی کەبۆم باسکردیت و باسیانت بۆ دەکەم باوەڕیان پێی نەهێناوە، بەڵام ئەی حەیران ووتە بەنرخەکەی‌غەزالیت یادە کەدەڵێت:- (ڕەتکردنەوەی ڕێبازێك پێش تێگەیشتنی و

---

١ بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە ()

چوونه ناو قوولآیی‌یەکانی‌یەوە، ڕەتکردنەوەیەکی کوێرانەیە).

حەیران:-بەڵێ.

شێخ:- وتەکانی سپینوزا لەبیرۆکەی (یەکێتی بوون) بۆتی کورت دەکەمەوە.. تا..بێ ئاگا نەبیت لە ڕێبازانی ئەم کابرایە و، من دەزانم ناوبانگە بەرزەکەی ڕایکشاویت و پێویستە ناوەرۆکی ئەم ڕێبازە بزانیت، هەتاوەکو ڕاستیەکانت لێ نەشێوێت.

حەیران:- کەواتە، هۆی ناوبانگیەکەی چی‌یە؟

شێخ:- بیروڕاکانی لە (زانست) و (ڕەوشتدا) ئەوەندە جوانن، توانیوێتی بیروڕا پووچەڵە میتافیزیکیەکەی بشارێتەوە.

هەندێ لەبیروڕاکانی سەبارەت بە (زانین) بۆتی بەدەردەخەم..تا..بزانیت چەند ڕاستی لەخۆ گرتووە.

دەشزانی کە ئەم پیاوە چەندە بۆ چوونەکانی هاو دژی خودی خۆیەتی کاتێك کە توێژینەوە لە بارەی (بوون) دەکات (سپینوزا) وەك (باکۆن) پایەیەکی بەرز نادات بە ئەزموونەکانی، پەنای تەواو نابات بۆ بەڵگە بەرەو ژوورەکان (برهان الصاعد)، کەبەهۆیەوە عەقڵ لە بەشەیی‌یەکانەوە (الجزئیات) بەرز دەبێتەوە بۆ گشتی‌یەکان (الكليات) بەڵکو بەپێچەوانەوە پەنا دەباتە ئەو بەڵگانەی کەعەقڵ تیادا نزم دەبێتەوە لە بەڵگە خوازیی‌یەکاندا لەگشتی‌یەوە بۆ تایبەتمەندی و، هەروەها لەگشتی‌یەوە بۆ بەشی‌یەکان و متمانەی زۆر دەکات بەشتە ئاشکرا و سەرەتایی‌یەکان و لێرەدا ڕێبازی باکۆن دەگرێتە بەر و، ئامۆژگاریمان دەکات، کەعەقڵ پێش توژینەوەکان لە (وێڵی ئەندێشە) (الوهم) پاکژ بکرێت.. تا..بەهۆی زانیاریی‌یەکانمانەوە شتە بەهێزەکانی کە دەمانگەیەنێتە بیرو باوەڕی جیا بکرێتەوە لەو باوەڕە پووچەڵیانەی کەمتمانەی پێناکرێت و، ئامۆژگاری خۆپارستنمان دەکات لێیان، وەك چۆن فەیلەسوفی گەورە دیکارت ئامۆژگاری کردوین و هەروەك جۆرێکی لاوازی تێدایە کەبەهۆی ڕێگای (پەرت و بلاوی‌یەوە) (ألإشـــــــاعة).. یاخود بەهۆی (ئەزموونێکی نادیارەوە) پێمان دەگات.. کەئەمەش ناگونجێت پەناو نامتمانەی پێبکرێت.

جۆرێکی تریان لەڕێگای (بەڵگە خوازی و ئاکام خوازی‌یەوە) (الأســــتدلال والأستنتاج) پێمان دەگات کەئەم جۆرەش لەجۆی یەکەم پتەو ترە، بەلآم بۆ چوونی ڕاستکردنەوە و گۆڕانکاری لەخۆ گرتووە.

جۆری سێهەم كەئەمیش بەهۆی بەڵگە ئاشكراكانەوە دەرك دەكرێت، وەك دەرك كردنمان بەوەی كە (گشتی لەبەشی گەورەترە) كەئەم جۆرەشیان گەشدارترین جۆرەكانی زانیارییەو بەرەو پڕ باوەڕیمان دەبات.

حەیران:- ئەمانە بنەما دروستەكانن و هیچ گومانێكیان تیادا نی‌یە بەڵام چۆن ئەم پیاوە بیرۆكەی (یەكێتی بوون) لەسەر ئەم بنەمایانە دادەمەزرێت، وەكو ئەو ئاشكرایەی كەدەڵێت خودا و گەردونی گوڕراو یەك شتن؟

شێخ:- سپینوزا ڕێبازی بەڵگە خوازی عەقڵ كە بەهۆی (بەڵگەی لێكەوتنەوە)و (بەڵگەی پێویستەوە) دروستبوە وەردەگرێت و دەڵێت:- بوونەكان و ئەوانەی توانای دەرك كردنی بوونیان دەكرێت، هەموویان بەگشتی لەژێر سایەی فەرمانی عەقڵدان لەنێوان سێ بەشدا كۆدەبنەوە.

یەكەم/ ناوەرۆكی (جوهر) كەبەخودی خۆیەوە پەیوەستە.

دووەم/سیفات و تایبەتمەندیەكان.

سێهەم/ ڕووكەشەكان (أعراض).

(ناوەرۆك) لەلای سپینوزا بریتی‌یە لەو بوونەوەرەی كەلەخودی خۆیدا پەیوەستە و بوونی پێویستە كەئەویش خودای تاك و تەنها و هەبوونی بەردەوامە بەڵام سیفاتەكانی یان تایبەتمەندیەكان بەهۆی عەقڵەوە دەرك دەكرێن كەلەشێوەی پایەكانن وەپەیوەستن بە زاتی خوداوە، بەڵام سپینوزا مەبەستی لە ڕووكەشەكان، ڕووكەشی ناوەرۆكەكان دەگرێتەوە كەلەشێوازی شتەكاندا دێنە بەرچاومان، وەبەهۆیانەوە دەركی ناوەرۆكە پێویستە بوونەكەی دەكەین كەخودایە.

حەیران:- لەم دابەش كردنەیدا هیچ وڕێنە و پووچەڵەیەك نابینرێت بەڵكو ئەو پەڕی باوەڕ و ڕاستی‌یە.

چونكە ئەم پیاوە دان دەنێت بەپێویستی بوونی خودا و، هەروەها باوەڕ بەو سیفاتە تەواوانەی دەهێنێت كەعەقڵ بەپێویستی دەزانێت بۆ بوونی خودا و، دان بەوەدا دەنێت كەخودا ویستی بەسیفاتە تەواوەكانی لەڕێگای دروستكردنی ئەم گەردوونەوە بەدەربكەوێت.

یەكێك لەسیفاتە دروستكەرە كارامە بەدەركەوتووەكەی دروستكردنی ئەم گەردوونەیە.

بەسیفاتی توانا و دانایی‌یە بەدەركەوتووەكەی خودا بوونی سیستەم و ووردەكاری و

بڕیارەکانی گەردونە و، لەسیفاتی وویستی خودادا بۆ دەرك كردنی ئەم بەدەرکەوتنەی، مرۆڤی دروستکرد و عەقلی پێبەخشی..هەتا..بەهۆیەوە بتوانێت دەرکی بوونی خودا و سیفاتی تەواوی بکات و، بەڕاست و دروستی بیپەرستێت.

ئەمەش واتای مانای ئەم فەرموده قودسیەیە کە پێغەمبەران بۆمان دەگێڕنەوە کەخودا فەرموویەتی (كنت كنزا مخفيا فخلقت الخلق ليعرفوني).

(من شاردراوە بووم، ئەم بوونەوەرانەم دروستکرد..تاکو بمناسن).

شێخ:- ئەمانە هەمووی ڕاستن، لەوانیە سپینوزاش هەمان مەبەستی هەبوو بێت لەسەرەتای قۆناغەکانی بیرکردنەوەی دروست و پوختیدا.

بەلاّم زۆر سەیرە لەم پوختی و دروستی‌یە دەردەچێت کاتێك کەدەلێت :- خودا هیچ دروست ناکات بەلاّم لەسروشتی خۆیدا ویستی بەدەرکەوتن دەکات و، یەکێك لەدیاردەی بەدەرکەوتنەکانی دروستکردنی ئەم گەردوونەیە کەڕووکەشی سیفاتەکانی خودایە.

حەیران:- تێناگەم، سپینوزا پاش ئەوەی باوەڕ بەسیفاتی تەواوی خودا دەهێنێت، ئایا ئینکاری سیفەتی دروستکەری کارامەی دەکات؟

شێخ:- سپینوزا، دەلێت :- عەقلّ بڕیاری پێویستی ئەدات بۆ نموونە (ناوەڕۆك) واتەخودا، هەروەها بڕیاری پێویست دەدات بەوەی کەئەم ناوەڕۆکە، سیفات و تایبەتمەندی خۆی هەیە، بەلاّم تەنها دوو سیفەت لەم سیفاتانە دەبینین کەڕەنگ بداتەوە لەڕووکەشەکاندا واتە لەو شتانەی کەگەردونی لێ پێکهاتووە.

کەئەمانیش سیفاتی (فکر) و(کشاندنە) (أمتداد).

گەوردوونیش بەو هەموو شتانەی کەلەخۆی گرتووە بریتی‌یە لەو ڕووکەشەی کەبەدەر دەکەوێت لەم دوو سیفەتەدا، وتەنها مرۆڤە، کەڕووکەشی درێژبوونەوە و بیرکردنەوە تیادا کۆدەبێتەوە.

حەیران:- بەلاّم ئەو شتە ئاشکرایانەی کەسپینوزا بەبەرزترین جۆرەکانی زانیاریی و پڕباوەڕی دادەنێت و، هەر ئەم شتە ئاشکرایانەش وایان لێکرد کەباوەڕی بەبوونی ناوەڕۆك (خودا) وسیفات و تایبەتمەندیەکای بهێنێت.

تەنها ئەم ئاشکرایانەی کەدەسەلمێنن خودا سیفاتی وویست و توانای هەیە و، بەهۆی ئەم دوو سیفەتەوە گەردوون هاتۆتە بوونەوە.

گەر بەهۆی چاومانەوە تەنها ڕووکەشی درێژبوونەوەی جەستە و ڕووکەشی

بیرکردنەوە لەدەروناندا ببینین، ئەوا تەنها بەهۆی عەقڵەوە دەزانین کەئەم دوو ڕووکەشە لەکاریگەری توانا و ویستی خودایە و، هەروەها وەك دەبینین ئەم سیستمی گەردوون و ووردەکاریانە لەکاریگەری کاربەجێیی خودان، چۆن سپینوزا وازی لەم لۆژیکە ساغەی هێناوە و لەجیاتی ئەوەی بڵێت خودا سیفەتی توانای هەیە کەبەهۆیەوە درێژ بوونەوەو بیرکردنەوەمان پێدەبەخشێت، دەڵێت، خودا خۆی تایبەتمەندی درێژ بونەوەی لەخۆ گرتووە.

شێخ:- لەمەوپێش پێم ڕاگەیاندی کەئەم فەیلەسوفانە هەندێ جار لەڕێبازە ترسناکەکاندا دەوەستن بەرامبەر ئەو ئاڵۆزیانەی کەعەقڵ دوو چاری دەبێت لەئەندێشەکانیدا و عەقڵیان نەتوانا دەبێت لەگەیشتن بەڕاستیەکان.

ئەو فەیلەسوفانە کەخودا ڕێ پیشاندەریان بێت لەو ئاڵۆزییە ڕزگاریان دەبێت و ڕێبازی بەڵگە عەقڵییە پێویستییە ئاشکراکان دەگرنەبەر و بەهۆیەوە دەگەنە ڕاستییەکان، بەڵام ئەوانەی کەخودا ڕێ پیشاندەریان نەبێ ئەم ئاڵۆزییە دەوەستن و دەست بەردار نابن لێی و وێڵی ئەندێشە وایان تێدەگەیەنێت کەئەمە پێویستیەکی عەقڵییەو ناتوانرێت وازی لێ بهێنرێت، کەئەمانەش هەرگیز لەپێویستیە عەقڵییەکان نین بەڵکو ئەمانە لەکرداری وێڵی ئەندێشەن وەك چۆن غەزالی لە پێشتر و کانط لە دواتر ئاماژەیان بۆ کردووە.

من وای بۆ دەچم کە سپینوزا لەم دوو سەرنجەدا وەستابێت، کەیەکێکیان پەیوەستە بەبنەما سەرەتاییە ئاشکراکانەوە و، دووەم وێڵی ئەندێشەی عەقڵی لەخۆگرتوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کەبینی گەردوون هەمیشە لە گۆڕاندایە.

وابڕیاریدا کەئەم گەردوونە لێکەوتەیێت و هەموو لێکەوتەیەك پێویستی بە (پەیداکەر) (مُحدِث) هەیە و هەروەها بڕیاریدا کەزنجیرەی بەرەو بێ کۆتایی مەحاڵە لەلای عەقڵ، لەبەر ئەوە دەبێت ئەم لێکەوتنانە هەموویان بگەڕێنەوە بۆ بوونەوەرێکی (کۆن) کەلە زاتی خۆیدا پەیدا بووە، کەسەرچاوەیە بۆ بوون و هۆی لێکەوتنەوەیان.

پاشان عەقڵی کولبوو بەرامبەر ئەندێشەی دروستکردنی بوون لەنەبوونەوە، وەك چۆن عەقڵی چەندەها کەس وەستا لەڕێبازی وێڵی ئەندێشە بەهۆی پێوەری نموونە پێهێنانەوە (قیاس التمثیل) لە لای وابوو مەحاڵە دروستبوون لەنەبوونەوە، کە ئەمەش لەلای عەقڵ مەحاڵ نییە.

هەرچەندە بەسەرنجدانێکی (ئاسایی) مەحاڵە بوون لەنەبوونەوە.
بەڵام دەرباز نەبوو لەم وێڵی ئەندێشەیی‌یە وەك بلیمەتەکانی پێش خۆی و دوای خۆی کەباسیانت بۆ دەکەم.
هیچ ڕێبازێکی بەدەستەوە نەما بۆ ڕزگار بوون لەم وێڵی‌یە تەنها ئەوە نەبێت کەدەڵێت:- بوون لەڕاستیدا تەنها خودایە و گەردوونیش بریتی‌یە لەڕووکەشەکەی (أعـــراض)، بۆ دەرکەوتنی ئەم سیفاتانە لەبەر پێویستی‌یە و، خودا و گەردونی بەیەك شت دانا.
هەروەك دەرکی پووچەڵی ئەم تێکەڵی‌یەی نێوان ناوەرۆك (خودا) و، خۆی وەسف دەکا بەوەی کە یەکە و تەنهایە و بوونی پێویستە و بێ کۆتایی و هەبوویی‌یە و لە زاتی خۆیدا پەیدا بووە، لەگەڵ ئەم گەردونە ماددییە جۆراو جۆرە، گریمانی‌یە، سنوردارە، گۆڕاوەدا و بیانوو دێنێتەوە بۆ خۆی و دەڵێت: جیاوازی نێوان خودا و گەردوون لەجیاوازی بۆ چوونەکانی‌یەوەیە بەم چەشنە ئەم بلیمەتە کە تیۆری پابەندی عەقڵەوە دەستی پێکرد ئامۆژگاریمان دەکات لە وێڵی ئەندێشە و بۆما ڕوونەدەکاتەوە کەتەنها پەنایەك بۆ بەڵگە خوازیی‌یە بەڵگە ئاشکرا سەرەتاییەکانە و هیچی تر نا دەیوویست لەڕێگای بۆ چوونە سەیرەکەیەوە ڕامانکێشێت بۆ باوەڕهێنان بە (یەکێتی بوون) (وحدة الوجود) لەنێوان خودا و گەردووندا.
عەقڵمان بەهێزی شتە ئاشکراکان دووچار بکات، بۆ دەرك کردنی ڕووە هاو دژەکانی تەنهایی و چەندیی و هەبوویی و کۆتایی و پێویست و گریمان و توانایی و بێ توانایی و چاکە و خراپە و زانست و نەزانین.
بەعەقڵیدا چوو خودای بەخشندە بۆ تەواوکردنی زات و سیفات و تەنهاییەکەی ئەم شتە هاو دژانەی لەخۆگرتووە و دەبێتە یەك و چەندیی و کۆتایی بێ کۆتایی و پێویست و گریمان و بچووك و گەورە.
چاکە و خراپە و نەزان و زانا و، تاوانبارێکی گوناهبار و پێغەمبەرێکی بەخشندە و شەیتانێکی دوور خراو لە ڕەحمەت.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت : دوای ئەوەی لەشێخ جیابوومەوە، ئەو شەوە غەم و پەژارەیەکی زۆر دایگرتم و، کاتێك کازیوەی بەیان نزیك بۆوە و نەوزێکی خەو بردمیەوە، لەخەومدا باوکم لەماڵی خۆمان قورئانی دەخوێند و، تەنها گوێبیستی ئەم ئایەتە قورئانیە بووم کە دەفەرموێت: ﴿وَمِـــنَ النَّـــاسِ مَـــنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ: کەسانێك هەن موجادەلە لەسەر بوونی خودا دەکەن﴾، پاش تەواوبوونی خوێندنەوەی قورئانەکە، ئاوڕی لێدامەوە و بەزەردەخەنەیەکەوە وتی : ئەی حەیران، تۆ قورئان ناخوێنیت؟ و پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە لەخەونەکەم راپەڕیم و غەمێکی قووڵ دڵی گوشیم و پەژارەی کردم.

بۆم بەدەرکەوت کەباوکم لێم زویرە، هەر بۆیە ئەو رۆژەم بەغەم و خەفەت بردە سەر. و کاتێك کاتی بەیەگەیشتنم هات لەگەڵ شێخدا. چوومە خزمەتی دەبینم قورئان دەخوێنێت، سەرم سوڕما لەم رێکەوتەو لەوەی کە لەخەونمدا بینیم و ئێستاش بەئاگاییم دەیبینم و، کاتێك هەستی بەچوونە ژوورەوەی کردم، کۆتایی بەخوێندنەوەی قورئان هێناو ئاوڕی لێدامەوە، بینی دڵتەنگ و زویرم، پرسی، چیتە ئەی حەیران؟

حەیران : هیچ، شتێك نی‌یە، تەنها خۆشی تۆ نەبێت.

شێخ : بەڵام بەغەمباری دەتبینم.

حەیران : لەخەوندا باوکم بینی.

شێخ : ئەمە، چاکە، چ پێویستی دڵگرانی دەکات؟

حەیران : بینیم قورئانی دەخوێند و تەنها گوێبیستی ئەم ئایەتە بووم ﴿وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يُجَـــادِلُ فِـــي اللَّـــهِ﴾. ئاوڕی لێدامەوە و بەزەردەخەنەیەکەوە وتی: ئەی حەیران، تۆ قورئان ناخوێنیت؟ و پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، چاوەکانم کردەوە.. ئەم خەونەم زۆر غەمگینی کردم و، وا تێگەیشتم کەباوکم لێم زویرە لەبەرئەوەی هۆگری خوێندنەوەی فەلسەفەم و قورئانم لەیاد کردووە.

شێخ : دوێنێ شەو کەنووستی بیرت لەوتەکانی سپینوزا نەدەکردەوە؟
حەیران : بەڵێ.... دوو دڵ و نائارامی کردم.
شێخ : بۆچی؟ ئایا لەوتەکانیدا سەبارەت بە (یەکێتی بوون) هیچ شتێکی رەوات لێ بەرجەستە کرد؟
حەیران : نەخێر.... بەڵام کاتێك لەشێخی گەورەم جیابوومەوە، سەیر بوو بەلامەوە چۆن ئەم عەقڵە مەزنانە دووچاری وێڵی و دڵەراوکێی دەستی شەیتان دەبنەوە، لەکاتێکدا ئەم پیاوە عەقڵی لەعەقڵی من مەزنترەو بیروباوەڕی لەبیروباوەڕی من پوخت ترەو لەمن داناترو زاناترە، چۆن دەرکی ئەو بەڵگانەی نەکردوە کەشێخی گەورەم باسیان دەکات.
شێخ : کەواتە گومان چۆتە دڵتەوە بەوەی کە شێخ مەوزون لەم بەڵگانەیدا راست بێت.
حەیران : داوای لێخۆشبوون لەخودا دەکەم و، چۆن ئەمە دەبێت کەمن هاوبەشی شێخم دەکرد لەکاتی رەخنەگرتن لەوتەکانی ئەم پیاوە.
شێخ وا بەدەردەکەوێت بەگومان بیت لەڕاستی.
بۆچوونەکانی خۆت و شێخت، بەرامبەر مەزنی ئەو فەیلەسوفە بەناوبانگەی کەجێگایەکی بەرزی هەیە لە دڵتدا، بەڵام ووتەت چی دەبێت بەرامبەر ئەو فەیلەسوفانەی کەهاوسەردەمی سپینوزا بوون و لەویش بەناوبانگتر بوون کەبەهۆی بەڵگە عەقڵییە پوختەکانەوە باوەڕیان بەبوونی خودا هێناوە. ئاگادارم ئەی حەیران، رێزی تۆو ئەوانەی هاوتەمەنی تۆن بۆ یەکێك لەم فەیلەسوفە بەناوبانگانە، متمانەت پێی سودمەندت ناکات، هەروەك چۆن متمانەت بەفەیلەسوفێکی مسوڵمان، یاخود بەعەقڵت و بەخودت سودمەندت ناکەن.
بەڵام ئەوەی سودمەندت بکات هەمان رێزت بۆ فەیلەسوفێکی‌تر بێت کە لە پلەو پایەو بەناوبانگیدا هاوشانی سپینوزا بێت، بەڵام باوەڕی بەبوونی خودا هەبێت؛ سێ فەیلەسوفت بۆ باسدەکەم کەیەك بەدوای یەکدا هاتوون و هەموویان لە سپینوزا داناترو بەناوبانگترو باوەڕ پتەوتر و خاوەن بەڵگەی پوختن، کەهەموویان بەگشتی باوەڕیان بەبوونی خودا هەیە وەك چۆن منی بەندەی هەژارو غەزالی و هەڵگرانی رێبازی کەلام و چەندەها فەیلەسوفانی‌تر، بەگشتی باوەڕمان بەبوونی خودا هەیە.
حەیران : مەبەست و ئامانجی من ئەمە بوو و، گومانی تیادا نی‌یە، شێخی گەورەم بە بەخشندەیی خودا ئەم باوەڕە مەزنەی بەدەستهێناوە.

شێخ : سەبارەت بەخەو نەکەت لەوپەڕی ڕاستیدایە، چونکە لەقورئانی پیرۆزدا دوو ئایەت بەم فەرموودەیەی خودا دەستپێدەکەن ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ﴾، کەیەکێکیان لەسورەتی (لوقماندایە) ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلاَ هُدًى وَلاَ كِتَابٍ مُنِيرٍ: کەسانێك هەن موجادەلەی بوونی خودا دەکەن بەبێ هیچ ڕێنمایی و کتێبێکی ڕۆشەن و زانستییەك﴾.

دووەم لەسورەتی (حەج)دایە کە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيْطَانٍ مَرِيدٍ، كُتِبَ عَلَيْهِ أَنَّهُ مَنْ تَوَلاَّهُ فَأَنَّهُ يُضِلُّهُ وَيَهْدِيهِ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ: کەسانێك بەبێ هیچ زانست و ڕێنمایی و زانیارییەك موجادەلەی بوونی خودا دەکەن و، دەکەونە دوی هەموو شەیتانێکی سەرکێش و ڕێوونکەر لەخەڵك و هەر کەسێك ئەم شەیتانە بکاتە پێشرەوی خۆی، ڕێی لێوون دەکات و بەرەو قوڵایی ئاگری دوزەخی (السعیر) دەبات﴾.

(خەونەکەت ئاماژەی ئەوە دەکات کەسپینوزا نموونەی ئەو کەسانەن کەبەبێ هیچ زانست و زانیارییەك موجادەلەی بوونی خودا دەکەن و، دەکەونە دوی شەیتانی خودی خۆیان کەهەمیشە فەرمانی کاری خراپیان پێئەدات) و، پرسیارەکەی باوکت سەبارەت بۆ خوێندنەوەت بۆ قورئان، بریتییە لەووردەانت بۆ تێگەیشتنی مانای ئەم ئایەتانە، کە بەڵگە پوخت و ڕۆشنەکانی لەسەر بوونی خودا لەخۆگرتووە، کە لەرێبازە بەڵگە خوازییەکانەوە بەدەستدێن و بەهۆیانەوە فەیلەسوفان و هەڵگرانی ڕێبازی کەلام، ئەوانەی کەخودا بیەوێت ئاماژەی ڕێگای ڕاستیان بکات، پێی دەگەن.

حەیران : خودا دەروی خۆشیت لێبکاتەوە و بەدوورتبخات لەهەموو غەم و پەژارەیەك، وەك دەروی خۆشیت لەمن کردەوە، بەڵام بۆچی شێخی گەورەم ئەو ئایەتانەی کەئاماژەی بوونی خوددا دەکەن بۆمی ساکارو سادە ناکات؟

شێخ : لەکاتی خۆیدا بۆتی ئاسان و ساکار دەکەم بەگوێرەی ئەو بەرنامە زەینیەیی کەبۆم داناویت.. ئەی حەیران. بەئارام بە بەهەموو تێگەیشتنێك دەگەیت.

حەیران : ئەو سێ فەیلەسوفە گەورانە کێن کە شێخی گەورەم دەیەوێت باسیانم بۆ بکات؟

شێخ : یەکەمیان (لۆك)، دووەمیان (لایبنز)

سێهەمیشیان (عەما نۆئیـــ کانته).

حەیـران : بـەڵێ، زۆر گوێبیسـتی ناویـان بـووم لـە لایـەن قوتابیانی فەلسـەفەوە و، تۆژینەوەکانی لۆك چی دەڵێت؟

شێخ : لەکاتێکدا کەسپینوزا جولەکەی هۆڵـەندی نقوومـی نـاو بیرۆکـەی (یەکێتی بوون) بوو بەهۆی لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی میتافیزیکی بەهاو دژەکانەوە.

(لـۆك) کـە لـە یـەك سـاڵدا لەگـەڵ سپینوزادا لەدایك بوون، لەوبەری کەناری دەریای (مانیشـەوە) گـێرۆدەی خوێندنی (دەرك کردنە مرۆڤایەتیەکان) (الأدراك الانساني) بـوو بەهۆی پەیوەستی زۆری بە لۆژیکـی سـاغی عەقڵەوە و، بە خۆدوورخستنەوە لەئەندێشەو وێڵـی ئەندێشـەکان، دانـی دەنـا بـە بوونـی خـوداو نەتوانای عەقڵ لەدەرك کردنی ئەو شتە شاراوانەی کەبەعەقڵ دەرك ناکرێت.

سـەبارەت بـە زانسـت (المعرفة) لـۆك لەسـەرەتای تۆژینەوەکانـیدا ئینـکاری بیروباوەڕە خۆرسکییەکان دەکـات و، دەڵێـت: - هەموو فیکرەکان لەگەڵ جیاوازی جۆرەکانیدا لەرێگای (ئەزموونەکانەوە) بەدەستمان دەگەن.

بـــەڵام هـــەندێ لەکێشـــەکان ئاشـــکراو روون بۆمـــان بەدەردەکـــەون کەبەچـــاو پیاخشـاندنێك عـەقڵ دەرکـی دەکـات، ئەوکاتـە ئـەم دەرك کردنە بەفکرە خۆرسکیەکانی دادەنێین.

گـەر سـەرنجی منـاڵ و مـرۆڤە کێویلەییەکان بدەین دەبینین سەبارەت بەم شتە ئاشکراو روونانە نەزانن و، ئەمەش بۆمان بەدەردەخات کەعەقڵ وەك تابلۆیەکی بەتاڵ دروستکراوە (Table rase) بـەڵام بـەهۆی ئەزموونەکانی ژیانەوە فکر و زانیارییەکانی لا دروست دەبێـت، ئـەم ئەزمونانـەش بەگوێـرەی هەسـت، دەرەکی دەبن و بەگوێرەی ووردبوونەوە و بیکردنەوەمان بۆیان دەروونی دەبن.

هەستەوەرەکان کۆمەڵـێك لەهەسـتەکان دەگەیەنـنە عـەقڵ و، عەقڵـیش هەڵدەسـتێت بەکۆکـردنەوە و پاراستن و بەراوردکردنیان و دەرك کردنی پەیوەندیی نێوانیان و، بەهۆی ئـەم تێڕوانیـنە دەروونییەوە عەقڵ دەگاتە دەرك کردنی شتە سەرەتاییە ئاشکراکان کەئێمە بەفکـرە خۆرسـکیەکانیان دادەنـێین. بـەڵام لەڕاستیدا بریتین لەو فکرانەی کەعەقڵ بەهۆی ئەزمونەکانەوە بەدەستی هێناوە،

حەیـران : گـەر (لـۆك) ئینکاری فکـرە خۆرسـکییەکان بکـات کەبریـتین لەفکـرە

سەرەتاییە جێگیرەکانی ناو عەقڵ، کەواتە چۆن راستیەکان پێدەزانین و، ئەو بنەمایانە چین کەبریارەکانی لەسەر ئەدەین بەوەی کەراستن یاخود هەڵەن؟.
شێخ : ئەم پرسیارە لەلای من جەوهەریی نییە، چونکە لەرووی ئاکامەوە هیچ جیاوازییەك نییە بەوەی کە ئەم فکرانە، خۆرسکیە جێگیرەکانی عەقڵمانن یان.. لەدروستکراوەکانی عەقڵە.
گرنگی لەوەدایە ئێمەی مرۆڤ ڕێکەوتووین لەسەرئەوەی لەعەقڵماندا فکرە ئاشکرا سەرەتاییەکان هەیە کەدەیکەینە بنەما بۆ تۆژینەوە و لێکۆڵینەوە و موجادەلە بۆ راستی و هەڵەی ئەم بیرۆکەیە و، هەروەها هەموو بەگشتی راستی دەخەینە پاڵ ئەم فکرە ئاشکرا سەرەتاییانە.
لۆك بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ باوەڕی بەفکرە خۆرسکیەکان هێنا وە بە (فکرە نموونە پێهێنانەوەکان) (أفكار تمثيلية)(Idees represetative) ناوی بردن، بەجۆرێك کە دەڵێت : لەعەقڵماندا نموونەی راستی شتەکان هەیە کەپێوەرە بۆ فکرەکانمان و دەتوانین بەهۆیانەوە راستییەکان لە هەڵەکان جیابکەینەوە بەرێژەیەك کە بەراوردەکە تەواو و ئاشکرا بێت لەنێوان ئەو فکرەیەیی کەهەمانە لەسەر ئەو شتە و، ئەو فکرە نموونەییانەی کە لەعەقڵماندا جێگیرن، ئەوکاتە زانیارییەکانمان لەراستییەوە نزیك دەبن و، دابەش کردنی زانیاریەکان بۆ سێ بەش کۆتایی دەهێنێت.
یەکەم : زانیارییە (ئاشکراکان)، ئەو زانیاریانەن کە لەنێوان فکرە بەدەستهێنراوەکان و فکرە نمونەییەکانی کەعەقڵ بەهۆی بەراوردەوە بەبێ بەڵگە دەرکی دەکات.
دووەم : زانیارییە بەڵگەییەکان، کە بریتین لە هێنانەوەی بەڵگە لەسەر بوونی بەراورد لەنێوان فکرە بەدەستهێنراوەکان و فکرە نموونەییەکان.
سێهەم/ زانیارییە نادیارەکان، کەهیچ بەڵگەیەکی لەسەر نییە و بریتییە لە زانیارییەکانمان سەبارەت بەجیهانە ماددییەکان.
ئێمە بەهۆی هەستەوە ئەم شتانە پێدەزانین بەڵام زانیارییەکانمان نە لەبەشە ئاشکراکانن و، نە لەبەشە بەڵگەییەکانن، چونکە ئێمە ناتوانین بەهۆی ئەو شتە حەقیقییە مادییانەی کەدەبینین بەڵگە لەسەر راستی زانیارییەکانمان بهێنین و، دەرك کردنمان بۆ ئەم شتە ماددییە تەنها (بوونە حەقیقەتە دەرەکییەکەیەتی).
ئەمە لەراستیدا حەقیقەتە خودییەکەی نییە بەڵکو ئێمە تەنها دەرکی رواڵەتەکەیمان

کردووه و هیچ شتێك دەربارەی حەقیقەتە ناوەڕۆکەکەی نازانین، هەربۆیە زانیاریمان سەبارەت بەجیهانی مادده زانیارییەکی نادیارە.

حەیران : ئایا.. (لۆك)یش وەك سەفسەتائیەکان و گومانداره‌کان دەیەوێت ئینکاری بوونی زانیاری سەبارەت بەحەقیقەتەکان بکات؟

شێخ/ دەبینم ئاگاداری هەموو، ئەو وتانەم نیت کەمن دەیلێم و تۆ دەیان نووسیتەوە، چونکە ئەم پیاوە دەڵێت : شتە ئاشکراکان بەبێ پێویستیمان بەکەمترین بەڵگە راستەوخۆ دەرك دەکرێن، هەروەك ئەم وتەیەمان کە دەڵێین، گشت لەبەشی گەورەترە و دوو جەمسەری هاو دژ یەکێکیان راستەو ئەوی تریان هەڵەیە.

زانیاری تری زۆرمان هەیە بەهۆی بەڵگەکانەوە دەرك دەکرێن، وەك کێشە ماتماتیکەکان، کەبەهۆی بەڵگەکانەوە دەگەنە راستییەکان، بەڵام زانیاریمان سەبارەت بەشتە مادديیەکان ئاشکراو روون نییە و ناتوانین بەڵگە لەسەریان بهێنینەوە، وەك ئەو بەڵگانەی لەسەر کێشە ماتماتیکەکان دەیهێنینەوە بەڵکو زانیاریمان دەربارەی شتە مادديیەکان رواڵەتی و نادیارن و، ئەم فەیلەسوفە بەهیچ شێوەیەك ناڵێت زانیاریمان سەبارەت بەجیهانی مادده لەوێڵی ئەندێشە مانەوەیە و هیچ راستیەکی تیادا نییە، بەڵکو خوازیارە بڵێت : ئەم جۆرە زانیارییە نادیارە و ناگاتە سنوری زانیارییە ئاشکراو بەڵگەدارەکان بەڵکو راستی پەسەند دەکات، بە بەڵگەی ئەوەی عەقڵە مرۆڤیيە ساغەکان هەموو بەگشتی رێکەوتوون لەسەرئەوەی دەرك کردنی وێنە هەستیەکان بەگشتی دەگەڕێنەوە بۆ یەك شێوازی دەرك کردن و وەسفکردنیان بەیەك وەسف دەکرێت.

هیچ گومانێکمان لانامێنێت کە وێنە زەینییەکان یەکسانی شتە دەرەکییەکانن و، ناتوانرێت بەڵگە لەسەر ئەم شتانە بهێنرێتەوە تاکو زانیارییەکانمانی لەسەر بنیادبنێین و، ناتوانین بەهۆی خودی شتە مادديیەکانەوە بگەینە تەواوی راستییەکان، وەك چۆن لەکێشە ئاشکراکاندا لەخودی خۆیاندا تەواوی راستییەکانیان تیادا بەدەردەکەوێت کە بەڵگەدارن.

حەیران : بیروباوەڕمان سەبارەت بەبوونی خوددا و شتە شارراوەکان، لۆك لەچ بەشێك لەبەشەکانی زانیاری دادەنێت؟

شێخ : ئا.. لێرەدا بەرزی و رەسەنی بیروباوەڕی لۆك بەدەردەکەوێت، کاتێك کە دەرك کردنمان بۆ بوونی خودا جیادەکاتەوە، لەدەرك کردنمان بۆ شتە شارراوە و

نهێنییەكان و، دەڵێت : ئێمە (بێگومانین) لەسەر بوونی خودا كەبەهۆی ووردبوونەوەیەك لەخودماندا پێیدەگەین بەوەی كەئێمە خاوەن ژیریو هەست و عەقڵین..

دەرك كردنمان بەبێ بەڵگە، بەوەی كەمرۆڤ مەحاڵە لەنەبوونەوە دروست بێت. و زانیاریمان سەبارەت بەبوونی خودا زانیارییەكی بەڵگەییە كەپەیوەستە بەزانیارییە ئاشكراكانەوە. چونكە بوونی ئێمە بەشێكە لەزانیارییە ئاشكراكان، ئەمە بەڵگەیە بۆ بوونی خودا، وەك دیكارت دەڵێت و، ئەو شتانەی كە لەئێمەی مرۆڤ و جیهاندا بەدی دەكرێت لەبەهرەوەری و سیستەم و رێكخستن و بەرنامە رێژی بڕیارو فەرمانەكان، هەموویان بەگشتی پێویست بەدروستكەرێكی بەتوانای هەبوویی زانا و كاربەجێ دەكەن.

بەڵام شتە شاراوە نهێنییەكان، وەك لێكۆڵینەوە لە زاتی خودا و ناوەڕۆكی روح و ناوەڕۆكی شت بەگشتی، لۆك سەبارەت بەم باسانە زۆر بەداناییانە وەڵام دەداتەوە، بەشێوەیەك كەپێویستە دەرخ بكرێت، ئەی حەیران، وەك چۆن دەرخی وتەی فەیلەسوفە داناكانت كردووە، كەدەڵێت (گەر خەڵك تۆژینەوەیەكی ورد دەربارەی توانایی عەقڵی خۆیان بكەن و، پەردە لەسەر ئەو ئاسۆیە لابەرن كەبەشە رۆشنەكان لەبەشە تاریكەكان جیادەكاتەوە.

جیاوازی بكەن لەنێوان ئەو شتانەی كەئەتوانرێت دەركیان بكرێت و، ئەو شتانەی كەناتوانرێت دەركیان بكرێت. ئەوكاتە دڵنیا دەبن بەنەزانینیان سەبارەت بەبەشە تاریكەكان و، دەتوانن تۆژینەوە و باسەكانیان بۆ لایەنێكیتر تەرخان بكەن كە سوودمەندو بەكەڵك و دڵنیا بەخش بێت).

حەیران : شێخی گەورەم،.. من لەوڵاتی خۆمان سەرگوزشتەیەكی هیندی فێربووم كە لەدەقی ئەم وتەیە دەچێت بەمانا و وتەیەوە.

شێخ : بەڵێ.. بەڕاستی بەدەق و بەمانا لەوتەكانی لۆك دەچێت، هەروەك (بەیرونی) لەكتێبەكەیدا (تحقیق ما للهند الخ... للهند من مقولة) و پڕ لەژیری و داناییە كە دەڵێت: (تەنها زانینی ئەو جێگایەمان بەسە كە تیشك دەیگاتێ، پێویستمان نییە بەزانینی ئەو جێگایەی كەتیشك نایگاتێ، هەرچەند لەخودی خۆیشیا گەورە بێت، هەر شتێك تیشك نەیگاتێ هەستیش دەركی ناكات. و هەر شتێك هەست دەركی پێنەكات زانراو نابێت).

(بەم چەشنە، ئەی حەیران گەورەترین عەقڵە ساغەکان بەبێ جیاوازی یەگدەگرن و ڕێدەکەون لەسەر ڕاستییەکان کەلەچوارچێوەی گەیشتنی ئەو تیشکە بەو جێگایە تێناپەڕن، گەر تێپەڕن دووچاری وێڵی و کەوتن دەبنەوە) هەروەکو چۆن سپیونزا تووشی بوو.

حەیران:- ئەی گەورەم،.. زیاتر.. زیاتر.. زانستم فێر بکەو باسی (لایبنزو کانط)م بۆ بکە،

شێخ:- زیاتر، بۆت باسدەکەم.. تا.. بەمەبەست دەگەیت، بەڵام ئەمشەو کات بەش ناکات بۆ باسکردنی (کانت) تەنها (لایبتز)ت بۆ باسدەکەم.

حەیران:- ئایا.. لایبنز پەیڕەوی لۆکسی هاوڕێی دەکات لەفکرە بەرزەکانیدا؟

شێخ/ لەهەندێ شتدا پەیڕەوی دەکات و لەهەندێ شتی تردا دژی دەوەستێت و، لەهەندێ باسدا لەلۆك بەرزترە، بەڵام لەهەندێ باسی تردا ناگاتە لۆك.

حەیران:- ئەمە، چۆن دەبێت؟

شێخ:- بەڵێ لە باوەڕدا پەیڕەوی دەکات و، لە قوڵایی بەڵگەکاندا لەو بەرزترەو، دژی لۆك دەوەستێت کەدەڵێت عەقڵ وەك تابلۆیەکی بەتاڵ وایە، بەڵام کاتێك پێچەوانەی داناییەکەی دەوەستێت لەسنوری ئەو جێگایەی کەتیشك پێی دەگات تێدەپەڕێت دووچاری هەڵە دەبێت و دەکەوێت: لایبتزی بلیمەتی ئەڵمانی، لە زانستەکەیدا گەورە بوو و، لەبیرکردنەوەکانیدا قوڵبوو بەتایبەتی لە تۆژینەوەکانیدا بۆ فەلسەفە زانستیەکان و بوونەکان و دروستکەرو دروستکراوەکان، بەڵام لەوەسفکردنەکانیدا بۆ بەدەرخستنی ئەو پەیوەندییەی کە لەنێوان ماددەو ڕوحدا هەیە دووچاری نوشستی دەبێتەوە، لایبنز لەسەرەتای کارە فەلسەفییەکەیدا هەڵگری بیروڕاکانی دیکارت بوو لەفکرە خۆرسکییەکاندا و دژی لۆك دەوەستێت لەو باسەیدا کە دەڵێت: عەقڵمان لەبنەڕەتدا لەتابلۆیەکی بەتاڵ پێکهاتووەو، بەهۆی ئەزموونەکانەوە زانیارییەکان و شتە ئاشکراکانی، دەرك ئەکات بەڵام لە (تاقیکردنەوە نوێکانیدا سەبارەت بەعەقڵی مرۆڤ) ( NOVVEAX ESAIS SUR PENTENDEMENT HUMAIN)

بە بیروڕایەکی نێوەند لەنێوان دیکارت و لۆك دێت کە لۆك و دیکارت بەیەگدەگەیەنێ بەجۆرێکی زۆر گەورە کاتێك کە دەڵێت : ئێمە هەرگیز ناتوانین زانیارییەکانمان تەنها بەپاڵپشتی ئەزموونەکان لێکبدەینەوە.

ئەزمونـەکان هـەموو شـتێك نـین بـۆ زانـیاری وەك لـۆك دەڵێـت : بـەڵکو گەلـێك لەراسـتی‌یە گشـتی‌یە پێویسـتی‌یەکانمانی تـێدایە ( UERITES NECESSAIRRE SETUNIVER SELLES) بـەڵام بـەهۆی ئەزمونەکانـەوە بەدەردەکەوێـت، واتـە ئـەم راسـتی‌یە سـەرەتایی‌یە پێویستیانە بەخۆرسـکی و بـەتوانایی لەعـەقڵماندا هەیـە، بەڵام تەنها بـەهۆی ئەزموونـەوە دەتوانرێـت بەدەربخرێـت و گەر ئەزموون نەبێت بۆمان بەدەرناکەون، بـەڵام ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێ کەپێکهاتەی ئـەزموون بـن و لـەم (مانـا قوولـەوە) (کانـــت) فکرەکانی خۆی وەرگرتووە.

(لایبنز) لەووتـە بەناوبانگەکەیدا دەڵێت : (ئەو شتانەی کەبەهۆی هەستەکانەوە دەرك دەکرێت، عەقڵیش لەخودی خۆیدا دەرکی دەکات)

پاش ئەوەی لایبنز بوونـی فکرە خۆرسکی‌یەکانی چەسپاند واتە بنەما پێویستی‌یەکانی عـەقڵ، بـەڵێ ئـەوەندەی تـر بـەرزبۆوە بەتایبەتی لـە بەڵگەخوازیی‌یەکانـیدا بـۆ گەیشـتن بەچارەسـەرکردنی کێشەکانی پەیداکردن (ایجاد) و بوونەکان پەیداکەر (الموجد)، لەسەر بـنەما سـەرەتایی‌یە پێویستی‌یەکانی عـەقڵ بەمـەتوانی بوونـی خـودای بەخشـندەو سـیفاتە تـەواوەکانی بچەسـەپێنێت و هـەروەها چەسپاندنی دروسـت بوونـی ئـەم گەردونە لەلایەن خوداوە.

بەمەش چەسپاندنی شیاوی دروستکردنی گەردونی لە نەبوونەوە کرد.

حەیران/ چۆن توانـی بگاتە چارەسەرکردنی ئەو ئاڵۆزیانەی کەچەندەها عەقڵی مەزن تیایدا سەرسام و وەستاو بوون؟

شێخ : بەهـەمان بەڵگەخوازیی‌یـەکانی فـارابی و ئیبن سینا و دیکارت و لۆك، گەیشتە چارەسـەرکردنی ئـەوجۆرە کێشـانەی کـەباسمان کـرد، بـەڵام زۆر بـەرزو گـەورە بـوو لەشێوازی ڕەوانبێژی و باوەڕیدا.

بەڵگـە خوازیی‌یەکانی بەکاردەهێنا بەشێوەیەکی ژیرو کارامەو رازاوە پتەو ئاشکراو و تەواو.

پەیوەسـتی زۆری بـە بـنەما پێویسـتی‌یەکانی عەقڵـەوە، مـرۆڤی ناچـار دەکـرد بـۆ باوەڕپێهێنانی.

گوێبیستی بە ئەی حەیران چی دەڵێت.

حەیران/ هەموو لەشم گوێیە، بۆ ووتەکانت گەورەم.

شێخ: لایبنز، دەڵێت: هەموو ئەو راستی‌یە عەقلیانەی کەعەقڵ بڕیاری سەلماندن و سەلماندنی دەدات پێویستە لە سەلماندن و نەسەلماندنەکەیدا پەنابباتە بەردوو بنەما پێویستی عەقڵ، کە ئەمانەن:- یەکەمیان/ (بنەما هاودژیەکان) (التناقض).

دووەمیان/ بنەما هۆ تەواوەکان (العلة الکافیة)، واتە: هەموو ئەندێشەکردنێك، یان، شیاوە یات مەحاڵە، یاخود پێویستە.

هەر شتێك ئەندێشەی کەوتنەوەی شیاو بێت بەلاّم پێچەوانەی عەقڵ بێت ئەوە (مەحاڵە) و، هەر شتێك ئەندێشەکردنی پێچەوانەی عەقڵ نەبێت ئەوە (شیاوە)، هەر شتێك ئەندێشەکردنی نەبوونیەکەی پێچەوانەی عەقڵ بێت، ئەوا پێویستە (واجب) هەروەها هەموو بوونێکی بەرچاو دەکەوێتە ژێر یاسای (هۆ و هۆکارەوە) کە دەبێت هۆیەك هەبێت بۆ پەیدابوونی کەتەواو و بڕەربێت.

وتە بەوەی بەبێ پێویستی (هۆیەکی تەواو) دەکەوێتە بوونەوە، ئەمە پێچەوانەی عەقڵە و لەسەر پەیڕەوی کردنی ئەم دوو بنەمایە (بنەمای هاودژ و) (بنەمای هۆی تەواو) دەتوانین ئاماژەی بیرۆکەی (شیاو) بکەین، ئەوکاتە (دەتوانین) (پەیدا بوو)، شیکار بکەین و، بۆئەوەی بتوانین بڕیاری پەیدابوونی شت بدەین، دەتوانین لەگەڵ (بنەما هاودژەکان) بەراوردی بکەین تا.. بزانین ئەندێشەکردنی پەیدابوون و لێکەوتنەوەی هاودژی عەقلی تیادایە، یاخود.. نەء.. گەر ئەندێشەکردنی پەیدابوون و لێکەوتنەوە هاودژی عەقلی تیادا نەبوو، بڕیاری (مەحالی) دەدەین. گەر ئەندێشەکردنی پەیدابوونی هیچ هاودژی عەقلی، تیادا نەبوو، ئەوا بڕیاری (شیاوی) دەدەین، گەر عەقڵ بەدووری زانی و نەتوانا بوو لەئەندێشەکردنیدا و، بۆئەوەی بڕیاری پێویستی بوونی شتێك بدەین، پرسیار دەکەین، ئایا دەشێت ئەندێشەکردنی نەبوونی ئەو شتە هاودژەی عەقڵ بێت، گەر بڕیاری ئەندێشەکردنی (نەبوونی) بە هاودژی عەقلەوە بە پێویست زانرا بڕیاری ئەوە دەدەین کە (بوونی پێویستە) (واجب الوجود) و بەپێچەوانەوە گەر وانەبوو، بڕیار نادەین.

پاش ئەمە دەچینە سەر شتە واقیعە بینراوەکان کە (هۆ تەواوەکانی) (العلة الکافیة)ی بەسەردا دەچەسپێت و، وا پێویست دەکات کە ئەم بینراوانە (هۆیەك) هەبێت بۆ پەیدابوونیان و، پێویست دەکات کە ئەو (هۆیە) هۆیەکی (تەواو) بێت.

کەواتە بوونی (هۆی تەواو) کارێکە لەپێویستی‌یەکانی عەقڵ و ئینکارکردنی ئەم (هۆ تەواوە) هاودژی عەقلیت بۆ دروست دەکات، چونکە ئەم (هۆ تەواوە) لەبەشەکانی

(پێویستیدایە) (واجب).

لەسەر ئەم بنەما پتەوانە لایبنز بیروڕاكانی خۆی لەسەر (بوون) و (پەیدابوون لەنەبوونەوە) و (پەیداكەر) داڕشتووە، بەم چەشنە باوەڕی بەخودا هێناوە و باوەڕی بەدروستكردنی گەردون لەنەبوونەوە هێناوە، هەروەها باوەڕیشی بەوە هێناوە كەدروستكەری ئەم گەردونە بێ كەم و كوڕییە خودایە كەبەسیفاتی تەواو وەسف دەكرێت.

گەیشتن بەم باوەڕە پاش ئەوە بوو كە بە بەڵگە سەلماندی (شیاویی بوونی خودا) چونكە هیچ هاودژی عەقلی تیادا نییە هەرچەندە عەقڵ نەتوانایە لەئەندێشەكردنی چۆنێتی خودا.

پاشان هاتە سەر بوونی ئەم جیهانەو وتی/ ئەم جیهانە بوونەو دەبینرێت و، خۆی دروستكەری خۆی نییە و، وتە بەوەی كەخۆی دروستكەری خۆی بێت، شتی وا پێچەوانەی عەقلە و، لەبەرئەوەی واقعەو بینراوە كەواتە پێویستی بە (هۆی تەواو) هەیە بۆ بوونی، چونكە بەبێ (هۆیەكی تەواو) بوونی نابێت و، لەراستیدا بوونی هەیەو دەبینرێت و لەوپەڕی شیاویدایە كەواتە دەبێت (هۆی تەواو) بۆ بوونی لەوپەڕی تواناو داناییدا بێت و هەموو سیفاتێكی تەواوی لەخۆگرتبێت و ئەم هۆ تەواوە (خودای بەخشندەیە) كە (بوونی پێویستە) و ئینكاری نەبوونی پێچەوانەی عەقلە حەیران : بەڕاستی ئەم وتەیە بەنرخەو تائێستا گوێبیستی هیچ وتەیەك نەبووم لەمە بەڵگەدارترو پتەوتر بێت.

شێخ : ئەی حەیران، قورئانت لەیاد كرد، كەباوكت هەمیشە خوازیار بوو، بیخوێنیت.

حەیران : من باوەڕم بەوە هەیە كەفەرموودەكانی خودای بەخشندە راسترین و پتەوترین بەڵگەی لەخۆگرتبێت، بەڵام نهێنییەكانی رەوانبێژی ئەم بەشە دەرك ناكەم كە ئێستا تاوتوێ دەكەین، بۆچی شێخی گەورەم ئەم نهێنییانەم بۆ ئاشكرا ناكات.

شێخ : زاناكان زیاتر توێژینەوەی رەوانبێژی قورئان لەبەشە زمانەوانیەكیدا دەكەن، بەڵام رەوانبێژی قورئانی مەزن و بەدەرخستنی ئەو توانایانەی كەعەقڵی مرۆڤ دەركی ناكات لەم بەشەدا خۆی گرتۆتەوە (كەبەشی بەڵگەكانە لەسەر بوونی خوداو سیفاتی تەواوی و، دروستكردنی گەردون و، وەڵام دانەوەی ئەوانەی ئینكاری بوونی خودا دەكەن) كەزۆر ئاشكراو روونترو زۆرترو مەزنترە و، بەدەرخستن و روونكردنەوەی وەك پەیمانم پێدایت لەكاتی خۆیدا بۆتی باس دەكەم.

حەیران : گەر ئەمە بیروڕای لایبنز بێت لەسەر بوونی خوداو سیفاتی تەواوی و دروستکراوەکانی، کەواتە هەڵە گوتنەکانی لەکوێدایە؟

شێخ : تەنها لەو جێگایەدا هەڵەنگووتووە کەویستی ئەو پەیوەندییەی نێوان جەستەو رووح بەدەربخات کەعەقڵ تائێستا سەر سامە تیایدا.

لێکدانەوەیەکی دانا کەزۆر لەبیروڕای مالبرانش دەچێت لەرێکەوتن گونجاندندا و، لێکدانەوەیەکی تێرو چڕ بوو کە لەسنوری توانایی عەقڵ دەستیپێکرد و، بە (رێبازی جەبرینی) کۆتایی پێهێنا کەناگونجێت لەگەڵ کاربەجێیی خودا و سیفاتی تەواوی، وەك سپینوزای هاورێی پێش خۆی.

هەروەها وتی/ ئەو جەستەو روحانەی کەلەجیهاندا هەیە هەمووی بەگشتی لە (گەردیلەی رۆحیی) پێکهاتوون کەهەر گەردیلەیەك جیاواز و ئازادە لە گەردیلەیەکی تر بەبێ پەیوەندیان بەیەکتریییەوە هەریەکەیان بەگوێرەی سیستمی تایبەتی خۆیان دەجولێن.

هەموو گەردیلەیەکیش دوو بەشی لەخۆگرتووە کەبەشی مادديی (کارلێکراوە) و بەشی روحی (بکەرە).

حەیران : بەڵام چۆن ئەم گەردیلانە کار لەیەکتر دەکەن گەر پەیوەندیان بەیەکەوە نەبێت؟

شێخ : لایبنز بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە ، تیۆری (هاوچەشنەی چەسپاوی لەخۆگرتوو) (التناسق السابق التوحید)ی داناوە، هەروەها دەڵێت: (گەردیلە بەتوانای خوددا لەجوڵەو کاردایە، بەشێوەیەك دەردەکەوێت کەهەموویان پەیوەندیان هەبێت پێکەوە بەڵام لەراستیدا ئەو پەیوەندییە نیيە و، تەنها توانایی خوودا والەجوڵەی هەر گەردیلەیەك دەکات بگونجێت لەگەڵ جوڵەی گەردیلەکانی تردا و هەروەها کاری عەقڵ و جەستەش بەم چەشنەیە هەر یەکەیان سیستەمی تایبەتی خۆیان هەیە و بەتوانایی خوددا بەشێوەیەکی سەربەخۆ هەڵدەسن بەکارەکانیان کە گونجاو هاوچەشنی یەکترن بەپێی بیرۆکەی (هاوچەشنەی چەسپاوی پێشینەیی) بەجۆرێك کەمەحاڵە کاری یەکێکیان دوا بکەوێت لەکاری ئەوی تریان و، هەر کاردانەوەیەکی عەقڵی جوڵەیەك لەجەستەدا دروست دەکات هەروەك لکاندن و هاوپەیوەندییەك هەبێت لەنێوەنیاندا، بەڵام لە راستیدا نەبەیەکەوە لکاون و نەکارلێکراوی یەکترن بەڵام ئەو شیاویی و گونجاندنەی کەبەرچاومان دەکەوێت لەکاریگەری (هاوچەشنەی چەسپاوی پێشینە) کە خودا پێی بەخشیوون.

حەیران : ئەم بیرۆکەیە مەحاڵ نییە بەڵکو دەشێت لەسەر بنەمای ئەو باوەڕەی کەلایبنز لەسەر بیرۆکەی (دەشێت) دایناوە، چونکە ئەندێشەکردنی هیچ هاودژیەکی عەقلی تیا نییە.

لەسەر بنەمای خودی ئەو باوەڕە پرسیار دەکەم، ئایا هیچ هاودژیەکی عەقلی دەرك دەکرێت لەنێوان ئەو پەیوەندییە نادیارەی کە لەنێوان روح و جەستەدا هەیە؟

گەر ئەم ئەندێشەکردنە هاودژی عەقلی نەبوو، بەڵکو (شیاوبوو کە ئەم شیاوییە، ئاشکراترو چەسپاوترە و باشترین ئاکام دەدات بەدەستەوە)، چی وای لێکرد لەکاتێکدا هەوڵدەدات دەربازمان کات لەو ئاڵۆزییەی کە لەنێوان پەیوەندی روح و جەستەدا هەیە بمانهاوێتە ناو ئاڵۆزییەکی تر کەزۆر لەو ئاڵۆزترو بێئاکام ترە؟

شێخ/ ووتەکانت راستە.. و گەر نەزان بین لێی دەشێت هەتا کۆتایی.. هەر بەنەزانی بمێنینەوە، گەر ئێمە ئەو پەیوەندییەی نێوان روح و جەستەمان دەرك نەکرد، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەمەحاڵ بێت، تەنها دەتوانین لەگەڵ لایبنزدا بڵێین ئەوە (دەشێت) چونکە ئەندێشەکردنی هاودژی عەقلی تیادا نییە.

گەر شیاو بوو، هیچ شتێك رێگەمان لێناگرێت کەبڵێین ئەم پەیوەندییە بەهۆی توانای خوداوە دەبێت لەجیاتی ئەوەی تیۆرێك لێکی بدەینەوە کە ئەندێشەکردنی ئاڵۆزو نادیار بێت. و نزیك بێتەوە لەبیرۆکەی (جەبری) کەناگونجێت لەگەڵ دادوەری و کار بەجێیی خودادا.

حەیران : گوێبیستی شێخ بووم کە دەڵێت/ لایبنز جیهان لەوپەڕی تەواویدا دەبینێت، مانای ئەمە چییە لەکاتێکدا ئێمە دژواری و خراپەکاری زۆری تیادا دەبینین؟

شێخ/ لایبنز بەگەش بینی بەناوبانگە، هەموو شتەکانی گەردون لەسیستم و چەسپاویی و رازاوەی دەکاتە بەڵگە بۆ تەواوی خودای میهرەبان لەسەر بنەمای بیرۆکەی (هۆ تەواوە لەبەرچاوەکان) (العلة الکافیة للواقع).

میهرەبانی و تەواوی، خودا، هیچ گومانێکی تیادا نییە کەدروستکەری ئەم گەردونەیە و، باشترین جیهانە کەعەقڵ بەشیاوی بزانێت، ئێمە نابێت وەك تاکە رووداوێك بۆ کاتێکی سنوردار سەیری ئەم گەردونە بکەین و سەرنج بدەینە خراپەکارییەکان و چاکەکان لەیاد بکەین.

بەڵکو پێویستە لەسەرمان بەشێوەیەکی گشتی سەرنجی هەموو شتێکی گەردون بدەین تاکو دانایی هەموو شتەکانی دەرك بکەین و، کردارە خراپەکان دەبێت هەبن.. تا..

بەهۆیانەوە بگەینە کردارە چاکەکان ئەم وتەیەیی لایبنز سەبارەت بەخراپەکاری وتەی هەڵگرانی ڕێبازی کەلام و فەیلەسوفانی پێشخۆیم دێنێتەوە یاد.

بەتایبەتی وتەیەکی (جاحظ) کە لەوپەڕی بەرزی و دانایدایە کە دەڵێت/ (خۆشبەختی لەکاری دەستپێکردنی دونیا تا.. کۆتایی ماوەکەی لەتێکەڵبوونی چاکەو خراپەوە زەرەرمەندو سوودمەندی و ناخۆشی و خۆشی و نزمی و بەرزی و زۆری و کەمی دایە. و گەر دونیا تەنها خراپەکاری بووایە ئەوا جیهان لەناو دەچوو و، گەر تەنها چاکەی رووت بووایە، چاکە مانای نەدەبوو و هۆکارەکانی بیرکردنەوەش لەیەکتر دەپچڕان و نەبوونی بیرکردنەوەیش نەبوونی دانایی دەخستەوە. و هەرکاتێك هەڵبژاردن نەبوو جیاکردنەوەش نابێت ئەوکاتە ئەم گەردونە بێبەش دەبوو لەچەسپاندن و وەستاندن و فێربوون کەبەمەش زانستی نەدەبوو و ڕێگاچارە نەدەبوو بۆ نەهێشتنی خراپەکاری و دەستکەوتنی سوودمەندی و بەئارام نەدەبووین بەرامبەر ناخۆشیەکان و نەسوپاس و پێزانینمان دەبوو بەرامبەر خۆشی‌یەکان و، نەمان دەتوانی سەنگینی پەخشانێك لەپەخشانیکی تر، جیابکەینەوە و ململانێ نەدەبوو بۆ پلەو پایە و، چێژی خۆشی سەرکەوتن نەدەبوو، کەبەماناش ڕاستگۆیەك نەدەبوو کەئاماژەی ڕاستی‌یەکان بکات و پووچەڵکەرێك نەدەبوو ڕێکخراوەکان بخاتەڕوو و، گلەیکەرێك نەدەبوو کەموکوڕی سەرسامی و ناخۆشیەکانمان بۆ بەدەربخات و، هیچ هیوایەك نەدەبوو بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی مرۆڤ، گەورەیی و بێگەردی بۆ ئەو خودایەیە کەسوودمەندیی‌یەکانی ئەم گەردونەی بۆ کردوینەتە بەهرەمەندی، زۆر کات زەرەرەکان بەسوودمەندی بۆمان دەگەڕێنەوە و، کۆی هەموو شتەکانی گەردون بەگشتی لەوپەڕی سوودمەندیدایە و یەگرتنیان لەوپەڕی بەهرەمەندیدایە)

حەیران/ بەڕاستی ئەو وتانە لەوپەڕی ڕەوانبێژی و داناییدایە.

شێخ/ جاحظ پێش لایبنز بەنۆ سەدە هاتۆتە دنیاوە، دەبینیت، ئەی حەیران، چۆن عەقڵی بلیمەتەکان یەکدەگرنەوە.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت/ چوومە خزمەت شێخ دەبینم خۆشحاڵ و گەش بینە وە کتێبێکی بە دەستەوەبوو، سەرنجم دا بەزوبانی (ئۆردی) نوسرابوو) سەرم سوڕماو نیشانەی سۆزو خۆشەویستی لەسەر رووم بەدەرکەوت، شێخ سەری هەڵبڕی و سەیری کردم و وتی/ چی‌یە ئەمشەو بەپێچەوانەی دوێنێ شەوەوە، دڵخۆش دەتبینم به (بێ‌بار) ناوت دەنێم، یاخود بەچاوپێکەوتنت بەزبانی نیشتمانەکەت، سۆزو خۆشەویستیت جوڵا بۆ وەتەن.

حەیران/ بەڵێ، ئەمە راستیەکەیەتی، بەڵام ئەو کتێبە چی‌یەو باسی چی‌دەکات؟

شێخ/ ئەم کتێبە تایبەتە بەشێخ (جسر) خودا لێی خۆشبێ.

حەیران/ شێخ (جسر) یەکێکە لەزانایانی هیندستان.

شێخ/ نەخێر.. یەکێکە لەزانایانی وڵاتی شام، بەڵام وەرگێڕراوە بۆ زوبانی ئوردی و تورکی.

حەیران/ ئایا، باسکردنی شێخ جسر هاتۆتە پێشەوە کەتۆ هەردەم باست دەکرد؟ بەڵام باسی سێهەمینی سێ فەیلەسوفەکەت بۆ نەکردم کە (عەمانوئێل کانت) بوو و، زۆر ئارەزوومەندی گوێبیستی باسکردنی دەکەم.

شێخ/ کاتی باسکردنی شێخ نەهاتووە، بەڵام وتەو باست لەسەری بۆ ئامادە دەکەم، بۆئەوەی بۆ شەوی ئایندە تۆژینەوەی لەسەر بکەین، بەڵام ئەمشەو باسی رابەری گومانداراني نوێ دەکەین کە (هیوم) لەگەڵ (کانت)دا کەپێشەوای فەیلەسوفانی نوێیە و باوەڕی بەعەقڵ و دروستکەری عەقڵ هەیە کە (خودایە).

حەیران/ من پەیوەندیم چی‌یە بەڕابەری گومانداراانەوە و گوێبیستی باسی زۆربووم لێیان، هیچ ساغ پوخت و فەلسەفەیەکی دروستم لێ‌وەرنەگرتن.

شێخ : راستە، (هیوم) لەلای رەخنەگرانی فەلسەفەوە بەفەیلەسوفی تەواو بەمانای وتە دانانرێت، چونکە هیچ فەلسەفەیەکی تایبەتی سوودبەخشی دانەناوە بەڵکو تەنها هۆگری

گومـان بـووه. ئینکاری هـەموو شتێکی دەکـرد، تەنانـەت ئیـنکاری عـەقڵ و خوداشـی دەکرد.

بـەڵام ئەگـەر کورتـە باسێکی (هـیوم)ت بـۆ نەکـەم، بـەرزی بەرگـری (کـــانط)ت سەبارەت بەعەقڵ و بوونی خودا بۆ بەدەرناکەوێت، تەنانەت بەرزی (هیوم) خۆیشی بۆت ئاشکرا نابێت.

حەیران/ چۆن؟

شێخ/ بـەڵێ.. ئـەی حەیـران. ئەگـەر گومـانی (هـیوم) نەبوایە (کانط) نەیدەتوانی ئەو تەمەنە درێژەی بەسەربەرێت لە دانانی نووسراوە بەنرخەکانی سەبارەت بە بەرگری کردنی لەعەقڵ.

حەیران/ بەڵام نازانم چۆن (هیوم) ئینکاری نەفس و عەقلی خۆی کرد.

شێخ/ ئـەی سوفسـەتائیەکانی پێشـوو لەگـەڵ گومـانداره دێرینەکان، ئینکاری هەموو شتێکیان نەکرد؟

حەیران/ بەڵێ.. راستە.. بەڵام سوفسەتائیەکان

هەڵخەڵەتێــنەربوون و خەڵکــیان هەڵدەخەڵــەتان و گوماندارانــیش بەبیرۆکـــەی (لائەدرییــەی) دژوار کۆتاییـان هــات و، لەسـەردەمێکدا هــاتن، فەلسـەفە لەعەم ئاسـۆ فـراوانەیدا نــەبوو و، ئــەم هــەموو بەرهەمــە زۆرە دڵرفێـنەی نــەبوو، کـە ئــەو هــەموو فەیلەسوفە گەورانەی خستۆتەوە لەنموونەی (دیکارت و لۆك و لایبنز..)

ئەمانە هەموو بەگشتی هاوچەرخی (هیوم)ن کەتۆ بەرابەری گومانداراني دادەنێیت.

نازانم چۆن (هیوم) لەپاش ئەم فەیلەسوفە گەورانە گومان چووە عەقڵ و خودییەوە؟

شێخ/ هیوم بەزانیارییەکان دەستی پێکردو رێبازی (لۆکی) گـرتە بـەرو هـەروەك ئـەوان ئینکاری فکـرە خۆرسـکییەکانی کـرد و، هەردووکیان باوەڕیـان وا بـوو، هەموو دەستکەوتەکانی بەشەکانی زانیاری بەهۆی هەست و ئەزمونەوە بەدەست هاتووە.

بـەڵام (فکـرە پێکهاتەکان) تـەنها بریـتین لەکۆمەڵە فکرەیەك، بەڵام کاتێك هاوشێوەی بەدەرناکەوێـت لەهەستەکاندا، بەداهێـنەرەکانی عـەقلی دادەنێین گـەر (هیوم) بەمەشەوە بوەسـتایە، هـەر بـاش بـوو بـەڵام دەڵێـت/ لەوانەیە فکرە خۆرسکیەکان کۆمەڵێك فکرەی سـادەو سـاکاربن، دوور نیـیە فکـرە سـەرەتاییەیە ئاشـکراکانی عـەقڵ لەداهێـنەری عـەقڵ خۆی بێت و، زۆر بەپووچەڵیانە دەچێتە ناخی باسەکانیەوە بەشێوەیەك ئینکاری سیستمی (هۆو هۆکارەکان) دەکات.

باوەری وایە کەپەیوەندیی نێوان (هۆو هۆکار) لەوێڵی ئەندێشەکانەوە بێت و هیچ سەرچاوەیەکی نەبێت.

ئێمە دیاردەیەکی پەیدابوو دەبینین کە بەدوایدا دیاردەیەکی پەیدا بووی تر دێت.

لامان وایە دیاردە پەیدابووەکەی دووەمیان هۆکاری دیاردە پەیدابووەکەی یەکەمیانە، لەگەڵ ئەوەی کەهیچ پەیوەندیی‌یەکی عەقڵی پێویست لەنێوەندیاندا نی‌یە کەبڵێین دیاردەی یەکەم (هۆیە) بۆ دیاردەی دووەم.

بەڵام ئێمە هەمیشە وا راهاتووین کەئەم رووداوە یەك لەدوا یەکە ببینین، لامان وا بووە پەیوەندیی‌یەکی (هۆ و هۆکار) لەنێوان ئەم دوو رووداوەدا هەبێت، لەبەرئەوە باوەڕمان وابوو یەکەم (هۆ) یە بۆ دووەم و، بیرۆکەی (هۆو هۆکار) فکرەیەکی خودیی‌یە کەهیچ بوونێکی نی‌یەو تەنها لەعەقڵماندا هەیە.

سیستمی (هۆو هۆکار) تەنها بریتی‌یە لە کورتکراوە ئەزمونەکانی پێشوو و، سەبارەت بەدوا رۆژ بەرگەی کەمترین دووپات بوونەوە ناکات.

حەیران/ وتەکانی (هیوم) دەربارەی نەبوونی پەیوەندی لەنێوان، ئەو دوو دیاردەیەدا، لەوتەکانی (غەزالی) دەچێت کەبەرامبەر (ئیبن روشد) وتویەتی، هەروەك بۆت باس کردم.

شێخ/ غەمبارنیم بەوەی کە تێگەیشتنت کەم بوو بێت بەکورتکراوەکەی سیستمی (هۆو هۆکار) کە غەزالی ئامژاەی بۆ کردووە، چونکە زۆر لەفەیلەسوفە گەورەکان، وەك تۆ تێگەیشتنیان کەم بووە لەخوێندنەوەی (تهافت الفلاسفة)ی غەزالی، لەبەرئەوە بەچاکی دەزانم بگەڕێینەوە سەر ئەو نوسراوەی کەدەربارەی ئەمە نووسیومانەو چاوێکی پیادا بخشێنینەوە.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف وتی/ لاپەڕەکانی ئەو دەفتەرەم هەڵدایەوە کەوتەکانی شێخم تیادا تۆمار کردبوو و، ئەو وتانەم بۆ شێخ خوێندەوە کەدەربارەی غەزالی نووسرابوو.

شێخ وتی/ بەڵێ.. حەیران چیت بەدی کرد.

حەیران/ هیچ جیاوازیەکی/ لەنێوان ئەو دوو وتەیەدا بەدی نەکرد، غەزالی دەڵێت ئەو شتانەی کەدەبیینین لەپەیوەستبوونی (هۆو هۆکار) ناتوانین بڵێین تەنها هۆیە بۆ پەیدابوونی ئەم دیاردەیە، هەروەها هیومیش هەمان بیرۆکەی هەیە.

شێخ/ نەخێر.. ئەی حەیران، لەراستیدا جیاوازی لەنێوان ئەو دوو وتەیە زۆر مەزنە، لەبەرئەوە پێویستت بەروونکردنەوەیەکی نوێ هەیە، چاك گوێبیستم بە.. حەیران : هەموو

لەشم، گوێیە، ئەی گەورەم.
شێخ : سوودمەند نابێت و، تێگەیشتنت ئاسان نابێت گەر نموونەی ئاگرەکەت بۆ بهێنمەوە کەغەزالی باسی دەکات.
چونکە تۆ گەورە بوویت و بێ گومانی لەوەی کەئاگر سوتێنەرە لەبەرئەوە ناتوانیت دەرکی ئەم پێویستیە عەقلیيە بکەیت بەوەی کەئاگر پێویستە سوتێنەر بێت، لەبەرئەوە واز لەنموونەی ئاگر دەهێنین و دەچینە سەر نموونەیەکی‌تر. بۆ نمونە ئەم زەیتی زەیتونە، گەر بۆ یەکەم جار لەژیانتادا ببینیت و، مرۆڤێك پێی ڕاگەیاندی، کەوا ئەم زەیتە بەتەواوی ئاگری لەخۆ گرتووە کەبەسووتاندنی، ئاگرەکە بەدەردەکەوێت، ئایا.. باوەڕت بەمە دەبوو؟
حەیران/ باوەڕم دەکرد گەر لەبەرچاومدا تاقیبکرایەوە.
شێخ/ گەر لەبەرچاوت تاقیکرایەوە، ئایا.. ئەو پێویستیە عەقلیەیی تیادا دەبینیت، کەدان بنێت بەوەی کەزەیت توانای سوتاندنی هەیە.
حەیران/ نەخێر، گەورەم، هەروەك چۆن ئەو پێویستیە عەقلیە بەدی ناکەم لەو باوەڕەدا کەبلێت/ نەتەراتی گلیسرین تایبەتمەندی تەقینەوەی هەیە، پێش ئەوەی زانیاریيەکی تەواوم نەبێت لەرێگای خوێندنە زانستیەکان و ئەزموونەکانەوە، شێخ/ زۆر چاکە ئەی حەیران، ئەم نموونەیەی کەباستکرد باشترە لەنموونەی زەیتەکە و، ئێستاش پرسیارێکی تازەت لێدەکەم، گەر جەستەیەکمان خستە بەردەمت، کە لەژیانتا نەت ناسیبێت و گوێبیستی نەبوو بیت و پرسیارمان لێکردیت، ئایا پێویستیيەکی عەقلی هەیە کەبەسەرتا بسەپێنێت کەباوەڕبهێنیت بەوەی کە ئەم جەستەیە تەنها بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییيەکە، تۆچی دەلێیت؟
حەیران/ من دەلێم.. پێویستیيەکی عەقلی زۆرم لێدەکات کە باوەڕبهێنم بەوەی کەهەموو جەستەیەك کەلێنێك پڕ دەکاتەوە.
شێخ/ بۆچی؟
حەیران/ چونکە.. بەکارێکی سەرەتاو ئاشکرای دادەنێم.
شێخ/ ئەی بۆچی توانای زەیت بۆ سوتاندن و توانای نیتراتی گلیسرین بۆ تەقینەوە بەکارێکی ئاشکراو سەرەتایی دانانێیت.
حەیران/ چونکە من لەکارە ئاشکرا سەرەتاکانی نابینم و، هیچ پێویستیيەکی عەقلی تیادا نابینم کەئەم ئاشکرایی و سەرەتاییيە بەسەرمدا بسەپێنێت.
شێخ/ ئەمانە ڕاستی ڕێبازەکەی غەزالین. و غەزالی هەر لەسەرەتاوە بەهیچ شێوەیەك

ئینكاری بیرۆكەی (هۆو هۆكاری) نەكردوە و، دووریشە لەوەی ئینكاری بكات، بەڵام دەڵێت ئەو دیاردەیەی كە بە (هۆ) ناوی دەبەین، داوای (پێویستی عەقڵی) ناكات بۆ روودانی ئەو كاریگەرەی كە بە (هۆكار) ناوی دەبەین.

عەقڵ ئەو پێویستی‌یە عەقڵی‌یە لەخۆیدا نابینێت كە بڵێت ئاگر سوتێنەرە و پێویستی بەسووتەمەنی هەیە وەك (دار)، بەڵام بەتاقیكردنەوە بینی.. دیاردەی سوتاندن بەهۆی نزیك كردنەوە و تێلكاندنی ئاگرە بۆ دارەكە، ئەم دیاردەیەش، دیاردەیەكی گونجاوە باوەڕم وایە.. كەئاگر هۆیەكە بۆ سوتاندن.

گەر ئەم هۆ گونجاوە نەبوایە كەعەقڵ دەیبینێت بەسەریا نەدەسپێنرا پێویستی باوەڕهێنانی ئاگر بۆ سوتاندن، وەك باوەڕهێنان بەپێویستی پڕكردنەوەی كەلێنێك لەلایەن جەستەوە.

بەڕاستی غەزالی دەیەوێت بەمە بگاتە ئەو وتەیەی كەدەڵێت/ لەبەرئەوەی تایبەتمەندی سوتاندن بوونی زۆر گرنگ نی‌یە و، لەپێویستی عەقڵیدا نی‌یە كەئاگر سوتێنەر بێت و، دەتوانرا ئەم تایبەتمەندیی‌یەی ئاگر پێچەوانەی ئەم سیفەتەی بووایە و، ئەوەی كەتایبەتمەندی و سیفاتی بەئاگرو بەهەموو شتێك بەخشیووە، هەر خۆی دروستكەرێتی و هەر خۆیشی دەتوانێت ئەم تایبەتمەندیی‌یەیان، لی‌دابماڵێت، بەڵام (هیوم) هەر لەبنەڕەت و بناغەوە ئنیكاری سیستمی (هۆو هۆكار) دەكات، تەنانەت ئینكاری عەقڵ و خودی خۆی و گەردون بەگشتی دەكات و دەڵێت/ گەر ئێمە باوەڕمان بەبوونی ئەو شتە بێت كە هەستی پێدەكەین، ئەوا ئەو باوەڕە لەو ساتەی كەهەستەوەرەكانمان كاریگەری شتەكانمان بۆ دەگوێزێتەوە و پاڵمان پێوە دەنێت كەدەركی بوونی بكەین، بەڵام هیچ بەڵگەیەك نی‌یە كەزۆرمان لێبكات باوەڕ بەبوونی ئەو شتە بهێنین گەر شارراوە بوو لەلایەن هەستەوەرەكانمانەوە.

وەك چۆن نەبوونی بەڵگەیەك كەزۆرمان لێبكات باوەڕ بەو شتە بهێنین كەئەمڕۆ بینیوومانە و، وازمان لێهێنان و، بۆ رۆژی دوایی گەڕاینەوە سەری، ئەوا ئەو شتە، هەمان شتە كەرۆژی یەكەم بینیمان و، گرنگی‌یەكەی لەوەدایە كەئێمە دوو شتمان بینیوە و، وێڵی ئەندێشەمان وامان لێدەكات كەئەم دوو شتە بەیەك شت ببینین.

كەواتە، ئێمە، هیچ شتێك لەجیهانی دەرەكی نازانین تەنها ئەو شتانە نەبێت كەلەمێشكماندا هەیە لەدەرك كراوە هەستیەكان و هەموو ئەو شتانەی لەگەردوندا هەن بریتین لەو فكرانەی كەبەدەرك كردن بەدەستی دەهێنین و، هیچ شتێك بێجگە لەمانە لەگەردوندا نی‌یە.

جەوهەری هەموو شتێك گەر ماددی بێت یاخود روحی.. بوونی نی‌یە.

ئایا هیوم لەگومانەکانیدا گەشە دەکات؟ نەخێر نزم دەبێتەوە و دەکەوێتە گێژاوێکی بێ‌سەرو بنەوە کاتێك گومان لەخودی خۆی و عەقلی دەکات و دەڵێت/ لەبەرئەوەی زانیاریی‌یەکانمان هیچ سەرچاوەیەکی نی‌یە گەر کاریگەری هەستەکان نەبێت.

ئێمە لەهەستکراوەکاندا هیچ شتێك نابینین کە بە (عەقڵ و خود) ناوببرێت، کەواتە ئەو عەقڵ و خودە بوونیان نی‌یە کەئێمە ناویان دەبەین.

ئەم وتەیە ئەو تێگەیشتنەم پێدەبەخشێت کەبڵێم من، خودو عەقلم هەیە و، زنجیرە هەستێك لەناخمدا هەیە لەگەڵ فکرە یەك لەدوایەکەکاندا کە بە(خودێکی ژیر) ناویان دەبەم.

وشەی خودو عەقڵ تەنها لەوێڵی ئەندێشەماندا هەیە.

حەیران/ ئەمە، سەیرە.

شێخ/ بەڵێ.. بەم چەشنە ئەم پیاوە ژیرە بەئاشکرا دووچای هاودژی و پێچەوانەیی‌یەکانی عەقڵ دەبێتەوە.

سەبارەت بە (شت) دەڵێت/ تەنها لەفکرەکانی خۆماندا هەن و، فکرەکانمان، بریتین لەبەرهەمی هەست کردنمان بەشت.

پێناسەی شتەکان دەکات بەوەی کەبریتین لەفکرەکانمان و، پێناسەی فکرەکانمان دەکات بەوەی لێکەوتەی کاریگەری شتەکانن،

لەپاشدا ئینکاری هەردوو بەشەکە دەکات،

حەیران/ زۆر ئاسایی‌یە، هیوم لەپاش ئەوەی ئینکاری خودو عەقلی خۆی و گەردون بەگشتی بکات، ئینکاری خودای پەروەردگاریش بکات، هەروەك شێخ فەرمووی.

شێخ/ بەڵێ.. بێ‌باوەڕی بەبوونی خودا ئاسایی‌یە بۆ مرۆڤێك کەئینکاری بێ‌سنوری هەبێت بۆ هەموو ئەو شتانەی کەبوونیان هەیە، گەر ئاگاداری بەڵگەکەی بیت بۆ نەبوونی خودا، بۆت ئاشکرا دەبێت کە ئەم پیاوە چەند بێ بارە لە فکرەکانیدا.

حەیران/ بەڵگەی چی‌یە بۆ نەبوونی خودا ؟

شێخ / دەڵێت /ئێمە هیچ شتێك دەربارەی ( هۆ) نازانین تەنها ئەوە نەبێت رووداوێکی پێشووە، کەپێش رووداني هۆکارەکەی بەرچاومان دەکەوێت.

کەواتە دەبێت هەردوو رووداوەکە ببینین، رووداوی پێشوو وەرووداوی دوای ئەو (بوونی ئەم گەردونە ئاماژەی بوونی دروستکەرەکەی ناکات، تەنها لەحاڵەتێکدا نەبێت کەئەویش ببینیی دروستکراو دروستکەرە بەگشتی پێکەوە).

حەیران/ خودا بمان پارێزێت لەم گومڕا هی‌یە ئاشکرایە.

شێخ/ ئەمە، لەگومڕاهی زیاترە بەڵکو سورە لەسەر بیرۆکە هەڵەکەی خۆی، تەنانەت گەر خودا زاتی خۆیشی بۆ بە بەدەربخات، وەك ئەوەی هیوم خۆی خوازیارێتی و، چۆنێتی دروستکردنی گەردونیشی پیشان بدات بەگوێرەی داواکاریی‌یەکانی خۆی، هەر سور دەبێت لەسەر ئینکاریی‌یەکەی هیوم دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ وتەکەی پێشووی لەسیستمی (هۆ و هۆکاردا)، ئەم دیاردەیە، دیاردەی تری بەدوادا دێت و هیچ پێویستی‌یەکی عەقڵی لەم دوا بەدوا هاتنەدا نی‌یە کەپێویستی خودا وەك هۆیەك دابنێت بۆ بوونی خوداو دروستکراوەکانی.

بەدەرخستنی ئەم بیروڕا پووچەڵانە بۆت، تەنها بۆئەوەی بیخەمە پێوەری ئەو بەراوردیی‌یەی لەنێوان (لایبنز) کەپێش هیوم هاتووە و کانت کەدوابەدوای هیوم هاتووە.

حەیران/ سەرنج ئەدەم شێخی گەورەم زۆر ئاماژەی (کانت) دەکات و ناوی دەخاتە ریزی غەزالی‌یەوە بەچەشنێك وای لێکردوم سۆزێکی مەزنم هەبێت بۆ خوێندنەوەی فەلسەفەکەی لەبووندا.

شێخ/ ترسناکترین شت لەسەرت ئەوەیە کە بەتەنها فەلسەفەکانی کانت بخوێنیتەوە بەبێ مامۆستایەکی رێپیشاندەرو رووناککەرەوە کە ئەو کەندو لەندو ئالۆزیانەی کە لەوتەکانیدا هەیە بۆت بەدەربخات و، (کانت) دان بەوەدا دەنێت کە ئەم ئالۆزیی‌یە لەفەلسەفەکانیدا بۆ گەورە فەیلەسوفەکانی نووسیوە.

لەوە ترسناکتر ئەوەیە ئەو نووسراوانە بخوێنیتەوە کەخەڵك لەسەر کانت نووسیوویانە و سەرسام دەوەستیت لەنێوەند کۆمەڵێك کەبەگەورەترین باوەڕداری دەژمێرن و، کۆمەڵێکی تر کە بەگەورەترین بێباوەڕی دادەنێن.

حەیران/ ئەی راستیەکەی کامەیە؟

شێخ/ راستیی‌یەکەی ئەوەیە کەفەلسەفەکانی کانت هیچ گومانێکی تیادا نی‌یە و، یەکێکە لەباوەڕداران بەبوونی خودا و، زۆر بەدڵسۆزانە خزمەتی ئەم باوەڕەی کردووە. بەڵام دوای ئەوەی چەکی ئامادەکرد بۆ بەرەنگاریکردنی گوماندااران و بێباوەڕان و، زۆر تیژکردنەوەی ئەم چەکەی وای لێکرد تەنانەت خۆیشی نەتوانا بێت لەبەکارهێنانیدا.

حەیران/ ئەمە، سەیرە، چۆن باوەڕدار دەبێت بەبوونی خودا و، لەهەمان کاتدا چەکێك دروست دەکات بۆ بەرگریکردن لەم باوەڕە، کەلەپاشدا خۆی نەتوانا دەبێت لەبەکارهێنانیدا.

شێخ/ (کانت) لەبەرگریکردن لەعەقڵ لەیەکچوونێکی زۆری هەیە لەگەڵ

(سوکراتدا) و لەباوەڕیدا لەئیبن روشد دەچێت و، گومانە بەرفراوانە پووچەڵەکەی (هیومی) پێشەوای گوماندااران، (کانتی) ترساندبوو، وەك چۆن گومانی سەفسەتائیەکان (سوکرات) یان ترساندبوو، ویستی هەروەك (سوکرات) بەرگری لەعەقڵ بکات، تاوەکو جارێکیتر بەدەرببخات کەزانیاری تەنها بەهۆی هەستەوە بەدەست نایەت بەڵکو بەهۆی ئەو عەقڵەوە دەبێت کە دەتوانێت هەست بکاتە کارێکی ڕەوا بۆ عەقڵ و هەروەها ئەوانەیشی کەلەپشت هەستەوەن و هەست پەیوەندی لەگەڵیاندا نییە و، زۆر بەرزو گەورە بوو لەبەرگریکردنەکانیدا لەعەقڵ.

بەڵام پاش بەدەرخستنی بنەماو پایەکانی عەقڵ و بەڵگە هێنانەوە لەسەر تواناو هێزی عەقڵ و ئاشکراکردنی یاسا خۆرسکییەکان و روونکردنەوەی شتە ئاشکرا بێ گومانە جێگیرکراوەکانی ناو عەقڵ، باوەڕی وای هێنا وەك چۆن ئیبن روشد پێش ئەو باوەڕی وابوو، بەڵگە تیۆرییە عەقڵییە پێکهاتووەکان، عەقڵ دووچاری ترازاندن و سەرسامی دەکەن، هەروەك (ئیبن روشد) ڕێبازێکی دیکەی بۆ خۆی هەڵبژارد لەبەڵگەخوازیدا بۆ بوونی خودا، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبوو لەم هەڵبژاردنەیدا.

وتەکانی (کانت)ت بۆ کورتکراوە و ساکار دەکەم، بەسادەترین شێواز، هەروەك چۆن هۆگری ئەم شێوازەم کردوویت، لەبەرئەوە تکایە چاك گوێبیستێکی بە.

حەیران/ بەڵێ، گەورەم هەموو لەشم گوێ دەبێت.

شێخ/ (کانت) ئەم پرسیارە دەکات:- ئایا عەقڵ لەخودی خۆیدا ئەو توانا تایبەتییەی هەیە کەوای لێبکات بتوانێت بگاتە پێکهێنانی دروستکردنی بڕیارەکان بەبێ پەنابردنە بەر هەست و ئەزمون؟ و سنوری ئەو توانایە چەندە؟

(کانت) بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە پاش گەشەکردنی فەلسەفەکەی کتێبی (ڕەخنەگرتن لە عەقڵی پوخت)ی دانا کە بەهاترین کتێبیەتی لەبواری بەرگریکردن لەعەقڵ.

بەڵام وەڵامە وردە دوورو درێژەکەی بۆ ئەم پرسیارە کەپەیوەستە بەچەند بنەمایەکەوە سەرەتا بۆت کورت دەکەمەوە و دەیخەمە بەرچاوت کەتۆژینەوە و باسەکانمانی لێدەکەوێتەوە، (کانت) دەڵێت/ سەرچاوەکانی زانیاری بەهۆی (هەست و عەقڵەوەیە).

ناتوانین تەنها بەهۆی (هەستەوە) زانیارییەکانمان بەدەست بهێنین، وەك چۆن ناتوانین تەنها بەهۆی عەقڵەوە زانیارییەکانمان بەدەست بهێنین.

لەعەقڵدا بیرۆکە خۆرسکییە چەسپاوەکان هەیە کانت بە (یاسا ڕێکخراوەکانی عەقڵ) ناویان دەبات کەعەقڵ بەهۆیانەوە دەتوانێت دەرکی ئەو پەیوەندییە لەبەرچاوانە

بکات کەلەنێوان کارلێکراوانی هەستدا هەیەو پێی دەگات؛ بەهۆی هەستەوە (دەرککراوە هەستیەکان) پێکدێت و بەهۆی دەرککراوە هەستیەکانەوە (دەرککراوە عەقلیەکان) دروست دەبێت.

گرنگترینی ئەم فکرەو یاسا خۆرسکیانە (فکرەی چەرخ و شوێن و سیستمی هۆو هۆکارە).

عەقڵ بەهۆی توانای یاسا رێکخراوەکانی‌یەوە دەتوانێت، لەخودی خۆیدا بڕیار دروست بکات و هیچ پەنا نەباتە بەر هەست و ئەزمون. بەڵام ئەم توانایەی عەقڵ، سنوردارەو پەیوەستە بەدیاردەکانی هەستەوە، گەر عەقڵ هەوڵیدا دەرباز بێت لەگۆڕەپانی ئەم دیاردانەو، بچێتە ناخی خودیی شتەکانەوە دووچاری هەڵە دەبێت و، پیشەو کاری میتافیزیکی ئەوەیە دەست نیشانی جێگای ئەو هەڵەیە بکات کە دووچاری عەقڵ دەبێت لەچوونە ناو جیهانی پشت هەستەوە، چونکە جیهانێکی شارراوەیە،

حەیران/ ئەمانەی کەگوێبیستی بووم شتێکی نوێی تیادا نی‌یە، بەڵام لەو وتەیە تێناگەم کەدەڵێت/ عەقڵ لەخودی خۆیدا توانای دروستکردنی بڕیاری هەیە بەبێ پێویستی (هەست) و، وتەی، بەوەی کەعەقڵ نەتوانایە لەتێپەڕبوونی لەچوارچێوەی هەستدا.

شێخ/ لەراستیدا (کانت) لەم بنەمایانەیدا شتێکی نوێی داهێنەری جوانی نەخستۆتەوە، بەڵام بلیمەتی نواند لەچەسپاندن و بەڵگەخوازی راستی وتەکانی.

مانەوەی کارەکانی عەقڵ تەنها لەچوارچێوەی هەستدا کردارێکی راستەو گومانی تیادا نی‌یە، هەرچەندە ئاکامە بەدەستهاتووەکانی (کانت) سەبارەت بەمانەوەی عەقڵ لەچوارچێوەی هەستدا بێ‌هەڵە نی‌یە.

حەیران/ تێناگەم، تکا.. لەشێخی گەورەم دەکەم زیاتر بۆم روون بکاتەوە.

شێخ/ (کانت) دەڵێت/ هەستەکان لەرێگای هەستەوەرەکانەوە بەچڕی و تێکەڵاویی و چوونە ناو یەکی‌و جۆراوجۆرەوە دەگەن بەعەقڵ.

عەقڵیش ڕیزبەندی و پۆلێن کراوی و جیاکراوەیی وەریان دەگرێت و، هاوەڵێتی لەنێوانیاندا دروست دەکات و لەیەکیشیان دووردەخاتەوە و هەندێکیان پێش دەخات و هەندێکی تریان دوا دەخات و گرنگی ئەدات بەهەندێکیان و هەندێکی تریان پشتگوێ دەخات، عەقڵ لەم شتانە بەگشتی (دەرککراوێکی هەستی) پێك دەهێنێت.

لەپاش ئەوەی عەقڵ ئەم دەرك کراوە هەستیانەی بەدەست هێنا، بەبێ ئەزموون و هەست دەرك کراوەکانی عەقڵ و بڕیارە نوێکانی بەدەستکەوت.

ئایا بەچ توانایەك عەقڵ ئەم کارانە دەکات؟

هەستەکان تەنها وێنەی شتەکان بۆ عەقڵ دەگوازێتەوە، بەڵام پەیوەندییە بەرچاوەکانی نێوەند شتەکان بەبێ جیاوازی رێکخستنەکانی چەرخ و شوێن یاخود هۆکاری هەندێکیان لەسەر هەندێکی تریان. ئەم پەیوەندییە عەقڵییەی نێوەند شتەکان لە وێنەی شتە هەست لێکراوەکاندا بوونیان نییە کەواتە عەقڵ لەکێوە ئەم بڕیارە نوێیانە دەخاتەوە کەلێکەوتەی ئەم پەیوەندیانەن.

ئێمە سەیری دوو ژمارەی جیاواز دەکەین، بەڵام دەتوانین بەهۆی کۆکردنیانەوە ئاکامێك بەدەستبهێنین کەجیاوازە لەئاکامی لێکدانیان.

گەر ئەم دەرك کردنە تەنها بەهۆی هەستەوە بێت هیچ پێویستی نەدەکرد کەئەم کردارە ژمێریارانە جیاواز بن، چونکە چاو تەنها یەك شێوەی وێنەمان دەداتێ کە هەرگیز ناگۆڕێت و، هەر بەهەمان شێوەیە دەرك کردنمان بۆ ئەو پەیوەندییەی لەنێوان هۆو هۆکاردا هەیە، چونکە هەستەکانمان وێنە دیاردەکانمان بە هەڵوەشاوەیی و یەك لەدوایەکی پیشان دەدات و، هەرگیز ئەو پەیوەندییە هۆو هۆکارییە پیشان نادەن، ئایا چۆن ئێمە ئەو پەیوەندییە بزانین؟ و چۆن دەرکی ئەو ئاشکرا سەرەتاییانە بکەین بەوەی کەهەموو هۆکارێك هۆی هەیە؟

لێرەدا (کانت) دەگاتە ئەو بیرۆکەیەی کە دەڵێت/ عەقڵ خاوەنی یاسای رێکخراوی خۆرسکییە، کەبەهۆیانەوە دەتوانێت دەرکی هەستەکان بکات و بیانگۆڕێت بۆ دەرك کراوەکانی هەست و لەپاشدا بەهۆی دەرك کراوەکانی هەستەوە دەگاتە دەرك کراوەکانی عەقڵ بەگشتی کەعەقڵ خۆی پاش ئەم کردارانە بڕیاری نوێ دروست دەکات کەبەهیچ شێوەیەك پەنا ناباتە بەر هەست؟

لەکۆمەڵەی فکرەکانی عەقڵ و یاسا خۆرسکییەکانیەوە، فکرەی چەرخ و شوێن دەرك دەکەین، کە ئەم دووانە عەقڵ لەرێگای هەستەوە نایان گاتێ، چونکە لەشتدا بوونیان نییە، هەتاکو هەست بیان ناسێت.

بەهۆی بیرۆکەی چەرخەوە مرۆڤ دەستنیشانی کاریگەرەکانی هەست دەکات و بەگوێرەی رێزبەندییە یەك بەدوایەکەکانی چەرخ رێکی دەخات و، بەهۆی بیرۆکەی شوێنەوە شان بەشانی عەقڵ لەنێوان کاریگەرەکانی هەستدا دەڕوات یاخود دەست بەردار دەبێت لێیان و لەمێشکیدا بەگوێرەی شوێن رێکیان دەخات کەبەهۆیەوە دەرك کردنەکانی دادەرێژێت، گەر بیرۆکە چەرخی و شوێنییە بیە چەسپێنراوەکانی عەقڵ نەبوایە، عەقڵ نەتوانا دەبوو لەهەموو دەرك کردنێك و نەیدەتوانی پەیوەندییەکانی عەقڵ

لەنێوەند شتەکاندا کە لەبەرچاون ئاماژەیان بۆ بکات و، هەروەها نە تواناً دەبوو لەدەربڕینی بڕیارە نوێیە پەیوەستەکانی شوێن و چەرخی شتەکان، لەبەرئەوەی هەموو بابەتە ماتماتیکەکان بریتین لەپەیوەندی و ڕێژەی شتەکان بەپەیوەستبوون بەچەرخ و شوێنەوە، چونکە ئەندازە پەیوەستە بەشوێنەوە و، ژمێرياری کەبریتییە لەژمێرە دووبارە ویەك لەدوا یەك کەئەمیش پەیوەستە بەدەرك کردنی چەرخەوە/ کەواتە بنەماکانی ماتماتیك بریتین لەبنەما عەقلیە خۆرسکییە هەلقولاوەکانی سروشتی عەقڵ خۆی. کەبەبێ پێویستی ئەزمون دەرککراو زانراون، لەمەوە بۆمان بەدەردەکەوێت کەبنەما ماتماتیکەکان هەموویان بەگشتی ڕاست و دروست و بێ گومانن و، مەحالە گومانی لێبکرێت و هەلەیەکی تیادا بەدی بکرێت، یاخود.. ئەندێشەی پێچەوانەی ئەم ڕاستیەی لێبکرێت، ئێمە دەتوانین ئەندێشەی نەسوتێنەری ئاگر بکەین (وەك غەزالی دەڵێت) بەڵام هەرگیز ناتوانین بڵێین/ (یەك نیوەی دوو نییە) و هەروەها هێڵی ڕاستی نێوان دوو خاڵ کورت ترین هێڵ نییە. چونکە بنەماکانی ماتماتیك هەلقولاوی سروشتی عەقڵ خۆیەتی.

هەروەها وەك چۆن عەقڵ بەتوانای بیرۆکەی چەرخ و شوێن کە لەمێشکدا هەیە، هەستەکان بگۆڕێت بۆ دەرك کراوەکانی هەست و هەروەها دەتوانێت بەهۆی یاسا ڕێکخراوە خۆرسکییەکانی تریییەوە هەلبسێت بە بەراوردکردن و شیکارو پێناسەکردن بۆ ئەو دەرك کراوە هەستیانە، تاوەکو دەرك کراوە عەقلیەکانیان لێ بەدەستبهێنێت و بڕیارە نوێکانی لێیك بهێنێت بەبێ پەنابردنی بۆ هەست و، گرنگترین یاسا ڕێکخراوەکانی عەقڵ (یاسای هۆو هۆکارە) کەبەهۆیەوە دەرك کردنێکی پوخت دروست دەکەین، هەموو گۆڕانێك پێویستی بەهۆو هۆکار هەیە و، بەتوانای ئەم یاسا گرنگییە خۆرسکییەی عەقڵەوە دەتوانین شارەزای هەموو یاساو سیستەمەکانی سروشت ببین.

حەیران/ ئەمە هەمووی ڕوون و ئاشکرایە، گەر عەقڵی ئێمە خۆرسکیانە دەرکی بنەما گرنگەکانی ماتماتیك بکات و، دەرکی یاساکانی زانست بەهۆی توانای یاسا گرنگە هۆو هۆکارەکانی عەقڵەوە بکات، کەواتە (کانت) چۆن دەڵێت/ توانای عەقڵ سنوردارەو پەیوەستە بەدیاردەکانی هەستەوە.

شێخ/ گەر هەندێك چاوەڕوان بویتایە دەمگەیاندیتە وەڵامی ئەم پرسیارە. لەسەرەتاوە کورتکراوەیەکی (کانت)م سەبارەت بە (توانای عقل) پێشکەش کردیت و، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە وتەکانی دەربارەی (نەتوانایی عەقڵ) باس بکەین.

پاش ئەوەی (کانت) بەرگری لەتوانای عەقڵ کرد دژی ئەوانەی کەعەقڵیان لەپێش

ئـەزمون و تاقـیکردنەوەکاندا بەتابلۆیـەکی بـەتاڵ دائـەنا و هـەروەها دژی ئەوانـەی کەگومانـیان لەعـەقڵ هـەبووە و ئینکاری بوونـیان دەکرد، پاش ئەوە بۆت دەرکەوت کە (کانـت) بەڵگەی لەسـەر عـەقڵ هێنایەوە بەوەی کـە خـاوەنی توانایەکی خۆرسکی‌یە بۆ ڕێکخستن و ڕیزبەندی و شیکار و پێناسە و ئاکام خوازی و دروستکردنی بڕیارە ڕاست و دروستەکان، لەپاشـدا دەڵێت/ ئـەم توانایـەی کـە لەعەقڵی پوختدا هەیە بۆ دەرك کردن لەچوارچێوەی ئـەو بەشـە (دیاردەیەیـە) کەهەسـت دەرکـی دەکـات، چـونکە گـەر عـەقڵ بەتوانا بێـت بـەهۆی هێزە فکرە خۆرسکی‌یەکان و یاسا ڕێکخراوەکانی‌یەوە پێکهێنانی دەرککـراوەکانی هەسـت دەکـات و لەپاشـدا دەرك کـراوەکانی عـەقڵ دەرك دەکـا، ئەوکاتەش پێویستی بە (کەرەستە) دەبێت بۆ پێکهێنانی ئەم دوو دەرك کردنە.

ئـەو کەرەسـتانەش بریـتین لەهەسـتەکانی و لەبەرئـەوەی هەسـتەکان تـەنها ڕواڵـەتی شتەکان دەرك دەکەن و ناچنە ناخی ئەو شتانەی کە هەستیان پێناکرێت.

عەقڵمان لەخودی خۆیدا بەتەنها ناتوانێت بچێتە قوڵای ناخی شتەکانەوە.

گـەر بمانەوێـت نـاخی شتێك لـەخودی خۆیدا بزانین بەهەمان یاساکانی عەقڵ کەتەنها دەرکـی ڕواڵەتەکان دەکات، دووچاری هەڵە دەبین و، کاری میتافیزیکی ئەوەیە ئاماژەی شـوێنی ئـەو هەڵەیـە بکـات، کەعـەقڵ دووچاری دەبێت لەکاتێکدا کەدەیەوێت لەسنوری چوارچێوەی دیاردەکـانی هەسـت تێپەڕێـت و بگاتـە ئـەو ڕاستیە بێ‌کۆتایی‌یـە کەلـەپاش هەستەکانەوە هەیە،

حەیـران/ مانـەوەی عـەقڵ تـەنها لەچوارچـێوەی هەسـتەکاندا ڕاسـت و ئاشـکراو بێ‌گومانە.

کەواتـە ئـەو ئاکامانـە چـۆن ڕاسـت نـین کـە (کانت) لەمانەوەی عەقڵ لەچوارچێوەی هەستدا بەدەستی هێناوە، وەك شێخی گەورەم دەڵێت،

شێخ/ ئـا... لـێرەدا مەبەستی وتـەکانم سـەبارەت بە (کانت) بەدەردەکەوێت و خاڵی جیاوازی بیروباوەرەکـانی تـیادا بـەدی دەکرێـت، کەهەندێ کەس لەو کەسانەی دائەنێن کەبێ‌باوەڕن بـەبوونی خـودا و هـەر لـێرەدا کەلـێن لەهـەندێ لەفکرەکانی ئەم پیاوە مەزنە بەدەردەکەوێـت، ئەمـەش نـەتوانایی عـەقڵی (کانـت) بەدەردەخات، هەروەك چۆن غەزالی لەئەندێشـەکانیدا بـۆ سـەرەتاو کۆتـایی و بێ‌کۆتـایی چـەرخ و شـوێن لەگـەڵ ئیبن ڕوشدا دوو چاری وێڵی ئەندێشە بوونەتەوە.

(کانت) نەتوانا بوو لەبەدەرخستنی بەڵگەخوازی پێکهاتە عەقڵیەکان، هەروەك کانت وەکـو غـەزالی دەڵێـت/ گـەر عـەقڵ هەوڵـیدا بڕیاری سنورداری و بێ‌کۆتایی ئەم گەردونە

بـدات بەگوێـرەی شـوێن، دەکەوێـتە هەڵــە و هاودژییـەوە. چـونکە ئـێمە لەلایەکـەوە ئەندێشـەمان وایـە کەلـەدوای هـەموو سنورێکەوە شتێکی دوورتـر لـەو هەیـە و لەلایەکی ترەوە مەحاڵە لامان، ئەندێشەی بێ کۆتایی بکەین لەخودی خۆیدا و، هەروەها گەر عەقڵ ئەندێشـەی ئەوە بکـات بـەوەی کە گەردون سەرەتایەکی هەیە لەچەرخدا. بەهەمان شێوە عـەقڵی دوچـاری نـەتوانایی دەبێـتەوە، چـونکە ئێمە نـەتوانایین ئەندێشـەی بێ کۆتـایی هـەتا هـەتایی بکـەین کەهـیچ سـەرەتایەکی نی‌یـە، وەك چـۆن نـەتوانایین لەئەندێشـەکردنی ئـەو چرکەیەیی کەبەسەرەتایی دەست پێکردنی چەرخ ناودەبرێت، چونکە ناچار دەبین لەپاش ئەندێشـکردنی ئـەو چرکەیە ئەندێشـەی پێش ئـەو چرکەیە بکـەین، بەهـەمان شـێوە دەبین لەئەندێشـەکردنی عـەقڵ بـۆ زنجیرە بێ کۆتایی‌یەکانی (هـۆو هۆکـار)، چونکە لەلایەکەوە نـاتوانین ئەندێشـەی زنجـیرەی بێ کۆتـایی بکـەین و، لەلایـەکی تـرەوە عـەقڵمان نەتوانایـە لەئەندێشـەکردنی هۆکـاری یەکـەم بـەبێ هۆکارێکی‌تـر و بـۆ ئـەوەی لـەم هـەموو گێژاوە رزگارمـان بێـت پێویستە دەرکی بیرۆکەی چەرخ و شوێن و یاسای هۆو هۆکارو هەموو یاسـا رێکخـراوەکانی عـەقڵ بکـەین بـەوەی کـە کاریان بەگشـتی لەچوارچێوەی دەرك کراوەکانی هەستدایە واتە لە چوارچێوەی ئەو دیاردا نەدایە کەهەست دەرکی دەکات.

گـەر بمانەوێـت دەرکـی ئـەو شـتانەی پشـت هەسـت بکـەین دووچـاری هەڵـەو گـێژاو دەبینەوە.

حەیـران/ مانـەوەی عـەقڵ لەچوارچێوەی هەستدا هـیچ هەڵەیـەکی تیادا بەدی نەکرا، کەواتـە هەڵەکانی (کانت) لەئاکام خوازیی‌یەکەیدا لەکوێدا بەدەردەکەوێت؟ شێخ/ ئەمە راستە، بەڵام (کانت) لەئاکام خوازیی‌یەکانیدا تووشی هەڵە بووە. کاتێك گومانی وابوو (گەر ئێمە هەوڵماندا بەهۆی عەقڵێکی تیۆریی بەڵگە بۆ بوونی خودا بهێنینەوە دووچاری هەمان گێژاو دەبین).

ئـێمە لەگــەڵ (کانــت)دا لەســەر ئــەو وتەیــەیی رێدەکــەوین کەدەڵێــت/ یاسـا رێکخراوەکانی عەقڵ لەگۆڕەپانی دیاردەکانی هەستدا دروست دەبێت و، هەروەها باوەڕ بەو وتەیەشـی دەهێـنین کەدەڵێـت/ یاسـاکانی هـۆو هۆکـارە گرنگەکان لەچوارچێوەی هەستدا دروست دەبن.

بـەڵام ئایـا ئەم گەردونە بەگشتی و بەشەکانی‌یەوە بەشێك نین لەهەستپێکراوەکان ئەی حەیـران. و بەهـۆی توانـای یاسای هۆو هۆکارە گرنگەکانەوە وەك کانت دەڵێت بڕیاری ئـەوە ئـەدەین کەهـەموو گۆڕانێك پێویستی بەهۆکارێکە و هەموو هۆکارێکیش پێویستی بەهۆ هەیە.

گەر ئێمە دیاردەیەك لەدیاردە بچووکەکانی ئەم گەردوونە ببینین بڕیارێکی گرنگی لەسەر دەدەین بەوەی ئەم دیاردەیە هۆیەك هێناویتیە بوونەوە.

گەر ئێمە بڕیاری گرنگی هەموو دیاردەیەکی بچووکی ئەم گەردونە بدەین، کەپێویستیان بەهۆ هەیە، ئایا عەقڵمان داوای ئەوە ناکات کەبڕیاری بوونی هۆیەکی تەواو بدەین بۆ هەبوونی ئەم گەردونە هەستپێکراوە گۆڕاوە؟

(کانت) زۆر راست بوو لەوەدا کەدەڵێت، هەموو هەوڵدانێکی عەقڵ بۆ گەیشتن بەناخی سەرچاوەی راستیەکان هەوڵدانێکی بێهوودەیە و، هەروەها راستی ووت کاتێك کەرروونی کردەوە، عەقڵ ناتوانێت بۆ دەرکی ناخی جیهانی پشت هەستەکان کەجیهانێکی شارراوە و نادیارە لە گۆڕەپانی دیاردە هەستیەکان تێپەڕێت، بەڵام لەچوارچێوەی ئەم جیهانی هەستەدا لەدڵ و دەروناندا پێویستییەکی عەقڵی دەرکی ئەوە دەکات کە ئەم هەستکراوە بەرزانە بەگشتی پێویستیان بەهۆیەك هەیە بۆ بوونیان و، زەرەرمەند نابین گەر ئەو وێڵی ئەندێشەیە سەربکات بۆ ناو عەقڵمان و زۆرمان لێبکات بەوەی، کە هەموو هۆیەك بەهۆیەکەوە بەندە و پێش هەموو چەرخێك چەرخیتر هەبووە و، دوای هەموو شوێنێك شوێنێکیتر هەیە.

هەروەها لەدەرك کردنی دیاردە بچووکەکانی رۆژانەی ژیانمان ئەم وێڵی ئەندێشەیە هۆگرمانە وجیانابێتەوە لێمان بەڵام لەگەڵ بوونی ئەم وێڵی ئەندێشەیش ئێمە دەرکی ئەوە دەکەین کە ئەم دیاردە بچووکانە ئاکامی هۆیەکن و، هیچ کاتێك بە خەیاڵمان دانایەت ئینکاری ئەم هۆیە بکەین بە بەهانەی ئەوەی کەوێڵی ئەندێشەیی عەقڵ داوای زنجیرە هۆیەکی بێکۆتاییمان لێدەکات. یاخود بە بەهانەی ئەوەی ئێمە هیچ زانیارییەکمان نییە سەبارەت بەناخی (هۆ)کاندان.

گەر ئێمە ئەم جیهانە هەستکراوەمان بینی و نەمان توانی ناخی هۆ تەواوەکانی بزانین کەهۆکارە بۆ بوونی، واتە زاتی خودا کەدروستکەرو هێنانە بوونێتی، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەئینکاری بوونی ئەم دروستکەرە بکەین کە خودایە. تەنها لەبەرئەوەی هیچ زانیارییەکی تەواومان دەربارەی زات و سیفاتی نییە، گەر ئێمە ئەم ئینکارییەمان کرد ئەوا ئینکاری یاسای هۆو هۆکار دەکەین کە کانت سەبارەت ئەم یاسای هۆو هۆکارە دەڵێت/ هەموو هۆشمەندێك باوەڕی وایە کەیاسای هۆو هۆکار یاسایەکی گرنگی چەسپێنراوی عەقڵە.

حەیران/ کەواتە شێخی گەورەم (کانت) بەباوەڕدار دادەنێت؟ و چ بەڵگە خوازییەکی گرتەبەر بۆ باوەڕهێنان بەبوونی خودا؟

شێخ/ وەك بۆت بەدەردەکەوت (کانت) بەڵگە تیۆریی پێکهاتەکانی عەقڵی بەزەحمەت زانی وەك چۆن پێش ئەو ئیبن روشد بەزەحمەتی زانی هەربۆیە بەڵگەیەکی تری گرتەبەر کەتێکڕا لە (دەرك کردنی راستەوخۆ) دەچێت، ئەو بەڵگانەی کەبرگسوونی گەورە فەیلەسوفی باوەڕدار بەبوونی خودا لەسەدەی بیستەمدا بەهەمان شێوە پەیڕەوی دەکرد.

حەیران/ ئەی کانت پەیڕەوی (بەڵگەکانی سیستمی) نەکرد، کەئیبن روشد گرتبویە بەر کە بە بەڵگەی (بایەخدان و داهێنان) ناویان دەبات.

شێخ/ نەخێر، ئەی حەیران، ئا.. لێرەدا کەلێنی لاوازیی‌یەکەی (کانت) بەدەردەکەوێت و، شتێکی سەیر نی‌یە بۆ (کانت) گەر بەڵگە پێکهاتووەکانی عەقڵ بەزەحمەت بێتە بەرچاوی، (هەروەك ئیبن طوفەیل و ئیبن روشد پێش ئەو بەزەحمەتیان زانی) و کانت واز لەو بەڵگانە بهێنێت و لەدوی بەڵگەیەکی سادەی ئاشکرا بگەڕێت. و ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە، تەنانەت (بەڵگەی سیستمیشی) پەسەند نەدەکرد، هەروەها ئەم بەڵگەیەش بەزەحمەت هاتە بەرچاوی و، بەڵگەیەکی تری داهێنا کەلای وابوو ئەم بەڵگەیە لەدڵ و دەرونەوە هەڵدەقوڵێت نەك لەعەقڵەوە.

حەیران/ ئەمە چۆن دەبێت؟

شێخ/ کانت و لایبنز دەڵێن/ عەقڵمان ماوەمان ئەداتێ تاکو بڵێین/ لەپشت ئەم گەردونەوە خواوەندێك هەیە و هەستی ئەخلاقیمان زۆرمان لێدەکات باوەڕمان بەبوونی خودا هەبێت.

حەیران/ چۆن (کانت) ڕێبازی لایبنز دەگرێتەبەرو لەهەمان کاتدا ئینکاری بەڵگەکانی عەقڵ دەکات کەئەم فەیلەسوفە مەزنە پەیڕەوی دەکرد.

شێخ/ ئەی حەیران، لات وایە دەشێت (کانت) جیاوازی هەبێت لەگەڵ لایبنزدا سەبارەت بەشتە ئاشکراو سەرەتایی‌یەکان کە هاودژی لەعەقڵدا، دروست دەکەن یان دروستی ناکەن؟

کانت وا دەبینێت وەك چۆن لایبنزو هەموو هۆشمەندێك دەیبینێت، عەقڵمان ڕێمان پێدەدات باوەڕمان وا بێت کەلەپشت ئەم گەردونەوە خواوەندێك هەیە، چونکە فکرەی بوونی خودا هاودژی لەعەقڵدا دروست ناکات، بەڵکو ئەوەی کە هاودژی لەعەقڵدا دروست دەکات، ئینکاری بوونی خودایە. بەڵام کانت پاش ئەوەی فەلسەفەکەی لەرەخنەگرتنی عەقڵی پوخت دا تەرخان کرد بەمانەوەی کاری عەقڵ لەسنوری

دیاردەکاندا کەبەهۆی هەستەوە دەرك کراوە.

بەڵگە پێکهاتووەکانی عەقڵی خستەڕوو کەفەیلەسوف و داناکان باسیان دەکرد.

(کانت) باوەڕی وابوو کە بەڵگەکانی (لێکەوتەو پێویست) پەنا دەبەنە بەر (سیستمی هۆو هۆکار) و بڕیارەکانی عەقڵ کەبیرۆکەی (زنجیرەیی) لەجیهانی وێنە و لێکەوتەو گریمانییەکان بەمەحاڵ دادەنێن.

باوەڕی وابوو کە ئەم دوو بڕیارە راست و دروستەی عەقڵ لەئەندێشەکردندا دووچاری هەمان ئەو وێڵی ئەندێشەیە دەبنەوە کەعەقڵ تووشی دەبێت لەداواکردنی شوێنێك لەدوای شوێنێکی تر وەیان بوونی چەرخێك پێش چەرخێکیتر و بوونی هۆیەك لەدوای هۆیەکیتر. لەپاش ئەم وێڵی ئەنێشە عەقڵییە بێسەروبەرانە گەیشتە ئەو وتەیەی کە بڵێت، ئەم دوو بەڵگەیە، باوەڕهێنان بەبوونی خودا دووچاری گومان و ئاڵۆزی دەکەن.

لەپاشدا (کانت) سەرنجی رێبازی بەڵگەخوازیدا کەرەنگ دەداتەوە لەنێوەند ئەم گەردونەدا، لە بەڵگەکانی مەبەست و نەخشەکێشان و سیستم و دانایی و، ون بون تیایدا و بەهۆی هەندێ زەرەرمەندییەکانی ئەم گەردونەوە، ئەم هۆیەی کردە بەهانە بۆلاوازی (بەڵگەی سیستم) بەبێ هیچ بەراوردو مەزەندەیەك لەنێوان ئەم بەشە کەمایەتیە زەرەرمەندانەدا، کە هیچ ئاگاداری دانایی بوونی ئەم زەرەرمەندانە پێنازانین لەگەڵ بوونی بەڵگەکانی مەبەست و دانایی ونەخشەیی و سیستمی کە ناتوانرێت بژمێررێت و ئامار بکرێت کە لەنێوەند ئەم هەموو بوونەوەرانەدا دەبینرێت، هەربۆیە گەیشتە ئەو ئاکامەی کەبڵێت/ مەحاڵە بەعەقڵی تیۆری بگەینە باوەڕ بەبوونی خودا هەر لەبەر ئەمە عەقڵێکی تری بۆ داهێناین کەناوی نا (عەقڵی پراکتیکی) (عقل العملي) بەواتای ویژدان، ئەم عەقڵە پراکتیکییەیی کردە بەڵگە خوازی بۆ بوونی خودا.

حەیران/ ئەی شێخ، تێناگەم.

شێخ/ (کانت) دەڵێت ئێمە لەناخی خودی خۆماندا خاوەنی هەستێکی پتەوین کەبەهیچ شێوەیەك ئینکاری ناکرێت و فەرمانی کرداری چاکەمان پێدەکات و بەوازهێنان لەخراپەکاری لەکاتی هەستانمان بەکردەوەی دژوارو ناڕەوا ئازارمان دەدات و سەرزەنشتمان دەکات ئایا.. ئەم هەستەمان لەکوێ وە بۆ هات؟ بە باوەڕی (کانت) لەهەستەوەرەکان و ئەزمونەکانەوە پێمان نەگەیشتوە، چونکە هەستەوەرەکان تەنها وێنەی شتەکانمان بۆ دەگوێزنەوە و، لە (شت)دا هیچ شتێك نابینرێت کەناوی سەرزەنشت و

ئازاری ویژدان بێت و، لەعەقڵی تیۆریشەوە نەهاتووە، چونكە كرداری عەقڵ پەنگ دەخواتەوە لەدەرك كردنەكانی هەست و گۆڕینیان بۆ دەرك كراوەكانی عەقڵ، كەواتە ئەم هەستە پتەوە ئاشكرایەمان لەكوێ و بۆ هات كە بەهیچ شێوەیەك ئینكاری ناكرێت؟.

ئەم هەستەی كە خەڵك بە (ویژدان) ناوی دەبات (كانت) بەعەقڵی پراكتیكی ناوی دەبات.

لەسەری دەڕوات و دەڵێت/ بریتین لەو یاسایانەی ئەخلاق كەخودمان خۆرسكیانە، هەروەك چۆن عەقڵمان خۆرسكی ئەو یاسا رێكخراوانەیە كەلەوە و پێش باسكرا و، ئەو كارانەمان بەسەردا دەسەپێنێت كەپێچەوانەی كارە دەرك كراوە عەقڵیەكانی ترە لە بەئاگابوون و دووركەوتنەوە لەمەترسی و فەرمانی هەستانمان بەكرداری چاكەو پەلەوەری و كەمكردنەوەی مەترسی‌یەكان و خۆبەخت كردن لەپێناوی چاكەی خەڵكیدا. ئا.. لێرەدا كانت گەشە بە بەڵگەخوازیی‌یەكانی خۆی دەدات و ئەم یاسا ئەخلاقی‌یە دەكاتە بەڵگەخوازی بۆ (ئازادی ویست) (حرية الادارة) و بەهۆی ئەم ئازادی ویستەوە نەمری خود بۆ ژیانی دوای مردن و رۆژی لێپرسینەوە دەسەلمێنێت و، بەهۆی رۆژی لێپرسینەوەوە بوونی خودای دادوەر دەسەلمێنێت و دەڵێت/ یاسای ئەخلاقیمان زۆرمان لێدەكات بەئازاد بین لەهەڵبژاردنی چاكە و خراپەدا و، ئێمە لەم جیهانەدا زۆر كەم دەبینین خاوەن چاكە پاداشتی چاكەكەی بدرێتەوە، بەڵكو بەپێچەوانەوە، دەبینین هەندێ جار پاداشتی چاكە، خراپەیە، لەبەرئەوە پێویست دەكات ژیانێكی‌تر هەبێت بۆئەوەی پاداشتی ئەو چاكەیەی تیادا وەرگرین و ژیانی دوای مردن وا پێویست دەكات ژیانێكی نەمری بێت تاكو نەفسەكان پاداشت وەرگرن و بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێت ئینكاری نەمری نەفسەكان بكرێت، چونكە دەبێتە هۆی ئینكاری ئەو یاسا ئەخلاقیەیی كەوتمان راستە و گومانی تیادا نی‌یە، هەر لەبەرئەوەیە كانت لای وایە نەمری ئەم نەفسانە لەبنەما عەقڵیە سەرەتایی‌یە پراكتیكەكان دەژمێررێن.

پاشان گەشە بە بەڵگە خوازیی‌یەكان دەدات و دەڵێت/ دوای ئەوەی كەنەمری خودەكانمان چەسپاندوە دادوەری بۆ پاداشتی چاكەو سزای خراپە پێویست كرا، كەواتە دەبێت باوەڕمان بەبوونی دادوەرێكی یەكسانی بەتوانای نەمری سەرپەرشتكار هەبێت بۆ بڕیاردانی دادوەری لەدوارۆژدا، چونكە نەمری و سزا كەبڕیاری پێویستیمان لەسەردان، هەردووكیان زۆرمان لێدەكەن كەدان بنێین بەبوونی هۆیەكی تەواو بۆ پاداشت دانەوەی هەردووكیان، كەواتە دەبێت ئەوەی نەمری بهێنێتە كایەوە، دەبێت خۆی نەمر بێت و

ئەوەی بڕیاری داد ئەدات پێویستە خۆی دادپەروەر بێت و ئەوەی پاداشتی چاکەو خراپە ئەدات دەبێت بەتوانا بێت و، ئەو نەمرو بەهێزو دادوەرە، خودای پەروەردگارە.

ئەمە ئەو بەڵگە ئەخلاقی و وژدانی‌یەیە کەکانت هەڵیبژرادوە بۆ بوونی خودا و، هەر خۆشی دەڵێت/ ئەم بەڵگەیە لەرێگەی تیۆر عەقڵەوە بەدەست نەهاتووە، بەڵکو وەرێگیراوە لەو هەستە خۆرسکی‌یانەمان کەپەیوەستەو بەندە بەیاساکانی ئەخلاقەوە و پێویست دەکات لەسەرو عەقڵی تیۆریی‌وە دابنرێت.

حەیران/ بەڕاستی ئەم بەڵگە خوازیی‌یەی (کانت) رازاوە و خۆرسکی‌یە، بەڵام وا لەوتەکانی شێخ دەگەم کەزۆر رەزامەندی لەسەر ئەم بەڵگە خوازیی‌یە نەبێت.

شێخ/ هەموو ئەو بەڵگانەی کەئەم بلیمەتانە لەسەر بوونی خودا هێناویانەتەوە، بەگشتی راستن و، یەکێك لەو بەڵگانە، ئەم بەڵگەیەي کەقورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ کردووە ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ: ئایا لاتان وایە کەئێمە ئێوەمان بەبێ هوودە دروستکردبێت و ئێوە بۆلامان ناگەڕێنەوە﴾.

بەڵام هەندێ لەرێبازە بەڵگەخوازیی‌یەکان بەشێوەیەکی پێکهاتەی قوڵی ئاڵۆز دێنەبەرچاو و، هەیانە بەپێچەوانەوە سادە و ئاسان و ئاشکران و ئەمە هیچ پەیدابوونێکی دروستکراوی تیادا نی‌یە، بەڵکو خودای پاك و بێگەرد ئاگاداری هەموو نهێنی و ئاشکراکانە و، ئەم سیفەتە، خودا لەقورئانی پیرۆزدا ئاماژەی دەکات[1].

بەڵام بەڵگەخوازیی‌یەکانی (کانت) بە (بەڵگەی ئەخلاق)، ئەو بەڵگە خوازیی‌یە پتەوە نی‌یە کەخۆی دەڵێت گەر ئاینەکان ئاماژەی سزاو زیندوبوونەوەیان نەکردایە ئەوکاتە پێویست نەدەکرا کەعەقڵ باوەڕ بەبوونی زیندوو بوونەوە و سزا بکات، چونکە زۆر گرانە لەسەر عەقڵ کە لەخودی خۆیدا باوەڕ بەزیندووبوونەوە بکات پاش لەناوچوون و مردن، مەگەر زۆر باوەڕدار بێت بەبوونی توانای و کاربەجیّ و دادوەری خودا، گەر گەیشتە ئەم پلە باوەڕداریی‌یە ئەم باوەڕە پتەوەی متمانەی ئەداتێ کەباوەڕی بەتوانا و کاربەجیّی خودا هەبێت و بلێت/ پاش مردن زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە هەیە.

کەواتە باوەڕهێنانمان بەژیانێکی تری دوای مردن لەپاش باوەڕهێنانمانە بەبوونی خودا.

ئەمە ئەو ریزبەندەیە لۆژیکی‌یەیە کەقورئانی پیرۆز پەیڕەوی کردووە لەبەڵگە خوازیی‌یەکانیدا بۆ زیندووبوونەوە و لێپرسینەوە و بەڵگەی لەسەر بوونی خوداو توانایی

---

[1] بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە ()

و کاربەجێیی و دادوەرییەکەی هێناوەتەوە.

توانایی خودای کردە بەڵگە بۆ زیندووبوونەوە پاش لەناوچوونی و، کاربەجێیی و دادوەری خودای کردە بەڵگە بۆ بوونی لێپرسینەوە و سزا، گەر ئێمە ئەم ڕێزبەندیە لۆژیکییە پێچەوانە بکەینەوە و تەنها پەنا بەرینە بەر هەستمان بەسەر زەنشتی ویژدان و چێژی خۆبەختکردن (کە ئەم هەستە لەوانەیە ترسێکی ئاسمانی بێت کە بۆتە بەشێك لەبیرکردنەوەمان).

ئەم هەستە بکەینە بەڵگە بۆ (ئازادی و ویست) و (نەمری روح) و (ڕۆژی سزاو لێپرسینەوە) و بوونی خودای کابەجێ و دادوەر ئەی حەیران من ئەم بەڵگەیەی (کانت) بە بەڵگەیەکی پتەوی دانانێم وەك خۆی دەڵێت، بەڵکو بە بەڵگەی ویژدانی دادەنێم وەوا چاکترە بە (بەڵگەی پشتگیرکەر) ناوببرێت بۆ بەڵگە عەقلییەکانیتر. و ئەمەش لەلایەن شێخ (جسرەوە) خودا لێی خۆشبێت پەیڕەوکرا و نزیکە بەواتا و مانا لەگەڵ وتەکانی (کانت)دا یەك بن وەك (کانت) دەڵێت/ (عەقلی ڕاست و پوخت باوەڕی وایە، کە کاربەجێیی خودا جیاوازی دەکات لەنێوان خراپەکار و چاکەکار و ئەم جیاوازیەش لەم دونیایەدا ناکرێت؛ چونکە ئێمە گەلێك تاوانبار و خراپەکار لەوپەڕی خۆشیدا دەبینین و گەلێك چاکەکاریش بەپێچەوانەوە دەبینین و، دەبێت بڕیاری دادوەری خودای بەخشندە بۆ بەندە ستەم لێکراوەکانی یەکسان بێت و بەپێچەوانەوە بۆ بەندە ستەم کارەکانی و ئەم یەکسانییە ناتوانرێت لەم دونیایەدا جێبەجێ بکرێت. چونکە ستەم لێکراو لەم دونیایەدا بەسوك و زەلیلی و ماڵ زەوتکراو و خوێن ڕژراو و ئابڕوو براو دەمێنێتەوە و زۆردار و ستەم کار لەوپەڕی شادی و دەسەڵاتیدا دەبێت، لەبەرئەوە پێویستە دونیایەکی تر هەبێت بۆ بەدەرخستنی دادوەری و یەکسانی سزا لەلای خودا گەر ئێمە ئەی حەیران لەساویلکەییەوە پەسەندی ئەوانە بکەین کە لەتوانایان نییە پێکهاتەو دەرکی بەڵگەیەك بکەن و بەڵگەی پشتگیرکار و پەیڕەوبکەن بەڵام لەزاناو فەیلەسوفانی قبوڵ ناکەین کەبیروراکانیان بۆ خەڵکی بڵاو دەکەنەوە سوکایەتی و لاوازی بە بەڵگە عەقڵیە پتەو ڕەسەنەکان بکەن و تەنها بیروباوەڕە ویژدانیەکان بکەنە بەڵگە کەدەرگا دەکاتەوە بۆ خەڵکی بۆ باوەڕهێنان و متمانەکردن بەبیروباوەڕە مەحاڵەکانی عەقڵ چونکە ئەم بیرۆکەیە دژایەتی ناخی ئاینی ئیسلام دەکات کەئینکارو ڕەتکردنەوەی هەموو بیرۆکەیەك دەکات کەپێچەوانەی عەقڵە ئەی حەیران گەر (کانت) ئەم بەڵگە ویژدانیانەی بەهۆی عەقڵی بیرۆکەییەوە بەدەست نەهێنا بێت کە لاواز دێتە بەرچاوی لەبەڵگەخوازییەکانیدا لەسەر بوونی خودا. کەواتە لەچ شتێکەوە ئەم بەڵگانەی بەدەست هێناوە؟

گەر ئەم عەقڵە بیرۆکەیی‌یە بگونجێت کەببێتە رێبازێك بۆ ئاکامخوازی ئەو رێگایەیی کە (کانت) گرتۆیتەبەر لەکاتێکدا کەویژدانی کردە بەڵگە بۆ یاساکانی ئەخلاق و، یاساکانی ئەخلاقی کردە بەڵگە بۆ (ئازادی ویست و نەرمی و سزاو لێپرسینەوەی یەکسان وە بڕیاری دادوەری و بەتوانایی خودای پەروەردگاری‌دا. کەواتە ئەم عەقڵە بیرۆکەیی‌یە بۆچی ناگونجێت ببێتە شێوازێکی پەسەند بۆ بەڵگەخوازی و ئاکامخوازەیی‌یەکان لەسەربوون و توانا و کاربەجێیی خودا؟ دووبارە بۆتی دووپات دەکەمەوە، تێکڕا هێزی عەقڵ و یاسا خۆرسکی‌یەکان کە (کانت) چەسپاندنی، ئەو هێزە هۆو هۆکارانەی کەپەیوەندیی‌یەکانی نێوان هۆو هۆکاری پێ‌دەرك دەکەیت و یەکەم شت کە عەقڵی تیۆری پوخت بەبڕیاری یاساکانی (هۆ و هۆکار) بەسەرمانا دەسەپێنێت.

بریتییە لەلێکۆڵینەوەی بینینی دیاردەیەك لەو پەیداکەرەی کەهێناویەتیە بوونەوە و، دروستکراو لەدروستکەرەکەی و بەکارهێنانی ئەم هۆو هۆکارە وەك بەڵگەخوازیی‌یەك هیچ زەرەرێك لەسەر پەیداکەرو دیاردەکەی نادات ئەو کولبونەی کەعەقڵ دووچاری دەبێت لەئەنجامی (پێکهاتە بەڵگەیی‌یەکاندایە)، عەقڵ بەڕاستی نەتوانا دەبێت گەر ئەندێشەی شتێکی بێ‌کۆتای بکات. وەك چۆن کانت و غەزالی و ئیبن تفەیل دانیان بەمەدا ناوە. وەك چەرخێك کەچەرخ نەبێت لەپێشیەوە و، ئەندێشەی (هۆ) یەك بەبێ هۆیەکی‌تر و، ئەندێشەی زنجیرەیەکی بێ‌کۆتایی. (بەڵام کولبونی عەقڵ لەئەندێشەی ئەو شتانەی کەکۆتاییان دوورە و، ئەمە ئەوە ناگرێتەوە کەزنجیرەی بەڵگەخوازیی‌یە سەرەتایی‌یەکان پووچەڵ بێتەوە، ئێمە لەبینینی دیاردەی هۆکارێك عەقڵمان بەبێ بەڵگە داوای پەیداکەری دیاردەکەو هۆیەك دەکات بەو هێزە یاسا پێویستی‌یەی کە (کانت) دەڵێت عەقڵمان خۆرسکێتی) لەوانەیە (کانت) لەم وتەیەیدا راست بێت کەدەڵێت کاری عەقڵی تیۆری تەنها لەچوارچێوەی جیهانی هەست و بینراوەکاندا دەبێت و، بۆ جیهانی شارراوەی پشت هەست تێپەڕ نابێت.

بەڵام کاتێك بونی یاسای هۆو هۆکاری چەسپاند، لەیادی چوو کەوا ئەم یاسایە کاتێك لەرواڵەتی بەشە بچووکەکانی گەردون دەکۆڵێتەوە، بۆ هەموو هۆکارێك داوای هۆیەك دەکات، وشتێکی ئاسایی‌یە عەقڵمان لەبینینی ئەم گەردونە بەگشتی لەخودی خۆیدا بەبێ بەڵگە داوای هۆو هۆکار بکات، گەر ئێمە بڵێین، عەقڵی تیۆری لەتوانایدایە پەیڕەوی یاساکانی هۆو هۆکار بکات و بەسەر جیهاندا بەگشتی تاقیان بکاتەوە.

پشتی (کانت) ناگرین و دژی ناوەستین لەم وتەیەیدا کەدەڵێت/ کاری عەقڵی تیۆری تەنها لەچوارچێوەی جیهانی هەستدایە، چونکە جیهانی هەست تەنها هەستکراوە بەشی‌یە

بچووكەكانی ئەم جیهانە دەگرێتەوە و، هەستكراوە گشتییە گەورەكان ناگرێتەوە. گەر عەقڵ لێكۆڵینەوەی لەسەر ئەم هەستكراوە مەزنانە كرد بە تێكڕایی، بەمە عەقڵ لەو سنورە تێناپەڕێت كە (كانت) بۆی داناوە.

بەڵام (كانت) ئەم هەستكراوە مەزنەی لەچوارچێوەی (یاساكانی هۆو هۆكار) دوورخستەوە. و (كانت) وەك فەیلەسوفانی پێشخۆی دەڵێت/ گەردون بەتێكڕایی، هەستكراوە و عەقڵ لەسنوری توانای خۆیدا، بەڵكو ناچارە بەبێ بەڵگە وەك لایبنز دەڵێت داوای هۆ بۆ ئەم گەردونە بەتێكڕایی بكات وەك چۆن هۆ بۆ هەموو شتێكی هەستكراوی بچووك داوا دەكات.

حەیران/ ئەمە لەوپەڕی ئاشكرایی و روونیدایە، خودا پاداشتی شێخی گەورەم بداتەوە.

شێخ/ هەرچۆنێك بێت (كانت) یەكێكە لەگەورەترین باوەڕداران بەبوونی خودا و، ئەم باوەڕەشی بە (بەڵگە) بەدەست هێناوە، گەرچی بەڵگەكانیشی پتەونین، وەك خۆی بەپتەویان دادەنێت. و یەكێكە لەو بەڵگانەی كە بە (بەڵگە پشتگیرەكان) ناوم بردن. چونكە پشتگیری بەڵگە بنەڕەتیەكان دەكات و یارمەتیان دەدات، بەمەش باوەڕ لەدڵدا پتەو دەكات و سنگ فراوان دەكات.

حەیران/ چۆن شێخی گەورەم باوەڕهێنانی برگسون پەسەند ناكات لەكاتێكدا كەبەگەورەترین فەیلەسوفی باوەڕدار بەخودای دەژمێرێت؟ شێخ/ هەرگیز نەم وتووە باوەڕی برگسونم بەدڵ نیيەو پەسەندی ناكەم، بەڵكو پەنابردنی بۆ بەڵگەی دەرك كردنە راستەوخۆكان و وازهێنانی لەبەڵگەكانی تری عەقڵ، پەسەند ناكەم. و بۆت بەدەردەكەوێت كەبرگسون تەنها بە (بەڵگە راستەوخۆكانەوە) نەوەستاوە و، وەك (كانت) عەقڵی تیۆری لەچوارچێوەی بەڵگە خوازییەكانیدا لەسەر بوونی خودا تەرخان نەكردوە، بەڵكو لەقوڵایی بەڵگەخوازییەكانیدا پەنای بردۆتە بەر عەقڵی تیۆری و پشتی بەستووە بەپتەوترین و گرنگترین و روونترین بەڵگەكانی عەقڵ بۆ چەسپاندنی بوونی خودا. و ئەو دەرك كردنە راستەوخۆیانە بێت كەباسی دەكات لەم بەڵگە عەقڵییە پتەوە ئاشكرایانەوە وەریگرتووە. بەم كارەشی بەڕاستگۆترین فەیلەسوفی سەددەی بیستەم لەرۆژئاوادا دەژمێررێت و لەهەموویان بلیمەترو ئازاتر بوو كە وەختێك ئینكاری رێبازە مادديیەكانی كردوو پووچەڵی كردنەوە.

حەیران/ ئەمە چۆن دەبێت؟ شێخ/ باوەڕهێنانی برگسون لەسەر بوونی خودا، لەناخیدا پشت بەدوو بیرۆكەی قووڵ دەبەستێت كەیەكێیان ئەم وتەیەی كەدەڵێت/

دەرککردنی راستیەکانی بوون بەهۆی سەرنجدانی بوون و جوولەکەیەتی (کە چەند پارچەیەکی پێکەوە لکێنراون) و، دووەمیان لەم وتەیەیدا کە دەڵێت/ بەڵگەکانی (مەبەست و نەخشەدانان) لەدروستکردندا و فکرەی دروستکردن لەرێگای رێکەوتەوە، وایان لێدەکات کەبڕیارێکی مەحاڵ بن لەلای عەقڵ.

حەیران/ تکام.. وایە شێخی گەورەم ئەم روونکردنەوانەی بۆمن بەزۆر نەزانێت؟

شێخ/ هیچ بەزۆری، نازانم روونکردنەوەکانم بۆت و مەبەستم بەدەرخستنی چۆنێتی بەیەگەیشتنی بلیمەتەکانە لەسەر راستیەکان، ئەو راستیانەی کەقورئانی پیرۆز لەهەموو رێبازەکانی بەڵگەخوازیدا لەسەر بوونی خودا ئاماژەی بۆ کردووە.

برگسون گاڵتەی بەو رێبازە ماددییە دێت کە دەڵێت/ ئەو شتانەی کە لەگەردوندا هەیە بە (ژیان و فکرەکانییەوە) بریتین لەو شتانەی کە لەکارتێکراوی ماددەو هێزەوە پەیدا دەبن و هەروەها گاڵتەی بەم وتەیەی ماددییەکان دێت کەدەڵێت/ (عەقڵ تەنها بریتییە لەمێشك)، برگسون وەڵامیان دەداتەوە و پێیان دەڵێت: نەخێر، عەقڵ تەنها ئەو مێشکە ماددییە نییە کەجوبجوومە لەخۆیی گرتووە بەڵکو عەقڵ شتێکەو مێشکیش شتێکی ترە و، عەقڵ بریتییە لەهێزێك و مێشکیش ماددەکەیەتی، هەرچەندە ئێمە وا دەبینین کەدەرککردنی عەقڵ پەیوەستە بەمێشکەوە و، دروستی و سەلامەتی و لاوازیو پتەوی مێشك کاردەکەنە سەر عەقڵ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کەمێشك کاسەیە بۆ عەقڵ و پاڵپشتێتی و ئامێرێکە کەعەقڵ بەهۆیەوە لەکاردایە، گەر ئەم ئامێرە لەکارکەوت ئەوا کارەکانی عەقڵ دەوەستێت و تێکدەچێت. وەك رۆیشتنی ئاو لەجۆگەیەکدا کەئەبینین رۆشتنی ئاوەکە ملکەچی پێچوپەنای جۆگەکەیە و ئەم ملکەچییە ئەوە ناگەیەنێت کەئاو و جۆگاکە یەك شت بن.

ئەوەی کەعەقڵمانی ئارەزوومەند کردوە کەهەموو شتێك بەهۆی رێبازە ماددییەکانەوە لێکبدەینەوە دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی، یەکەمیان/ ئەوەیە کەبەشتێك لەعەقڵمان لەسەر جێبەجێی دەرك کردنی جەستە ماددییەکان گەشەی کردوە و، بەمانەوەی لەچوارچێوەی شتە ماددییەکاندا وای لەعەقڵ کرد زۆر لەئەندێشەو یاساکانی بەدەست بهێنێت و دووەمیان کەزۆر گرنگە/ ئێمە تا.. ئێستا چۆنێتی تێڕوانینی راستی شتەکانمان نەزانیوە و هەرگیز نەمان زانیووە چۆن زیندوویان بکەیتەوە، تاکو بیانبینین، واتە راستیەکان بەش بەش دەکەین تاکو دەرکیان بکەین/ بەواتای ئەوەی عەقڵمان وێنەکانی گەردون بە بەش بەشی وەردەگرێت بەبێ ئاگای و دەرککردنی ئەو پەیوەندییەی کە لەشێوەی جوڵەیەکی بەردەوامی لەنێوانیاندا هەیە و

بەگشتی بەم چەشنەیە.

هەرچەندە کە ئەم راستیانە بەهۆی تێڕوانینی گشتییەوە نەبێت دەرك ناکرێت کەبەهۆیانەوە دەتوانین راستیە گشتیەکان بەدەربخەین.

ناگونجێت بووترێت وێنەکانی هەست بریتین لەبەشییەکانی گشتی و بەشییەکانی راستی و دەرك کردنی ئەو بەشانە، دەرکردنی راستییەکی زیندوویی لەبەرچاوە دەرك کردنی بەشەکان بە پارچەکراوی شتێکە و، دەرك کردنی جولە و پێکەوە لکاندیان و بەردەوامیان شتێکی ترە. لەنموونەی بەکرەیەك (شریتی فیلم) کە وێنە جوڵاوەکانی لەخۆگرتبێت ئەم وێنانە لەکاتی وەستاندنیاندا، پارچە پارچەن و جوولەیان تیادا نییە، گەر ئەم بەکرەیە جولێنرا وێنەکانی ناوی بەگشتی دەجولێن و، لەمەدا راستی ژیان لەکۆمەڵەی وێنەکاندا دەردەکەوێت وەك (راستییەکی گشتی) و لێوەی دەرکی مانای چیرۆکەکە دەکەین و هەروەها ناتوانرێت بووترێت/ بۆ دەرك کردنی بەشیەکان، شتێك پێویست بەدەرك کردنی شتە گشتییەکەی دەکات بۆ زانینی راستییەکەی بەبێ پێوەلکاندنی بەشیەکان پێکەوە و، راستگۆترین بەڵگە بۆ ئەم وتەیە، هێڵی راست و هێڵی چەماوەیە گەر ئێمە سەرنجی ئەم دوو هێڵە بدەین دەبینین هەریەکێکیان لەچەندەها خاڵ پێکهاتوون کەهیچ جیاوازییەکیان نییە لەهەردوو هێڵەکەدا، لەگەڵ ئەوەی پارچەکانی ئەم دوو هێڵە لەیەك شت پێکهاتوون، بەڵام ناتوانین بڵێین هێڵی راست و هێڵی چەماوە وەك یەکن.

هەروەها ناتوانین تەنها بەهۆی دەرککردنی بەشیەکانەوە دەرکی حەقیقەتی بوون و ئەو ژیانەی کەتیایەتی بکەین. بەڵکو پێویستە ئەو پەیوەندی و جوولەو بەردەوامێتییەی نێوانیان ببینرێت و، ئەمەیە کەعەقڵ بێئاگایە لێی، بەڵکو بەهۆی پەیامێکی راستەوخۆوە دەرکی دەکەین هەروەك چۆن برگسون ناوی دەبات کەمەبەستی هۆشمەندیی و پەیامە کە لەدڵ و دەروغاندا هەستیان پێدەکەین، بەبێئەوەی پەنا بەرینە بەر عەقڵی تیۆری.

حەیران/ من لەمەبەستی ئەم وتەیە تێناگەم کەدەڵێت: (دەرك کردنی راستەوخۆ هیچ پەیوەندییەکی بەعەقڵەوە نییە).

شێخ/ هەقی خۆتە کە لەووتەکەی تێنەگەیت. گەر لەوتەکەی برگسون وا تێگەیشتبین کە ئەم دەرککردنە هیچ پەیوەندییەکی بەعەقڵەوە نییە ئەوا برگسون ئەم وتەیەی نەوتووە، بەڵام دەیەوێت بڵێت/ ئێمە هەست بەم دەرك کردنە راستەوخۆیە دەکەین کە لە پەیام دەچێت بەبێ پەنابردنی بۆ عەقڵی تیۆری. ئەو عەقڵە تێڕوانینیەی کە لەپێکهاتەی بەڵگەکانەوە دروست دەبێت.

ئـێمە بۆئـەوەی بـەم دەرککـردنە راسـتەوخۆیە بگـەین پێویسـتە دوور بکەویـنەوە لەبیر کردنەوە لەحەقیقەتی شتەکان لەرێگای بەڵگە پێکهاتەکانی عەقڵ.

حەقـیقەتەکان زیـندوو بکەیـنەوە تـاکو لەبەرچـاو بـن. حەیـران/ بـەڵام، بـەچ شـتێك زیندوویان بکەینەوە تاکو.. بیانبینین؟

شێخ/ ئێمە بەهێزی عەقڵـەوە زیندوویان دەکەینەوە بەڵام برگسون خوازیار بوو کەئەم زیـندووبوونەوەیە لـەرێگای بەڵگـە تێڕوانینە پێکهاتەکانەوە نەبێت. (چونکە هەندێ جار عـەقڵ کولدەبێـت لـەپاشماوەی ئاکـامی ئـەم بەڵگانـە) بـەڵکو بـەهێزی تێڕوانینـێکی سەرتاسـەرییەوە بێـت و، کاتێـك کەبیـنی عەقڵی تیۆری بەتێڕوانینی بۆ شتە بەشییەکان، نەتوانایە لەدەرك کردنی حەقیقەتی بوون و ئەو ژیانەی کەتیایەتی.

بەتێڕوانینی سەرتاسەری گەیشتە زانینی بەشیە گشتییە جوڵاوە لکێنراوە بەردەوامییە زیندووەکان.

ئەم هەستکردنانەی بەدەرك کردنی راستەوخۆ یاخود.. پەیام (نیگا) ناونا..

(لـەم هـەموو شـتانەدا بەگشـتی لەڕاسـتیدا پـەنای بـردە بـەر عـەقڵی تێڕوانیـنی بـەبێ خۆهیلاك کردنی بە بەڵگە پێکهاتەکانەوە.

سوێند بێ ئەی حەیران ئەو تێڕوانینە سەرتاسەرییەی کەئیبن روشد خوازیاری بوو و، هـەروەها قورئانی پیرۆز لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بۆ کردووە ﴿**أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّـمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَـا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ**: ئایا سـەرنج نادەنە دروستکراوەکانی ئاسمانـەکان و زەوی و ئـەو شـتانەی کـەخودا تیایاندا دروستیکردوە﴾. و بەهەزارەها وێنە ئەم پارچەو بەش بەشانەی نیشان داوین.

حەیـران/ چـۆن شێخی گەورەم دەڵێت (برگسون) پەنای بردۆتە هەمان تێڕوانینی ئیبن روشـد، لەکاتـێکدا ئێمە دەزانـین کەئیبن روشـد هەمیشـە پـەنای بـردۆتە بـەر (بەڵگـەی سیستم) و (بایەخدان و داهێنان)؟

شـێخ/ برگسـون هـەمان تێڕوانیـنی هـەبووە و، هـەروەها هەڵگـری هـەمان بەڵگـەی مەبەسـت و نەخشـەدانان و دانایی و سیستم و بایەخدان و داهێنان بووە، کە (ئیبن روشد) پەیڕەوی دەکردن، بەڵام (برگسون) لەتێڕوانینیدا بەزرترو ئاسۆ فراوانتر بووە (گەردون وا هاتـە بەرچـاوی لـە گەردیلەکـەی تـاکو گشـت هەسـارەکان، بریـتین لـەیـەك جەستەو یەك ژیـان، پێکەوەلکاندنی بەشیەکان بەگشـتی و بـەردەوامی و هاوکـاری و پەنابردنـیان بـۆ یەکتری و پەیوەندی نێوانیان تیایاندا بەدەردەکەوێت.

ئەمانە هەموویان بەگشتی پەیام و دەرك كردنی راستەوخۆ لەسەر بوونی خودای دروستكەر و گەورە و كاربەجێ، لەدڵ و دەروغاندا دروست دەكەن).

حەیران/ دەبینم شێخی گەورەم پلەو پایە زیاتر دەدات بە (برگسون) وەك لە (ئیبن روشد).

شێخ/ پلەو پایەی زیاتر نادەم بە (برگسون) چونكە هەردوو كیان لەگەورەترین فەیلەسوفە باوەڕدارەكانن بەبوونی خودا و هەردوو كیان چاكەیان بەسەرمەوە هەیە بۆ دەرك كردنی هەندێ لەنهێنی و شاراوەكانی قورئانی پیرۆز، بێگومان لەدوای چاكەی شێخی گەورەم شێخ جسر (خودا لێی خۆشبێت).

حەیرام/ چۆن. ئەمە دەبێت؟

شێخ/ یەكەم كەس كەرێنمایی تێگەیشتنی قورئانی كردم لەسەر رۆشنایی زانست و فەلسەفە، شێخ جسر بوو، لەپاشدا هەندێ لەنهێنیەكانی ئەم رێنماییە راستەقینەیەم بۆ بەدەركەوت، لەكاتی خوێندنەوەكانم بۆ نووسینەكانی ئیبن روشدو رێبازی بەڵگەخوازییەكانی بۆ بوونی خودا بەهۆی بەڵگەی بایەخدان و داهێنانەوە بەڵام دەركردنم بۆ ئایەتە قورئانیەكان بەسەر زارەكی مایەوە و، تێگەیشتنم زیاتر بۆ رواڵەتی ئایەتە بێپێچ و پەناو ئاشكراكان بوو و، نەچووبوومە ناخ و قوڵایی ئەو هێمایانەی كەنهێنیان لەخۆگرتووە، كاتێك كەنووسینەكانی برگسونم خوێندەوە، لەووتەكانیدا (سیستمی دوانەییم) لەروەك و ئاژەڵدا بۆ روون بۆوە بەمە روناكیەك لەفكرەكانمدا سەری كێشا بۆ تێگەیشتنی نهێنیەكانی قورئان كەلەوە و پێش بێئاگا بووم لێی و رووەكانی دانایی لەدووبارەبوونەوەی وشەی (دوانە) لەقورئاندا بۆم بەدەركەوت، وسەیر بوو بەلامەوە ئەم دووبارەبوونەوەیە، وا بەخەیاڵمدا دەهات كەئەمە تەنها منەتێك بێت خودا بەسەر بەندەكانیدا دەیكات و، رووەكانی ئەم منەتییەیی خودام لەدروستكردنی هۆكارەكانی مانەوەی ژیان لەسەر گۆی ئەم زەوییە نەدەزانی، كەویستێكی خودا بوو.

بەڵام كاتی خوێندنەوەی بەڵگەخوازییەكانی (برگسون) لەسەر بوونی مەبەست و نەخشەكێشان بۆ دروستكردن بەهۆی (سیستمی دوانە)یی سەرتاسەرییەوە دەركم كرد، هەموو ئەو ئایەتانەی كە لەسەر بوون و توانا و كاربەجێیی خودا لەقورئاندا ئاماژەی بۆ كراوە، مەبەستی خودا زۆر گەورەترە لەمنەتكردن بەسەر بەندەكانیدا. كەهەمووی بەگشتی ئاگاداری و هۆشمەندییە كە ئەو دروستكراوانە لەخۆیان گرتووە لەبەڵگەكانی مەبەست و داهێنان و دانایی و، كاتێك پەیڕەوی ئەم بنەمایانەم كرد بۆ تێگەیشتنی، ئایەتەكانی قورئان لەسەر رۆشنایی زانستی نوێ، دەركی نهێنی موعجزەكانی قورئانم

کرد کەلەوە و پێش دەرکم نەکردبوون و لەکاتی خۆیدا بۆت باسدەکەم ئەی حەیران.

حەیران/ برگسون سەبارەت بەسیستمی دوانەیی چی دەڵێت؟

شێخ/ برگسون کاتێك وەڵامی هەڵگرانی ڕێبازە ماددییەکانی دایەوە کەدەیان وت: دروستکراوەکان لەرێگای ڕێکەوت و هەڵبژاردنەکانی سروشتەوە دروست بوون، گاڵتەی پێیان دەهات و بەڵگەی لەسەر پووچەڵی ڕێبازەکەیان هێنایەوە.

هاتە سەرباسی (سیستمی دوانە) کە ئەمە کورتکراوەکەیەتی چۆن عەقڵمان باوەڕ بهێنێت کەهەستی بینین بۆ گشت ئاژەڵەکان لەرێگای ڕێکەوت و گەشەو هەڵبژاردنەکانی سروشتەوە بووە؟!

مەحاڵە پەیدابوونی (چاو) بەم هەموو پێکهاتە سەیرو نامۆو ئاڵۆزەوزە ڕاستەوخۆ دروستکراوی ماددە بێت و، هەر لەسەرەتاوە لەم وێنە تەواوەیدا بووبێت.

گەر باوەڕ بەرێبازی گەشەپێکردنیش بهێنین و لەگەڵ ئەمانەدا بڵێین کەدەڵێن. هەستی بینین لەلای گشت ئاژەڵان پێکهاتووە و گەیشتۆتە ئەم پلە تەواوە لەدوای چەند زنجیرە گەشەکردنێکی لێکەوتەیی بەهۆی یاسا هەڵبژاردنەکانی سروشتەوە. و هەروەها کاریگەری ئەو ژینگەو بارودۆخەی کە ئەو ئاژەڵەی تیادا ژیاوە، ئایا دەتوانین بەعەقڵێکی ساغەوە باوەڕ بهێنین کە هەستی بینین لەلای مرۆڤ بەهەمان بارودۆخ و خول و گەشەدا تێپەڕ بووە کەهەستی بینینی ئاژەڵان پیایدا تێپەڕ بوون؟

هەڵبژاردنی سروشتی لەسەر (ڕێکەوت) بەندە. چونکە باوەڕداران بەم وتەیە لایان وایە کەزیندوو دەکەوێتە ژێر کاریگەری جۆراوجۆرەوە، بەڵام ئەو کاریگەریەی (زیندوویەك) ڕێدەکەوێت، مەرج نییە بۆ هەموو زیندویەك ڕێبکەوێت بەڵکو پێویستە جیاوازیی لەهۆکارە کاریگەرەکاندا هەبێت و، لەمەوە بۆمان بەدەردەکەوێت کەپێویستە لەئاکامدا جیاوازی لەدروستبوونی هەستی بینیندا هەبێت.. لەبەرئەوە چۆن عەقڵمان باوەڕ بهێنێت کە بەهۆی ڕێکەوتەوە پێکهاتن گەشە بۆ هەستی بینین بکرێت و لەهەموو ئاژەڵێکدا یەك وێنەی هەبێت.. ؟

ئا.... لێرەدا برگسون دەچێتە سەر (سیستمی دوانە) بەمەش گاڵتەپێکردنەکانی بۆ ماددییەکان زیاد دەکات کاتێك کەدەڵێت/ گەر باوەڕمان بەم موناقەشەگیرییە هێناو وتمان، گەر ئەم ڕێکەوتە سەیرو سەمەرەیە شیاو بێت لەدروستبوونی یەك هەستی بینین بۆ گشت ئاژەڵ و گەر ئاسانمان کرد لای خۆمان و وتمان و باوەڕبهێنین کەگشت ئاژەڵان یەك جۆرن و یەك هەستی بینینیان هەیە!!

کەواتە.... بیروڕامان چۆن دەبێت بەرامبەر ڕووەك کەئەمیش جۆرێکی ترە

كەرێگایەكی گرتۆتە بەر جیاوازە لەرێگای ئاژەڵان. گەر ئێمە بینیمانن لەشێوازێك لەشێوازەكانی ژیاندا رێكەوتوون.. ؟ (ئێمە دەبینین رووەك و ئاژەڵ هەردووكیان پەیرەوی شێوازێك دەكەن لەكرداری زاوزێدا)... بەڵام چۆن ئاژەڵ لەنێوەند یەكتردا رێكەوتوون كەنێرەو مێیە بخەنەوە و بەهەمان شێوە رووەكەكان لەنێوەند یەكتردا رێكەوتن بەرێكەوت نێرو مێ بخەنەوە).

نەخێر مەحاڵە ئەم بنەما لاوازە كە بەهەڵبژاردنی سروشتی ناوی دەبەین، ببێتە بنەمایەك بۆ ئەم رێكەوتنە. و پێویستە لەهەموو بەشەكانی (بووندا) هەرچەند جیاوازیان هەبێت لەجۆرو رەگەزدا، هێزێكی هاوشێوەیان هەبێت، كەئەویش ژیانە و، هەر ئەم ژیانەیە كەداهێنان و گۆڕان و جوانكاری دەهێنێتە كایەوە.

گەشەكردن بەهۆی توانای ئەم ژیانەوە دەكرێت نەك بەهۆی كاریگەرە دەركیەكانەوە و، دروستكەری ئەم ژیانەش خودای بەخشندەیە.

حەیران/ بەڕاستی برگسون یەكێكە لەگەورە فەیلەسوفە باوەڕدارەكان بەخودا، هەروەك شێخی گەورەم دەفەرموێت تەنها عەقڵی كردۆتە رێبازێك بۆ بیركردنەوە.. تاكو بەهۆیەوە بگاتە ئەو هەستە ویژدانی‌یەی كەخۆی بەدەرك كردنی راستەوخۆ ناوی دەبات. و ئەمە ئاكامی دەرك كردنێكی راستەوخۆ نی‌یە بەڵكو ئاكامی بیركردنەوەیەكی قوڵی ناخی (برگسون) خۆیەتی و، (كانت) یش هەمان بیركردنەوەی هەبوو كە بە بەڵگەكانی ئەخلاق ناوی دەبرد و، هەموومان بەگشتی هەست بەم باوەڕە ویژدانی‌یە دەكەین بەبێ زانینی هۆكارەكەی. شێخ/ و منیش هەمان هەستی ویژانیم هەیە بەڵام بە بەڵگەی پشتگیركەر ناوی دەبەم، چونكە بەڵگەیەكی پتەو نی‌یە، تاكو.. باوەڕەكانمانی لەسەر دامەزرێنین، چونكە تۆو وێنەی گەنجانی وەك تۆ نوشستی بەباوەڕتان دەهێنێت لەموناقەشەگیریدا. بەڵام بەڵگە عەقڵیە بڕەرە بێ گومانەكان هیچ رێگایەك نی‌یە بۆ راماڵین و لاوازی و پووچەڵكردنەوەیان، هەرچەند دووچاری نەتوانای ببینەوە لەپێكهاتنی ئەم بەڵگانەدا بەتایبەتی لە بەڵگەكانی مەبەست و نەخشە كێشان و سیستەمدا هەروەك چۆن (برگسون) ئاماژەی بۆ دەكات حەیران-بەڵگە پشتگیرەكانی تر چین ئەی شێخی گەورەم؟.

شێخ: زۆرن لە هەر هەموویان زیاریش موعجیزەی پێغەمبەرانە.

حەیران/ ئایا.. شێخ موعجزەكان بە بەڵگە پشتگیركەرەكە دادەنێت و بە بەڵگە عەقلیە بڕەرەكانی دانانێت؟

شێخ/ موعجزەکان هەرچەندە بەڵگەی پتەویان لە خۆگرتووە، بەڵام لادانە لەسیستم و، لەبەڵگە عەقڵیە تێڕوانینی پوختەکان پتەوترنین کە بەبڕیاری پێویستی باوەڕ بۆ بوونی خودا کۆتاییان دێت.

بەڵام مرۆڤ بەتێکڕایی لەدێر زەمانەوە، نەتوانا بووە بەهۆی تێڕوانینی عەقڵی پوختەوە بەڵگەخوازی بەکاربهێنێت و، ژیریی و دانایی وای پێویست دەکرد لەکاتی بانگێژکردن بۆ باوەڕهێنان بەبوونی خودا لەگەڵ خەڵکدا بە بەڵگەی موعجزە بدوێن، کەئەمەش لادانە لەیاساکانی گەردوون و، ئەم موعجیزەیە لەسەر دەستی پێغەمبەرانە کەمرۆڤێکن لەخۆیان و موعجزەکان لادانێکەو ئاماژەی بوونی خودا دەکات چونکە لەسەرو توانای مرۆڤەوەیە.

بەڵام کاتێك مرۆڤایەتی گەشەیکرد لەپلەکانی بیرکردنەوەی عەقڵدا و ئامادەبوو بۆ هێنانەوەی بەڵگە خوازییەکان لە ڕێگای تێڕوانینی عەقڵی پوختەوە. و پێشکەوتنی زانستیش بووە هۆی چوونە ناخی نهێنییە شاراوەکانی سیستمەکانی سروشت بەجۆرێك لەگەڵ کارە موعجزەکاندا تێکەڵی کرد، تا.. گەیشتە رادەیەك کەنەیان دەتوانی کارە موعجزەکان لەداهێنانەکانی زانست جیابکەنەوە، بەڵام حیکمەت و کاربەجێیی خودا واپێویستی کرد کەباوەڕهێنان بەبوونی خودا لەڕێگای بەڵگەخوازییە عەقڵییە پوختەکانەوە باشتر بێت وەك لە بەڵگە خوازییەکانی موعجزە.

پەیامی قورئانی پیرۆزیش هەمان بەڵگەخوازی هەقلییە بڕەڕە پوختەکانی گرتۆتەبەر وەزیاتر لەبەڵگە خوازییەکانی موعجزە پەیڕەوی کردوە و، لەکاتی خۆیدا بۆتی باسدەکەم....

لەکاتی دیاریکراودا، چوومە لای شێخ دەبینم چاوەکانی پاشماوەی فرمێسکی پێوە دیارە، کاتێك هۆکەیم پرسی، وتی/

هیچ هۆیەك نیە ئەی حەیران تەنها ئەوە نەبێت کاتێك چاوم خشان بەکتێبەکەی شێخ جسردا یادەوەرییەکان، بەئاگایان هێنامەوە.

حەیران/ پەیوەندی چی‌یە لەنێوان کتێبی شێخ جسرو یادەوەرییەکاندا؟

شێخ/ ئەو یادەوەریانە کۆنن و هی سەردەمی لاوین ئەی حەیران.

حەیران/ کەواتە ئەمشەو شێخی گەورەم باسی شێخ جسرم بۆدەکات کەدەمێکە تامەزرۆی باسی ئەم بلیمەتە دەکەم، کە شێخی گەورەم زۆر جار ناوی دەبات.

شێخ/ ئێستا باسی شێخ جسرت بۆ ناکەم، بەڵکو باسی یەکێکی ترت بۆ دەکەم کە تۆ زیاتر تامەزرۆی گوێبیستی دەکەیت.

حەیران/ ئەو کەسە کێ‌یە ئەی گەورەم؟

شێخ/ ئەو بلیمەتە (داروینە) کە خاوەنی تیۆروانینی (پەیدا بوون و گەشەکردن) و (النشوء والأرتقاء).

حەیران/ پێویست چی‌یە، باسکردنی پێش شێخ جسر بکەوێت، ئایا تۆ وادەبینێت کە ریزبەندی لەمێژوودا پێش جسر بێت؟

شێخ/ نەخێر، بەڵکو هاوچەرخی یەکترن، بەڵام باسکردنی جسر بەتامترو بەمانا تر دەبێت گەر دوای داروین بێت.

حەیران/ من زۆر پەرۆشی گوێبیستی باسی ئەم فەیلەسوفە گەورەیەم کە ماوەیەکی زۆرە فەلسەفەکانی عەقلی ئێمەی لاوانی گێژدە کردوە و بەرەو کەناری بێباوەڕی بەخودا دەمانبات.

شێخ/ داروین نەفەیلەسوفەو نەفەلسەفەی هەیە وەك ئەوەی کە تۆ تێگەیشتوویت، بەڵکو زانایەکی سروشتی گەورەو پاڵپێوەنەرێکی بەتواناو چاونەترس بوو لە پێشخستنی

ڕێبازی گۆڕان: (مذهب التحول)دا.

کاتێك لەساڵی ١٨٥٩ ز، دا کتێبی (بنەمای جۆرەکان لە ڕێگای هەڵبژاردنی سروشتی)یە (اصل ألأنواع بطريق ألأنتخاب الطبيعي) بڵاوکردەوە، کە بەهۆیەوە دارون بوو بەخاوەنی ڕێبازێکی تایبەتمەند لە گۆڕان و پەیدا بوون و گەشەکردندا و بە (ڕێبازی دارونی) ناوبرا. بەڵام ئەو فەیلەسوفەی کەڕێبازی گۆڕان و پەیدا بوون و گەشەکردنی کردە بنەمایەك بۆ دانانی فەلسەفە تایبەتمەندیی‌یە گشتیەکان (هربەرت سبەنسەر) بوو، کە خاوەنی ڕێبازی (گەشەکردن)ە (التطور).

بەڵام سەبارەت بەو وتەیەت کە دەڵێیت بیروڕاکانی دارون و کەسانێکی تر ئێوەی لەسەر ڕۆخی بێباوەڕی بەخودا ڕاگرتووە، من شارەزای نهێنیی‌یەکانی ئەو بیروباوەڕەم.

ئارەزوومەندانی فەلسەفە لەنێوان گەنجانی ئەم سەردەمەدا کەچاویان بەزانست و زانیاری کردۆتەوە، زیاتر هۆگری بیروڕا نوێکانی کتێبەکەی (دارون)ن وەك لەوەی هۆگری فەلسەفە بن، کە بەناهەق لەلایەن زاناکان و ڕێبازی لاهوتەوە لە ئەورروپاو ئەمریکا دنیایان شڵەقاندووە و، بۆت دەردەکەوێت کە ئەم هەموو هێرشە توندو تیژانە لە ئەنجامی تێنەگەیشتنی بیروڕاکانی (دارون)ەوەیە.

هەندێکیان وایان دەزانی کە بیرۆکەکانی دارون دژایەتی لەگەڵ باوەڕ بە بوونی خودا دەکات و، بۆت ئاشکرا دەبێت کە نەبیروڕاکانی دارون لە کتێبی (بنەمای جۆرەکان و پەیدا بوون و گەشەکردن)دا و نە فەلسەفەی (گەشە پێدان)ی (سبەنسەر)، هیچیان ئینکاری بوونی خودا ناکەن، کە دروستکەری ماددەو توخمەکان و یاساکانی گۆڕان و گەشەپێدانە، لەبەر ئەوە هەوڵئەدەم بەپێی توانا کورتە باسێکت لە سەر ئاستی ڕێبازی (دارون) بۆ بەدەربخەم.

حەیران/ هەموو لەشم گوێیە گەورەم.

شێخ/ پاشماوەی زیندەوەرە بەردبووەکان، کەلە ژێر چینەکانی زەویدا دۆزراونەتەوە، وادەچەسپێنن کە مرۆڤ (لێکەوتەیە) (حادث)ە لەسەر رووی زەوی پاش ئەوەی کەنەبوو بووە، کە ئەمەیش بوونی چەندەها ئاژەڵ و رووەکی لەناوچوو دەسەلمێنن و، زاناکان ئەم لەناوچوونەیان وا لەقەڵەمداوە کەلە ئەنجامی ئافات و گێژاو بومەلەرزەو چەندەها کارەساتی تر بێت کە دووچاری زەوی دەبنەوە، هەروەها وتوویانە لە ئەنجامی لەناو چوونی ئەم زیندەوەرانە ژیانێکی نوێی تر پەیدا بووە و، ئەم ژیانە نوێیەش دووچاری لەناوچوون دەبێت جارێکی تر، کە ئەمیش دووبارە ژیانێکی تری

نوێ دەخاتەوە، کە ئەمەش بەرێبازی (یەك بەدوایەکی دروستکردندا) ناو دەبرێت بە (تعاقب الخلق) کە زۆر لەزانایان باوەڕیان پێهێناوە، لەوانەش زانای فەرەنسی (کوڤیە) و زانای سویسری (ئاگاسیز)، بەڵام هەندێ لە زانایانی زەویناسی باوەڕیان وانی‌یە کە (لەناوچوونی سەردەمی) (انقراض الدور) لە کاریگەری ئافاتەکانەوە بێت و دەڵێن ئەم ئافاتانە بە شێوەیەکی گشتی رووی زەوی نەگرتۆتەوە، بەڵکو لە هەندێ شوێنی دیاریکراوی زەویدا روو دەدات و ئەم جیاوازیی‌یە لەبەرچاوەی نێوان زیندەوەرە بەروبوومەکان، بە تیۆروانین (پەیدا بوونی هێدی) ناوی دەبەن و هەروەها وتیان ئەم پەیدا بوونە هێدیی‌یە بە درێژایی چەرخ، جۆرەها ژیانی دروستکردوە.

ئاوا بەم چەشنە زاناکان لە لێکدانەوەی (دروستبوونی زیندەوەران)دا بوونەتە دووبەشەوە: تاقمێ دەڵێن، دروستکەری مەزن هەر لەسەرەتاوە ئەم زیندەوەرانەی دروستکردووە و، پاش هەموو لەناو چوونێك زیندەوەری نوێ و جۆری سەربەخۆ دروست دەکاتەوە و، هەندێکی تریان دەڵێن/ پەیدا بوونی زیندەوەران بەهۆی کاریگەری سروشتەوەیە کە بەشێوەیەکی هێدی هێدی پەیدا دەبێت لەسەر بیرۆکەی (پەیدا بوونی هێدی) دەبێتە هۆی گۆڕانی جۆرێك و پەیدا بوونی جۆرێکی تر و، بەناوبانگترین زانا بۆ باوەڕ بەم بیرۆکەیە، زانای فەرەنسی (لامارك)ە، کە لای وایە جۆرەکانی زیندەوەرە سەربەخۆو تایبەتمەندنین لە دروستکردن و پەیدا بونیاندا، بەڵکو هەندێکیان لێکەوتەی هەندێکی تریانن، بە پێی بیرۆکەی گۆڕان و گەشەکردنی هێدی کەلەئەنجامی چەند هۆکارێك روو دەدەن.

یەکێ لەوانە : ا-بەکارهێنانی ئەندامێك یان پشتگوێخستنی ئەو ئەندامەیە ب-جۆری گوزەران و ژیان، ج-کاریگەری بۆ ماوەیی، د-پێداویستی‌یەکانی تری ژیان، بۆ نموونە، سفتی جەستەی مارو نەمانی دەستەکانی لە ئاکامی هامووشۆیەکی دوورو درێژی ناو کون و قلیشە تەسکو تروسکەکانەوەیە و هەروەها باڵندە ئاویی‌یەکان ئەو شێوازەی قاچیان وەرنەدەگرت گەر پێویستیان بەمەلە نەبووایە.

لەقلەقیش بەو شێوەیە ملی درێژ نەدەبوو گەر خواردنەکانی لە قوڵایدا نەبووایە و، زەرافەش ملی ئەوەندە درێژ نەدەبوو گەر خواردنەکەی لە لق و پۆپی درەختەبەرزەکاندا دەستگیر نەبوایە بەڵام ئەم (رێبازی گۆڕانە) هەر بەلاوازی مایەوە کە نەیدەتوانی بەرامبەر بیرۆکەی (یەك بەدواهاتنی دروستکردن) بوەستێت. تابەدەرکەوتنی (داروین) کە رێبازی گۆڕانی بەرەو پێش برد کە لەساڵی ١٨٥٩ز. دا کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناوی (بنەمای رەگەزەکان بە رێگای هەڵبژاردنی سروشتی) دانا و، پاشان لەساڵی ١٨٧١ز دا کتێبی

(زنجیرەی قۆناغی مرۆڤ)، (تسلسل ألأنسان)ی دانا.

حەیران/ ڕێبازی دارون چی‌یە؟

شێخ/ کورتەی ڕێبازی دارون لە پەیدا بوون و گەشەکردندا زیندەوەران مل کەچی چوار یاسان / یاسای (ململانێ بۆ مانەوە) (تنازع البقاء)، یاسای (جیاوازی نێوان تاکەکان) (تباینات ألأفراد) و هەروەها یاسای (جیاوازی بەهۆی بۆ ماوەیی) (التباینات بالأرث) و یاسای (هەڵبژاردنی سروشتی) (الأنتخاب الطبیعي) بۆ تاکە زیندەوەرێکی چالاك کە هەموو سیفاتێکی بەرزی لە خۆ گرتبێت بە پێی تاکەکانی تر بە کاریگەری سێ یاساکەی پێشوو دەبێت.

یاسای (ململانێ بۆ مانەوە) بەواتای ئەوەی کە زیندەوەران لە ململانێیەکی هەمیشەیی دان لەگەڵ سروشتدا و لە نێوەند خۆیاندا و، سەرکەوتن بۆ ئەو تاکە دەبێت کە سیفاتەکانی سەرکەوتووی و مانەوەی تیادا بێت.. سەبارەت بە ئاژەڵ و ڕووەك، ئەم سیفاتانە زۆرو جۆراوجۆرن، لەوانەیە ئەو سیفاتانەی کە سەرکەوتن و مانەوە دەبەخشن سیفەتی تواناو ئازایو گەورەی، یان بچوکی جەستە و، یاخود سیفاتی جوانی و ژیری و خێرایی و هەروەها سیفەتی فێڵبازی بۆ دوور خستنەوەی شەڕ وەبەدەستهێنانی خۆراك، یاخود ئارامی لەسەر برسێتی و تونێتیو کاریگەرە دەرەکی‌یەکان..هتد، تێدا بێت.

گەرهاتوو ئەو تاکانەی کە ئەو سیفاتانەیان لە خۆگرتووە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و، بە پێچەوانەوە ئەو تاکانەی کە سیفاتی سەرکەوتنیان تیادا نی‌یە، ئەو کاتە مانەوە بۆ ئەو تاکانە دەبێت کە شیاوی ژیانن و، لەناوچوون بۆ ئەو تاکانە دەبێت کە ناشێن بۆ ژیان. و ئەمە واتای (ململانێی مانەوە)یە.

بەڵام یاسای (جیاوازی نێوان تاکەکان)، بەواتای ئەوەی هەموو جەستە زیندووەکان هەر لەبنەڕەتدا لەهەندێ سیفاتدا جیاوازیان لە خۆگرتووە.

هەر لەبەر ئەوەیە لێکچونی تەواو بەدی ناکرێت لە نێوان دایك و باوك و منداڵەکانیان و نەلەنێوان بنەڕەت و بەشەکانی دا تەنانەت ڕووەکیش وا ئەندێشەی دەکەین کەلەیەکچوونێکی تەواو لەنێوان بەشەکانیدا هەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا گەڵایەك بەدی ناکەین لەگەڵایەکی تری هەمان ڕووەك بچێت، بەڵام لەبەرکەمی ئەم جیاوازی‌یە و، نەچوونە ناو ناوەڕۆکەوە لەبەر ئەوە ئەو جیاوازیانە نادیار دەبن بۆ ئەوانەی کە تۆژینەوەی لەسەر ناکەن، بەڵام بەدرێژای ڕۆژگار و چەرخ ئەم جیاوازیانە بە دەردەکەون و جۆرێکی تری نوێ پێکدەهێنن.

یاسای بۆماوە تەواوکەری یاسای جیاوازییەکانە و، ئەو جیاوازیانەی کەلەمەوپێش باسکران بەهۆی بۆ ماوە لەبنەڕەتەکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ لقو پۆپەکان، کەلەسەرەتاوە کەم و رووکەشی دەبن و، لەپاش ماوەیەکی زۆر دەبنە، بنەڕەت و جۆری تری نوێ یان لێ دەبێتەوە.

هەموو ئەم رێبازانە لە ئاکامدا بەیاسای هەڵبژاردنی سروشتییەوە بەندن بەکورتی-یاسای بۆ ماوە، هەروەك چۆن جیاوازییەکان دەگوێزرێنەوە هەروەها هەموو ئەو سیفاتانەی کە بنەڕەت لە خۆی گرتووە دەیانگوێزێتەوە بۆ بەشەکانی تری،

جائەم سیفاتانە ماددی بن یان (معنوی) بەدەست هاتوو و، ئەم سیفاتانەش یان سودمەندن، وەك تواناو هێز، تەندروستیو ژیری و هەندێکیان زیانبەخشن وەك نەخۆشیو کەم ئەندامی و نەوازە (شــذوذ)، بەڵام زیانبەخشەکان دوو رێگا دەگرنە بەر یان لەناو دەچن بە زاڵبوونی سوود بەخشەکان بەسەریاندا یان سەرکەوتن بەدەست دەهێنن کە ئەمەش دەبێتە هۆی لەناوچونی خودی خاوەنەکەی یان نەژادەکەی.

سـودمەندەکان وا لــە خاوەنەکــەیان دەکــەن کــە لــە شــەڕی ململانــێی مانــەوەدا سەرکەوتووبن.

بەشەکانی تر ئەم سیفەتە سوودمەندە وەچە لەدوای وەچە وەردەگرن و، لەدوای تێپەڕبوونی هەزارەها نەوە، جیاوازییەکان دەگەنە پلەیەك کەوا لەتاکە جیاوازە کە دەکەن ببێتە جۆرێکی نوێ تر، ئەمەیە یاسای هەڵبژاردنی سروشتی، کە داروین بەهۆکارێکی دادەنێت بۆ پەیدا بوونی جۆرە زیندوە بینراوەکانی سەرزەوی،

حەیران/ ئەی نەیارانی داروین چۆن رەدی ئەویان داوەتەوە؟

شێخ/ نەیارانی داروین) زۆرن، لەوانە ئەو زانایانەن کە بەهیچ جۆرێك لە بورای ئاینیدا موناقەشەی بیرۆکەکانی داروینیان نەکردوە، بەڵکو لەبواری زانستی ڕووتدا رەخنەیان لێگرتووە و هەروەها زانایانی ئاینیش بەناوی ئاینەوە هێرشێکی کوێرانەیان کردۆتە سەری.

نموونــە بــۆ بەرپەچــدانەوەی زانســتی زۆرن گرنگترینــیان زیــندەوەرە دەریایــە سەرتاییەکان کەهەر لەسەرەتاوە لە ئەزەلەوە هەتا ئەمڕۆ لە شێوەی خۆیاندا ماونەتەوە و، بەهیچ چەشنێك یاسای (گەشەکردن) کاریگەری نەبووە لەسەریان و، کۆمەڵەی زیندەوەرە گەورەکان بە پلەی نزم و بە پلەی بەرزیانەوە لە چینەکانی ژێر زەویدا وەك یەك ماوە، دەی گەر یاسای گەشەکردن راست بووایە، واپێویستی دەکرد زیندەوەرە گەورەکان کە کۆمەڵەی خاوەن بڕبڕەکان سەربەوانە، لە هەموو چینەکانی زەویدا

نەبوایە، بەڵکو بەس لە چینی سەرەوەدا ببوایەو کۆمەڵە پلە نزمەکانیش بەس لەچینی ژێرەوەدا ببوانایە؟

ئێستا دەبینین کە زۆر لە رەگەزو کۆمەڵە جیاجیاکان لە سەردەمەکانی پێشوی کۆندا، جەستەیان زۆر تەواو دروست تر بووە، وەك لە ئەمڕۆدا.

هەروەها لە چینەکانی زەویدا دەبینین زیندەوەرە نزم و ناتەواوەکان لەسەرو زیندەوەرە گەورە تەواوەکانەوە دێن.

حەیران/ کەواتە دارون دەیەوێت بڵێت گشت زیندەوەران لەیەك رەگەز پەیدا بوون بەهۆی خۆیەتیو سروشتەوە لێکەوتەیان لێدەبێتەوە، نەك بەدروستکردنی خوا.

شێخ/ ئەمە یەکێکە لەو وتە ناڕەوایانەی کە دژی دارون بڵاوی دەکەنەوە و ئەوە راستیە کە گومانی تیادا نییە، دارون باوەڕی بە بوونی خودا هەبووە و دەربارەی (بنەمای رەگەزەکان) (أصل الأنواع) وا دەردەکەوێت دارون گومانی بووبێت لە دانانی سنورێك بۆ بیرۆکەکانی لەگەڵ ئەوەی کە مەیلی وا بووە هەموو جۆرەکانی زیندەوەر بگەڕێنێتەوە بۆ یەك رەگەز و، ئاماژەی ئەوە دەکات کە زیندەوەرەکان بەگشتی دەگەڕێنەوە بۆ چوار یاخود پێنج رەگەز و، لە چەرخێکی دێریندا بەدروست کردن دروست کراوە و هەر رەگەزێك لە سەرەتاوە لە جووتێکەوە کە وتۆتەوە و، هیچ گومانی تیادا نی یە کە دارون باوەڕی تەواوی بە خودا دروستکەری (رەگەزە جۆراو جۆرەکانە) گە ریەك رەگەزبن یاخود زیاتر، بووە.

چونکە عەقڵی باوەڕی بەو ووتانە نەدەهێنا کە دەڵێن (رەگەزە جۆراو جۆرەکان لە خودی خۆیان و سروشتدا پەیدا بون و زیاد دەبن).

حەیران/ کەواتە چۆن هەتا ئێستا ئەوەی ئێمە بیستوومانە لەداروون و هەوا دارانی شتێ ترە؟.

شێخ/ بەڵێ کۆمەڵێك لە هاوبیرانی دارون کە لەسەر رێبازی مادی بوون باوەڕیان بە وتەی دارون نەدەهێنا کەدەی وت: ژیان لەسەرەتادا بەهۆی توانای خوداوە پەیدا بووە، تۆمەتی ئەوەیان دەخستەپاڵ دارون کە لەدڵەوە ئینکاری بوونی خودا دەکات و پێنان لەبوونی کردگار، رواڵەتییە، تەنیا لەبەر خاتری دڵی پیاوانی ئاینییە لە گەردیلەیەکی بچووك پێکهاتووە و، هەندێکی تریان باوەڕیان وایە: ژیان لەسەرەتاوە لەچەند برێکی زولالی زیندووی زۆر بچووك پێکهاتووە، کەبەهەموویان ناگەنە ئاستی تەنها شانەیێ و لەویش سادەترن هەر لەبەر ئەوە بە (مونیراMoner) ناوبرا کە بەیونانی یەکەی ساکار دەگرێتەوە بەعەرەبیش: جەوهەی فەردی پێ دەگوترێ و لایان وایە: بنەمای ئەمانە

بەشێوەیەکی گشتی خود کارە و لەخۆیەوە بەخودی خۆی لەماددەی بێ گیان پەیدا بووە و بەرە بەرە گەشەی کردووە و بەناوبانگترین زانا کە باوەڕی بەم وتەیە بووە زانای بایلۆجی (ئەرنیستی هیگڵ) ی ئەڵمانی‌یە،

حەیران/ ئەی هیگڵ چی دەڵێت؟

شێخ/ هیگڵ دەڵێت گەردون بەگشتی لەماددە پێکدێت و، ماددەش لە گەردیلە پێکدێت و، لەم ماددەیە، هەموو ئەو زیندەوە بێ گیانانە پەیدا بوون کەلە گەردووندا دەبینرێن و جولەی گەردوونیش لە جولەیەکی .گەشەیی هەمیشەیدایە بەساکارترین گەردیلە دەست پێدەکات و بەگەشە دارترین زیندەوەر کۆتایی دێت، ئەم زیندەوەرانە بە گیانلەبەرو بێ گیانەوە، هەموو بەگشتی پێکهاتەی یەك رەگەزن، هیچ جیاوازیەك لە نێوان گیانلەبەرو بێ گیاندا نی‌یە، چونکە رەگەزی ماددە ئەندامی‌یەکان لەو رەگازانەیش دا هەن کە ئۆرگا نیزی نین و دەتوانرێت بە رێگای تەکنیکی هەندێ لە پێکهاتە ئۆرگانیزەکان ئامادە بکرێت.

لەسەر ئەم بنەمایە هیگڵ دەڵێت، ساکارترین جۆری زیندەوەر لە ماددەیەکی بێ گیان لە خودی خۆیدا گەشەدەکات.

حەیران/ چۆن ژیان لە بێگیان دەبێت؟

شێخ/ هیگڵ، وا مەزندەی دەکات کە سەرچاوەی ژیان لە پێوەری رێژەیی نێوان رێژە تایبەتیەکانی رەگەزەکانی ماددە پێکهاتبێت، بەڵام ئەم پێوەرە زۆر ووردەکاری تیادایە و، تارادەیەك زۆری و کەمی بەشێکی رەگەزێك هۆکارێکە بۆ پەیدا بوونی ژیان، یاخود وەستانێکی ژیان، ئەمە بۆ چوونەکانی هیگڵە، بەڵام خۆی و هاوەڵەکانی تری لە ماددیی‌یەکان نەتوانان لە دۆزینەوەی نهێنی چۆنێتی پەیدا بوونی یەکەم ژیانی سەرەتایی لە بێ گیانەوە، تەنانەت (بوخنەر) کە یەکێکە لەوانەی کە زۆر لایەنگری رێبازی پەیدابوون و گەشەکردنی دەگرن و، لە هەموو ماددیی‌یەکانی تر زیاتر هۆگری رێبازی ماددیی‌یە و یەکێکە لەوانەی کە داروین تاوانبار دەکات بەوەی کەموداراتی پیاوانی ئاینی دەکات و سەرسام و دەستەوسان بوو بەرامبەر بەوتەی پەیدا بوونی ژیان لە بێ گیاندا، بە چەشنێك کە بەویژدانەوە زاناکان لەو تاوانانە دوور دەخاتەوە (بڕیار لەسەر ئەو فەرمانەی کە دەڵێت هەموو لێکەوتەیەکی سەرەتایی لە خودی خۆیدا پەیدا بوە کە یەکەم رەگەزی لێ پەیدا دەبێت، بڕیارێکی هەروا ئاسان نی‌یە، چونکە بارو دۆخێکی گونجاو بۆ ئەو پەیدابوونە خۆیەتی‌یە نادیارو نەزانراوە، تەنانەت ئەو خانە سەرە تاییانە کە پێکهاتەو دروستکراون، بەرپەرچی ئەوە دەدەنەوە کە لێکەوتەی بێ گیان بن، بەڵکو لە بواری

زانستدا لێکەوتنەوەیان لە بێ گیان بە موعجزە دادەنرێت و، موعجیزەیەکە کە بەگوێرەی عەقڵ لەوە کەمتر نییە کە بڵێین زیندەوەرە گەشەدارەکان راستەو خۆ لە بێ گیان پەیدا بوون).

حەیران/ ئەمە زۆر راستە. بەڵام من وا گوێبیست بووم، کە دارون دەڵێت رەگەزی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ مەیمون، کە بە پلەکانی گەشەدا تێپەڕبووە، تا... بۆ تە مرۆڤ، ئەمە چۆن دەگونجێت لەگەڵ ئەو وتەیەی کە دەڵێت دارون موداراتی پیاوانی ئاینی کردووە.

شێخ/ ئەمەش، دووبارە وتەی دارون نییە، گەرچی ئەو لەبارەی رەگەزە جۆراو جۆرەکانەوە، ئەم جۆرە گوتنەیش هەڵدەگرێت بەڵام هەندێ لە توندرەوە مادییەکانی رێبازەکەی داروون و هەندێ قسەی ئەویان، سەبارەت بە هەندێ پاشەرۆکی ماددەی ئەندامی کردووە بە بەهانەیێ بۆ نەفی ئامانج و دانایی لە دروستکردنی دروستکراوەکان پاڵپێوەنەری راستەو خۆ (الخلق الدفعي المباشر) کردووە کە لەکتێبە پیرۆزە دابەزیوەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە و، باوەڕیان وابووە کە رەگەزی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ مەیموون بەڵگە خوازیان وابووە کە لێکچوونێکی زۆر زۆر لە نێوان مرۆڤ و مەیمووندا هەیە، لە زۆر لە ئەندامەکانیاوە هەندێ رەوشتی بۆ ماوەیان وەك (حیض) و هەورەها دەیان ووت زۆر لە زیندەوەران هەستی خۆشیو ناخۆشیو قین و سۆزیان تیادایە و لە هەندێکی تریاندا توانای بیر کردنەوە و بەراووردکردنیان تیادایە ئاکام خوازی تۆژینەوەکانیان وا بەدەریدەخات کە ئەم زیندەوەرانە وەك مرۆڤ خاوەنی عەقڵ و سۆزن لە گەڵ جیاوازی لەپلەکانی گەشەکردندا و، ئەوانەی کە دەڵێن رەگەزی مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ مەیموون سەرسام بوون لە چۆنیەتی گواستنەوەی سروشتی ئاژەڵێتی مەیموون بۆ سروشتی مرۆڤایەتی مرۆڤ کە ئەم پلەیەش دوا گواستنەوەیە، هەندێکیان دەیان ووت ئەم گواستنەوانە لە پڕو بێ بەرنامە بوون و، هەندێکی تریان دەڵێن پلە پلە روویداوە، چونکە گواستنەوەی لە پڕو بێ بەرنامە زۆر دوورە لەو جیاوازییەی کەلەنێوان مرۆڤ و مەیمووندا هەیە، بەتایبەتی لە عەقڵیاندا و، زۆر گەڕان لە چینەکانی زەویدا لە دووی ئەو زنجیرە وونبووەی کەمەیموون پیایدا تێپەڕیوە، هیچ پاشماوەیەکیان نەدیتەوە، هەتا ئەمڕۆش نەیان توانیووە بڕیاری تەواو لەسەر ئەم گواستنەوەیە بدەن بە بیروڕایەکی بڕەر و پەسند.

حەیران/ کەواتە فەلسەفەی (گەشە پێدان) چییە کە سبەنسەر دایناوە؟ و جیاوازی چیە لەنێوان (گۆڕان)و (گەشە پێدان)؟

شێخ/ ئەو جیاوازییەی نێوان گەشە پێدانو گۆڕان لە رووی زاراوەی زانستی فەلسەفییەوە زۆر کەمە هەروەك چۆن لە بواری زماندا کەمە، رێبازی گۆڕان (

Transformisime) ئەو رێبازە بایلۆژییەیە کە دەڵێت هەموو جۆرەکانی ئاژەڵ و رووەك دە گۆڕێن و جۆری نوێیان لێدەکەوێتەوە،

رێبازی گەشە پێدان Levolutionnisme، ئەو ریبازە بایلۆژییەیە کە دەڵێت روودانی گۆڕانێکی گە شەدارە لە زیندەوەراندا.

لەراستیدا رێبازی داروینی بریتییە لە (گۆڕانی گە شەپێدانی گەشەدار (تحـــول تطوري ارتقائي)، بەڵام داروون رێبازی گەشەدانی بە رێبازی بایلۆژی داناوە و، نەیکردۆتە فەلسەفەیەکی گشتی سەرتاسەری بۆ بوون، بەڵام سبەنسەر بە پێچەوانەوە رێبازی گەشە پێدانی کردۆتە فەلسەفەیەکی گشتی سەرتاسەری بۆ بوون، کە هەموو شتەماددیي و مەعنەویەکان دەگرێتەوە بەمەش بەدانەری (فەلسەفەی گەشە پێدان) دادەنرێت، کورتەی ئەم فەلسەفەیە (کەلە راستیدا وەسفێکی جوانە بۆ هەندێ لەبینراوە راستەقینەکان کە لە وێنە بووندا بە دەردەکەون زیاتر لەوەی کە شیکردنەوەیەك بێت بۆ پەیدا بوونی راستی ئەم بوونە).

هەموو شتێکی ئەم گەردوونە لە ماددەو ئۆرگانیزو عەقڵ و داب و نەریت و رەوشت، ئاکامی کۆکبوونی بەشە لەیەکچووەکانە، کە ئەم کۆبوونە سنورێك بۆ جوولەکان دادەنێت و دەیان بەستێتەوە و هێزەکانیان پەرش و بڵاو دەکاتەوە، کە بەمەش وێنە و جۆرایەتی نوێی پێدەبەخشێت، پاشان بەرەو ململانێ و لاوازی و لەناو چوونیان دەبات، دووبارە بۆ کۆکبوونێکی تر..... هەر بەم چەشنە بەردەوام دەبێت..... لە کۆمەڵ بوونی گەردیلەی مادییەکان بەردو شاخ پەیدا دەبێت و، لە کۆبوونەوەی تنۆکە ئاوەکان دەریاکان پێکدێت و لە کۆکبوونی ئەندامان خێزان دروست دەبێت و، لە خێزان تیرە پێکدێت و لەکۆك بوونی تیرەو هۆزەکان دەولەت پێکدێت و، لە داب و نەریتەوە رەوشت و یاساو ئاینەکان و لە ژمێرەی خواوەندەکانەوە گە یشتنە دۆزینەوەی خودای تاك و تەنها و لە کۆکبوونی هەستەکانەوە فکرەو بەشەکانی زانیاری دروست بووە و، لەبەشە زانیارییەکانەوە زانست پێکهات و لە کۆکبوونی زانستەکانەوە فەلسەفە پێکهات....

بەڵام گەشەپێدانی زیندەوەرەکان، وەك داروون و کەسانی تر دەڵێن( لەسەر بنەمای گونجاو و هاوچەشنی دەبێت لە نێوان زیندەوەرەکان و ئەو ژینگانەی کە تیایدا دەژین و وەئەو پێداویستیانەی کە گرنگە بۆیان و ئەو پێویستیانەی کە یارمەتیدەرن بۆ مانەوە و ژیانیان و، بەفەرمانی ئەم پێداویستیا ئەو پێویستیانەی کە ئەندامەکانی لەش و هەستی

لێپێکهاتووە تەنانەت عەقڵ و ئەو فکرانەی کە ئێمە بەفکرە خۆرسکیەکان ناویان دەبەین.
هەموویان بەگشتی پێکهاتەی ئەم گەشەپێدانەن، بەڵام ئارەزوە رەنگدانەوە کەڵکبووەکان و داب و نەریتە چەسپاوەکان لەیەکتریان جیادەکاتەوە و، لە ئارەزووە خۆرسکییەکانەوە عەقڵ پەیدا بووە.
وێنە خۆرسکیەکان و یاسای هۆکان و دارشتەی چەرخ و شوێن، بریتین لە شێوازاکانی فکرە خۆرسکییەکان کە نەژاد بەدەستی هێناوە و، بەدرێژایی چەرخ چەسپاون و بوونەتە خۆرسکییە چەسپاوەکان.
حەیران/ لە یادمە نوسراوێکم لەسەر فەیلەسوفی ئەڵمانی کە بە (شوبنهر) ناو دەبرێت، خوێندۆتەوە، بیروڕای هەروەك ئەم بۆ چوونەیە کە دەڵێت ئەندامەکانی جەستەی زیندەوەر بەپێی پێویستیان بۆ ژیان و خۆراك و مانەوە دروست بوون.
شێخ/ بەڵێ (شوبنهر) ئەم پێداویستی و پێویستیانەی بە (ویست) داناوە و، گەشەی بەمانای ویست داناوە هەتا... کردویەتیە راستیەك بۆ کۆتایی هەموو شتەکان و باوەڕی وا بوە کە گەردوون بەگشتی بریتییە لە کۆمەڵێك ویست کەلە حالەتێکی بکەری بەردەوامدایە و، ئەم ویستانەش هێزێکی زیندووی بەتوانایە بۆ دروستکردنی هەموو شتێك و پێکهاتن و ئاراستەو بەردەوامیان بە پێی پێویست پێدراوە و ئێمە لەشتە بەشییەکاندا تەنها ڕواڵەتی ئەم ویستە نەقشێنراوە دەبینین.
حەیران: ئایا.... مەبەستی (شوبنهار) لە ویست ئەوەیە کە خودا ئەو خۆرسکو ئارەزووانەی بەزیندەوەران بەخشیوە لەگەڵ هەموو ئەو یاساو سیستمانەی کە لەگەردووندا هەن، یاخود مەبەستی لە ویستی پێکهاتوو ئەوەیە کە ویستی خودا ئەم گەردوونەی پێکهێناوە و، چەندەها ویستی خودا ئەم گەردوونەی پێکهێناوە و، چەندەها ویستی پێبەخشیوە کە هۆیەکە بۆ بەردەوامی و گەشە پێدانیان کەواتە گەروانەبێت مانای ویست چییە و کێ دروستی کردووە؟
شێخ/ من وا لەوتەکانی (شوبنهاوەر) تێدەگەم هەرچەندە نادیاریشی لە خۆگرتووە، دەیەوێت ئینکاری رێبازی ماددی دینامیکی بکات و، بڕیاری بوونی هێزێکی چالاك لە پشت ماددەوە بدات کە ژیانە و، بۆ چوونی وابوو کە ئەم هێزە لە نەزیندەوەرەکانیشدا چالاکی خۆی دەکات هەربۆیە بەویست ناوی دەبات.....
هەر چەشنێك بێت ئەی حەیران ئەم گۆڕان و گەشە پێدانە هیچ یاسایەکی بەسەردا ناچەسپێت، گەر بە(ژیان) یان بە (ویست) ناو ببرێت هیچ جۆرە باوەڕ ناسەلمێنێ کە دژی باوەڕ بە خودا بێ.

حەیران/ چۆن ئەمە دەبێت؟

شێخ/ ئێستا لە وتەکانی شێخ (جسر) بە دوورو درێژی و ئاشکرا بۆت بەدەردەکەوێت؟

حەیران/ هەموو باساکانی سبەنسەر دەربارەی فەلسەفەی گەشەپێدان، نهێنی ئەم سیستەمەی بۆ دەرنەخستوین کە گەشەپێدان پیایدا تێپەڕ دەبێت و هۆی یەکەم (العلة الأولى) بۆ بوونی ئەم گەردوونە بە گەردیلە و بەشەکان، رەگەزو تایبەتمەندیی یەکانی بۆ بەدەرنەخستوون لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە دەبێتە هۆی کۆك بوون و جیابوونەوەن.

شێخ/ سبەنسەر وای لە فەلسەفەکەی کردوە کە تایبەتمەندیێت بەوەسفی ئەم گەشە پێدانە لە وێنەکانی ژیاندا و، هەوڵی داوە کە هەموو وێنەکانی بوون بە گشتی بگرێتەوە، بەلام ئەو راستیەی کە لەپشتی دروستبوونی گەردوون و هۆکەیدا هەیە، سبەنسەر دەڵێت عەقڵ نەتوانایە لە چوونە ناو قولایییەکانی‌یە و تەنها بۆ تێگەیشتن و زانینی رواڵەتی شتەکانی گەردوون دروستکراوە و، عەقڵ بە هۆی بەکارهێنانی ئەم ڕواڵەتانەوە بوونی خۆی سەپاندووە و هەموو تێڕوانینەکانی بیرۆکەیەکانی عەقڵ کەباسی پشتی ئەم ڕواڵەتانە دەکات عەقڵ دووچاری هەڵەو سەرسامی و گێژاو دەبێت و، وتە بەوەی کە ئەم گەردوونە لە خودی خۆیدا بەبێ هیچ هۆیەك دروست بووە و، هیچ سەرتاییەك نی‌یە، ئەم وتەیە عەقڵ باوەڕی پێناکات ئەو عەقڵەی کە دەڵێت هەموو هۆکارێك بەبی هۆ نابێت هەروەك چۆن عەقڵ داوادەکات کە هەموو هۆکارێك هۆی هەبێت هەرهەمان هۆ، هۆکارە بۆ بوونی ئەم گەردوونە.

عەقڵ دووچاری کول بوون و نەتوانای دەبێت لە ئەندێشەکردنی هۆی یەکەم بەبێ هۆ پەیدا بووبێت.

حەیران/ هەربەم چەشنە بوە بیروڕای ئەما نوئێل کانط لەبابەت نەتوانایی عەقڵەوە، ئایا باوەڕ هێنانی بەخودا هەروەك ئەو بووە.

شێخ/ بەڵێ سبەنسەرو کانط وتەکانیان وەك یەکبووە لە بواری نەتوانایی عەقڵ لەهەڵەکردن و سەرسامی دا و، هەروەك ئەو لە ئاکامدا باوەڕێکی ویژدانی پتەوی هەبووە کە دەڵێت/ چەند راستیەك هەیە کەوا لە نەفسمان دەکات بەهۆی هەستە نادیارە بەتواناکان هەست بە بوونیان بکەین، کە ناتوانین بە عەقڵمان دەرکی بکەین و، یەکێك لەو راستیە گرنگانە باوەڕهێنانە بەخودا.

حەیران/ وا لە شێخی گەورەم تێگەیشتم کە داروِن باوەڕی بەخودا بووبێت، کەواتە

هۆکاری ئەو هێرشە کوێرانەیە چی‌یە کە کراوەتە سەری؟ بۆ ئەم هێرشە نەکراوەتە سەر سبەنسەر کە ڕێبازی گەشەپێدان و بیروڕای وەك داروِن بووە؟

شێخ/ هێرش نەکرایە سەر سبەنسەر چونکە لە تێڕوانینی دروستکردنی جۆرەکاندا، جگە لەوەی داروون گوتبووی لەم بارەیەوە و هێرشە کەیش بۆسەر داروِن بەرە بەرە لاواز بوو کاتێك فەلسەفەی گەشەپێدانی سبەنسەر بلاوکراوەیە، شتێکی ئاسایی بوو کە بیرۆکەکانی هیچ گێژاوێك نەنێتەوە سەبارەت دروستکردنی پلەکانی گەشەپێدات کە پیاوانی ئاینی خرۆشاند و لایان وابوو ئەم بیرۆکانە ترسناکن لەسەر باوەڕهێنان بە خوداو فەرموودەی کتێبە ئاسمانی‌یەکان دەربارەی دروستکردنی مرۆڤی یەکەم بەدرۆ دادەنێت و، هێرشەکانی بۆ سەر داروِن زۆر توندو تیژ بووە کەلەلایەن گەورە پیاوانی ئاینەوە کرا وەزۆر لە پیاوانی زانست و رامیاری و ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیران هێرشیان بردە سەری لە شێوازی موناقەشەگیری، تانەو لۆمەکردن و جنێو و ئازاردان و تاوانی بێ باوەڕی دەخرایە پالی و، هەر ئەوەندە بزانیت کە چۆن هەوالی ئەم هێرشە کرچ و کالانە درێژەی خایاند لە توندو رەقیدا هەتا کۆتایی سەددەی نۆزدەهەم.

بۆ نموونە گەورەو زانای بەناوبانگ ئەسقوفی ئۆکسفۆرد، وتەیەکی لەبەردەم کۆمەلەی پێشکەوتوخوازانی بەریتانیادا بلاوکردەوە تیایدا وتی (داروِن گەورەترین تاوانی کردوە، کاتێك کە هەولی داوە سنورێك بۆ مەزنی خودا لە کاری دروستکردندا دابنێت) و هەروەها کاردینال ماتنگ دەلێت (ڕێبازی داروِن فەلسەفەیەکی دڕندانەیەو عەقل بەرەو ئینکاری بوونی خودا دەبات و، (دوکتۆر بەپری) گەورەی ئوسقوفەکانی (مەلبورن) کتێبێکی دانا کە تیایدا هێرش بۆ داروون دەبات و تاوانی ئەوەی دەخاتە پال کە تۆوی بێ باوەڕی بە خوداو کتێبە ئاسمانی‌یەکان لە دلی خەلکدا دەچێنێت.

هەروەها (مونسیۆر) (سەگۆر) لەفەرەنسا لەسەر ڕێبازی داروِن دەلێت یەکێکە لەو ڕێبازە کەم نرخانەی کە تەنها بێ باوەڕان و نەفس نزمان پالپشتی دەکەن ئەو بیروباوەڕە نەشازە نزمانە لەلایەن کەسانێك پەیڕەو دەکرێت کە پایە نزمو هەست پیسن، ئەم جۆرە ڕێبازانە سەرچاوەکەیان کفرە و کۆتایەکەیان گەندی و چەپەلی دەبێت و، لە ئەلمانیا هەندێ زانایان وایان بلاوکردەوە کە ڕێبازی داروِن دژایەتی هەموو بیرو باوەڕکانی کتێبە پیرۆزەکان دەکات و، هەروەها (لونارت) مامۆستای لاهوت لە (لایبزیگ)، دەلێت/ فکرەی (پەیدا بوونة النشـــــوء) دژایەتی کاربەجێیی خودا دەکات و، فکرەی (دروستبوون) ئاین خاوەنیەتی، نەك زانستی سروشتی و، هەموو پەیکەرێکی بەرزی ئاین، بنەماکەی لەسەر ڕێبازی (دروستبوون)ە و، یەکێك لە زانایانی لاهوت لە سویسرا

بانگێشتی هەڵسان بە شەڕی (خاچی) دژ بەم ڕێبازە (چەوت و خراپکارە) کرد و هەروەها گۆڤاری زانکۆی دبلن دەڵێت: ((داروِن قسەو گفتوگۆ لەوە دەکات کە چۆن دەتوانرێ خودای مەزن لە سەر عەرشی دا بنرێت)) و، هەروەها زاناو دانای گەورە (قسطنطین جمس) لە کتێبەکەی کەبەناوی (داروِنیز، یاخود مرۆڤی مەیمونی) لە پاریس ساڵی ١٨٧٧ بلاوکرایەوە کە ڕێبازی داروِنی بە (ئەفسسونێکی گاڵتەپێکراو) دانا و، هەروەها (گلادستون)ی وەزیری پایەدار لە یەکێك لە وێژەیەکیدا گاڵتە بەم ڕێبازەی داروِن دەکات و د. هیدج کەسەربە زانکۆی (برنستون): دەڵێ: ((پێویستە بەرەنگاری بلاوکردنەوەی ئەم جۆرە ڕێبازانە بکرێت کە ئینکاری کتێبە پیرۆزەکان دەکات)) و هەرلە هەمان زانکۆ )د. دوڤلید) دەڵێت: گونجاندن لەنێوان ڕێبازای پەیدا بوون و کتێبە پیرۆزەکاندا شیاو نی‌یە و، هەرکەسێك بەزانستیانەش ئەم گونجاندنەی چەسپاندو باوەڕی پێ هێنا، ئەوە ئینکاری بوونی خودا دەکات)

هەروەها (د. لی) دەڵێت (بەهیچ شێوەیەك لە شێوازەکانی لێکدانەوە شیاو نی‌یە مانا هێمایی‌یەکەی کتێبی پیرۆز، فراوانی و زیادە ڕۆیی تیادا بکرێت بە چەشنێك کە بلێین ئەم ڕێبازەیشی لەخۆگرتووە، داروِن و کۆمەڵەکەی بەسەر لێشێواوو بۆگەن وەسفی کردون. و لەزانکۆی ئەمریکی لە بەیروت ئەو مامۆستایانەی باوەڕیان بە ڕێبازی داروِن بوو، لە دانیشتگاکە دوور خرانەوە).

حەیران دەڵێت/ ئا.... لێرەدا شێخ مەوزون لەگەڵ فکرەکانیدا خامۆشی گرتی و، منیش بەبێ دەنگی سەیرم دەکردو چاوەڕێی کۆتایی وتەکانی بووم لە پاشدا سەری بەرزکردەوە و بەزەردەخەنەیەکەوە کە هەموو مانایەکی شانازی و ڕێزلێنانی لە خۆگرتبوو.

دووبارە وتی، شێخ/ و لەقولایی ئەم شەڕە ترسناکەدا. ئەی حەیران، لە هەموو ئەم جیهانەدا، تاکە زانایەکی ئاینی پەیدا بوو کە توانی پڕکێشی بکات و بە ئازاو مەردانە کتێبێك دابنێت و تیایدا بلێت ڕێبازی داروِن -گەر چەسپا-، هیچ دژایەتی‌یەکی بڕیارو فەرموودەکانی قورئانی پیرۆز و باوەڕهێنانی بەبوونی خودای گەورە ناکات)

حەیران/ گەورەم ئەو تاکە زانایە کێ‌یە؟

شێخ/ ئەو زانایە شێخ حسین جسرە کە دانەری پەڕاوی (الرسالە الحمیدە)یە، کەلەشەوێکی تردا بۆتی بەدەردەخەم چونکە باسکردنی دوورو درێژە و، شێخی گەورەمەو بەهۆی ئەوەوە ڕێبازی هەق و ڕەوام گرتە بەر لەبەر ئەوە وتەی کەم دەربارەی دادم نادات.

حەیران/ ئێمە هێشتا لەسەرەتای شەو داین، تکام وایە کە زنجیرەی باسەکان نەپچڕێنیت.

شێخ/ منی پیرە مێرد هیچ گرنگ نیە بەلامەوە شەو نخونی و، زۆر بەکەمی شەوان دەخەوم.... و تەنها ترسم لەتۆیە.

حەیران/ تامەزرۆیم بۆ وتەو باسەکان وام لێدەکات زیاتر لە شێخی گەورەم بە ئارام تربم بۆ شەونخونی....

شێخ/ نزیکترین زانا کەلە ئیمامی غەزالی بکا لە رووی زانستەوە و گرنگترینی ئەو لێکچوونە ئەوەیە جسر هەروەك غەزالی هەلگری ڕێبازی زانستی کەلامە و، زیاتر لە زاناکانی سەردەمی خۆی و، هەروەك ئەو ئاگادارییەکی زۆری هەیە سەبارەت بە راستی زانیارییەکانی گەردوون و، چۆتە قولایی دەریای فەلسەفەی میتافیزیکییەوە و، ئامانجی هەردووکیان لە لێکۆلینەوە فەلسەفیەکاندا، چەسپاندنی بوونی خودایە هەروەك چۆن غەزالی باوەڕی بە ڕاستییە زانستییەکان هەبووە کە بە بەلگەی ڕاست و دروست چەسپاوە و ئینکاری ئەوەی دەکرد کە ئەم ڕاستیانە پێچەوانەی ئایین بن و زۆر سەرزەنشتی ئەوانەی دەکرد کە ئینکاری ئەم ڕاستیانەیان دەکرد و وایان دەزانی بەهۆیەوە ئایین سەر دەخەن و پێی دەوتن بێ گومان ئەم زانایانە زیانیان زیاترە بۆ ئایین وەك لە دوژمنەکانی. هەروەها شێخ جسریش زۆر توندبوو بەرامبەر ئەو زانا ئاینیانەی کە ئینکاری ڕاستییە زانستییە بڕەوەکانیان دەکرد و دەیوت: ئەوانە کۆسپ و تەگەرەن لەسەر ڕێبازی ئیمان و بڕواهێنان چونکە جاهیل و نەفامن بە بناغە و بنچینەکانی ئایین و ناتوانن دەقەکانی خوای کاربەجێ و بەلگە عەقلیە بڕەرەکان لەگەلێ یەکتردا بگونجێنن بۆیە ئەمانە زەرەر و زیانیان زیاترە بۆ ئایین لە دوژمنە سەرسەختەکانی. غەزالی و جسر ڕێککەوتن و هەریەکەیان کتێبێکی تایبەتیان دانا بۆ ڕەتدانەوەی فەیلەسوفەکان لەو بوارانەی کەوا تێکگەیشتن پێچەوانەی ئایینە بە تەواوی.

غەزالی کتێبی خۆی دانا بەناوی (تهافت الفلاسفة) کە بۆم باس کردی، جسریش کتێبێکی خۆی دانا بەناوی (الرسالة الحمیدیة) بەلام جیاوازی نێوان ئەم دوو پیاوە لە دوو شتدایە:

یەکەم: غەزالی لە کتێبەکەیدا بە کورتی ڕەددی ئەو فەیلەسوفانەی داوەتەوە کە لە بارەی خواوەندەکان دواون.

هەروەکو پێشتر زانیوتە بیروڕای ماددییە سروشتییەکانی تیادانییە کە ئینکاری

وجودی خوایان کردووە.

بەڵام جسر کە بینی بۆچونی ماددی پەرە دەسێنێ و گەشە دەکات لەسەر دەستی هەندێك لە زانا ماددیەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە دوای داروخان و نووشستی هێنان، وای بە چاك زانی کە زۆرینەی قسەکانی لەگەڵ ماددیەکان بێت.

دووەم: جسر ڕووبەڕووی هەندێك بیروڕای نوێ بۆوە کە لەسەردەمی ئەودا دەرکەوتن گرنگترینیان بۆچوونی (پەیدابوون و گەشەسەندن) بوو کە زانا ماددییە سروشتییەکان گرتبوویانە بەر بۆ ئینکاری خوای دروستکەر و دەیان ووت ژیان پەیدابووە لە نەبوونەوە بە بوونێکی خۆیەتی.

ئەم بیروڕا ماددییانە لەسەردەمی غەزالیدا بەم چەشنە ووردەکاریی و ئاراستەکراو نەبوو و، ئەم هەموو لایەنگرو دۆستانەی نەبوو وەك ئەمڕۆ ڕەچاو دەکرێ.

جسر بۆ چوونی وابوو، موناقەشەگیری ئەم رایانە لەسەر رووناکی ئاینی راست و زانستی دروست و بێ هەڵە بکات.

هەر لەبەر ئەوە هەستا بەتوژینەوە و لێکۆلینەوە لەگەڵ ماددییەکان بۆ چەسپاندنی لێکەوتەی گەردوون و چەسپاندنی بوونی خوداو سیفاتی خودا کە عەقڵ مەزەندەیان دەکات و، دەستیکرد بەلێکۆلینەوەی گومانی مادییەکان کە سەردەکێشێ بۆ باوەڕنەهێنان بە بوونی خودا و، دروستکردنی گەردوون لەنەبووونەوە و، بوونی سیستم و دانایی لە دروستکردندا و هەمووی بەگشتی پووچەڵکردەوە و لەناو یبردن، لە پاشاندا دەستیکرد بە توژینەوەی فەلسەفەی (پەیدا بوون و گەشەکردن) و بەدوورو درێژی باسی لەسەرکردن و بەنیشانەی بەرزو ویژدانیەوە لێکۆلینەوەی لەسەردەکردن و لە هەموو بیروراکانیدا زۆر پەیوەستی ئاینی دەکرد و، سوور بوو لەسەر گونجاندن لەنێوان (عەقلیەکان و نەقلیەکان) و زۆر شارەزایی هەبوو بە شێوازەکانی ئەم گونجاندنە، دوور لە کرچ و کاڵی و دەمارگیری کوێرانە و، باوەڕێکی پتەوی هەبوو بەوەی کە ئاینی ئیسلام هەرگیز دژایەتی و ئینکاری فەرمانەکانی عەقلی ساغ ناکات.

حەیران/ ئایا.... وتەکانی جسر سەبارەت بە کێشەکانی لێکەوتەی گەردوون و کۆنێتی گەردوون هیچ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ وتەکانی غەزالی و کەسانی تردا؟

شێخ/ (لەناوەرۆکدا هیچ جیاوازییەك نییە، بەڵام جسر وەڵامی بۆ سروشتیو چەرخییەکان (دهریین) بوو کە ئینکاری بوونی خودایان دەکرد، بە پێچەوانەی غەزالییەوە کەهەمیشە وەڵامی ئەو فەیلەسوفە خواوەندیانەی دەدایەوە کە باوەڕیان بە کۆنێتی گەردوون هەبوو بەبێ ئینکاری بوونی خودا).

وتەکانی جسر لە هەندێ بواردا جیاوازە لە گەڵ وتەکانی غەزالیدا، لە شێوازو موناقەشەگیری و بەڵگەیی ماددیی‌یەکان لەگەڵ بوونی ئەم جیاوازیانەشدا جسر پەیڕەوی ڕێبازی غەزالی دەکرد و لەسەرەتادا بەزمانحاڵی ماددیی‌یەکان بڕیاری لەسەر وتەکانیان دەداولێکی دەدانەوە، پاشان وەڵامی دەدانەوە، ئەمەش کورتکراوەکەیەتی:- (ئەو بڕیارەی کە ئێوە ددانتان پیادا ناوەو بەوەی کە بنەمای گەردوون دوو کارە:- ماددەو هێزەکەی واتە جووڵەکەی و، هەردووکیان کۆنن و هەر لەئەزەلەوە پەیوەستی یەکترن و، ئەم جوڵەیەش هۆکەی تەنها ماددەکە خۆیەتی و، دروستکراوەکان هەموویان بەگشتی لێکەوتەی ماددەن بەهۆی جووڵەکەیەوە و، پەیدا بوون پاش ئەوەی نەبوون، وەك پەیدا بوونی هۆکار لەهۆکەی بە پێی پێویست و هیچ ویست و مەبەستێك نەبووە لە ماددە و جووڵەکەیدا بۆ لێکەوتەی شتێ لێی.

ئێوە دەڵێن، چەسپاوە لەلامان پەیدا بوونی زیندەوەرو ڕووەك، پاش ئەوەی نەبوو بوون، بەهۆی دۆزینەوەی پاش ماوەیان لە ناو چین و توێکانی ژێرزەویدا کە واتان بۆ دەرکەوت کە دواچینی زەوی هیچ جۆرە زیندەوەرێك و پاشماوەیەکی تیا نی‌یە و، چەرخێکی زۆر بەسەر زەویدا تێپەڕ بووە بەبێ زیندەوەر و، بەکۆك بوونی بەشەکانی ماددە بەهۆی جووڵەیەوە، رەگەزە بنەمایی‌یەکان پەیدا بوون و، بەتێکەڵبوونیان، بە ڕێژەی تایبەتمەند، جەستە زیندووەکان پەیدا بوون و، یەکەم شت کە پێکهات لە جەستەی زیندوو ماددەیەکی بێگەردی زولالی‌یە کەتوانای خۆراکدان و دابەشبوون و زۆر بوونی تیادایە کە ئەویش (پرۆتۆپلازما)یە و لە پەیدا بوونی پرۆتۆپلازما، ساکارترین ڕووەکو زیندەوەر پێکهات و ئەم زیندەوەرانە بەهۆی ئەو چوار یاسایەی کەلە پەیدا بوون و گەشەکردندا باسکران، زۆر بوون و جۆرایەتیان لی پەیدا بوو و، پاش ملیۆنەها ساڵ گەیشتە ئەم پلەیەی کە ئەمڕۆ تیایدایە.

مرۆڤ تاکە ئاژەڵێکە لە تێکڕای ئاژەڵەکانی تر و، بە توانای یاسای (هەڵبژاردنی سروشتی) گەشەی کردووە، لەوانەیە لە مەیمون پەیدا بووبێت و، عەقڵیشی هیچ جیاوازیی‌یەکی نی‌یە لەگەڵ عەقڵی ئاژەڵەکانی تر، تەنها ئەوە نەبێت کە عەقڵی مرۆڤ لە پلەیەکی گەشەو بەرزدایە و، پاش ئەوەی کە شێخ جسر کورتکراوەی ڕێبازی ماددیی‌یە سروشتی‌یەکان پێشکەشکرد، دەستدەکات بە وەڵامدانەوەیان و پێیان دەڵێت: (پاش سەرنج دانێکی ڕاست و قوڵ لەم ڕێبازەتان، بۆم دەرکەوت کە بنەماکەی باوەڕ هێنانتانە بە کۆنێتی ماددە، وەلەگەڵ باوەڕهێنانتان بە کۆنێتیەکەی، باوەڕتان بەبوونی خودایەك نەبووە کە دروستکەری بێت و کاتێك جۆراو جۆری ماددەتان بینی و چەسپا

لاتان کەئەم جۆرایەتی‌یە لێکەوتەیە، باوەڕتان نەهێنا کە ئەم لێکەوتە جۆراو جۆرانە لێکەوتەی هەمان مادده بن و، پێویستتان بە چەسپاندنی جوولەی بەشە تاکەکانی ماددەی بوو و لەسەر بنەمای مادده و جوولە جۆرایەتیان چەسپاند. گەر باوەڕتان بە لێکەوتەی مادده بوایە ئەم (باوەڕە) زۆری لێدەکردنکە باوەڕ بەبوونی خودایەك بێنن کە پەیداکەری بوون بێت و جۆرایەتی پێبەخشیبێت و، خۆتان ماندوو نەدەکرد کە بلێن ئەم جۆرایەتی‌یە پەیدا بووی ماددەو جولەکەیەتی لەبەر پێویستی‌و بەبێ هیچ مەبەست و دەرککردنو نەخشەدانانێك و یەکەم شت کە پێویستە لەسەر من ئەوەیە کە بەلگە بهێنمەوە بۆ پووچەلی کۆنێتی مادده و چەسپاندنی پەیدا بوونی و، سەرنجدەرێکی لێکۆلەر لەرێبازەکەتان سێ داوا دەبینێت، کە ناتوانرێت چەسپاندنی هەرسێکیان بەیەکەوە بکرێت، چەسپاندنی هەندێکیان رامان دەکێشێت بۆ پووچەلکرنەوەی هێندێکی تریان.

کێشەی یەکەم/ ئێوە دەلێن، کۆنێتی ماددەو جوولەکەی، هەرلە ئەزەلەوە پەیوەستی یەکترن و لێك جیانابنەوە و، کێشەی دووەم/ ئێوە وتان جۆرەکانی زیندەوەر لێکەوتن، پاش ئەوەی بەهۆی زانستی توێژینەوەی چینەکانی زەویی‌یەوە بۆتان بەدەرکەوت، کە جۆرەکانی زیندەوەرو رووەك پەیدا بوون پاش ئەوەی کە نەبون بوون و، مرۆڤ نوێ ترین قۆناغیانە.

کێشەی سێهەم/ وتتان هەموو جۆرەکان بەگشتی بەهۆی جوولەی بەشەکانی ماددەوە پەیدا بوون، ئەو جوولەیەی کەلاتان وابوو هەر لە ئەزەلەوە پەیوەستێتی و، نەماددە و نەجوولەکەی هیچ وویست و خوازیاریی‌یەکیان نەبووەلەم پەیدا بوونە جۆراو جۆرایەتیەدا.

مانای ئەمە وادەگەیەنێت کە جۆرایەتی‌یەکان لەماددەو جولەکەی پەیدا بووبن، وەك پەیدا بوونی هۆکار لە هۆکەی، ئەمە ئەو سێ داوایەیە کەلەرێبازە کەتاندا چەسپاندوتانە و منیش لە وەلامیاندا دەلێم:

هەموو عەقلێکی ساغ بڕیارێکی تەواوو بڕەر دەدات و هیچ گومانێکی تیادا نی‌یە کە شت بە هیچ شێوەیەك لەهۆ پەیوەندیدارەکەی دوا ناکەوێت، گەر هۆکەی لێکەوتەبێت، هۆکارەکەشی لێکەوتەدەبێت بەبێ هیچ دواکەوتنێك.

گەر هۆ کۆن بێت، هۆکاریش کۆن دەبێت، گەروا نەبێت بوونی هۆ بەبێ هۆکار دەبێت، کەئەمەش لەلای عەقل مەحالە و، وتەتان، بەکۆنێتی مادده و جوولەکەی، کە هەردووکیان هۆی جۆرایەتی گەردوونن، ئەو کاتە پێویست دەکات کە جۆرایەتی‌یەکانیش کۆن بن بەلام ئێوە باوەڕتان بە کۆنێتی جۆرایەتی‌یەکە نی‌یە.

لەبەر ئەوە ئێوە لەم حاڵەدا کەوتوونەتە نێوەندی سێ کێشەوە یان باوەڕتان بە کۆنێتی جۆرایەتی هۆکارەکان هەبێت لەبەر کۆني هۆکانیان، بە پێچەوانەوەی ئەو چەسپاندنانەی کە بەدەستان هێناوە یاخود دەڵێن مادده جووڵەکەی بەهۆی (هەڵبژاردن و ویستەوە) دو بکەرن و، چەرخێکی دیاریکراو تایبەتمەندکرا بۆ لێکەوتنەوەی جۆرایەتیەکان.

ئێوە ئەمە زۆر بەتوندی ئینکار دەکەن وەیان دەبێ بڵێن ماددەو جووڵە لێکەوتەن کە ئەمەش راست و ڕەوایە.

پاشان شێخ جسر بەشێوەیەکی تر وەڵامیان ئەداتەوە کە دەڵێت/ شاراوە نی‌یەو عەقڵیش باوەڕ ناهێنێت کە ماددەبێ بەش بێت لەو وێنانەی کەوەریدەگرێت و، هەر لەبەر ئەوە وتووتانە هەرگیز مادده بەبێ وێنە نەبووەو نابێت.

چونکە مادده و جووڵەکەی کە بەهۆیانەوە وێنە دروست دەبێت.

هەردووکیان کۆن و پەیوەستن بەیەکەوە،

بەڵام عقڵی ساغ بێ گومانە لەوەی هەموو وێنەیەك کە مادە وەریدەگرێت، لێکەوتەیە، چونکە لەناو دەچێت و دووچاری گۆڕان دەبێت.

گەر ساکارترین وێنەش بێت، بەبەڵگەی ئەوەی کە ئەم وێنە ساکارانە گۆڕان و لەناو چوونی بەسەردا هاتووە.

وێنە جۆرایەتی زیندووەکان جێیان گرتونەتەوە وەك چەسپاندتان کە بوونیان لە چینەکانی زەویدا لێکەوتەیە و هیچ شاراوە نی‌یە لەلای عەقڵ کە هەرشتێك بچێتە خانەی نەبوونەوە کۆنێتی مەحاڵە.

لەبەر ئەوە وێنە پەیوەستەکەی مادده، لێکەوتەیە، ناگونجێت مادده کۆن بێت، چونکە گەر سەرنجی ساکارترین وێنەی مادده بدەین دەبینین وێنەکانیش دووبارە لێکەوتەن، بەبەڵگەی ئەوەی نەبوونی بەسەردا دێ.

کەواتە پێش پەیدا بوونی مادە، دەبێت مادده چۆن بوو بێت؟

یان ئەوەیە بووترێت وێنەی لەخۆنەگرتووە، کە باوەڕتان بەمەش نەهێنا، چونکە لەلای عەقڵ مەحاڵە، مادده هەرگیز بێ وێنە نەبووە، وەك بڕیاری ئێوەو فەیلەسوفەکانی پێشووتان لەبەر ئەوە لێکەوتەیە و کۆن نی‌یە و، بەدەربڕینێکی تر دەڵێین: مادە بەگوێرەی وتەتان و بە بڕیاری عەقڵی ساغ پەیوەستی وێنەیە و، وێنەش پەیوەستی مادەیە و جیانابێتەوە لێی گەر ماددەی پەیوەستیدار کۆن بێت،وێنە پەیوەستەکەشی کۆن دەبێت، چونکە بە بڕیاری عەقڵ هەرگیز پێویست لە پەیوەست جوودا نابێت، بەڵام ئەم وێنەیە کۆن نی‌یە، بە بەڵگەی ئەوەی، نەبوونی لە خۆگرتووە، کەواتە ماددەش کۆن نی‌یە.

پاش ئەوەی کە شێخ جسر بە بەڵگە لێکەوتەی ماددە و وێنەکەی سەلماندی کەعەقڵ ڕێگا چارەیەکی نییە بۆ ڕزگار بوون لێی گەورەترین زانایان و فەیلەسوفان باوەڕیان پێهێناوە و شێخ جسر بەماددیەکان دەڵێت، هەموو لێکەوتەیەك دەبێت کارێك پەیدای کردبێت.

بەهۆیەوە بوونی بەسەر نەبوونیدا زاڵ دەبێت، دەنا بێ لایی بەسەر لایەکا زاڵ دەبێ بەبێ هۆکاریگەری (ترجيح بلا مرجح)، کەئەمەش مەحاڵێکی ئاشکراو بێ گومانە، گەر ماددە چەسپا لێکەوتەیە دەبێت شتێك هەبێت کەماددە لێکەوتەی ئەو بێت و بەهۆیەوە هەبوونی بەسەر نەبوونی دا زاڵ بووبێ و ئەم شتەش پێویستە هەبووبێ، چونکە نەبووشتی لێ پەیدا نابێ و، ئەم هەبوەش خودای گەورەو بەخشندەیە.،

لەلای عەقڵ دەبێت ئەم هەبووە کۆن بێت گەر لێکەوتەبێت خۆیشی پێویستی بەپەیداکەر دەبێت، ئەوکاتە، یان بەوشێوازی، خولاندنەوە (دەور) پەیدا دەبێت وەیان بە شێوازی زنجیرەیی (تسلسل) کە هەردووکیان لەلای عەقڵ مەحاڵن.

لە پاش ئەو هەبووە کۆنە، کە پەیدا کەری ماددەیە، یان دەبێت لێکەوتنەوەکەی بە شێوازی هۆ و هۆکار ناچاری بێت بەبێ وویست و هەڵبژاردن و، یان لێکەوتنەوەکەی بەویست و هەڵبژاردن دەبێت، کە ئەمەش لەلایەن عەقڵ ناگونجێت کە لێکەوتنەوەیان بەشێوازی هۆ و هۆکاری ناچاری بێت، گەر وابوایە لەگەڵ (کۆنێتی‌یەکەشیدا) ئەو کاتە پێویستی دەکرد ماددەو جۆرایەتیەکانی هەموویان بەگشتی کۆن بوونایە، کەواتە هەر ئەوە ماوەتەوە کە بڵێین بە وویستو هەڵبژاردەی خودا پەیدا بووەو، کاتێکی تایبەتمەندی بۆ تەواو کردووە، بەم شێوەیە چەسپا کە ئەو هەبووە کۆنە خاوەن ویست و خاوەن هەڵبژاردنە.

پاشان ئەو خواستە بوون بەسەر نەبووندا زاڵ دەکات و کاتی بۆ دیاری دەکات بەڵام هەمان بوون تەنها بە ویست پەیدا نابێت بەڵکو پێویستی بەتوانایی‌و زانست هەیە.

هیچ گومانی تێدا نییە ئەو خودا گەورەی کە پەیدا کەری ماددەیە وەسیفەتی گەشەکردن و گۆڕان لە وێنەیەکەوە بۆ وێنەیەکی تری پێبەخشیوە خاوەنی بەرزترین تواناو زانستە، جایا هەرخودا خۆی جۆرایەتی و گەشەکردنی بەماددە بەخشیبێت یاخود ئەو گونجاندنەی بەماددە بەخشیوە کە توانای جۆرایەتی و گەشەکردنیان هەیە بەگوێرەی ئەو یاساو جوولە بەشیانەی کە ماددە لە خۆیی گرتووە، وەك ماددییەکان دەڵێن هەردوو بیرۆکە کە بڕیاری تەواوی تواناو زانستی خودا دەدەن.

ئەوکەسەی شتێکی ساکار دروست بکات و پاشان بیگۆڕێت بۆ جۆرەها شتی تر کە

نەتوانرێت ئامارو ژمێر بکرێت، پاشتێکی ساکار دروست بکات بە گوێرەی ئەو یاسایانەی کە پێی بەخشیون بگۆڕێت بۆ جۆرەها شت کە نەتوانرێت ئامارو ژمێرە بکات، بەچەشنێك کە عەقڵ سەرسام بکات لە پوختی و بڕیاری، هیچ ژیرێك گومان لە پێویستی بوونی خودای بەتوانا و زانستی ناکات ئەم بیرۆکەیە چەسپا کە خودای هەبووی دێرین خاوەن خواست و خاوەن هەڵبژاردن و تواناو زانایە.

پاش ئەوەی کە شێخ جسر بەڵگەکانی لەسەر سیفاتی تەواوی خودای بەخشندە ئاشکرا کرد، ئاورێك لەوانە ئەداتەوە کە تەنا باوەڕیان بە هەستپێکراو بینراوەکان هەیە و، هیچ نرخێك بۆ ئەو بەڵگە خوازیانە دانانێت کە بەهۆی تیۆری عەقڵی پوختەوە بەدەستهاتووە و، پێیان دەڵێت: ئێوە لەبەر ئەوەی کە ڕێگاتان نەبرد بۆ ئەو زانستەی کە بوونی خودای دروستکەری مادده دەچەسپێنێت، باوەڕتان بە کۆنێتی مادده هێنا و، کاتێ بەچاوی خۆتان جۆرایەتیەکانی مادده تان بینی، پێویستیتان بە بوونی پێویستکارێك بوو (موجب) کە ئەم جۆرایەتیەي لێکەوتبێتەوە، چونکە عەقڵ باوەڕ ناهێنێت مادده بەبێ هیچ هۆکارێکی لەبار ئەم جۆرایەتی‌یەیی لەخۆ گرتبێت، پاشان بەناچاری وتان: مادده لەزاتی خۆیدا بەش بەش و تاك تاکە، ئەو بەش و تاکانەیش خاوەنی شێوەو شێوازی جیاوازن و هەر لەسەرەتاوە (لەئەزەلەوە) دەجووڵێن و خاوەنی جووڵەیەکی ئەزەلی و ئەبەدین و، بەهۆی جووڵەکانیانەوە دەستیان کرد بەکۆکبوون بەجۆرەها چۆنێتی و شێواز، جا ئەم کۆبوونەوەیە لەسەر ئەم چۆنێتی و شێوازانە ئەم جۆرەها شتانەی بە بەرهەم هێنا، لەگەڵ ئەوەش بە بڕیاری خۆتان تا ئەمڕۆیش حەقیقەتی نەزانیوە و، ئەم ویەتان کە هەمیشە پەیوەستی بوون ئەوەش ئەوەیە کە ئێوە تەنها باوەڕ بە بەڵگەی هەستپێکراو و بینراو دەهێنن دژی ئەم پەنابردا نەتانە بەڵگەی نەظەری ئەوەتا بیرۆکەکانی عەقڵ کەدوورن لەهەستپێکردن و بینینەوە.

لەبەر ئەوەی گەڕانەوە بۆ بەڵگە خوازی بە ڕێگای تیۆری ئەوەی کە ئێوە دەڵێن: ئەم کۆبوونەوەی بەشانە بەرێکەوت بووە، جۆرێکە لەبەڵگەی نەظەری، نەك بەڵگەی هەستپێکراوو بینراوی عەقڵ پوخت، منیش ئەم پرسیارەتان ئاراستەدەکەم- ئەم دوو بۆ چوونە کامیان لای هۆش و عەقڵ ئاسانترە:

ئایا لەلای عەقلی ساغ ئاسانە باوەڕ بهێنێت کە هەموو شتەکانی گەردوون لە سیستم و داهێنانی کوێرانەی مادده بێت...؟ یاخود ئاسانترە لەلای عەقڵ و نزیکترە بۆی کە ئەم هەموو شتانەی گەردوون لەئاکامی دروستکردنی خودای بەتوانا و وویستخواز و زانا و

کاربەجێ بێت؟

ئا.... لێرەدا شێخ جسر بەڵگە خوازییەکانی بەبەڵگەکانی سیستەم و دروستی تەواوەکان و دانایییەکان دەردەبڕێت دوای ئەوەی کە ئاماژەی تایبەتمەندیی ڕەوشتکاری شتەکانی ناو گەردووندەکات، کەبەهۆی تایبەتمەندی خودای بەتوانا و کاربەجێوە پێیان بەخشراوە.

گەر خودا نەبووایە ئەم شتانەی گەردوون نەیان دەتوانی ئەم تایبەتمەندیانە لەخۆ بگرن بە پێچەوانەی هەندێ تایبەتمەندی شتی تر. (هەر ئەو تایبەتمەندیی‌یەی کە غەزالی باسیکردووە و منیش بۆتم ئاشکرا کرد لەکاتی وتەمان لەسەر (هیومی) پێشەوای گوماندارانی) هەروەها شێخ جسر سەرنجی خەڵکانی رادەکێشێت بۆ هەموو ئەو نیشانە داهێنانە رازاوانەو بڕیارانەی کە لەگەردووندا بەدی دەکرێت و، سەرنجی مرۆڤ دەدات لە پەیدا بوون و دروستکردنیدا، نیشانەی دانایی‌و تەواوی دروستی کارەکانی خودا ئەوەندە زۆرن کە ناتوانرێت نەئامارو نەژمێرە بکرێت.

بۆ نموونە (هەستی بینین) هەڵدەبژێرێت و دەڵێت (گەر سەرنجێکی پێنج هەستیارەکان بدەین بەتایبەتی هەستی بینین، کە زۆر کاری تیادایە عەقڵ و مێشك سەرسام دەکات، چاو لە بۆشایدا دانراوە و، لە سێ چین و سێ شێ دا پێکهاتووە لەگەڵ ئەو پێداویستیانەی کەلە بەستەرودەمارو پەردەو ماسولکەکان پێکهاتوون.

چینەکان یەکەمیان (رەقە) کە بریتی‌یە لە پەردەیەکی نزمی پتەویی سپیەر کە ڕووناکی لێوە دەرناچێت و ناوەوەیش نابینرێ و چواردەوری چینەکانی تروسی شێیەکەی داوە بۆ پاراستن و پارێزگاری یان، بەڵام لە پێشەوەیدا پارچەیەکی تەنکی روون هەیە کەلەدەرەوەی قۆقزەو لەناوەوە چەماوەیە کە پێی دەڵێن (قرنیە)و دووەم چین (رەشایی) (مشیمیە) کە بریتی‌یە یە لە چینێکی ناسکی رەنگ رەش لە نێوان چینی رەق و تۆڕدایە، سێهەم چین بریتی‌یە لە تۆڕەکان کە ئەمیش لە راخەرە دەمارەکانی چاو پێکهاتووە کە لە مێشکدا دروست دەبێت و لە پشتی چاوەوە شوێنی خۆی دەگرێت.

بەڵام شێینەکان، یەکەمیان (ئاوی‌یە) کە بریتی‌یە لە شلەیەکی پاکی روون کەلە ژوورێکی پشتی فەرەینەوەدایە، وسنورەکەشی بریتی‌یە لەپەردەیەك کەناوەراستەکەی کونە کە پێی دەڵێن (رەنگدەر) (قزحیە)کە رەنگی رەشە یان شینە یان کوژەکی‌یە و ئەو کونەی کەلە ناوەراستدایە پێی دەڵێن (بیلبیلە) (بۆبۆاة) وە دووەمین شێینەیی کە (کریستالی) (بلوریە) کە جەستەیەکی نزمی سفت و لوس و تەنکە وەك عەدەسە، لەهەردوو رووەکەیەوە قۆقزەوەلە ناوەکەیدا چڕتر وەك لەلاکانی، وەلەپشتی

(ڕەنگدەرەوە) دێت، سێهەم چینی شێینەیی (شوشەییەیە) کە جەستەیەکی تەنکی لینجە وەك سپێنەی هێلکە بۆشایی پشت کریستالێ و تۆڕەکان پڕدەکاتەوە.

ئەو کردارەیە کە وێنە بینراوەکان لە چاودا نەخش دەکات کە بریتییە لە ڕووناکی سەر بینراوو کاردانەوەکەی، وەك ئاشکرایە ڕووناکی سیستەم و یاسای تایبەتمەندی خۆی هەیە لەکاردانەوە و هەڵمژین و فشار کۆکبوون و بڵاوبوونەوەی گەرپێکهاتەی چاو نەگونجێت لەگەڵ ئەو سیستەم و یاسایانەی روناکیدا چاو نەتوانا دەبێت لە بینین. کاربەجێی خودا وا پێویست دەکات کە چاو لەم چین و شێینە جیاوازانە پێکبێت و بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە گەر ڕووناکی کەوتە سەر بینراوێك کاردانەوەی دەبێت و هێڵەکانی دەکەوێتە ناو چاو وێنە بینراوەکان لەسەر تۆڕەکان دەنەخشێنێت و ئەویش دەیگەیەنێت بە دەماغ بەڵام روناکی بەکاردانەوەی لەسەر بینراوەکە بە هێڵێکی ڕاست دەبێت گەر هەر بەردەوام بێت لە ڕۆشتن بەبێ کۆکبوون بە پرش و بڵاوی دەگاتە سەر تۆڕ ئەو کاتە وێنەکان بە شێواوی نەخش دەکرێن، بەڵام کاربەجێیی خودا وای کردووە هەر لە یەکەم چوونە ڕووناکی بۆ ناو چاو بەرەشایی (قرینە) دەگات و لێی دەردەچێت و لەبەر قۆقزی ڕوی دەرەوەی و چەماوەیی ڕووی ناوەوەی، هێڵەکان هەندێ کۆکبوون دەکەن دوای ئەوە ڕووناکییەکە بەچینە شێیە ئاوییەکەدا تێپەڕدەبێ بەم ڕێژە زۆر کۆکبووە دەگەنە تۆڕەکان، وێنە لە ناوەڕاست و هەردوو لاکەیدا دروست دەبێت، ئەو کاتە وێنەکان شێوا و دەبن، بەتایبەتی گەر ڕووناکییەکە زۆر بەتین بێت، خودای دروستکەر و کاربەجێ بەم چەشنە ڕێکیخستووە و، پەردەی ڕەنگدەر (قزحیە) لە پشت چینە شێینە ئاوییەکەوە دێت و، لەناوەڕاستیدا کونە وە فراوانی و تەسککردنەوەی خستۆتە ژێر ڕکێفی بینەرەوە تاکو ماوە بە ئەو ڕووناکییە بدات بچێتە ژورەکەی پێویستی پێیەتی، کونەکەفراوان دەکات کە ڕووناکی یەکە کەم بێت و، تەسکی دەکەنەوە گەر ڕووناکیەکە بەتین بێت و چواردەوری ڕەنگدەری بۆیەکردووە بەرەنگێك کەماوە نادات بە تێپەڕبوونی ڕووناکیەکە واتە نزمی دەکاتەوە بە هەڵمژین تاوەکو ئەو هەڵە ڕووناکیانە دەرنەچن کە دەکەونە سەر چواردەوری ڕەنگدەرەکە کە دەوری گلێنەی داوە و بگاتە لێواری تۆڕو وێنەکە شێواو بکات، لە پاشدا هێڵە ڕووناکیەکان بە شێیە کریستاڵیەکە تێپەڕ دەبێت کە هەردوو ڕووەکەیان قۆقزن بەمەش کۆکبوونیان زۆر دەبێت بەتایبەتی لە ناوەڕاستدا چونکە ناوەندی کریستاڵەکە چڕترە وەك لە لێوارەکەی، خودای داناو شارەزا دووبارە ئەم کریستاڵیەی خستۆتە ژێر ڕکێفی بینەرەوە بۆ ئەوەی قۆقزیەکەی بە پێی پێویست زیادو کەمدەکات، چونکە هێڵە ڕووناکیەکان زیاتر کۆك

دەبن بەزیاد بوونی قۆقزی ئەو جەستەیەی پیایدا تێپەڕ دەبێت و کەم دەبن بەکەمی قۆقزی ئەو جەستەیەی پیایدا تێپەڕ دەبن و، لەپاش تێپەڕ بوونی هێڵەکان بە شێینەلینجەکەدا کۆکبوون زیاد دەبێت تاوەکو ئەو کۆکبوونە تەواو بێت بۆ نەخشاندنی ئەو فۆڕمانە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا.

ئەمە سەبارەت بەناوەوەی چاو بەڵام دەرەوەی چاو خودای بەخشندە چاوی داناوە لە چاڵێکدا و لەهەموولایەکەوە پارێزراوە تەنها ئەو لایە نەبێت کە رووناکیەکەی پیادا تێپەڕ دەبێت و چینی یەکەم کە رەقە لەگەڵ رەشایی یەکەدا کەوتۆتە نزمایییەوە تاوەکو بەرەنگاری هەندێ هێزی دەرەکی ببێت و بە پێڵو دا پۆشراوە بۆ پاراستن و لە لێواری پێڵوەکاندا موویەکی چری نزمی چەقاندووە بە شێوەیەك کە مووەکانی پێڵووی سەروو بەرەو سەرەوە بێت و بە پێچەوانەی موو پێڵوی خوارو بەرەو خوارەوەیە و هەمەرەنگی مووەکان لە تیراوی ئەو رووناکیەوە دروست دەبێت کە دەکەوێتە سەرچاو و چڕی و چەقاندنی بۆ بەرەنگاری ئەو جەستە بچووکانەی کە دووچاری چاو دەبن لە خاك و خۆڵ و تەپ و تۆز و هەڵگەڕانەوەی مووەکان بۆ جیابوونەوەی برژاڵەکانە لەکاتی کردنەوەی پێڵوەکاندا، گەر لاتەریب و بەرامبەر بوونایە بە هۆی شێی چاوەوە دەچوونە ناو یەك و پێکەوە دەنووسان ئەو کاتە بەرەنگاری تێپەڕبوونی رووناکیەکە دەبون کەبەمەش گەیشتنی فۆرمەکان بۆ تۆڕ و وێنە بینراوەکە شێواو و لێڵ دەبوو و، لەبەر ئەوە ئێسکە پێڵوو(حجاج)و پێڵوو برژاڵەکان رێگرێکی راستەوخۆنین بۆ پاراستنی چاو لەتەپ و تۆز کە زەرەرمەندە بۆ رەشاییو ناسکی چاو، هەر لەبەر ئەوە خودای بەخشندە رشتنی فرمێسکی کردۆتە دەرمان بۆ دوورکەوتنەوەی ئەو خۆڵ و تۆزە.

پێڵوی وا دروستکردووە کە هەمیشە لە جوڵەدا بێت بۆ داخستن و کردنەوە تاوەکو بینین نەوەستێت و لێڵ نەبێت و فرمێسك ئەو خۆڵ و تۆزەی سەر گلێنە دەشوات و پێڵوش بە جوولە هەمیشەییەکەی ئەو فرمێسکە تێکەڵ بە خۆڵ دەکاتە دەرەوە و، ئەو فرمێسکەی کە بەتێکەڵبوونە کە پیس بووە، پێویستە لەسەر گلێنە لابچێت و، خودای بە خشندە ناهێڵێت ئەم فرمێسکانە بەسەر رووومەتدا بێنە خوارەوە بەڵکو دەیکاتە شێوەی (ریپۆق) (موق) لە پاشدا کونێکی باریکی بچووکی دروستکردووە کەدەچێتە ناو (لووت) پێی دەڵێن کە ناڵی فرمێسك، ئایا لای عەقڵ پەسەندە ئەم هەموو داهێنانە رازاوەو ووردەکاری و دانایيانە، دیاردەیەك بێت لە دیاردەکانی جوولەی کوێرانەی بەشەکانی ماددە؟

لەدوای ئەوەی کە شێخ جسر کۆتایی بەباسی چاو دێنێت ئاماژە بۆ دانایی و

وورده کاریی‌یه سەرسوڕێنەرە کانی بە شە کانی هەست و ئەندامە کانی تری لەش دە کات.

دەڵێت/ ئەو زانایانەی کە وێڵن بەدوای ئەم لیێکۆڵینەوانەدا درێژەی پێدەدەن و وورده کاری دە کەن کە نهێنی و نادیاریی و کاربەجێیی و وورده کاریی‌یە کانیان بۆ بەدەردە کەوێت، هەر ئەوان شایانی ئەوەن بە کەسانی باوەڕدار بە بوون و دانایی و بەخشندەیی خودا بژمێرێن و گەر پێشیان ووترا ئەوان زیاتر لە (زانایانی ڕێبازی کەلام) کەبە بەڵگە تێکڕایی‌یە کانیان بوونی خودا دەسەلمێنن شایاندارترن ئەوا ئەو وتەیە ڕاست و دروستە.

حەیران/ شێخی گەورەم باسی ئەوەی کرد کە شێخ جسر وەڵامی گوماندارە ماددیی‌یە کانی داوەتەوە، ئەو گومانانە چین؟ و وەڵامی شێخ جسر چی‌یە بەرامبەریان؟

شێخ/ جسر بەماددیە کان دەڵێت/ سێ گومانتان تیادا بەدی دە کەم کە کۆسپن لە ڕێگای باوەڕهێنانتان بە خودا و بەوەی کە خودا خۆی دروستکەری ئەم گەردوونەیە لەنەبوونەوە.

یە کەم/ نەتوانایی عەقڵتان لە ئەندێشە کردنی ناخی ئەم خواوەندە گەورەی کە هیچ شتێك لەوێنەی ئەودا نی‌یە.

دووەم/ وتەتان بەوەی کە دەڵێن عەقڵمان نەتوانایە لە ئەندێشە کردنی پەیدا بوونی شتێك لە نەبوونەوە، بەواتای دروستکردنی ماددە لەنەبوون.

سێهەم/ وتەتان کە دەڵێن، گەر سیستەمی گەردوون بەمەبەست و دانایی بێت، ئەو کاتە نیشانە کانی مەبەست و دانایی لەسەر هەموو شتێك بەدی دە کرا، ئێمە زۆر شت لەم گەردوونەدا دەبینین، مەبەست و دانایی بەسەردا ناسەپێت بەڵکو پێویستی و گرنگێتی زیاتر بەسەردا دەسەپێت سەبارەت بە گومانی یە کەم وەڵام لەسەری. گەر ئێوە سەیری پلەو پایەی خۆتان لە زانستدا بکەن، کە ئێوە لەگەورە زانایانن، ئێستا ئێوە لە ڕۆخی دەریایە کی مەزندان کە بێ ئاگان لە کۆتایی و چوونە ناو قووڵایی یە کەی و بە درێژی چەرخ گەورە کانتان دان بەوەدادەنێن کە نەتوانا و کەم زانستن لەزانینی زۆر لە نهێنی‌یە کانی گەردوون و لە حەقیقەتی ئەو ماددەیەی کەلەبەردەستاندایە و بەچاوی خۆتان دەیبینن و بەزمان چێژی دە کەن، بەلووت بۆنی دە کەن و بۆ ژیان و بەردەوامی ژیانتان بە کاری دەهێنن کە چی.... تا ئێستا ڕاستی و ناخی نازانن چی‌یە؟

هەروەها ئێوە... تائێستا نەتوانان و دان بەنەتواناییتاندا دەنێن بۆ زانینی (ڕاستی ماددە) و (ڕاستی عەقڵ) و دەرك کردن و ئەو ئاکامەی کە بیرکردنەوەتان دوچاری کردوون ئێوە دەڵێن، ڕواڵەتێکە لە ڕواڵەتە کانی کارلێکردنی بەشە کانی ماددە، لەگەڵ

یەکتردا، ئەگەر ئەمە حاڵتان بێت کە ئێوەی زانایان لە زانینی نزیکترین و پەیوەسترین و هۆگرترین شت لێتان بێ ئاگاین، ئایا.... ئارەزووی ئەوە دەکەن کەبەعەقڵتان بگەنە زانینی زاتی خودای بەخشندە.

ئایا ئەو مرۆڤەی کە هیچ شتێك نازانێت لەو مادەیەی کە دەستی لێدەدات و دەیخوات و دەیخواتەوە و بۆنی دەکات چۆن تکای زانینی ذاتی خودا دەکات و ئەو مرۆڤەی کە نازانێت چۆن بزانێت و دەرکی دەرککردن ناکات و عەقڵی بە بەکارهێنانی عەقڵی ناشێت، چۆن دەرکی راستی ناخی خودا دەکات، ئێوە تا... ئەمرۆ ئەتوانن لە زانینی ئەو رێگایەی کە دەرککردنی پێدەکرێت و، ئەو شێوازەی کەبەهۆیەوە پەك کەوتنی ماددەو عەقڵ دروست دەبێت و، ئەو چۆنێتی‌یەی کە عەقڵی ناوەوەی نادیار هەست بە شت دەکات، ئێوە دەتانەوێت حەقیقەت و کونهی خودا بزانن.

نەتوانایی عەقڵتان پاڵتان پێوە دەنێت ئینکاری ئەندێشەبکەن لەسەر ئەو وێنەی کەوا راهاتوون دەرکی جەستەی مادییەکانی پێ بکەن... ؟

وەك فەیلەسوفی ئەڵمانی (لایبنز) شێخ جسر بەماددیی‌یەکان دەڵێت( گەر عەقڵتان نەتوانایە لە ئەندێشەکردنی بوونی ئەم خواوەندە ئەوە ناگەیەنێت کە خودانی‌یە و گەلێك راستی هەیە لەگەردوندا نەتوانراوە تائێستا ئەندێشەی بکرێت، کەلەراستیدا هەیە کە بەڵگەکانی عەقڵ بوونیان دەسەلمێنن و، ئێوە باوەڕی تەواوتان وایە کە بوونی شتێك بەو سیفەتانەی کەوەسف کراون ناشێ کە جەستەو مادە نەبێ، ئەم بۆ چوونەشتان لە (پێوەری نموونە پێهێنانەوە (قیاس التمثـیل) و سەری هەڵ داوە، بەڵام ئەم قیاسە لەم شوێنەدا نابێتە بەڵگەیەکی تەواوی بڕەر بەڵکو بەڵگەیەکی هەڵخەڵەتێنەرە، عەقڵ هەڵدەخەڵەتێنێ و وای لێدەکات بەبڕیاری شتێکی تر بڕیار. بەسەر شتێکی تردا بدات، لەگەڵ بوونی جیاوازیی‌یەکی زۆر لەنێوان ئەو دوو شتەدا و، نەتوانیتان لە ئەندێشەکردنی حەقیقەتی بوونی خودا و ئەو ناگەیەنێ کە بوونی خوا مەحاڵە و قیاسی خودا لەسەر ئەو شتانەی کەلە جیهانی ماددی بینیوتانە، ئەمە پێوەرێکی هەڵەیە لەبەر بوونی جیاوازی لەنێوانیاندا و، عەقڵ ئەوندەی بەسە کە بەئاسەواری خودا بەڵگە بۆ بوونی خودا و سیفەت و نیشانەکانی بهێنێتەوە.

و هەموو شتەکانی گەردوون لە بوونی سیستم و ووردەکاری و بڕیار، هەموو یان بەگشتی بەڵگەی بڕەرن لەسەر زانست و توانایی و کاربەجی‌یی خودا)

سەبارەت بە گومانی دووەم/ کە ئەمەش نەتوانایی عەقڵە لە ئەندێشەکردنی

دروســتکردنی گــەردوون لــە نەبوونــەوە جســر لەوەڵامدانەوەکــەیدا دەڵێــت : (ئەندێشــەنەکردنی راستی (حەقــیقەت)ی شــتێك نابێتە بەڵگــە بــۆ نــەبوونی ئــەو شــتە لــەخۆیدا)و سەرچاوەی پەیدا بوونی نەتوانایی ئەندێشەکردنی شتێك لەنەبوونەکان ئەمەیش دووبارە دەگەڕێتەوەبۆ (پێوەری نموونە پێهێنانەوە)، چونکە ئێوە هیچ شتێکتان نەبینیوە لەنەبوون پەیدا بوویێت و نەبینین لێکەوتەی شتێك لەنەبوونەوە بەڵگە نی‌یە بۆ مەحاڵبوونی روودانی ئەو کردارە و (پێوەری نموونە پێهێنانەوەیی)، بەڵگەیەکی بڕەری تەواو نی‌یە و زۆر جار بەهەڵەمان دەبات و، توانایی خودا بە توانایی مرۆڤ پێوەر ناکرێت، چونکە جیاوازی نێوان ئەو دوو توانایە زۆر مەزنە.

ئێمە دان دەنێین بەنەتوانایمان لەدەرککردنی چۆنێتی دروستکردنی گەردوون لەنەبوونەوە لەلایەن خودای بەخشندەوە، (بەڵام نەتوانای ئەندێشەکردنی راستی شتێك کەبەهۆی بەڵگەکانی عەقڵەوە بوونی سەلمێنراوە نابێتە هۆی ئینکاری کردنی بوونی ئەو شتە).

بەڵام گومانی سێهەم/ کە دەڵێن زۆر شت لەم گەردوونەدا هەیە رێسای مەبەست و دانایی تیادا بەدی ناکرێت بەڵکو زیاتر ناچاری بەسەردا دەسەپێ و، وەڵام بۆ ئەم گومانە/ ئێمە، دانایی و ژیری و رازی نهێنی زۆر دەبینین لە دروستکراوەکانی خودادا کەوەك ئێستاش رۆژ لەدوای رۆژ گەلێ لە داناییەکانی خودا لەدەرکەوتندان، کە چەندەها چەرخ لێمان نادیارو نهێنی بوون، گەر شتێکمان بینی و دانایمان تیادا بەدی نەکرد باوەڕبەوە ناهێنین کەبێ هوودە دروستکرابێت، بەڵکو دەڵێین خودای کاربەجێ و، بەڵگەمان بۆ کاربەجێیی‌یەکەی لە دیاردەی ئەو شتانەی هەیە کە دەیبینین، کە رۆژ بەرۆژ زیاتر بۆمان بەدەردەکەوێت و، بەڵگەی ئەم داناییانە کە چەندەها چەرخ لێمان شاراوە بووە و، ئێستا بۆمان بەدەردەکەوێت و ئەو شتەی کەلەسەر دانایی‌یەك دروستکراوە و داناییەکەیمان لا شارایەوە دەبێت رۆژێك بێت ئەو داناییەمان بۆ بەدەربکەوێت وەك چۆن داناییەکانی ترمان بۆ بەدەوردەکەوتن گەر سەرنج لە نەتوانایی عەقڵ لەدەرککردنی زۆر لەشتە ماددیی بینراوەکان و، بەراوردیی کردنتان لەنێوان ئەم نەتوانایی‌یە و توانا و کاربەجێیی خودای بەخشندە، نامۆنابێت لاتان شاراوەی دانایی هەندێ لە شتەکان لەلای عەقڵ و ئێوە واتان بینی : ((لەم شوێنەدا کار بە پێوەری کەمی دانسقە- قیاس القلیل النادر؟؟؟؟)ی بکرێ چاترە مەبەست لەکەمی دانسقە ئەو شتانەیە کە داناییەکەیان هێشتا بەدەر نەکەوتووە هەتا کارکردن بە پێوەری زۆری بێ شومار لەو هەمکە بەڵگە و ئاسەوارە ئاشکراو نهێنی یانەی کەلە دروستکراوەکانی خودا دیارن، کەچی ئێوە بە

پێچەوانەوە ئەم کەم دانسقەیەتان کردووە بەبەڵگە لەسەر نەبوونی خودای کردگار وشێخ جسر نموونەیەکی جوان لەسەر ئەمە دەهێنێتەوە و دەڵێت (گەر ئێوە سەرنجی زیندەوەرە گچکەکان بدەن دەبینین ئەوەندە خاوەنی دەرکن کەبەس بێت بۆ بەسەر بردنی ژیانیان، ئایا چاوەڕوانی ئەوەیان لێدەکەن کە ئەم زیندەوەرانە دەرکی حەقیقەتی مرۆڤ بکەن و بەووردی، ئەندێشەی ئەندامەکانیان و فەرمانەکانیان بکەن و چۆنیەتی دروستبوونی گوێبیستیان و بۆنکردن و چێژ و دەست لێدان و خۆراك و کرداری سووڕی خوێن لەشیاندا بکەن و هەروەها چۆنێتی بیرکردنەوەیان و نهێنی کارو شتە دروستکراو داهێنراوەکانیان، یاخود بزانێت کە چۆن مرۆڤ ئەو شتانەی داهێناوە و چۆن چۆنی پەیدای کردوون و لەبەرچی دروستی کردوون؟!

دروستکراون مرۆڤیش لەم زیندەوەرانە توانا و زانستی سەبارەت بەتواناو زانستی خودا زۆر کەمترە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، جیاوازی نێوان ئەم دوو توانایی و زانستی و دانایییە زۆر مەزنترە، گەر خودمان ململانێی لەگەڵدا کردین و داوای لێکردین نزیك بینەوە لە زانینی چۆنێتی دروستکردنی گەردون و، بۆچی دروستیکردووە و، دانایی چییە لەهەموو ئەو شتانەی کە دەیبینین، دەبێت دان بە نەتوانایی عەقڵدا بێنن و، بەسمانە زانینی خوداو بڕیار لەسەر بوون و توانا و کاربەجێیی‌یەکەی بەهۆی رێنمایی دیاردەکانی خودا لەسەر بوون و ئەو هەموو روونا کی داناییانەی کە زۆر لە دیاردەکاندا بەدەردەکەوت و، نەبینینی کەمی ئەو داناییانە بکەینە هۆکار و پاساو بۆ ئینکاری بوونی خودا و، رێژەی زۆری ئەم دیاردە دانایییە و ووردەکارییە کە ژمێرەو ئامار ناکرێت بکەیتە کاری رێکەوتی کوێرانە.

حەیران/ وەڵامی جسر بۆ ئەم سێ گومانە بەتەواوی دەچەسپێت بەسەر ئەو وتەی لایبنز کە دەڵێت/ شیاوە بوون لەنەبوونەوە و هەروەها شیاوە بۆ عەقڵ داوای هۆکارێکی تەواو بکات و شیاوی بوونی دیاردەکانی دانایی لە گەردووندا.

خوازیارم شێخی گەورەم باسێکی بیروڕای جسرم بۆ بکات لەسەر رێبازی (پەیدا بوون و گەشەکردن).

شێخ/ من ئاگادارم کە تۆ تامەزرۆی بیستنی راکانی جسریت سەبارەت بەم رێبازە، بەتایبەتی گوێگرتنت لە باسکردنی ئەو هێرشە کوێرانەی کە کرانە سەر رێبازی داروون بەڵێ ئەی حەیران لەکاتی ئەو هێرشانە و لەناو جەرگەی ئەو ململانێییەدا لەهەموو گەردوندا بەگشتی یەك زانای ئاین، پەیدا بوو، کەزۆر بەئازایانە کتێبێك بنوسێت و تیایدا بڵێت/ (پاش چوونە ناو قوڵایی رێبازی داروون هیچ هاودژییەکی لەگەڵ بیرۆکەکەی

بوونی خودا (کە دروستکەری راستەقینەی هەمووشتێکە) تیا نابینرێت) گەر پێت ووترا لەساڵەکانی کۆتایی سەدەدەی نۆزدەهەمدا هەندێ لە زانایانی لاهوت لە ئەوروپا ئازایەتیان دەربڕی لەهەوڵدان بۆ نزیکیوونەوەی رێبازی دارون لەکتێبە پیرۆزەکان چاك بزانە لەکاتی بەراوردکردنی مێژووی راستەقینەدا بۆت بە دەردەکەوێت، کەشێخ جسر تەنها کە سێکە کە پێش هەمووان بەگشتی لەم بوارەدا کتێبێکی داناوە، لەساڵی ١٨٨٨.

حەیران/ چۆن، توانیویەتی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لە کاتی بەراوردکردنی رێبازی دارون و دەقەکانی قورئانی پیرۆزدا.

شێخ/ جسر لای وانی‌یە کە رێبازی پەیدا بوون و گەشەکردن و هەموو ئەو شتانەی کەلەخۆیان گرتووە لەبنەما رەگەزەکانی مرۆڤ و ژیان و عەقڵ دووربن لەراستی‌یەوە و، دژایەتی بڕیارەکانی ئاین بەتەواوی بکەن وەك لای هەندێك وایە چونکە جسر وا دەبینێت کە فەرمانی گرنگ و پێویست داوامان لێدەکات باوەڕمان وابێت کە خودا دروستکەری ئەم گەردوونەیە بەهەموو جۆرەکانی‌یەوە و، پاش ئەم باوەڕ هێنانە هیچ جیاوازی‌یەك نی‌یە بەباوەڕهێنانمان بە (رێبازی دروستکردن) و باوەڕمان بە (رێبازی پەیدا بوون و گەشەکردن) کە هەردووکیان دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ماددە بنەڕەتی‌یەی کە خودا دروستکەریتی و، لەپاشدا کردویەتیە چەندەها جۆرو و بەهۆی پەیدا بون و گەشەکردن جۆرەها لقی لێکەوەتۆتەوە لەسەر ئەو سیستمانەی کە خودا لەم گەردوونەدا دایناوە، بەڵام جسر وادەبینێت ئەم رێبازی پەیدا بوون و گەشەکردنە، ئێستاش نەگەیشتۆتە پلەی راستیەکی بەڵگەنەویست، تاکو ناچارمان بکا، کە دەقە ئاشکراکانی بۆ قورئان تەئویل بکەین و هەر کاتێك بەڵگەی بڕەر هەبوو لەسەر راستی ئەم رێبازە دروستە باوەڕی پێ بکەین ئەو کاتە دەشێت تەوفیق لەنێوان مانای هێماکانی دەقەکان و ئەو شتانەی کە پابەندی بەڵگە بڕەرەکانن بکرێت.

شێخ جسر رێ خۆشدەکات بۆ نووسینی دوو پێشەکی گرنگ لەسەر ئەم بیرورِا بەرزو نەمرانە درێژە بەبیروڕاکانی خۆی دەدات لەسەر بڕیارەکانی دژایەتی لەنێوان دەقە ئاینیەکان و کێشە زانستی‌یە بێ گومانەکان و ڕووەکانی لێکچوون تیایاندا، پاش رێخۆشکردنی بۆ ئەم دوو پێشەکی‌یە دەست دەکات بەلێکۆڵینەوەی رێبازی پەیدا بوون و گەشەکردن و، بیروڕای خۆی بە دوور و درێژی خستە ڕوو کە کورتکراوە کەیت بۆ باسدەکەم تا بزانیت ئاینی راست هیچ کاتێك دژایەتی و پێچەوانەی زانستی راست ناکات و بەرامبەریشی دەستەوەستان ناوەستێت وەك نەزان و ناژیریەکان دەڵێن.

جسر لە پێشەکی یەکەم دا دەڵێت/ ئەو دەقانەی کەلە باوەڕهێنان و کارو بڕیارەکاندا

لەشەریعەتی ئیسلامیدا پەنای بۆ دەبرێت دەکرێتە دوو بەشەوە (متەواترو مەشهور) موتەواتر: ئەوەیە کەبەشێوەیەکی بڕەرو بێ گومان چەسپابێ و هاتبێتە کایەوە، چونکە هەموو هۆکارێکی چەسپاندنی زانستی راستی لەخۆگرتووە، ئەو هۆکارانەی کە زانستی بێ گومان دەسەلمێنن.

مەشهور ئەوەیە کە چەسپاوەو چەسپێنراوییەکەی نزیکە لە بڕەرە و لەبەر بوونی ئەو هۆکارانەی کە دڵ ئارام دەکەن، کە ئەمەش پلەی لەسەرو نیمچەگومانەوە (ظن) دێت و ناگاتە باوەڕی تەواو جا هەریەك لەمتەواترو مەشهور یان مانایەك دەبەخشن و ناتوانرێت مانای هێمای تریان لێوەربگیرێت، کە ئەمەش بە (مانای دیاریکراو) ناو دەبەین و، ئەم بەشەش لە شەریعەتی محەمەد (ﷺ) نییە کە پێچەوانەی بەڵگە بڕەرە تەواوەکانی عەقڵ بکات و، یا هەریەکەیان لە متەواتر و مەشهور ئاماژەی مانایەك دەکەن کە ماناکەی لە ڕواڵەتیدا بەدەر دەکەوێت. یاخود ئاماژەی مانایەك دەکەن کە دوورە لە ڕواڵەتی وشەکە و ناودەبرێت (مانا بەڕواڵەت) و ئەم بەشەش لە شەریعەتی محەمەددا (ﷺ) هەیە، کە ئەو مانا بەڕواڵەتەکەی پێچەوانەی بەڵگە بڕەرەکانی عەقڵ بێت، گەر متواتر بێت یاخود مەشهور، پێویستە باوەڕ بەمانا دیاریکراوەکە بهێنرێت و ناگونجێت ماناهێمایی لێ وەربگرێت بۆ مانایەکی تر، چونکە مانا هێمایی لەخۆنەگرتووە و بە پێچەوانەی بەڵگە بڕەکانی عەقڵ نییە... تا پێویستی بەمانا هێمایی بێت.

بەڵام فەرمانی دەق لە (مانا بەڕواڵەت)دا گەر موتەواتر بێت یاخود مەشهور پێویستە باوەڕ بەمانا بەدەستهاتووەکەی بکەین و ناشێت مانای هێمایی بکرێت مەگەر بەڵگەی بڕەرو عەقلی ئاماژەی مانایەکی تر بکات کە پێچەوانەی مانا بەدەستهاتووەکە بێت، ئەو کاتە مانا هێمای و لادان دەکرێت بۆ مانایەکی پێچەوانەی بەجۆرێك دروست بێت گونجاندن لەنێوان مانای لەبەر چاو (موتەبادەر) ئەم مانایەو ئەو مانایەیی کە بەڵگە بڕەرەکانی عەقڵ ئاماژەی بۆ دەکەن و، بۆیە شیاوو دروستە، گەر ئەم گونجاندنەی نێوانیان هەبێت ئەوکاتە دەتوانین مانا هێمای دەقە (مانا بەڕواڵەتەکان) بکەین، گەر نەیکەین ئەوا دەستەوستان دەبین لەسەر مانای بەدەستهاتووە و، دەبێت ئەو مانایەش ڕەتکەینەوە کە بەڵگە بڕەرەکانی عەقڵ ئاماژەی بۆ دەکات، کە ئەمەش رووخاندنی (بنەماکان) دەگرێتەوە کە عەقڵە کەبەهۆیەوە ئەو پەیامەی کە دەقەکانی شەریعەتی محەمەدی لە خۆ گرتووە چەسپا، گەر عەقڵ نەبوایە نەدەگەیشتە ئەو بەڵگە خوازیانەی راستی بانگێژی ئەو پەیامەدەکات، گەر بنەماکانی رووخان ئەوا لقەکان مەحاڵە بمێنن

(ئەو کاتە، ڕەتکردنەوەی بەڵگەکانی عەقڵ گەڕانەوەیە بۆ تێکدانی بەڵگەکانی ئەقڵ ئەمەشە ڕێسای چارەسەری هەموو دەقێکی (مانا بەڕوالەت) کە بەڵگەی بڕەری عەقلی دژی بێ.

گەر ئەو بەڵگانەی پێچەوانەی مانا بەڕوالەتەکانن، بەڵگەی بڕەرو تەواو نەبن ناگونجێت، مانا هێماو لادان بکرێت بۆ مانایەکی تر لەدەق دا.

وەك ئاشکرایە بەڵگەی بڕەر/ خۆی ئاماژەی بەڵگەی لە خۆ گرتووە کەی خۆی دەکات بەبەڵگەیەکی تەواو بێ گومان و بەهیچ جۆرێ مانای دژ (نەقیض)ی خۆی قەبوڵ ناکات ، بەڵام بەڵگەی نیمچەگومان بڕەر نییە و ئاماژەی پەسندکردنی بەڵگەکەی خۆی دەکات کە پێچەوانەی قبوڵ دەکات، گەر قبوڵ کردنە کەش دووربێت بەمە پلەی لە پلەکانی باوەڕی تەواو دا کەم دەبێتەوە و، ناگونجێت مانا بەهێمای بکرێت بۆ مانا بەڕوالەتەکان.

ئەمە پێشەکییەکەمە، بەڵام پێشەکی دووەم جسر تیایدا دەڵێت شەریعەتی محەممەدو هەموو شەریعەتە ئاسمانییەکان مەبەست لێ یان ئاماژەکردنی مرۆڤە بۆ ناسینی خودای گەورەو بەخشندە و باوەڕهێنان بە بوونی، وەسفکردنی بەسیفاتی تەواوو پەسەند و چۆنیەتی خودا پەرستنی و گەیاندنی مرۆڤ بۆ ئەو بڕیارانەی کە ڕێکخستنی ژیان بۆ بەدەستهێنانی دوا ڕۆژی بەڵام فێرکردنی زانستە گەردوونییەکان لە چۆنیەتی دروستکردنی گەردوون و ئەم سیستمانەی کە تیایدا بەدی دەکرێت... هتد.

ئەمانە بەگشتی لەمەبەستەکانی شەریعەت نین، بەڵکو بەهۆی عەقڵەوە و بەم زانیاریانە دەگەن، لەپایەیی یەکەما شەریعەت ئاوڕ لەمانە ناداتەوە و، هیچ مەبەستی نییە قوڵبوونەوە تیایاندا و، تەنها بە کورتە باسێکیان واز دەهێنێت تەنها ئەوەندەی کە پەیوەندی بەمەبەستە بنەڕەتیەکەوە هەبێت، بۆ نموونە ناوی ئاسمان و زەوی دەبات و چۆن لە نەبوونەوە پەیدا بوون و، دروستکردنی جۆرە ها زیندەوەر و چۆنێتی بەڕێوەبردنی گەردوونەکان بە تێکڕایی و ئەو سیستمانەی کەلەخۆیان گرتووە، تاوەکو ناوبردنی ئەم شتانەی لەبەڵگە عەقلیەکان بێت بۆ بوونی خواوەندێکی دروستکەر و زانا و کاربەجێ و بەتوانا پاش ئەم دوو پێشەکییە (جسر) بیروراکانی خۆی لەسەر ڕێبازی پەیدابوون و گەشەکردن دەردەبڕێت و دەڵێت ئەو باسانەی کەلەشەریعەتی محەممەددا هاتووە لەدەقەکانی موتەواتر و مەشهور سەبارەت بەدروستکردنی گەردوونەکان و، جۆرایەتی لە جۆرەکاندا، هەموو بەتێکڕایی بەدرێژی باسی دروستکرن و چۆنێتی دروستکردنی نەکردوە و، لە شەریعەتدا هاتووە کە خودای بەخشندە ئاسمان و زەوی ئەوەی لەنێوەندیاندا هەیە لەشەش ڕۆژدا،

دروستیکردون و، هەروەها تیایدا هاتووە کاتێ خودا ویستی لەدوو کەڵ ئاسمانەکان دروست بکات حەوت ئاسمانی دروستکرد و، ڕاڤەکارانی قورئانی پیرۆز بیرورایان جیاوازە لە لێکدانەوەی ئەم شەش ڕۆژەدا و زۆریان دەڵێن ئەو ڕۆژانە هەروەکو ڕۆژەکانی ئێمە بوون و هەندێکیان دەڵێن ئەو ڕۆژانە لە ڕۆژەکانی پاش زیندوو بوونەوە دەچن کە هەر ڕۆژێکی بەهەزارساڵی ساڵەکانی ئێمە دەچێت و، هەندێکیان دەڵێن هەر ڕۆژێك لەو شەش ڕۆژە بە پەنجاهەزار ساڵ دادەنرێت. هەروەها لەدەقەکانی قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە ئاسمانەکان و زەوی هەموو یەك پارچە بوون و خودا لەیەکتری جوودا کردونەتەوە و ڕاڤەکانی قورئانی پیرۆز دەڵێن ئاسمانەکان و زەوی یەك شت بوون، کە هەریەکێکیان بەوی تریانەوە نووسابوو و، خودای بەخشندە لەیەکتریی جیاکردوونەتەوە و، هەندێ لە ڕاڤەکارەکانی تر بەجۆرێکی تر لێکیدەدەنەوە و هەندێکیان وا لەدەقەکانی قورئانی پیرۆز تێگەشتوون کە زەوی پێش ئاسمانەکان دروست بووبێت بەڵام بەرفراوان و پان و بەرین نەبووە تا بەکەڵکی ژیان بێت، پاشان خودای بەخشندە ئاسمانی لە شێوەی دووکەڵدا دانا کە ئەم دووکەڵەی پێش ئاسمان دروست کردبوو و، کردیە حەوت چینەی ئاسمان، پاشان زەوی تیادا ڕاخست و بەرینی کردەوە و، ئەو لێکدانەوانەی بەمانای هێماکان کراون بە پێچەوانەی مانا ڕواڵەتەکانەوە دێن بەڵام درێژە باسی پەیدابوونی ئاسمانەکان و زەوی و چۆنێتیو دروستکردنیان و دروستکردنی خۆرو هەسارەکانی و زەوی لە گاز هەروەك ماددیەکان دەڵێن، یاخود بەرێگایەکی تر بەڵام شەریعەتی محەممەد باسی ئەم چۆنێتی یەی نەکردووە و لەدەقەکانیدا چەسپاندن و ئینکاری ئەم شتانەی بەدی ناکرێت. گەر بەچاوی ویژدانەوە سەرنجی ئەو درێژە باسانە بدەین کە ئێوەی ماددیی یەکان ناوی دەبەن لەدروستکردنی ئاسمان و زەوی، بۆمان بەدەردەکەوێت کە هەموویان بەگشتی گریمان کە ئێوە دەڵێن دروستکردبێت و هەروەها دەشێت بە پێچەوانەی ئەم شێوازەی ئێوە شەوە بێت، بەڵام گەر ئەو گریمانانە چاسپان بە بەڵگە برەرەکان کەبەهیچ شێوەیەك قبوڵی هەڵوەشاندنەوە ناکات و هیچ بوارێك عەقڵ نادات بۆ ڕەتدانەوەی ئەوکاتە موسڵمانان باوەڕی پێدەهێنن لەگەڵ باوەڕ هێنانیان بەوەی کەخودا پەیداکەری خۆرو دروستکەرێتی، زەوی و هەسارەکانی لێخستۆتەوە، وەك ئێوە دەڵێن و، ئەو سیستمانەی کە ئێوە باوەڕتان پێ هێناون و دەڵێن: کاریگەرن و دروستکەرن و ئێمە دەڵێین ئەمانە هۆکاری ئەساسیین لەخودی خۆیان کاریگەرنین کاریگەری ڕاستەقینە تەنها خودای بەخشندەیە.

وەك ئاشکرایە هیچ لەم دەقانە کە باسمان کرد، ئینکاری ئەو شێوە دروستکردنەی کە

ئێوە باسیدەکەن، ناکات جاهەرکاتێ ئەوەی ئێوە دەیلێین سەبارەت بەدروستبوونی بوونەوەر، هەرکاتێ بۆ چوونەکەتان بەبەڵگەی بڕەرچەسپا، ئێمە دەڵێین: خودای بەخشندە لەسەرەتاوە ماددەی گەردوونی لەیەك شت دروستکردووە و، بە دووکەڵ ناوی بردووە، کە بریتی‌یە لەگازێکی بڵاوبووەوەی ناو بۆشایی، پاشان زەوی و ئاسمانی لێك جیاکردەوە، واتە ماددەی ئاسمانی لەو ماددەیە جیاکردەوە کە خۆرو هەسارەکانی لێ پەیدا بۆوە و، پاشان خۆری دروستکرد و زەوی و هەسارەکانی لێ جیاکردۆتەوە، بەڵام زەوی کاتێ جیابوونەوەی لەخۆر پان و بەرین نەبوو، خودای بەخشندە ئاسمانی لەودووکەڵە دروستکرد کەبریتی بوو لەچینە گازیی‌یەکان و زەویشی پان و بەرین کرد و، هەموو ئەم شتانە بەگشتی خودای بەخشندە لەسەر سیستمی تایبەتمەند دروستیکردوون، کە ئەم سیستمانە هۆکاری ئاسایین و بەگشتی لێکەوتەی چەندەها چەرخی درێژن، کەبەشەش رۆژ ناویان دەبات... و لەم راپۆرتەدا باسەکانی ماددیی‌یەکان دەردەکەوێت لەدروستکردنی خۆرو هەسارو زەویدا کە دەقاودەق رێدەکەوێت لەگەڵ ئەو ووتانەی کەلەشەریعەتی محەممەددا هاتوون، بەڵام بیروباوەڕمان پەیڕەوی ئەم وتانە ناکات تابەڵگەی بڕەر بەدەست ئەهێنن لەسەریان و، لەبەر ئەوەی بەڵگەکانت نیمچە گومانیان لەخۆگرتووە بە پێویستی نازانین باوەڕیان پێ بهێنین، تەنها.. دەتوانین بڵێین ئەم ووتانە دەشێن راستیان لەخۆ گرتبێت جا لەبەر ئەوەی چوارچێوەی باسەکە لەبیروباوەڕی موسڵمانانەدا ئەوەیە کە زانست بەبەڵگەی بڕەر سەلماندوویەتی کە جیهانەکانی گەردوونی پەیدا بوون و پێویستیان بەپەیداکەرێك هەیە کە ئەویش خودای بەخشندەیە کە لەنەبوون پەیدای کردووە و، ئەم جۆرایەتیەی لێخستۆتەوە کە ئێمە دەیبینین و، هیچ جیاوازیی‌یەك لای موسڵمانان نیە گەر بووترێت خودای مەزن دروستکەری ئەم گەردوونەیە بەشێوازە جیاجیاکان بەواتای ئەوەی کە هەموو جۆرەکان بەسەربەخۆ لەسەرەتا دروستکراون و، لێکەوتەی شتێکی تر نین (جاگەر بەیەك کەڕەت دروستی کردبن یان بەچەند قۆناغێك).

لە نێوەندی باوەڕهێنان کە خودای بەخشندە دروستکەری جۆرەکانی ئەم گەردوونەیە لەسەر رێبازی (پەیدابوون) کەلەسەرەتادا ماددەی ساکاری دروستکردووە، پاشان گەشەی پێداوە تا... بۆ چەندەها رەگەز کانزاو ساکارترین تەنی زیندوو (پرۆتۆپلازما) یاخود بۆ نزمترین رووەك و ئاژەڵ و، لە مانەوە چەندەها لقی لێ دروستکردووە، کەبەمەش جۆرایەتی دروستکردووە، کەبەمەش جۆرایەتی دروستبووە و هەندێکیان لە هەندێکی تر کەوتووەنەتەوە، هەندێکیانی هەڵبژاردووە بۆمانەوە و،

هەندێکی تریان بۆ نەمان و، ئەم کردارانەش بەهۆی ئەو سیستمانە بو کەخودا بەماددەی بەخشیوە کە هۆکارێکە کە ئێستا پێی گەیشتووە و، هەریەك لەم دووباوەڕە واتە باوەڕهێنان بەڕێبازی (دروستکردن) و یاخود باوەڕهێنان بە ڕێبازی (پەیدا بوون) ئینکاری باوەڕهێنان بە بوونی خودای بەخشندە ناکات و، هەرچۆنێك بێت خودا تەنها خۆی دروستکەری ئەم گەردوونانەیە، پاشان جسر دەڵێت/ و کورتەی ئەو ئەو دەقانەی کە پشتی پێ بەستراوە لە باوەڕهێناندا کەلە شەریعەتی محەممەددا هاتووە سەبارەت بەدروستکردنی ژیانی سەرزەوی بریتی‌یە لەمانە/ خودای بەخشندە لە ئاو هەموو شتێکی زیندوی دروستکردووە و، هەموو پێدراو بێ پێیەکی سەرزەوی لە ئاو دروستکردوە و، لەهەموو ئاژەڵێك (جووتە) دروستکراوە و هەموو جووت و جمکەکان خۆی دروستی کردوون، هەموو جوتێ و لەهەموو روەکێکی سەرزەویدا نێرو مێی تیا دروستکردوە ئەم دەقانە دەشێت لە خودی خۆیاندا لەسەر ڕێبازی دروستکردن و (گەشەکردن) لێك بدرێنەوە ئەوەندە هەیە ئەو دوو دەقەی دەفەرموێت کە هەموو زیندەوەرێك لە ئاو دروستکراوە یالەسەر ڕێبازی ڕێك دەردەکەوێت لەگەڵ بۆچوونی تازەی ماددیەکان کە دەڵێن زیندەماددە لە ئاو پەیدا بووە بەڵام دەقەکانی تر مانا ڕواڵەتی یەکانیان ئاماژەی ڕێبازی دروستکردن دەکەن، لەگەڵ ئەم هەموو دەقانەشدا، دەقێك نەهاتووە لە قورئاندا، کە ئاماژەی ئەم دروستکرنانە بکات لەیەك کەڕەتدا و یاخود بەچەندەها قۆناغ، تەنها لەچەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر کە ئیمامی موسلیم گێڕاویەتەوە کە دەفەرموێت (خودای بەخشندە درەختی لە ڕۆژێکی شەش ڕۆژەکەدا دروستکردووە، پاشان ئاژەڵی دروستکردووە) ئەم دەقانە تەنها ئەو سوودەی تیادایە کە دەڵێت درەخت لەدروستکردندا پێش ئاژەڵ کەوتووە.

ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەم دوو جۆرە ئایا لەیەك کەرەتدا دروستبوون یاخود بەچەند قۆناغێك دروستبوون لەسەر ئەو دەقانەی کە هاتووە و، بەگوێرەی ئەو ڕێسایانەی کەلە سەرەتادا باسکراون، شەریعەتی محەممەد وا پێویستی دەکات، کە باوەڕی لایەنگرانی پێغەمبەر پەیرەوی مانا دیاریکراو مانا بەڕواڵەتەکان بکەن کەلەدەقەکانی متەواترو مەشهوردا هاتووە بەڵام بەمەرجێك بە بەڵگە بڕەکانی عەقڵ پێچەوانەیی مانا ئاشکراو ڕواڵەتەکان نەکات.

ئیمە باوەڕمان وایە کە خودای بەخشندە لەسەرەتادا هەموو جۆرێکی بەسەربەخۆی دروستکردووە و لەسەر ڕێبازی (پەیدا بوون) دروستی نەکردوون، هەرچەندە خودا لە توانایدایە بەهەردوو ڕێبازەکە دروستی کردبێت، گەر بڵێین هەموو رەگەزو جۆرەکانی

لەیەك کەرەتدا دروستکردبێت یاخود بە پلە و قۆناغ و گەشە، بەهۆی ئەو سیستمانەی کە خودا پێی بەخشیبوون ئالێرەدا پێویستە ئێمە رێبازمان بوەستێنین، چونکە لەشەریعەتی محەممەددا دەقێك نەهاتووە، کە بیرۆکەیەك لاسەنگ بکات بەسەر بیرۆکەیەکی تردا و، بۆ ئێمە نەهاتووە لابدەن بۆ باوەڕهێنان بەمانا ڕوالەتیەکان بۆ یەکێك لەم دوو بیرۆکەیە، بەلێکەوتنەوەی هەندێ رەگەز لەهەندێ رەگەزی تر بکەین لەبەر نەبوونی بەلگەی بڕەر کە زۆرمان لێبکات مانا هێمایی ئەو دەقانە بکەین و، هەرکاتێك بەلگەی بڕەر بۆ راستی رێبازی بنەمارەگەزییەکان و پەیدا بوون بەدەرکەوت، ئەو کاتە پێویستە لەسەرمان مانا هێماییەکانی ئەو دەقانە بکەین و گونجاندن بکەین لەنێوان دەقەکان و بەلگە بڕەرەکاندا.

حەیران/ سوپاس بۆ خودا سوپاس بۆ خودا ، دلت فێنك کردمەوە بەم بەدەرخستنە رازاوانەت، کە ئاماژەی بڕیارەکانی ئاین دەکات کەبەهیچ شێوەیەك دژایەتی راستیەکانی زانست ناکات کە بە بەلگە بڕەرەکانەوە پەیوەستن و تکام وایە چاکەت لەسەرم زۆربێ بەباسکردنی راکانی جسر سەبارەت بەدروستکردنی مرۆڤ، ئایا شێخ جسر وادەبینێت کە وتەکانی رێبازانی پەیدابوون لەسەر گەشەکردنی مرۆڤ دەشێت بگونجێت لەگەڵ ئەو دەقانەی کەلە قورئانی پیرۆزدا هاتووە؟

شێخ/ شێخ جسر لە وەلامی ئەوانەدا کە دەلێن مرۆڤ ئاژەلێکە لە تیکرای ئاژەلەکانی تر، لێکەوتەی رێبازی پەیدابوون و گەشەکردنە و، هەروەها لەوەلامی ئەوانەش کەلەپاش ئەمانە هاتوون و دەلێن مرۆڤ و مەیموون یەك رەگەزیان هەیە دەلێ: لەدەقەکانی شەریعەتی محەممەدیدا هاتوە کەهەموو رێچکەکانی باوەڕ هێنان لەدروستکردنی مرۆڤدا پابەندیتی. ﴿وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنسَانِ مِن طِينٍ﴾، ﴿مِنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾، ﴿مِن صَلْصَالٍ كَالْفَخَّارِ﴾.

هەندێ لەلێکدەرەوەکانی قورئانی پیرۆز دەلێن خاك و ئاو دوو رەگەزی مرۆڤن، واتە مرۆڤ لەو دوانە دروستبووە، هەندێ کات دەقەکانی قورئان وارادەگەیەنن کە مرۆڤ لەخاك دروست بووبێت و لەهەندێ دەقدا هاتووە کە خودا بەدەستی خۆی مرۆڤی لەیەك نەفس دروستکردووە و هەرلەو نەفسەوە جمکی بۆ دروستکردووە و لەوانیشەوە پیاوان و ئافرەتی زۆری لێکەوتۆتەوە، روالەتی ئەم دەقانە وادەگەیەنن کە خودا مرۆڤی لە رەگەزێکی سەربەخۆ دروستکردبێت، نەك بەرێگەی پەیدا بوون و لێکەتنەوە لە رەگەزێکی تر، لەگەڵ ئەوەی ئەم دوو رایە لەلای عەقلێك شیاون کەباوەرشی بەتوانایی

خودا هەبێت.
بەڵێ لەو دەقانەوە بەئاشکرای نەهاتووە کە بڵێت خودا مرۆڤی یەکەمی لەیەك کەرەتدا لەخاك دروستکردووە و هەروەها نەهاتووە کە بڵێت مرۆڤی یەکەمی بە قۆناغ و هێدی دروستکردووە.
ئەوەندە لەسەر ئێمە یە کە لێرەدا بوەستین و باوەڕ بەرایەکیان نەهێنین و راکەی تریان فەرامۆش بکەین یاخود بە پێچەوانەوە، لەگەڵ ئەوەش کە هەندێ لەدەقە تاکیەکاندا نەبێت هاتووە و دەڵێت خودا مرۆڤی یەکەمی بەرێگای قۆناغ و هێدی دروستکردوە و ماوەیەکی زۆری بەسەردات چووە بەڵام رواڵەتی ئەو دەقانەی کە باوەڕهێنان پابەندێتی ئاماژەی دروستکردنی سەربەخۆ دەکەن وەناگونجێت مانا هێمای ئەم دەقانە بگرێت و، لادان لەمانا بەرواڵەتیەکەی بکرێت مەگەر بەڵگەیەکی بڕەری عەقلی رێبازی پەیدا بوون بچسپێنێت کە ئەوکاتە دەتوانرێت ئەو دەقانە مانا هێمایان بکرێت و گونجاندنی بکرێت لەنێوانیان و نێوان ئەو بەڵگە بڕەرانەی عەقڵ و ئەمەش هیچ لەباوەڕهێنانی موسڵمانان کەم ناکاتەوە لەبەر ئەوەی لایان ئاشکرایە کەخودای بەخشندە لەبنەڕەتدا خۆی دروستکەری مرۆڤە بەهەر شێوەیەك دروست بێت بوە و بەم چەشنە شێخ جسر دەڵێت: ئاینی ئیسلام پێچەوانەی زانست نی‌یە و نابێت، گەر زانستە کە پشتگیری کراو بێت لە لایەن بەڵگەیەکی بڕەری عەقڵەوە هەروەها وا رادەگەیەنێت کە لەڕوانگەی ئاینەوە هیچ جیاوازی نی‌یە لەنێوان ئەوەی کە خودا ئەم گەردونەی بە (دروستکردنی یەك کەڕەتی) یان (دروستکردنی قۆناغ و هێدی)یاخود بەرێبازی (پەیدا بوون و گەشەکردن)دروستکردبێت بەویست و توانا و کاربەجێیی خودا بووە و هیچ کامێك لەم رێبازانە بەڵگە دارترنی‌یە لەوی تریان لەسەر بوونی خودا.
جسر بەم شێوەیە دەدوێت سەبارەت بە رێبازی پەیدا بوون و گەشەکردن ئەی حەیران و، دەبینیت نەئینکاری دەکات و نەبەمەحاڵی دادەنێت و دەرگاشی لەسەر زانست بەناوی ئاینەوە دانەخستووە، بەڵکو بەکراوەیی بەجێیهێشتووە بەوەی کەچەند جارێك دووبارەی دەکاتەوە کە رێبازی پەیدا بوون و گەشەکردن لەکاتی چەسپاندنی بەچەسپاندنێکی عەقلی بڕەر هیچ هاودژیەکی ئایینی تیادا نی‌یە و دەشێت سودی لێوەربگیرێت و، ماناهێمای ئەو دەقانە بکرێت کە بەڕواڵەت ئاماژەی رێبازی دروستکردن دەکەن.
لەسەر روناکی ئەم بیرە بەرزە، رۆژ هەڵاتناسی بیانی (چارلز ئادەمز) لەکتێبە کەیدا کەبەناوی (ئیسلام و نوێکردنەوە) بلاوکردۆتەوە ئاماژەی کردووە بەوتەیەی کە دەڵێت،

لەسەردەمێکدا کەنووسەرە کلاسیکی‌یەکان بیرورا زانستیەکانیان پشتگوێ دەخست وا بەباشیان دەزانی کە بەهێزی شمشێر بەرەنگاری بکەن بەڵام شێخ حسینی جسر ئەم رایەی نەبوو، بەڵکو لای وابوو ئەو سەردەمە بەسەر چووە کە موسڵمانان دەستەوسان بن بەرامبەر ئەو بیرۆکانەی کە هێرش دەهێننە سەر باوەڕ هێنانیان، دەستیکرد بە هێنانەوەی بەڵگە بەوەی بەتێکڕای هەموویان لەبیرو باوەڕ و بڕیارەکانی ئیسلامدا بەبەروبەها بەدەردەکەون، دەکاتە وەڵامدانەوەی ئەو زانا رۆژئاوایانەی کەلەسەر بنەمای فەلسەفەو مادده گومانی زۆریان بەرپاکردبوو لە دژی و هەروەها بەرامبەر رێبازی داروِن وەستا و وای بینی کە ئەم رێبازە، گریمان راستیش دەرچێ دژی قورئان ناوەستێ.

حەیران/ ئەو زانا کلاسیکی‌یانە کێن کەلەلایان وا بوو بەرەنگاری زانست بەهێزی شمشێر بکرێت؟

شێخ/ من هیچ کامێك لەو زانا سونیانە ناناسم کەلای وابێت بەرەنگاری بیرورا زانستیەکان بەهێزی شمشێر بکرێت، بەڵام ئەوەی کەمن بزانم بۆ نموونە غەزالی کە پێش (برونۆ و گالیلوو گپلەر) بەحەوت سەدساڵ هاتووە لەکتێبی (تهافت الفلاسفه)دا کاتی هێرشکردنی بۆ سەر ئەو زانا ئاینیانەی کە ئینکاری راستیەکانی زانستیان دەکرد، وەك خۆر گیران و مانگ گیران.... هتد.

ئەمە دەقەکەیەتی کە دەڵێت: (هەرکەسێك نیمچە گومانی وابوو کە موجادەلەکردن بۆ پووچەڵی ئەمە لە ئایندایە، ئەوە هێرشێکە بۆ سەر ئاین و لاوازکردنی بڕیارەکانی، چونکە ئەم کارانە پابەندی بەڵگەکانی ئەندازە و ژمێریاری یە کەهیچ گومانیان تیادا نی‌یە، هەرکەسێك شارەزای تیادا هەبێت بەدوای بەڵگەکاندا بگەڕێت، گەرپێی ووترا ئەمە پێچەوانەی شەریعەتە هیچ گومانێکی تیادا نی‌یە بەڵکو گومانە لەشەرع و، هەرکەسێك هەڵسەنگاندنی شەرع بەرێگای چەوت بکات زیاتر زەرەرمەند ترە لەوەی کە تانەو توانجی لێدەگرێت هەروەك ووتراوە (دوژمنێکی ژیر باشترە لە دۆستێکی نەفام) ئەمەیە وتەکەی غەزالی و لەپێناوی ئەمەدا نەدووچاری هێزی شمشێر و نەگری ئاگر بۆوە، بەڵکو بەچاوی بەرزو رێزەوە تەماشای دەکرا وەك دەزانی هەتا ناویان دەبرد بە (حوجەتی ئیسلام).

حەیران/ رەحمەتی خودا لە شێخ جسر بێت بەراستی زۆر بەرز بووە لەزانیاری یەکەیدا لە عەقڵ و باوەڕیشی دا و تێگەیشتنی بەجەوهەری ئاین و، بیرو بەرزی لە گونجاندنی نێوان زانست و باوەڕ، وادەبینێت کاتێك کە رێبازی پەیدا بوون و گەشەکردن بەڵگەدار بێت، هیچ پێچەوانەیەکی قورئان نابێت، گەرهاتوو ئەم رێبازە

بڕەولامان چەسپا هیچ زەرەرێك لەباوەڕ نادات.

گەر باوەڕ بهێنیت کە خودا لەسەرەتادا ماددەی ساکاری دروستکردووە پاشان گەشەی پێکردووە بەگوێرەی ئەو سیستمانەی کە پێی بەخشیبوون تا... ژیان پەیدا بوو لەخانەی یەکەمدا.

من لە شێخ دەپرسم کەواتە بۆچی بەمولحیدیان دائەنێن ئەوانەی کە دەڵێن خانەی یەکەم لەبێ گیانەوە پەیدا بووە.

شێخ/ ئاگاداربە ئەی حەیران، چاوێك بەو پاسەوانەدا بخشێنەرەوە کەباسمان کردوە، دەبینیت وشەیەکت لە یادچووە کە وتەکانی من و (شێخ جسرت لێتێکدەدات، من ئەوانەم بەبێ باوەڕ وەسف نەکردووە لەبەر ئەوەی مەزەنەی وابووە کە خانەی یەکەم لەجەماد پەیدا بووە، ئەمە فەرمانێکی شیاوە و مەحاڵی تیادا نی‌یە بۆیە ناووم بردوون بەبێ باوەڕ، چونکە باوەڕیان وابوو کە خانەی یەکەم لە جەمادەوە پەیدا بووە (دروستکردنی خۆیی)

حەیران/ جیاوازی چیە لەنێوان ئەم دوو وتەیەدا؟

شێخ/ جیاوازی زۆرە ئەی حەیران، مەبەستیان (لەدروستکردنی خۆیی‌یە) دەیانەوێت بڵێین خانەی یەکەم لەجەماد پەیدا بووە بەرێکەوت لەبەراوردکردنێکی رێژەیی کاتێکی تایبەتی لەرەگەزە ماددییەکان، نەك بەتوانایی خودا و، جسر دەڵێت پەیدا بوونی ژیان لە جەماد کارێکی شیاوە و، هەندێ کات ژیان ڕواڵەتێك دەبێت لە ڕواڵەتەکانی ماددە کەلە جوولە و بەرامبەریەکی رێژەیی لەنێوان دیاریکراوە تایبەتمەندەکان لەرەگەزەکاندا دەبێت و، ئەمانە هەمووی لەلایەن خوداوە دروستکراون نەك بەرێکەوتی کوێرانە، سەرنج بدە لەم دوو وتەیە بەوەی کە جسر دەڵێت/ خودا دروستکەری ماددە بنەمایی‌یە گەردوونە بنەڕتیەکەیە لەنەبوون و هەر خۆشی بەخشێنەری سیفاتی رەگەزەکانە و، هەرخۆشی جوولەی بە گەردیلەکان بەخشیووە و، هەرخۆشی زانایە لەنهێنی ئەو بەرامبەرە رێژەیی‌یە کە دەتوانرێت ژیان لێی پەیدا بێت و هەر لەخودا خۆشی ئەم گونجاندنەی پێبەخشیبوون کە بۆتە هۆی ژیان هەروەك ئاساییەکانی تری خودای پەروەردگار لە لێکەوتنەوەی هۆکار لەهۆ، بەڵام ماددیی‌یە بێ باوەڕەکان هەر لە بنەڕەتدا ئینکاری خودا دەکەن و ئینکاری بوونی وویست دەکەن لەدروستکردندا و، لایان وایە کەهەموو رەگەزەکان ئاشنایی و تێکەڵبوونیان لەگەڵ یەکتردا بەرێگای رێکەوتە و، بەمەش ژیان پەیدا بووە، ئەم جیاوازیی‌یە بزانە ئەی حەیران و لەبەرچاوی خۆتی دابنێ، تەنها ئەمەت بەسە ئەی حەیران کەوا ئینکاری (دروستکردنی بەرێکەوت بکەین) و

لەپاشدا خۆت دەبینیەوە لە ئامێزی باوەڕدا و هیچ گریمانێکی دروستبوون و پەیدا بوون لەمەودوا کارت لێناکات.

حەیران/ چۆن ئەمە دەبێت ئەی گەورەم.... زیاتر بۆم ئاشکرا بکە؟

شێخ/ دەگەڕێمەوە بۆ لێکۆڵینەوە کە بۆ مەبەستی پوچەڵکردنی، دروستکردن بەڕێکەوت وەبۆتی ساکاردەکەم بەئاسانی و تەواوی لەکاتی خۆیدا.

حەیران/ شێخ جسر سەبارەت بە عەقڵ و رۆح چی دەفەرموێت؟

شێخ/ سەبارەت بە عەقڵ شێخ جسر دەفەرموێت، عەقڵ لەو شتە شاراوانەیە کە رێگا نی‌یە بۆ روونکردنەوەی راستیەکانی و لەشەریعەتدا هیچ روونکردنەوەیەکی تیادا نەهاتووە دەربارەی عەقڵ، دووریش نی‌یە وتەی ماددیی‌یەکان راست بێت کە دەڵێن عەقڵ دیاردەیەکە لەدیاردە کار لێکراوەکانی بەشەکانی مادده، بەڵام دەڵێین ئەم کارلێکردنە بەوویستی خودا پەیدا بووە نەك بەگوێرەی جوڵە کوێرانەکەی مادده خۆی، هەروەها ئەو وتەیان کەدەڵێن عەقڵی مرۆڤ جیاواز نی‌یە لەگەڵ عەقڵی ئاژەڵدا تەنها لەرێژەکەیدا نەبێت و لەخودو راستیدا جیاوازی لەنێوانیاندا نی‌یە ئەمەش دژایەتی دەقەکانی شەریعەتی محەممەد ناکات لەباوەڕدا و هیچ پشتگیری دەقێکی تیادا نەهاتووە کە ئینکاری بکات یاخود پشتگیری بکات ئەوەی لە شەریعەتدا هاتووە تەنها ئەوەیە کە مرۆڤ بەعەقڵ لەهەموو جۆرەکانی ئاژەڵ جیادەکرێتەوە و، مرۆڤ بەهۆی عەقڵیەوە بەکارهێنانی شەریعەتی پێ سپێردراوە گەر بڵێین دەرك دەکرێت یان بەپێچەوانەوە هیچ دەقێك سەبارەت بەمە نەهاتووە.

قەدەغە کراونی‌یە لامان گەر بڵێین دەرککردنی ئاژەڵ و عەقڵی مرۆڤ هەردووکیان یەك ووتراون، بەڵام عەقڵی مرۆڤ گەشەی کردووە... تا... ئەو پلەیەی کە ئێستا تیایەتی کە پێی جیادەکرێتەوە لە عەقڵی هەموو ئاژەڵەکان سەبارەت بەرۆح شێخ دەڵێت بوونی هەیە بەڵام عەقڵ نەتوانایە لەدەرککردنیدا.

ئەم وەستاندنەی شێخ جسر و نەچوونە ناو قوڵایی راستیەکان ژیان و رۆح و عەقڵ کە هەموو فەیلەسوفان نەتوانا بوون بەرامبەری ئەمە بەڵگەیە بۆ بەرزی بیرو ڕاکانی شێخ جسر و هەروەها ئینکاری نەکردنی ئەوانەی کە دەڵێن دیاردەیەکە لە دیاردە کارلێکراوەکانی مادده بەتوانای خودا، ئەمانە هەموو بەگشتی بەڵگەن بۆ فراوانی عەقڵی شێخ جسر و دووری لەکرچ و کاڵی و بەرزی سەرنجدانی لە تێگەیشتنی راستیەکانی ئاین.

حەیران/ وا لەباسەکانی شێخ تێگەیشتووم کەباوەڕی بەکاریگەرە سروشتی‌یەکان

هەبێت، کەواتە بیرو ڕای چۆنە سەبارەت بە سیستەمی هۆکاریی‌یەکان، کە فەیلەسوفان زۆر لەسەری دواون؟

شێخ/ شێخ جسر لەو سیستمە هۆ هۆکارانە دەرناچێت کە غەزالی باسی دەکات و لەسەری دەڕوات یان ئەو باسانەی کەلوتەکانی (هیومی) گوماندار بۆم بەدەرخستی کە جسر دەڵێت خواوەندی پەروەردگار هەرچەندە هۆکارەکانی پەیوەست کردووە بەهۆکانیانەوە، هەرتەنها خۆی دروستکەری هەردووکیانە گەر سەرنجێکی ئەو شتانەی بدەین کە دیاردەکانیان لێدەکەوێتەوە، سەرنج بدەین لەراستیەکان دەبینین ئەم شتانەی لەخودی خۆیاندا پەیوەستدارنین بۆ لێکەوتنەوەی ئەو دیاردانە لێیان و چونکە هیچ شتێکی تیادا نی‌یە کە عەقڵ باوەڕی پەیوەستداری هەبێت پێیانەوە، بۆ نموونە گەرمایی بەفر دەتوێنێتەوە و ساردیی ئاو دەبەستێنێت، گەر سەرنجێك لەراستی ئەم شتانە بدەین بۆ عەقڵ بەدەرناکەوێت کە ئەم دووشتە پەیوەست بن بەلێکەوتنەوەی ئەم دوو دیاردەیە لێیان وەك ئەوەی کە بلێین تەنێك پەیوەستە بەپڕکردنەوەی بۆشایی‌یەك و هەروەها وەك پەیوەست نیە بەدانانی دوو تەن لەیەك بۆشاییدا، ئەم دوو فەرمانە عەقڵ وادەبینێت کە پێویستی وا داوادەکات کە عەقڵ باوەڕی پێیان بێت بەڵام بەوەی کە گەرمایی بەفر دەتوێنێتەوە و ساردی ئاو دەبەستێت لای عەقڵ پێویست نی‌یە کە باوەڕی وابێت و دیاردەی ساردی بۆ ئاو بەستن بێت، عەقڵ دەڵێت بۆ ئەم حاڵەتە پێچەوانە نەبێت؟

گەرووترا گەرمایی هۆیە بۆ توانەوە لەبەرئەوەی ئەو هێزەی لاواز دەکات کە گەردیلەکان ئەو تەنەی پێکەوە بەستووە، دەڵێن بۆچی ئەم فەرمانەی پێچەوانە نەبێت؟ پێویستە لەکۆتاییدا تەنها ئەوە بلێین هەریەك لەگەرمایی و ساردیی‌یەو تایبەتمەندی کە پێوەی پەیوەستن، تایبەتمەندی تایبەتمەندێکە وویستی وابوو کە ئەم کارە بەم چەشنە بێت و ئەو تایبەتمەند بەخشە کەلە تایبەتمەندی و سیفاتی سروشتی بەهەموو شتێك بەخشیوە تەنها خودای بکەرو هەڵبژێرەرە.

حەیران: ئەم باسە زۆر نزیکە لە وتەکانی ئیبن ڕوشدەوە.

شێخ: بەڵێ... هەروەك دەبینیت شێخ جسر ئینکاری هۆ و هۆکار و تایبەتمەندی و سیفاتی سروشتی و سیستمەکانی ناکات هەروەك چۆن زانایان و فەیلەسوفانی ئیسلامی ئینکاری ئەم شتانە ناکەن و بەچ ڕێگایەك ئینکاری بکرێت گەر هەموو شتێك بە تایبەتمەند و سیفاتی سروشتی خۆی جیا بکرێنەوە لە شتەکانی تر، گەر هەر شتێك ئەم تایبەتمەندی و سیفاتە سروشتی‌یەی خۆی لە دەستدا ئەو کاتە ئەو شتە وەك خۆی نامێنێتەوە بەڵکو دەبێتە شتێکی تر و، لەبەر ئەوەی عەقڵ ئەو پێویستی‌یە نابینێت کە ئەم شتانە لە خودی خۆیان ئەو

تایبەتمەندییانەیان هەبێت، هیچ بوارێك بۆ عەقڵ نابێت کە گومان بکات لەوەی کە خودا دروستکەری هەموو شتێکە و هەر خودا خۆشی ئەو تایبەتمەندی و سیفاتە سروشتیانەی پێبەخشیوون هەر خۆشی بە توانایە کە ئەو سیفات و تایبەتمەندیانەیان لێ داماڵێت گەر شەریعەتەکانی ئاسمان ئینکاری هۆو کار بکەن ئەو کاتە پەیڕەویکردنی شەریعەتەکان پووچەڵدەبێتەوە و، مرۆڤیش لەتێکۆشان بەدوای خودادا دەوەستێت و دەرگای پاساوکردن کراوە دەبێت بۆ ئەو کەسانەی فەرمانی خودا پشتگوێدەخەن و لەکارە بەدەکان نزیکدەبنەوە و ئەمەش پووچەڵکردنەوەی شەریعەتە، بەڵکو تێکدانی عەقڵ و وەستاندنی باوەڕهێنان کەتەنها بەهۆی عەقڵەوە دێتە دی و، هەرکەسێك باوەڕی وابێت کە ئاینی ئیسلام ئەم فەرمانە پەیڕەودەکات ئەوا نەزان و نەفام و کەم عەقڵە.

حەیران/ لەباسکردنی سیستەمەکان و تێکدانیان بەهۆی موعجیزەکانەوە لە شێخی گەورەم دەپرسم، ئایا دەتوانرێت لێکدانەوەی موعجیزە لەسەر بنەمای سیستەمە سروشتییەکان بژمێررێت هەروەك هەندێ لەزانایان باوەڕیان وایە؟

شێخ/ لەراستیدا ئەو فەرمانە شاراوە و پەنهانانەی کە قورئانی پیرۆز و کتێبەئاسمانیەکان باسیدەکەن، دووجۆرن فەرمانی وایان تیایەدا کەوا دەزانین تێکدانە بۆسیستەمەکانی سروشت لەبەر شارراوەی نهێنییەکانیان لێمان، لەوانەیە رۆژێك لەرۆژان زانست ئەو سیستمانەی بەدەربخات کە بەهۆیانەوە ئەم فەرمانە دروست بوون، تیایدا هەیە بەراستی تێکدەرن بۆ سیستەمەکانی سروشت کە خودا خۆی لەسەردەستی پێغەمبەران بەدی هێناوە، وەلەکتێبە ئاسمانیەکاندا ناویان براوە تاکو بۆمان بەدەربخات توانای خودا خۆی لەسەر تێکدانی سیستەمەکانی گەردوون و، ئەم تێکدانانە شیاون بەموعجیزە ناو دەبرێت و لەتوانای زانستدا نییە بگاتە ئەو پلەیەی کە سیستمێکی سروشتی بە دەربخات کە ئەو موعجیزەیەی تیادا رویداوە و پێویستە لەسەر باوەڕدار باوەڕی بەمە هەبێت و باوەڕی بەوەش هەبێت کە ئەم فەرمانانە موعجیزەن و پێچەوانەی سیستەمەکانی سروشتن، بەڵکو من وا دەبینم پێویست ناکات هەوڵبدەین لێکیبدەینەوە لەسەر بنەمای سیستەمە سروشتییەکان، گەرتێکدەری سیستەمەکان نەبێت بەموعجیزە ناو نابرێت و، ئەگەر بڵێین ئەم موعجیزانە لەسەر بنەما سیستەمە سروشتیەکان پەیدا بوون ئەوا ئامانجی موعجیزەکە پووچەڵدەبێتەوە، خودای پەروەردگار، ئەم موعجیزانەی خستۆتەوە بۆ ئەوەی رێنماییمان بکات بەوەی کە تەنها خۆی پەیداکەری هەموو سیستەمەکانە و هەر لە توانای خۆیدایە تێکدانیان، گەر لەتوانای مرۆڤدا بووایە بۆ بەدی هێنانی یەکێك لەنموونەی ئەو موعجیزانە بەهۆی دۆزینەوەی هێزی سیستەمەکانی سروشتەوە ئەو کاتە

بەموعجیزە ناو نابرێت و ناوبردنی خودا سەبارەت بەم موعجیزانە بێ حیکمەت و مانا دەبێت.

هەر لەبەرئەوە دەڵێم زانایانی ئاینی، کە هەوڵیان داوە لێکدانەوەی ئەو موعجیزانە بکەن لەکتێبە ئاسمانیەکان هاتووە لەسەر بنەمای سیستەمە سروشتیەکان، ئەوانەی بەهەڵەدا چوون، وەك لەلای هەندێکیان وایە، ئەی دروستبوونی (عیسا) بەبێ باوك چۆن لێکبدەینەوە، ئەو وتەیەشیان دادیان نادات کە دەڵێن/ ئێمە دەمانەوێت موعجیزە لەعەقڵ نزیك بکەینەوە، تاکو باوەڕی پیاوانی زانست بەدەستبهێنن، چونکە ئەم نزیککردنەوەیە لەگەڵ ئەوەی مەحاڵە لەبواری زانستدا بۆ هەندێ موعجیزە.

ئەمە لەخودی خۆیدا لەناو بردنێکە بۆ مانای موعجیزە و پێچەوانەی دانایی و ئامانجەکەیەتی و، ئەمەش ئەی حەیران هەڵەیەکە زۆر لەزانایانی موسڵمانان و نەسرانیەکان بەدڵسۆزیی یەوە دووچاری بوون، وەتا... ئێستاش لەیادمە کە هەندێ لە زانایان هەوڵیان داوە، ئەو ئایەتانەی لەسورەتی فیلدا هاتووە بەم جۆرە لێکی بدەنەوە، ئەو باڵندانەی کە گرمۆڵە قوڕی وەك بەردیان دەگرتە فیل سوارەکان بەمیکرۆبی ئاوڵەیان لێکداوەتەوە کە تووشی فیل سوارەکان بوون و لەناوچوون هەوڵیان داوە مانای معراج و شەقکردنی دەریا لەلایەن موساوە و دروستبوونی (عیسا) لەسەر بنەمای سیستمە سروشتیەکان لێکبدەینەوە و ئێمە گەرچی بەدووری نەزانین کە مەبەست لەباڵندە نێراوەکان میکرۆبی ئاوڵە بێت، چونکە لەسورەتی فیلدا ناوی موعجیزەی نەبردووە کە تێکدانی سیستمە، بەڵکو وەسفێکە بۆ ئەو حەبەشانەی کە بەفەرمانی خودا دووچاری ئەو لەناوچوونە بوون و، بەدروستی دانانێین ئەو ئایەتانەی کە باسکردنی موعجیزە تیادا هاتووە بەلێکدانەوەی سروشتی زانستیانە لێکبدرێتەوە، چونکە بەم لێکدانەوەیە ماناو نهێنی و بەهای موعجیزە کە لەدەست دەچێت وەك لەمەوپێش باسکرا و، بەو کەسە دەڵێین کەداوامان لێدەکات عەقڵی رازی بکەین، بەلێکدانەوەی ئەو موعجیزانەی کە مەحاڵە لەرێگای زانستەوە بکرێت، بەمەدەیخەینە گومانەوە و بەرەو دواوەی دەگێڕینەوە بۆ گومان و ئینکاری، بەبێ ئەوەی مەبەستمان بێت، گەر باڵندە نێراوەکانمان (طیر أبابیل) بەمیکرۆبی ئاوڵە لێکدایەوە، ئەی دارەکەی دەستی موسا کەبووە مارێك و دەرۆیشت بەچی لێکبدەینەوە؟!! گەر ئەمەشمان بەنوستنی موگناتیس و ئارەزوومەندکارێك دانا، ئەی شەق بوونی دەریا بەلێدانی دارەکەی موسا بەچی لێکبدەینەوە گەر ئەمەشمان بەکشاندن و چونەوەیەك (مد و جزر) دانا، وەك لەلای

هەندێکیان وایە، ئەی دروست بوونی (عیسا) بەبێ باوك چۆن لێکبدەینەوە و گەر لەسەر لێکدانەوەی هەندێ لەمێشك پووچەکان بڕۆین سەبارەت بەدروستبوونی ئەم منداڵە بەرێگای (پیتانی خۆیی- التلقیح الذاتي) کە دەشێت رووبدات، بەگوێرەی قسەی ئەوان لەلای هەندێ لە نێرەمووکەکان، ئەی توانای قسەکردنی عیسا لە بێشکەدا بەچی لێکبدەینەوە؟

وا..... بۆی دەچم ئەی حەیران، ئێستا بەتەواوی تێگەیشتین لەمانای وتەکانم، هەوڵدانی لێکدانەوەی موعجیزە لەسەر بنەمای سیستەمەکانی سروشت لەخودو ئامانجیدا سەرکەوتوونی‌یە و، تێکدەری مانای موعجیزەیە و، خەڵکی بەرەو گومانی زیاتر دەبات، راستی باوەڕهێنانە بەو خودایەی کە دروستکەری ئەم گەردونەیە و هەروەها هەرخۆی دروستکەری هەموو سروشت و سیستەمێکە و هەر لەبەرئەوەی خودا خۆی دروستکەریەتی لەتوانایدایە تێکدانی نهێنی موعجیزە لەمەدایە و، هەرکەسێك باوەڕی بەخودا چەسپاو بوو، باوەڕهێنانی بەموعجیزە لائاسانە بەڵام ئەوانەی کە باوەڕییان وایە موعجیزە لەسەرو عەقڵەوەیە بەمە جیاوازی لەنێوان مەحاڵی ئاسایی و مەحاڵی عەقڵ ناکەن و تێکدانی سیستەمەکان لەمەحاڵەکانی عەقڵ نیە و لەبەر ئەوەی باوەڕمان وایە کە خودا خۆی دروستکەی ئەم سیستەمانەیە زۆر ئاسانە لامان باوەڕبهێنین کەلەتوانای خودایە تێکدانی ئەم سیستەمانە.

حەیران کوڕی ئەزعەف دەڵێت: ئا.... لێرەدا لەناکاو، شێخ لەقسەکردن وەستا، لەپاشدا چەند وتەیەکی بەدەمدا هات لێی تێنەگەیشتم، وایدەزانی کە خۆر هەڵهاتووە وەیان نزیکە، هەستاین و لەپاش نوێژکردن خوا حافیزیم لەشێخ کرد، چووە ژوورەکەی خۆی و لەکاتی دەرگاداخستندا پێی ووتم تابەیەك گەیشتنێکی تر... لەشەوی ئایندەدا... ئەی حەیران کەشەوی تاقیکردنەوەیە.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت/
شەوی رابردوو لەناکاو و بەپەلە شێخ مەوزونم بە جێهێشت بەبێ ئەوەی لێی بپرسم مانای (شەوی تاقیکردنەوە) چی‌یە؟ و چوومە جێنوستنەکەم زۆر دڵخۆش بووم بەگوێبیستی باسەکانی خوا لێخۆشبوو شێخ جسر لە پاشدا خۆم دا بەدەست نوستنێکی قوڵەوە، تاپێش نیوەڕۆ بەئاگا نەهاتم، کە راپەڕیم مانای شەوی تاقیکردنەوە لەگوێمدا ئەزرنگایەوە، بەچەندەها شێوەی جیاجیا لێکم ئەدایەوە، وەگەلێك شت دەهاتە یادم و ئەوەی کە پەسەند بوو لەلام ئەوەیە کە شێخ ئاماژەی ئەو باسانە دەکات کەلەشەوانی پێشوودا ناومان بردبوون دەستمکرد بەپێداچوونەوەی (دەفتەری ئامالی) کە شێخ پێی نوسیبوومەوە، بەڵکو خودا بکات شتێکم لێی دەستگیر ببێت کە ئاماژەی شەوی تاقیکردنەوە بکات.
لەکۆتاییدا وای بۆ چووم کەمەبەستی شێخ ئەوەیە کە تاقیکردنەوەیەکی گشتیم بکات لەو باسانەی کە خوێندوومانە، دەستمکرد بەخوێندنەوەی دەفتەری (ئامالی) کە وتەکانی شێخ تیادا تۆمار کرابوو و خواردن و خواردنەوەی لەبیربردمەوە، تا.... گوێبیستی بانگی شێوان وازم لە خوێندنەوەی نەهێنا و، کاتێك کۆتایی نوێژی خەوتنانی ئەو شەوە هات چوومە لای شێخ سەرنجێکی دوورو درێژی دام و بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی بۆ وا پەشۆکاوی، چی‌یە لەتاقیکردنەوە کە دەترسی؟
حەیران/ کێ هەیە لەتاقیکرنەوە نەترسێت ئەی گەورەم بەڵام ئەوەی من تەنها ترس نی‌یە بەڵکو ترس و ماندوی و برسێتی‌یە.
شێخ/ برسێتی.... !؟
حەیران/ بەڵێ برسێتی گەورەم، وەتا..... ئێستا هیچ خواردنێکم نەخواردووە.
شێخ/ چۆن دەبێت، هیچت لانی‌یە بیخۆیت، یاخود نەخۆشیت؟

حەیرانت/ نەئەمەو نەئەوەش، بەڵام گوێم لێبوو فەرمووت سبەی شەو تاقیکردنەوەیە و، واهات بەیادما کە دەتەوێت تاقیکردنەوەم بکەیت لەو وتانەی کە بۆت باسکردوم و، ترس دایگرتم نەك دووچاری شەرمەزاری لای تۆ ببم ئەی گەورەم.

خۆم تەرخان کرد بۆ پێداچوونەوە و، هیچ کاتێکم بۆ نەمایەوە بۆ خواردن، لەبەرئەوە ترس و ماندوویتی دایانگرتووم.

شێخ/ راست بۆی چوویت و بەئاگا بوویت، لە راستیدا.. دەمەوێت تاقیکردنەوەت بکەم، ئایە وا دەزانی هەروەك هەندێ لە مامۆستای نەزان تاقیکردنەوەت دەکەم کە قوتابیانی خۆیان تاقیدەکەنەوە، ئەم باسە بەها بەرزانە لە جۆرەکانی دەرخکردن نین، تاکو لە قوتابیان پرسیار بکرێت هەر وەك بابەتی هۆنراوە دەرخ بکرێت، بەڵکو گفتوگۆیەکی عەقلی پوختە پێویستی بەتاقیکردنەوە هەیە، بەجۆرێك کەلەکاتی پرسیارکردندا قوتابی بۆی هەبێت لەکتێبەکەیدا بەدوایدا بگەڕێت و موناقەشەکردنی بابەتەکانی و لەم گفتوگۆو موناقەشانەدا مامۆستا رادەی تێگەیشتنی قوتابی یەکەی بۆ دەردەکەوێت و ئاکامی تاقیکردنەوەکە لەلای مامۆستا کەئاشکرا دەبێت.

لەبەر ئەوە با دەفتەرەکەت لەبەردەمدا بێت و هیچ مەترسیت نەبێت ئەی حەیران بەڵام پێش ئەوەی دەستپێبکەین هەندێك ماست بخۆ زۆر... نا.... چونکە برسێتی زۆر مێشك دەوەستێنێت وەك چۆن تێری زۆر مێشك دەوەستێنێت.

چوومە ژوورەکەی خۆم و هەندێ ماستم خوارد، گەڕامەوە بۆ لای شێخ و، دەفتەری ئەماڵیەکانم هەڵگرت و بەشێخم ووت:/ ئێستا من لەبەردەستام ئەی گەورەم.

شێخ/ ئەی حەیران تۆ دەڵێیت من بەسەر هەموو دەفتەرەکەدا ، چوومەتەوە.

حەیران/ بەڵێ... بەڵام پیا چوونەوەیەکی شڵەژاوی ترسناك.

شێخ/ هیچ نییە، ئێستا کتێبەکە لەبەردەستدایە، بەهێمنی و لەسەرخۆ ئەو شتانەی کەنەت خوێندۆتەوە، بیانخوێنەرەوە.

حەیران/ سوپاس... گەورەم.

شێخ/ تەنها..پرسیارێك ئەی حەیران.... ئایا.... ئەزانیت ئامانجی من چییە لە وباسانەی کە بۆم کردوویت و بۆم هەڵبژاردوویت و، مەبەستی گەورەم چییە کە دەمەوێت پێی بگەیت.

حەیران/ بەڵێ... دەرکم کردووە گەورەم ئەو ئامانجەی کەجەنابت ئاواتخوازی پێی بگەم، کە بۆم بەدەربخەیت کەبەرهەمی فەلسەفەی راستە کە گەورە فەیلەسوفەکان بە دەستیان هێناوە و لەسەری رێکەوتوون، هەرگیز پێچەوانەی ئاینی راستەقینە ناکات لە چەسپاندنی بوونی خودادا، بەڵکو ئەم چەسپاندنە، عەقڵی پوختیش پشتگیری دەکات، واتە: عەقڵی گەورە پیاوانی ئاین و فیلەسوفان هەمیشە لەسەریەك بەڵگە رێکدەکەون و، لەبەر خۆشەویستیو رێزی زۆری ئەم فەیلەسوفانە لام بوونەتە رێبازێك بۆ گەیشتنم بە باوەڕی پوخت بەخودا لە رێگای بەڵگەکانەوە، کەبەهۆی سەرنجە عەقڵیە، پوختەکانەوە پشتیان پێ بەستراوە بەبێ پشت بەستن بە بەڵگەی ئاینی پاش ئەوەی کە بینیت وازم هێناوە لەو بەڵگانەی کە گوێبیستی دەبووم لەپیاوانی ئاینەوە و، بۆم بەدەربخات ئاینی راستەقینە هیچ کاتێك دژایەتی و ئینکاری راستەیەکانی زانست ناکات، کەبەڵگە بڕرەکانی عەقڵ پابەندێتی چونکە ئایینی پوخت بڕیاری عەقڵ دەکاتە یاسایەکی بەرزی جیاکەرەوە بۆ ناسینی راستیەکان.

ئەمە ئەو ئامانجە بەرزەیە کە ویستم پێمی رابگەیەنیت.

شێخ/ ئایا.... ئەی حەیران تۆم گەیاندۆتە ئەم ئامانجە.

حەیران، بەڵێ... گەورەم.

شێخ/ زیاتر ئارەزوومەندی وتەی کام فەیلەسوف بوویت و چ بەڵگە خوازیەك زیاتر باوەڕت پێهێناوە.

حەیران/ بە وتەی هەموویان ئەی گەورەم بەتایبەتی وتەی گەورەکانیان، لەپوختی بیرکردنەوەو راستی بەڵگەکانیان و نەفرەتم دەکرد لە وتەی هەندێ لە بچووکەکانیان لەوەی کە نادیاری و لاوازی و کرچ و کاڵیان لەخۆ گرتبوو و، ئەوانەی کە خۆیان بە رێبازی سەفسەتەوە هەڵواسیبوو و چووبوونە ناو قوڵایەکانی گومانەوە لەناو هەموو میلەت و بیروباوەڕێکدا لەسەر ئەوەی کە راستی یەك شتە، لەگەڵ زۆری رێبازە بەڵگەکان و، بەبەراورد کردن و پێوەرکردن لە نێوان هەردوو لایەنەکە کە گەیاندمیانە رۆخی زانستەکانی قورئان و، رێنمایی پیرۆزی تۆش ئەی گەورەم گەیاندمیانە دەروازەکانی باوەڕ، سوپاس بۆ خودا.

شێخ/ ئایا... باوەڕی دەروونی خۆت بوو، یان باوەڕی بەڵگەکان بوو؟

حەیران/ ئایا.... مەبەستت لەباوەڕ بە پەیامی پێغەمبەرەکانە؟

سوێنبێت بەخودا، هیچ کاتێك بێ باوەڕ نەبووم بەخوداو کتێبە پیرۆزەکان و پێغەمبەرەکانی.

شێخ/ ئەزانم، ئەزانم، ئەو باوەڕە ویژدانییە خۆرسکییە و بۆماوەییەیە لەو خێزانەوە وەرت گرتووە کە تیایدا پەروەردە بوویت، بەڵکو بۆماوەیەکە بۆ نەوەکانی داهاتوو، بەڵێ ئەم باوەڕە زۆر بێگەرد و پوختە گەر فەلسەفەچی نەزان لێڵی نەکات و بەدبەختی ڕێگای پێنەگرێت.

حەیران/ کەواتە، مەبەستی شێخم لەباوەڕی دەروونی چییە؟

شێخ/ پرسیارت لێدەکەم، ئایا.... ئەو باوەڕەی کە ئەمڕۆ پێی گەیشتوویت پاش گوێبیستنت بە وتەی فەیلەسووفەکان کە باوەڕێکی پەیامی دەروونییە کە ڕێزت بۆیان هەڵقوڵاوە کەلە ناختدا شاراوە بووە بۆ گەورە فەیلەسوفان گە پێش ئەوەی وتەکانیان لێکبدەیتەوەو باوەڕیان بناسیت یاخود بەهۆی ئەو بەڵگانەی کە عەقڵت دەرکی کردوە؟

حەیران/ باوەڕی یەقین و ڕێز لێنانی بەرزە و، هەروەها باوەڕی بەڵگەکانیشە بەگشتی، بەراستی بۆم بەدەرکەوت لە بینینی بەیەك گەیشتنی فەیلەسوفەکان لەسەر هەق و ڕاستی و باوەڕ بەبوونی خودای گەورە، لەنێوەند گەورە فەیلەسوفان و گەورە پیاوانی ئاین و بەهۆی زانینم بە وتەکانی جسر سەبارەت بە پێویستی بڕیارەکانی عەقڵ، لەبەراوردکردن لەنێوان زانست و ئایندا و، مەعقول و مەنقول لەکاتی هێنانەوەی بەڵگە بڕەکانی عەقڵ لەسەریان و بگەڕێمەوە بۆ زانایانی ئایینی بەهەمان پشت بەستن کە ڕێزی زۆرم بۆ فەلسەفەو زانست، ململانێی لەگەڵدا دەکردم و، کرچ و کاڵی زانایانی ئایینی هەندێ جار دوریان دەخستمەوە، ئەوانەی کە غەزالی و جسر پێیان دەڵێن: زیاتر زەرەمەند ترن بۆ ئاین لە دووژمنەکانی ئاین و، بۆم ڕێکەوت پابەندی ڕێبازە بەڵگەخوازییەکان بیم لەسەر بوونی خودا بەگشتی لەگەڵ بوونی ئەو جیاوازییەی نێوانیان لە ئاڵۆزی و سادەیی کەبەگشتی هەموو ڕوودەکەنە باوەڕ هێنان بەخودا.

شێخ/ دەمەوێت لەدەمی خۆتەوە باسی ئەم بەڵگانە گوێبیستبم تا... بۆم بەدەربکەوێت لەکوێدا دووچاری ئاڵۆزی دەبێت. و ئێستا.. من بە قوتابی خۆت دابنێ.. ئەی حەیران و، تۆش ببە بەشێخ مەوزون.

حەیران/ لە (بەڵگەکانی پەیدا بوون) دا کە زۆربەی فەیلەسوفان و زانایان هەڵگری ئەم ڕێبازەن، دەبینم بیروباوەڕەکانی منیش زۆر بە ئاسایی ئەم ڕێبازەم گرتۆتەبەر، لە ڕێبازێکی ئاشکرای بەڵگەدار، کە بەبەڵگە پشتیوانی کراون و، هەندێکیان پەیوەستی هەندێکی تریانن، بەرەو بەرزی مل دەنێن، تا دەگەنە شتە ئاشکراکان لەلای عەقڵ و، عەقلم پێم دەڵێت/ ئەم گەردوونە پێکهاتەیە (واتە: مرکب)ە بەخۆی و گشت بەشەکانیەوە هەموو پێکهاتەیەك پەیدا بوونی ئاشکراو روونە و، گەردونیش بەهەموو ئەو شتانەی کەلە خۆیی گرتووە لە گۆڕانێکی بەردەوامیدایە لە وێنەیەکەوە بۆ وێنەیەکی تر، واتە: لەشێوەو شکلێکەوە بۆ شێوە و شکلێکی تر و هەموو گۆڕاوەکانیش دووبارە دەگۆڕێن بۆ وێنەی تر و ناگونجێت وێنەیەکی بنەڕەتی ئەزەلی کۆن هەبێت، گەروابوایە بەهیچ جۆرێك شیاو نەدەبوو کە گۆڕانی بەسەردا بێت. و وتە بەوەی کە زنجیرەی وێنەکان بێ کۆتایی‌یە، وتەیەکی هەڵەیە، چونکە زنجیرەیی و تەسەسول لەلای عەقڵ مەحاڵە.

لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە لە سنورێکدا بوەستین و بڵێین: ئەم گۆڕراوانە لەسەرەتاوە بێ شێوە وێنە و سوورەت بوون و لەبەر ئەوەی بێ شێوەو بێ وێنە بوون و بوونیان نەبووە، چونکە وێنە بریتی‌یە لە شێوەو قەبارەو کێش و ڕەنگ و چێژ و بۆن و، چ کاتێك وێنە ئەو شتانەی لەدەستدا بوونی نابێت کەواتە جیهانی گۆڕراو بوونی نەبووە لەپاشدا پەیدا بووەو گەردوون پەیدا بووە، عەقڵ بەهۆی سیستمی هۆو هۆکارە ئاشکراکان، بە ئاشکرایی بڕیار دەدات کە هەموو پەیدا بوونێك پێویستی بەهۆکارێك هەیە بۆ پەیدا بوونی و، پەیدا کەرە، ئەم هۆکارە ناگونجێت خۆی پەیدا بووبێت چونکە ئەویش پێویستی بەهۆکارێك دەبێت بۆ پەیدا بوونی، ناگونجێت بگوترێت زنجیرەی هۆکارەکان بێ کۆتایین، چونکە زنجیرەیی (تسلسل) لەلای عەقڵ مەحاڵە، لەبەر ئەوە دەبێت پەیداکەرو، دروستکەری گەردوون کۆن بێت، کە خودای بەخشندەیە، کە دروستکەرو پەیداکەری گەردوونە پاش ئەوەی نەبوونێکی ڕەها بووە.

شێخ/ ، بژیت، بژیت،... ئەی حەیران.

حەیران: و سەبارەت بە بەڵگەکانی پێویست (وجوب) کە فارابی‌و ئیبن سینا و دیکارت و لوك و لایبنز... هتد پابەندی بوون.

دەڵـێم/ عەقڵ بەئاشکرا بڕیار دەدات کە مانای بوون لەنێوەند سێ حاڵەتدا جێگۆڕکێ دەکـات (دەشـێت، مەحاڵ، پێویست) (الأمكان، الأستحالة، الوجوب) لەبەر ئەوە هەموو شتێك یـان بوونـی دەشـێت یـان بوونـی مەحاڵـە یـان بوونـی پێویستە و، عەقڵ بڕیاری ئەوە دەدات کـە ئـەم گەردوونە لە جۆری (دەشێت) و لەحاڵەتی (دەشێت)دا دەبێت زاڵکەرێ هـەبێ حاڵـەتی بـوون زاڵ بکا بەسەر نەبووندا، کە بتوانێت لە دەشێتەوە دەربازی کات بۆ بوونـێکی کـرداری (فعلـي) و پەیداکـەری ئەم بوونە، ناگونجێت بوونی لە جۆری دەشێت بێـت چـونکە ئـەو کاتـە پێویستی بـە پەیداکـەرێك دەبێـت کـە ئەمەش دیسان بەرەو یاسای زنجیرەی مان دەباتەوە کە ئەمەش لەلای عەقڵ مەحاڵە.

کەواتـە ئـەم پەیداکـەرە، دەبێت (پێویستە بوون) بێت و، ئەم پەیداکەرە پێویستە بوونە، ناگونجێت لـە خـودی خۆیـدا دەشێت بێت، چونکە گەر وا بێت، ئەو کاتە دەبێت خودی دەشـێت پێویستە بـوون بێـت، کـە ئەمـەش پێچەوانەی عەقڵـە چـونکە دوولایەنی دژبەیەك کۆدەکاتـەوە کـە (دەشـێت پێویسـتە) و لەبـەر ئـەوەی دیسـانەوە روو دەکاتـەوە یاسـای زنجیرەیـی کـەوا لـەهۆکار دەکـات ببێتە هۆیەك بۆ هۆکارەکە خۆی و هەروەها هۆکانیش ببنە هۆکار بۆ هۆکانی خۆیان.

ئەم خولاندنـەوەیش کەوا باوەڕییان دەگوترێ لە زاراوا (دەورو تسلسل) لەلای عەقڵ مەحاڵـە لەبەر ئـەوە ئـەم گەردوونـە دەشـێت، پێویستی بە پەیداکـەرێك هەیە کەلەخودی خۆیـدا پـەیدا بووبێـت و پایـەندی خـۆی بێـت و، ئەو پەیداکەرە پێویستە بوونەیش خودای بەخشندەیە.

لەیەکێك لـە وتـەکانی دیکـارت کـە هەمیشـە خـەڵك دەیڵێتەوە (من بوونم هەیە، کێ پەیدای کردم و کێ دروستی کردم؟)

مـن دروسـتکەری خـۆم نـیم و پێویستە دروسـتکەرێکم هەبێـت و ئـەو دروسـتکەرەش پێویستە (پێویستە بوون بێت) کە خودای بەخشندەیە.

بەگوێـرەی دەربڕینـی باسـکاڵ: (لەوانـە بوو نەبومایە گەردایکم پێش لەدایکبوونی من بمردایە، کەواتە من زیندەوەرێکی (پێویست بوون) نیم، کەواتە پێویستە (پێویستە بوونێك) هەبێت کە بوونی من پاپەندی ببێت ئەویش خودایە.

شێخ/ و بەگوێـرەی تەعبیر دەربڕینـی قورئـان: ﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ؟: یا لەهیچ شتێك پەیدا نەبوون یاخود خۆیان دروستکەری خۆیانن؟﴾.

حەیران/ و لەبەڵگەکانی (هۆو هۆکارەی تەواو) وا لەسەر بنەمای (باوەڕی هاودژ) (مبدأ التـناقض) کەلایبنز بە ئاگابووە لێی عەقڵ وا بڕیار ئەدا هەموو شتێك کە ئێمە ئەندێشەی دەکەین دەبێت، یان دەشێت بێت و یان مەحاڵ بێت و یاخود پێویست بێت وەراستی ئەم گەردوونە دەگەڕێتەوە بۆ جۆری (دەشێت)

هەموو راستیەکانی جۆری دەشێت دەبێت (هۆ و هۆکارێکی تەواوی) هەبێت بۆ کەوتنەوەیان و هێنانە بوونیان.

ئەم گەردوونە بینراوە خۆی دروستکەری بوونی خۆی نییە، وتەی بەوەی خۆی دروستکەری بوونی خۆیەتی پێچەوانەیە لەگەڵ عەقڵدا وەك لەوەو پێش ووتراوە. کەواتە پێویستە ئەم گەردوونە راستە دەشێت هۆو هۆکارێکی تەواو هەبێت بۆ خستنەوەی بوونی، چونکە بەبێ (هۆو هۆکاری تەواو) بوونی نابێت، لەگەڵ ئەوەی کە شتێکی راستییە بوونی هەیە وە دەبێت (هۆو هۆکاری تەواو) بۆ بوونی، لەوپەڕی زانست و توانا و کاربەجێیی بێت هەموو سیفاتێکی تەواوی لەخۆ گرتبێت، چونکە گەرسیفاتی تەواوی لەخۆ نەگرتبێت هۆو هۆکارەکەی تەواو نابێت، کە خودای بەخشندەیە.

هەمووی بەگشتی لەسەرەتاییەکان بۆ عەقڵ دەژمێرێت کە هەندێکیان تەواوکەری هەندێکی تریانن و، ئەم شتە سەرتاییانە لە مێشکی مرۆڤدا لە کۆتایی قۆناغەکانی بیرکردنەوەیدا دووچاری شڵەژاندن و کولبوون دەبێتەوە، کاتی ئەندێشەکردنی کۆتاییەك کە هیچ شتێك لە دوایدا نایەت و، ئەو نەبێ کۆتاییەی کە هیچ سنورێکی نییە و، ئەو ئەزەلیەی کەهیچ سەرەتایەکی نییە و، ئەو چەرخەی کە هیچ چەرخێك لە پێشیەوە نەبووە و ئەو جێگایەی کە هیچ شتێك لەدوایەوەنییە و هەروەها (نەبوونی رەها) (العدم المطلــق) بەڵام ئەم هەموو کولبوون و شڵەژانە بێزارم ناکا و ئازارم نادات بەقەد ئەو کولبون و نەتوانایەی عەقڵ کە دووچاری دەبێت لە ئەندێشەکردنی دروستبوون لەنەبوونەوە.

شێخ/ تۆ لێبوردراوی ئەی حەیران، لەکولبوون و نەتوانایەی عەقڵت کە تووشی دەبێت لە ئەندێشەکردنی ئەم هەموو بابەتانەدا و عەقڵت گەورە ترنییە لە عەقڵی غەزالی و ئیبن روشد ئیبن طــوفەیل و کانت و سبەنسەر کەبەگشتی دان دەنێن بەنەتوانای عەقڵ و کولبوی لەهەندێ کاتدا.

بەلاّم هەرگیز لێبوردراو نیت لەبەردەم ئەم کولبونەدا دەستەوسان و سەرسام و نەتوانابیت لەبەدەر خستنی بەلّگە بڕەرەکانی عەقلّ بۆ خۆت، کە ئەم کولبوونە بە ویلّبوونی ئەندێشە دەژمێررێت، ئایا عەقلّمان هەمیشە دووچاری ئەو ویلّبوونی ئەندێشەیە نابێت کەلە پاشدا بەهۆی بەلّگە بڕەرەکانی عەقلەوە پووچەلّی بکەینەوە و بەدرۆی بخەینەوە کەواتە گوێبیستم بە ئەی حەیران.

حەیران/ هەموو لەشم گوێیە گەورەم.

شێخ/ ئەم گەردوونە راست و بینراوە،... ئایا لەبەشی (دەشێت) یان لەبەشی (پێویستە)

حەیران/ بێ گومان ئەمە لەبەشی دەشێت چونکە دەتوانین ئەندێشەی نەبوونی گەردون بکەین.

شێخ/ ئایا... گەردوون دروستکەری خۆی بووە؟

حەیران/ نەخێر.... چونکە ئەم ئەندێشەیە پێچەوانەیەکی عەقلّی دروستدەکات، کە ئەوکاتە دەبێتە (پێویستە بوون) کە خۆی لە راستیدا (دەشێت).

شێخ/ کەواتە دەبێت (هۆو هۆکارێکی تەواوی) هەبێت بۆ خستنەوەی و هێنانە بوونی.

حەیران/ ئەمە، ئاشکرایە.

شێخ/ کەواتە گەردوون پێش ئەوەی هۆ و هۆکاری تەواو پەیدا بکات بوونی نەبووە.

حەیران/ گومانی تیادا نی‌یە کەوایە.

شێخ/ ئایا، ئەندێشەکردنی بوونی گەردون لەپاش نەبوون هیچ پێچەوانەیەك بۆ عەقلّ دروستدەکات، بیر بکەرەوە ئەی حەیران.

حەیران/ نەخێر.... بەلّکو پێچەوانەیي عەقلّ کاتێك دروست دەبێت کە ئەندێشەی نەبوون بکەین بەوەی کە بوونی گەردوون نەبوونی لەپێشەوە نەبووە.

شێخ/ پەیدا بوون لەنەبوونەوە، لەلای عەقلّ مەحالّ نی‌یە، گەرلەلامان مەحالّ بوو یان بەدورمان زانی و نەتوانابین لە ئەندێشەکردنی وەکوو لایبنز دەلّێت.

حەیران/ راستە، لەلای عەقلّ مەحالّ نی‌یە.... بەلاّم گەورەم سوێند بێت بەخوا من تا ئێستا نەتوانام لە ئەندێشەکردنی لەگەلّ ئەوەی بەهۆی بەلّگە بڕەرەکانی عەقلەوە باوەڕی تەواوم بەخودا پەیدا کردووە سەبارەت بەوەی کەلەلای عەقلّ مەحالّ نی‌یە، بەلّکو مەحالّ

ئەوەیە کە نەبوون پێش بوونی گەردون نەبێت، کە بوونەکەی (دەشێت) بەڵام چی بکەم گەر عەقڵ نەتوانا بێت؟

شێخ/ و بەهای ئەم نەتوانایی‌یە چی‌یە بەرامبەر بەڵگە بڕەرەکان؟

منیش هەروەك تۆ عەقڵم نەتوانایە لە ئەندێشەکردنی دروستبوونی لەنەبوونەوە، بەڵام باوەڕی تەواوم هەیە کە ئەم نەتوانایی‌یە ئەنجامی ویڵی ئەندێشەی پووچەڵ و بێ مانایە. و دەستەوەسان بەرامبەری ئاماژەی تێکچوونی عەقڵ دەکات.

حەیران/ چۆن؟

شێخ/ ئایا.... باوەڕت بە راستیەکانی ماتماتیك نی‌یە کە باوەڕی تەواو بەئەنجامە راستیەکەی دەهێنێت؟

حەیران/ چۆن.... نەء.

شێخ/ ئایا زۆر لە راستیەکانی ماتماتیك نازانیت، کە پشت دەبەستیت بەشتە سەرتایی‌یە ئاشکراکانی عەقڵ کەلە سەرەتادا نادیارن لەلات و، تەنها بەهۆی بیرکردنەوەو ئاکامخوازی و بەڵگە خوازی بۆت بەدەردەکەوێت.... ؟

حەیران/ ئەمە راستە... بەڵام دوای بیرکردنەوەو بەڵگەخوزای دەتوانم ئەندێشەی بکەم؟

شێخ/ وتەت چی دەبێت، گەر چەند بابەتێکی ماتماتیکی ساکارت پێشکەش بکەم، کە بەهۆی بەڵگە بڕەکانی عەقڵەوە بەدەستهاتووە لەگەڵ ئەوەشدا عەقڵت لە ئەندێشەکردنیدا دووچاری نەتوانای دەبێتەوە تەنانەت بەدەرخستنی ئەنجامی کێشە ماتماتیکەکەش؟!

حەیران/ لە نموونەی.

شێخ/ بەئاگا بە ئەی حەیران، عەقڵمان لە بواری ژمێرە زۆرەکاندا کول دەبێت بەرامبەر ئەندێشەکردنی چەند راستی‌یەکی دیار و ئاشکرا، کە تەنیا پێویستی بەبیرکردنەوەیەکی کەم و ژماردنێکی سادە هەیە لە جۆری کۆکردنەوە بۆ تێگەیشتنی تەواو لێی، عەقڵ بەشێوەیەکی سەیر کول دەبێت لێی، تەنانەت لە ئەنجامەکە دەکەوێتە گومانەوە، گەر راستترین کەسیش ئەو ئەنجامەی پێ بڵی، بگرە عەقڵ خۆشی ئەوئەنجامە بەدەست بهێنێ هەر لێی بەگومانە.

ئایا... (مەتەڵی پەرە پارچەکراوە کە دەزانیت)؟

حەیران/ نەخێر...... گەورەم.

شێخ/ گەر پەڕەیەکی زۆر تەنکت بدرێتێ کە ئەستوریکەی بەشێك بێت لە (١٠٠) بەشی میلیمەترێك و داوات لێکرێت بیکەیتە دووبەشەوە و، پاشان دوو بەشەکەش بکەیتە چوار بەشەوە و چوار بەشەکەش بکەیتە هەشت بەشەوە،.... تا.... بەم جۆرە کەرت بوونە کە دووبارە دەکەیتەوە تا.... دەگەیتە (٤٨) جار، وەلێت پرسرا پێش ئەوەی دەست بەکەرتبوون و ژماردن بکەیت بە پێی مەزەندەت درێژیی ئەم پارچانە چەند دەبێت پاش کەرتبوونیان بە (٤٨) جار؟ ناتوانی بلێیت هەرچەند زۆر لەخۆت بکەیت کە رێژەیەکی بۆ دابنێیت و، بلێیت د\رێژییەکەی زیاترە لە ١ یان ٢ یان ٣ مەتر و گەر پێتوترا ئەستوریکەی زیاترە لە ١٠ کیلۆمەتر.... هەرگیز باوەڕ ناکەیت.......

گەر پێتووترا کەرتبووەکە بۆ ٤٦ جار دووبارە بکەرەوە و لەسەر یەکیان دابنێ تا بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمان.... بەرمانگ دەکەوێت یان نزیکە بەری بکەوێت، کەدووریی یەکەی لە زەوییەوە ٣٨٤ هەزار کێلۆمەتر دەکات، گەربە شێوەیەکی ساکار لەم ژمێرەیە بکۆڵیتەوە و بتەوێت ئەندێشەی بکەیت دەبینیت عەقڵت نەتوانایە لە ئەندێشەکردنی، پێنوسەکەت بگرەو ژمێرە بکە ئەی حەیران.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت: پێنووسەکەم گرت و دەستم بەژماردن و کۆکردنەوە کرد بۆ ماوەی زیاتر لە کاتژمێرێك و شێخیش پێدەکەنی، کاتێك تەواو بووم بۆم بەدەرکەوت بەهۆی ژمێرەیەکی ساکار پەڕە پارچەکراوەکان، گەر بخرێنە سەریەك، بەراستی نزیکە بگاتە مانگ، بەشێخم وت.

حەیران/ بەڵێ، راستە ئەی گەورەم درێژییەکەی نزیکەی ٣٨٤ هەزار کیلۆمەترە.... و راستە نزیکە بەرمانگ بکەوێت بەخودا ئەمە شتێکی سەیرو نامۆیە.....

شێخ/ ئێستا پرسیارت لێدەکەم/ ئایا دەتوانیت ئەندێشەی ئەم ئەنجامە بکەیت پاش ئەوەی خۆت بەدەستت هێنا. و یاخود هێشتا هەست بەنەتوانای عەقڵ دەکەیت لە ئەندێشەکردنیدا.

حەیران/ سوێند بێ بەخوا.... تا ئێستا هەست بەتوانایی عەقڵ دەکەم لە ئەندێشەکردنیدا.

شێخ/ ئایا.... دەرکت کردو باوەڕت هێنا ئەی حەیران کە عەقڵمان زۆر کات نەتوانایە لە ئەندێشەکردنی زۆربەی ڕاستیەکان کە بەهۆی بەڵگەکانی عەقڵەوە بەدەستهاتووە.

حەیران/ بەڵێ... باوەڕ دەکەم... بەڵام چۆن ئەمە دەبێت؟

شێخ/ لەبەر ئەوە وا عەقڵمان دروستبووە کە نەتوانانێت لە ئەندێشەکردنی زۆربەی ڕاستیەکان، بەڵام بەهۆی بەڵگە بڕەرەکانی عەقڵەوە دەتوانیت بڕیاری ڕاستیان بدەیت چونکە ئەی حەیران (ئەندێشەکردن) جیاوازە لە (بەگەڕ خستنی عەقڵ) لەوانەیە بە عەقڵ باوەڕ بەشتێك بهێنیت بەڵام ناتوانیت ئەندێشەی بکەیت، چونکە بەگەڕخستنی عەقڵ پەنادەبات بۆ شتە سەرەتایی‌یە ئاشکراکانی کە عەقڵ خۆی ڕێکیان دەخات و پەیوەستیان دەکات بەیەکەوە و، دەرهێنانی هەندێکیان لەهەندێکی تریان دەکات و، دروستکردنی هەندێکیان لەسەر هەندێکي تریان دەکات و دەگاتە ئەو بڕیارە بڕەرە عەقڵیانەی کەلەوانەیە بەئاسانی نەتوانرێت ئەندێشە یان بکرێت، ئێستا تێگەیشتیت؟

حەیران/ بەڵێ.... تێگەیشتم.

شێخ/ زانستی نوێی ئەمڕۆ دان بەم ڕاستی‌یەدا دەنێت بۆ ئەو جیاوازیی‌یەی کە بۆم باسکردیت لەنێوان شیاوی ئەندێشە کردنی شتێك و بەگەرخستنی عەقڵ، گوێ نادرێ بەنەتوانایی عەقڵ لە ئەندیشەکردندا و تەنها پەنا دەبەنە بەگەڕ خستنی عەقڵ چونکە ڕاستی‌یەکانی زانست لەبوارە جیاجیاکانیدا و لەچەندێتی و ژمێرەیی‌دا بەرزترە لە ئەندێشەکردن، بەڵام لەڕێگای بەگەڕ خستنی عەقڵەوە ژمێرە دەکرێت و دەناسرێت و بڕیاری لەسەر دەدرێت بۆ نموونە: شەپۆلەکانی ڕووناکی وەردەگرین، ئایا... ئەزانیت کە زانایان پاش ژماردنی ئەو شەپۆلانە دەڵێن ئەو شەپۆلە ڕووناکیانەی کە ڕەنگی نەوشەي دروست دەکەن بەخێرایی ٦٠ هەزار شەپۆلە لە ئینجێکدا؟ ئایا ئەو زانایانە دەتوانن ئەندێشەی ئەو خێرایی‌یە بکەن گەرچاو بنووقێنن و خەیاڵیان بخەنە گەڕو ماندووی بکەن؟

نەخێر چونکە ئەم ژمارە زۆرە لەم ڕووبەرە بچووکەدا، عەقڵ نەتوانایە لە ئەندێشەکردنی دا، بەڵام نەتوانایی‌یە لەبەگەڕخستنی عەقڵ تیایدا واتە بەهۆی عەقڵەوە بڕیاری ڕاستی‌یەکەی دەدات، لەوانەیە ژمارە لە لێکۆڵینەوە گەردیلە نوێکاندا بگاتە ژمارەیەکی سەرسوڕهێنەر کە عەقڵ نەتوانا بێت لە ئەندێشەکردنی ئالەمەوە بۆت

بەدەردەکەوێت ئەی حەیران، بۆ نموونە زانایان ژمێردەدەکەن و دەڵێن خێرایی لەرینەوەی دەنگ لەوانەیە بگاتە... نیو ملیۆن لەرە لە چرکەیەکدا و، ئەمەش چەسپاوە لەلای زاناکان چەسپاندنێکی عەقلی، زانستی بڕەر کە هیچ گومانێکی تیادا نییە، ئایا وایان دەبینی کە بتوانن ئەندێشەی ئەم ژمارە زۆرەی لەرینەوە بکەن لەچرکەیەکدا؟

بۆ تاقیکردنەوە، ئایا دەتوانیت ئەندێشەی روودانی هەزار لەرینەوە لەچرکەیەکدا بکەیت؟ چجای هەزار لەرینەوە یاخود نیو ملیۆن لەرینەوە لەچرکەیەکدا، بەڵام ئەم شتەی کە تۆ نەتوانای لەئەندێشەکردنی دارشتنێکی راست و بی گومانە، ئایا بەچ رێگایەك دۆزیانەوە؟ بێگومان بەهۆی بەگەڕخستنی عەقڵ و ژمێرە (حساب)ەوە دۆزیویانەتەوە.

ئێستا تێگەیشتیت کە چۆن ئەندێشەکردن جیاوازە لە بەگەڕخستنی عەقڵ و، پەند وەرگرتن وا لە بەگەڕخستنی ژیریو عەقڵدا، نەوەك لەکول بوونی لەئەندێشەکردن.

حەیران/ بەڵێ زۆر بەروون و ئاشکرا تێگەیشتم.

شێخ/ ئێستا لەوتەی زانایان و فەیلسوفان تێگەیشتیت کە دەڵێن: دروستکردنی بوون لە نەبوونەوە لەلای عەقڵ دەشێت، تەنانەت گەر عەقڵیش کول و نەتوانا بێت لە ئەندێشەکردنیدا؟

حەیران/ بەراستی (فەلسەفە دەریایەکە پێچەوانەی هەموو دەریاکانی ترە، هەڵگری رێبازی دووچاری ترسناکی و خنکاد لە رۆخ و کەناریدا دەبێت و، لەناخ و قوڵیدا دڵنیایی و باوەڕی دەستگیردەبێت).

هەروەك شێخ دەفەرموێت و، هەروەك (باکون) دەڵێت: کەمی فەلسەفە مرۆڤ بەدوردەخاتەوە لە ناسینی خودا بەڵام زۆرینەی بەرەو خودامان دەگێڕێتەوە.

شێخ/ ئێستا کاتی قورئانە ئەی حەیران، ئەو قورئانە پیرۆزەم لەکتێبخانەکەدا بۆ بهێنە و تۆ بڕۆ بۆ جێنووستنەکەت.

من کارێکی ترم هەیە کە پێشکەشی خودای پەروەردگاری بکەم بەبێ فەلسەفە..

# وته کانی به روه ردگارم

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت/ لەژوورەکەی شێخ دەرچووم پاش ئەوەی قورئانە پیرۆزەکەم دایە دەستی و چوومە جێنووستنەکەم، خەو نەدەچووە چاوم چونکە فێرنەبووم لەم کاتە زووانەدا بنووم، و نەشم ئەتوانی بخوێنمەوە چونکە چراکە هێشتا لەژوورەکەی شێخ مابوو، و زۆرم لەخۆم دەکرد کە بخەوم لەنێوان خەوو ناخەودا بەدەنگی کۆکەی شێخ بەخەبەر هاتم.... دەبینم شێخ هەر بەئاگایە... پاشان خەوێکی قووڵ دایگرتم تا... لەدەنگی لێدانی دەرگاکە لەلایەن بخێورە پیرەمێردەکەوە بە ئاگا هاتم و کاتێك لە جێنووستنەکەم هەستام بۆ ئەوەی دەرگا کە بکەمەوە دەبینم چراکە هەر لەژوورەکەی شێخدا رووناکە و کاتێك بانگی بەیانیدا شێخ بەرەو دەستنوێژ هەڵگرتن چوو، پرسیاری شەو نەخەوتنەکەیم لێکرد، ووتی ئێستا لە خوێندنەوەی قورئان تەواو بووم.

ووتم/ گەورەم شەونخوونی بێ هێزت دەکات.

ووتی/ ئەمە هەمووی لەبەر تۆیە ئەی حەیران.

ووتم/ لەبەر منە؟

زەردەخەنەیەك گرتی و بەرەو دەستنوێژەکەی رۆیشت لەپاشدا هەردوو کمان نوێژی بەیانیمان کرد، لە پاشدا شێخ بەرەو جێنووستنەکەی چوو، و ووتی: من ئەمڕۆ بۆ پەرستگام ناچم.... لەبەر ئەوە پێویستیم بەخەوێکی زۆرە، منیش ئەو رۆژەم لەنێوان پەرستگای شێخ و مزگەوتەکەدا بەسەر برد، و ئەوانەی دوێنێ شەو شێخ پێی گووتم بەسەریا چوومەوە و دووبارە کۆو ژمێرەی (مەتەڵی پەڕە پارچەکراوەکانم) کرد... دەبینم لەوپەڕی باوەڕدایە بەڵام عەقڵی ئێمە هەندێ کات نەتوانایە لەئەندێشەکردنی هەندێ راستیەکان کەبەهۆی عەقڵەوە دەسەلمێنرێن... و نابێت دەستەوەستان بین بەرامبەر ئەم نەتوانایی‌یەی عەقڵەوە، بەڵکو بەهۆی ئەو بەڵگە بڕرانەی کەلامان چەسپاوە، باوەڕ بەوە بهێنین کە ئەم نەتوانایی‌یە (وەهم)ە ئەندێشەیە، و وێڵی ئەندێشە بەرەنگاری بەڵگەی پێناکرێت، و وتەکانی غەزالیم هاتەوە یاد لەم رووەوە دووبارە بەوتەکانی غەزالیدا چوومەوە دەرکم کرد، مانای ئەم وتەیەی (تەنها رێگا چارەیەك بۆ گومان و وێڵی

ئەندێشـە، بەڵگەیە) و بەڵگەش بەهۆی پێکەوە لکاندنی سەرتایی بنەما پێویستی‌یەکانی‌یەوە بەدەست دێت، کە عەقڵ بەبێ ئەوان ناگاتە باوەڕی تەواو) لەپاشدا ووتم هاوار بۆ خۆم، چۆن دەرکی ئەم هەموو شتە بکەم، و وێڵی ئەندێشە فەراموش بکەم، لەکاتی چەسپاندنی بەڵگەی برەردا، گەر خودا ئەم پیاوە رابەرە بەئارامەی بۆ نەرەخساندمایە، هاوار بۆ خەڵك بە دەست ئەم هەموو گومانەوە، کەهیچ کەسێك دەربازبوونی نی‌یە لێی، ئایا.... ئەو هەموو لێکۆڵینەوە باسانەی کە ئێمە کردمان لەمەوبەر بۆ ئەو خەڵکە بەدەستێت؟

خوداش بەگوێرەی توانامان داواکردنمان بەسەردا دەسەپێنێت... چۆن دەتوانن ئەم هەموو گومانە لەباوەڕیان بە دووربخەنەوە، کە ئێوارە داهات... چوومە لای شێخ... دەبینم لە دەفتەرێکی گەورەدا هەندێ ئایەتی قورئانی نووسیوە، سڵاوم لێکردو هەردوودەستم ماچکرد، زەردەخەنەیەك گرتی و ووتی:-

بۆچی... بەبێ بۆنە دەستەکانم ماچ دەکەیت چی‌یە خواحافیزیم لێدەکەیت، وا دەزانی لەوانە کانت تەواو بوویت و بەرەو وولاتت دەچیتەوە... نەخێر ئەی حەیران هێشتا زۆرت ماوە کەوانەکانت تەواو بکەیت.

حەیران/ هەرگیز نەهاتۆتە یادم لێت جیاببمەوە ئەی گەورەم: گەر سەردانی باوکیشم بکەم هەر دەگەرێمەوە بۆلات، لەزانکۆی (پیشاوەر) لەزانست دابڕام، سوێندبێ بەخودا لەتۆ باشترم دەست نەکوتووە پاش دابڕانم لە زانکۆ هەردوو دەستتم بۆیە ماچکرد، چونکە دەمەوێ بەسۆزو هەستێکی زۆرەوە بتوانم بەم ماچانە دەریببڕم.

رازو نهێنی‌یەکی خۆمت لەگەڵ دا بکەم، و ئەم ماچانە .کەم بە صدقەی پێش نجوی (قدموا بین یدی نجواکم صدقە)

شێخ/ چیت ئەوێت بیڵێ، وتەی ناخۆش لەتۆ نابیستم.

حەیران/ زۆر بەووردی بیرم کردەوە لەو راستیانەی کە دوێنێ شەو پێت راگەیاندم، تۆ خودا پێم بڵێ، چۆن توانیومە دەرکی ئەم هەموو شتانە بکەم و چۆن فێر بووم وێڵی ئەندێشە لە ئاستی بەڵگە برەرەکانی عەقڵدا فەراموش بکەم گەر خودا ئەم پێشەواو رێ پیشاندەرە دڵسۆزە سنگ فراوانە بەئارامەی بۆ نەرەخساندمایە ، لەنموونەی بەرێزت.. ئەی گەورەم؟

شێخ/ رێپیشاندەرە پێشەواکان زۆرن ئەی حەیران، کەلەوانەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە، تەنها ئەوە گرنگە کە داواکاری رێگای راست سەرنجێکی قووڵ و بیرکردنەوەیەکی دوورو درێژی هەبێت و پرسیار لە شارەزایانی ئاین و قورئان بکات....

حەیران/ ئایا بۆ هەموو کەسێك ڕێدەکەوێت واز لەکاروباری ژیان و هۆکانی بەدەستهاتنی بژێوی بهێنێ‌و خۆی تەرخان بکات بۆ بیرکردنەوەی قووڵ و لێکۆڵینەوەی دووروودرێژ؟، و هێنانەوەی بەڵگە خوازی ماندوو کەرو زەحمەت، ئایا خودا داوای شتێك لە مرۆڤ دەکات کەلە توانایدا نەبێت؟

شێخ/ ئەمە ڕاستە حەیران، و ئەمە بوو کە دەمویست تۆ پێی بگەیت و پیشانی بدەم و ئامۆژگاریتی پێبکەم تا گەیشتمە ئەو پلەیەی کە بتوانم تۆی پێ ڕێنمایی بکەم بە گەیشتنت بۆ بەراستی بیرۆکەی بەڵگە پێکهاتەکان و ڕاستیەکانیان بەڵکو ئامۆژگاری هەموو ئەو مرۆڤانەی پێبکەم کە بۆیان ڕێناکەوێت خۆیان تەرخان بکەن بۆ بەسەرکردنەوە و لێکۆڵینەوەی دوورو درێژ... نەت بینی چۆن دوێنێ شەو لەبەر تۆ خۆم تەرخان کرد بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

شێخ/ بەچی ئامۆژگاریم دەکەیت گەورەم.

شێخ/ تۆ و خۆم و هەموو مرۆڤێك هیوادارم گوێبیستی ئامۆژگارییەکەی ئیبن روشد بین کە دەڵێت پێویستە بۆ چەسپاندنی بوونی خودا پەنا بەرینەبەر بەڵگە سەرەتاییە، ساکارە، ئاشکراکان کە عەقڵ بە ئاسانی دەرکیان دەکات بەبێ چوونە ناو قوڵایی گێژاوی بەڵگە خوازی و موناقەشەگیری کە ڕوتە لەوێڵی ئەندێشەو کولبوون و نەتوانایی، کە ئەمانەش ئەو بەڵگانەن کە قورئان زیاتر ئاماژەیان بۆ دەکات لەبەڵگە پێکهاتەکانی تری عەقڵ.

چونکە لەدەرککردنیاندا نەزانێکی نەخوێندەوارو زانایەکی فەیلەسوف وەك یەکن، نەزانەکە بەکورتی لەساکاری و ئاشکرایی و سەرتای یەکەی تێدەگات، بەڵام زاناکە بەدرێژی تێدەگات و دەزانێت ئەم ئاشکراییانە لە بەڵگەکانی قورئاندا پەنادەبەنە گەلێك بەڵگەی بەدەرخراو (شواهد) و هەموویان بەگشتی بڕیارێکی عەقڵی پێکدەهێنن بەجۆرێك، کە ئینکاری کردنیان وەك ئینکاری هاوکێشەی ماتماتیکی ڕاست و دروست وایە.

حەیران/ ئەمە شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە، بەڕاستی شێخی گەورەم لەمەوپێش ئاماژەی بەوە کرد کەلەقورئاندا سەبارەت بە بەڵگە لەسەر بوونی خوداو دروستکردنی گەردوون کۆمەڵێ بەڵگە هەیە گەیشتوونەتە ڕادەی ئیعجاز، کە لەتوانای تێگەیشتنی ئێمەدا نییە.و هەروەها هەستم بەمە کرد لەخوێندنەوەی هەندێ لە بەڵگەکانی ئایەتە قورئانیەکاندا. بەڵام لە وانەبوو کە هەموویان بەگشتی بڕیارێکی عەقڵی بدەن کە ئینکاریکردنیان وەك ئینکاریکردنی هاوکێشەیەکی ماتماتیکی ڕاست بێت.

شێخ/ چەند جار قورئانت خوێندۆتەوە ئەی حەیران؟

حەیران/ هەڵەم نەکردبێت زیاتر لە دەجار خوێندوومەتەوە.

شێخ/ وتەکانی باوکت دێتەوە یادت کەلە خەودا پێی ووتیت (ئایا قورئان دەخوێنیت؟)

حەیران/ لەیادمەو لەیادی ناکەم.

شێخ/ ئایا بەخەیاڵتا هاتووە کە بەووردی سەرنج بدەیتە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزەی خودای پەروەردگار ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ تا... بزانیت، پەروەردگارت، ترسی لەدڵی زانایاندا کۆکردۆتەوە بەرامبەر بە گەورەیی خودا خۆی، و ویستویەتی نهێنی‌یەکانی بوون و دروستکردن، پەیوەست بێت تەنها بەزانایانەوە هەروەك ئیبن روشد و جسر دەڵێن؟

حەیران/ سەبارەت بەم ئایەتە پرسیارم کرد ووتیان مەبەست لە ئایەتە کە (زانایانی ئایینی‌یە)

شێخ/ ئایا... دەبێت زانایانی ئاینی زانستەکەیان ئەوەندە سنوردار بێت کە تەنها بایەخ بدەن بەمانا زاراوە فیقهیەکان کە پەیوەستە بەدەرهێنانی بڕیارەکانی خودا پەرستن و مامەڵە کردن (معاملات) وەبێ ئاگابن لە نهێنی‌یەکانی بوون و دروستکردن کەلەرێگای فەلسەفەو زانستەوە بەدەست دێن، نەخێر... ئەی حەیران (فقـه) تێگەیشتنە بۆ هەموو شتێك و هەموو شتێك کە ئایینی لەخۆ گرتبێت لە نهێنی و دانایی و بڕیارەکان وەیەکەم شت کە پێویستە تێی بگەین وتەکانی خودایە، ئەو ئایەتانەی کە ئاماژەی بوونی خودا دەکەن، بەوەی کە دروستکەرو زانا و بەتواناو ویستدارو بێ هەڵەو خاوەن نەخشە و کاربەجێ‌یە، و ئەم ئایەتانە ناتوانرێت بەتەواوی لێکبدرێتەوە، کاتێك دەتوانرێت کە شارەزای‌یەکی تەواومان هەبێت بەسەر نهێنی‌یەکانی گەردوون و سیستەم و بڕیار و ووردەکاریی‌یەکانی‌دا، و زانایانی ئایینی پێویستە لەهەموو کەس زیاتر شارەزابن بەنهێنی‌یەکانی زانست، و کاتێ ئەم ئایەتە پیرۆزەیان بەسەردا دەچەسپێت ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ کەترسەکەیان چڕو پڕدەبێت کە شارەزایی تەواویان هەبێت سەبارەت بەزانستەکانی گەردون،و هەرشتێك کە پەیوەست بێت بە نهێنی‌یەکانی بوون و دروستکردنەوە و کە قورئان هەندێکیان بۆ رێنمایی کردووین و هەندێکی تریشی بۆ باسکردووین، و ئەم ئایەتە پیرۆزە لە شێوازی وتەکەیدا، تەنها بۆ ئەو فەرمانە نەهاتووە کە پەیوەستە بەخودا پەرستی و مامەڵەو رەوشتە و بەڵکو لەشێوازی وتەکەیدا ئاماژەبە توانایی

و کاربەجێیی خودا دەکات لەباران بارینداً، و هەروەها دروستکردنی رووەك و ئاژەڵ بەهەموو جۆرو رەنگیانەوە، هەروەك خودای مەزن دەفەرموێت

**﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفًا أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ:** ئاخۆ نەتدی، خودا ئاوی لەو بەرزەوە باراندووە، میوەجاتی هەمەرەنگەمان پێڕواندووە؟ لەکێوانیش رێگەوبانی سپیو سووری جۆراو جۆری بەرەنگ جیا وەدی هێنان؟ رەشی وەك قەلەڕەشەشیان تێدا هەیەلەمەردم و جانەوەر و ئاژەڵیشدا هەروەهایە، رەنگیان لە یەکتر جودایە، لەناو عەبدانی خودادا هەر ئەوانە فرەزانان لێی دەترسن﴾فاطر/۲۷.

حەیران/ بێگومان، مەبەست لەم ئایەتە ئەو زانایانەن کە فرە شارەزایی نهێنییەکانی گەردون و سیستمەکانین).

شێخ/ تێگەیشتنی تەواو، ئەو بەڵگانەن کە لەقورئانی پیرۆزدا هاتوون و ئاماژە بە بوونی خواوەند و توانایی و کاربەجێییەکەی دەکەن، کە پێویستی بەسێ کار هەیە، و ئایەتە قورئانییەکان ئەم سێ پێویستییەی لەیەك پانتاییدا کۆکردۆتەوە، کەلەکاتی بەراورکدندا لەبەرچاوو عەقڵدان تاوەکو مرۆڤ لەبیرکردنەوەدا فکری لەچوارچێوەی قورئان دەنەچێت، بەئارەزوویەکی راست و دروستەوە لەم ئایەتانە بکۆڵێتەوە لەسەر رۆشنایی زانست و فەلسەفە، بۆ بەدەستهێنانی ئەو بەڵگانەی کەلە خۆی گرتووەکە کەوەڵامدانەوەیەکە بۆ بێ باوەڕان، و دەرچوونە لەو کۆتو بەندە دەمارگیرییە کوێرانەی بۆ هەر رایەکی ئایینی یاخود فەلسەفی دوترێت.

حەیران/ من لەهەندێ لەزانایانم بیستووە کەوا قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ هەموو زانستێك کردووە.

شێخ/ نەخێر، حەیران نەخێر، و ئەوانەی ئەو قسانە دەکەن نەزانان و نەژیرو نەدانا و قورئان هەرگیز فەرمانگەیەکی زانستی و زانیاری نییە، و لەڕووی فێرکردنەوە هیچ مەبەستی نییە رێنمایی خەڵك بکات بۆ زانستەکانی گەردون و ئەو ئایەتانەی کە ئاماژەی راستیەکانی گەردون دەکەن زانست بەدەربخستوون مەبەستی ئاگادارکردنەوەی خەڵك لەدروستکردنی گەردون هاتوون کەوا چۆن دیاردەکانی ویست و تونا و زانست و دانایی و ووردەکاریی و سەنگێتی لەخۆ گرتوە کە هەموویان بەگشتی ئاماژەی بوونی خودا دەکەن کە ئینکاری دروستکردنی گەردوون دەکەن بەرێکەوت، و مەبەستی نییە

راپۆرتکردنی زانستەکانی گەرودن، چونکە قورئان ووتارێکە راوێژی مرۆڤ دەکات بەزمانی مرۆڤ خۆی، و خودا فرە داناترە لەوەی کە راوێژی مرۆڤ بکات بە زانستێك کە تەنانەت ناوەکەی نازانن بێجگە لەنهێنی‌یەکانی.

بەڵام خودای مەزن ئاماژەی بۆ بەڵگەکانی بوون و توانا و ویست و زانست و دانایی خۆی کردوە، بەدەربڕینێکی سەر سەوڕهێنەر کە کابرایەکی نەخوێندەواری دەوارنشین لەسەدەی حەوتەمی زاینیدا لێی تێگیشتووە، و پیاوێکی زاناش لە سەدەی بیستەمدا نهێنی‌یەکانی تێدەگات، هەر لەمەوە ئەو موعجیزانەی کە قورئان لە خۆی گرتووە بەدەردەکەوێت. نەك تەنها لەڕووی رەوانبێژیی‌یەکەیدا وەك لەوە و پێش باسکرا، و موعجیزوەکانی رەوانبێژی و زمان پاراوی، عەرەب دەرکی دەکات، و قورئان ووتارێکە راوێژی هەموو خەڵك دەکات بەگشتی.

بۆ ئەم جۆرە موعجیزانە خودای زانا و کاربەجێ ئاماژە دەکات و دەفەرموێت ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾، خودا دوای چەندەها سەددە نیشانەکانی گەورەیی خۆی لە ئاسۆی ئاسمانەکان و زەویدا بەدەرخست وەك چۆن پەیمانی دابوو، و بۆ مرۆڤیش بەدەرکەوت کە خودا هەرخۆی راست و هەقە، لەووڵاتەکانی رۆژ ئاوا چەندەها کتێبی دوورودرێژ لەم ڕەوە بڵاوکراوەتەوە بەڵام ئێمەی موسڵمان، کە دەستپێشخەر بووین لە بەدەرخستی زۆرینەی ئەو ئایەتانەی کە لەرێگای زانستەوە دۆزراونەتەوە، لاموایەدا کەم و کورتیمان کرد لەراو بۆ چوونی زاناکانمان، بەڵام قورئانی پیرۆز بەم بەڵێنەی پێشکەشکرد و ئاماژەی بۆ زۆر لەو بەڵگانە کرد کە بون و تەنیایی و توانا و کاربەجێیی خودا دەسەلمێنن پێش ١٤٠٠ ساڵ.

کورتەی باسەکەمان ئەی حەیران ئەم ئایەتە قورئانیانە نزیکە دابەش بێت لەنێوان بانگێژی بۆ ناسینی خودا وەرێنماییە بۆ بەڵگەکانی بوونو تەنیایی و ویست و توانا و کاربەجێیی و زانستی خودا و گشت سیفاتە بەرزەکانی و بەڵێنە خۆش و ناخۆشەکانی کە هاندانە بۆ پەرستن و خۆپاراستن لەسەر کێشکردنی فەرمانەکانی و سوربوون لەبوونی رۆژی زیندوو بوونەوەو پاداشت و بڕیارەکانی خوا پەرست و مامەڵەکردن و بەهرەیی لەکرداریی ژیان و هاندانمانە بەرەو رەوشتی پەسەند و چەند داستانێك کە پەیوەندی‌یان هەیە بەم شەش بەشەی کە باسکرا.

بەڵام لەهەموو بەشێکمان گرنگترو مەزنتر لەلای خودا، بەشی یەکەمە چونکە باوەڕ بە بوونی خودا بناغە و بنەمایە بۆ هەموو بەشەکانی‌تر، لەبەرئەوە کاتێك کە پەڕەکانی قورئان

دەکەینەوە دەبینین، ئەو ئایەتانەی کە ئاماژەی بوونی خودا دەکەن لە هەموو سورەتەکانی قورئاندا هاتوون، بەڵکو لە سورەتێکدا چەند جارێك دووبارە دەبنەوە.

حەیران دەڵێت/ لێرەدا شێخ ئەو دەفتەرەی داپێم کە ئەو ئایەتانەی تیادا نووسیبوو و ووتی/

شێخ/ ئەمە ئەو دەفتەرەیە کە ئایەتەکانم تێدا نووسیوە بەگوێرەی ڕیزبەندی دابەزینیان زیاتر ئەو ئایەتە قورئانیانەی کە خودای مەزن ویستوویەتی بیان کات بە بەڵگە لەسەر بوونی خۆی، و بەوەی کە خۆی، دروستکەر و زانا و وێنەکێش و بە ئاگا و بەتوانا و کاربەجێیە.

زۆر ئاماژەی هێناوەتەوە لەسەر نهێنی تواناکانی و کاربەجێییەکەی سەبارەت بە سیستەم و بڕیارو ووردەکاریی و سەنگینی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و خۆرو مانگ و هەسارەکان و ئەستێرەکان و ڕۆژ، و باو باران و چیاو رووبارو دەریاو رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ و بیستن و بینین و دڵ و ئەو سیستەم و یاسایانەی کەوا ئەم دروستکراوانە لەخۆیان گرتووە.

وەرە ئەی حەیران، با... ئەم ئایەتانە بخوێنینەوە و لەیەك کۆمەڵدا بیانخوێنینەوە و لەسەر رۆشنایی ئەو زانستەی کە هەموو نهێنیەکانی بون و دروستکردنی بەدەرخستووە لێکدانەوەیان لێ بکەین.

حەیران/ بۆچی، شێخی گەورەم ئایەتەکانی بە پێی دابەزینیان بۆی ڕیزبەند کردوم نەك بەگوێرەی ریزی ناو سورەتەکان.

شێخ/ چونکە، ویستم بۆت وابوو کە خۆت بەیەکێك لە خەڵکانی ئەو سەردەمە دابنێیت کە قورئانی تیادا دابەزیوە تاکو ببینین چۆن نیگا دابەزیوە و چۆن بەخشندەیی بەدوایەکدا هاتوون، و لەناوەختی ئەو ووتارانەی کەڵەزاری خەڵکانەوە لەسەر ئەو بەڵگانەی کە بوونی خودا دەسەلمێنن وتراون، ئەو کاتە ئەم ئایەتانە زیاتر کاریگەر تر دەبن لەسەرت و تێگەیشتنت بۆ ڕێنمایی خودای گەورە ئاسانتر دەبێن ئەوانەی کە قورئان پەیرەوی کردوە.

حەیران دەڵێت/ پاشان شێخی گەورەم، دەفتەرەکەی دا پێم و ووتی: بیانخوێنەرەوە.

**﴿اقْــرَأْ باسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْاِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّــمَ بِــالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْاِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾**: بخوێنە ئەی محەممەد بەناوی پەروەردگارت ئەو پەروەردەگارەی کە بوونەوەری دروست کردووە مرۆڤی لەخوێنی مەیوو دروستکردووە،

بخوێنه كه خودای تۆ لەهەموو كەس دەهنده تره، ئەو خودایەی مرۆڤی بەهۆی قەڵەمەوە فێر كرد، ئەوەی كه مرۆڤ نەیدەزانی فێری كرد.﴾العلق/١-٥.

﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى، الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى، وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى، وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَى، فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَى: ناوی پەروەردگاری بەرزو گەورەی خۆت بە پاكی بەه، ئەو خودایەی كه خەلقی كردو جارێك و دروستی ئەندامی كرد، بۆ هەرشتێ ئەندازەی دا ناو ڕێ نیشانی كرد، و ئەو كەسەی كەلەوەڕگەی بەدی هێنا، پاشان جارێكی تر بەووشك و رەشی هەڵگێڕا.﴾الأعلى/١-٥.

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، اللَّهُ الصَّمَدُ، لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ: بڵێ ئەی محەممەد ئەو خودایە تاكە، خودایەكی بێ نیازو جێی نیازە، لە كەس نەبووە كەسیش لەو نەبووە، هەرگیز كەسیش نەیتوانیوە هەمبەری بێ.﴾سورة الاخلاص.

﴿قُتِلَ الْإِنْسَانُ مَا أَكْفَرَهُ، مِنْ أَيِّ شَيْءٍ خَلَقَهُ، مِنْ نُطْفَةٍ خَلَقَهُ فَقَدَّرَهُ، ثُمَّ السَّبِيلَ يَسَّرَهُ: با ئەو مرۆڤە بكوژرێ كە سپڵەو ناسپاسە، خوا ئەوی لەچ شتێك بەدی هێناوە لەدڵۆپێك بەدی هێناوە و ئەندازەشی بۆ داناوە، لەپاشاڕێگای بۆ خۆش و ئاسانكراوە.﴾عبس/١٧-٢٠.

﴿فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ، أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبّاً، ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقّاً، فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبّاً، وَعِنَباً وَقَضْباً، وَزَيْتُوناً وَنَخْلاً، وَحَدَائِقَ غُلْباً، وَفَاكِهَةً وَأَبّاً: بامرۆڤ بڕوانێتە خۆراكی خۆی، ئێمە خۆمان ئاوەكەمان بۆ ڕژاندوە، پاشان ئەم زەویەشمان قەڵاشت و لەتكردووە جا دانەوێڵەمان لەو عەرزەدا سەوز كرد لەگەڵ ڕەزو سەوزایی، بنە زەیتوون و دارخورما وە باخە رازاوەكانی پڕدار، و میوە و گژوگیا.﴾عبس/٢٤-٣١.

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا، وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا، وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا، وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا، وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا: سوێندبێ بەخۆرو پەرەگرتنی ڕووناكی، و بەمانگ كەلەدوای ئەو هەڵدێ و بەڕۆژ كاتێ كەرووی زەوی ڕووناك دەكاتەوە و بەشەو كەڕووی زەوی دا ئەپۆشێ، بەو ئاسمانەو بەوەی ئەوی بەدی هێناوە، و بەو زەمینەو و بەوەی كە بە پانی ڕایخست، و بەگیانی مرۆڤ سوێند و بەوەش كە ئەندازەی كردوە.﴾الشمس/١-٧.

﴿لَقَـدْ خَلَقْـنَا الْاِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيم: له‌راستیدا ئێمه مرۆڤمان به‌رێكترین شێوه به‌دیهێناوه. ﴾التین/٤...

﴿أَيَحْسَـبُ الْاِنْسَـانُ أَنْ يُتْرَكَ سُدىً، أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِنْ مَنِيٍ يُمْنَى، ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَـقَ فَسَوَّى، وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى: ئایا مرۆڤ لای وایه كه‌به‌خۆڕایی به‌ره‌ڵاده‌كرێ، ئایا تنۆكێك ئاوی نێرینه نه‌بووه كه رژاوه‌ته ناو منداڵانه‌وه له پاشان بوه به خوێنی مه‌یو، جا خوا ئه‌وی خه‌لق كردو ئه‌ندامی راست و رێكی پێدا، له‌پاشا كردنیه جووت: نێرو مێ. ﴾القیامة/٣٦-٣٩.

﴿وَالْمُرْسَـلات عُـرْفاً، فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفاً، وَالنَّاشِرَاتِ نَشْراً، فَالْفَارِقَاتِ فَرْقاً، فَالْمُلْقِيَاتِ ذِكْراً، عُذْراً أَوْ نُذْراً: سوێندبێ به‌و با... یه‌ك له‌دوایه‌كه تێك ئاڵاوانه، و به‌و باچرو گژه هاتوانه‌ی هه‌ڵده‌كه‌ن، به‌و بایانه‌ش كه باران ئه‌ڕژێنن، جاسوێند به‌وانه‌ی به‌جیاكردنه‌وه‌یان جیاده‌كرێنه‌وه، به‌وانه‌ش كه یادی خودا ده‌خه‌نه ناودڵانه‌وه، بۆ به‌هانه‌گرتن یان ترساندن. ﴾المرسلات/١-٦.

﴿أَلَمْ نَخْلُقْكُمْ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ، فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَكِينٍ، إِلَى قَدَرٍ مَعْلُومٍ، فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ، وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ، أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتاً، أَحْيَاءً وَأَمْوَاتاً، وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتاً، وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ: ئایا ئێوه‌مان له ئاوێكی بێ بایه‌خ نه‌خولقاندووه، و له‌جێیه‌كی پته‌ودا جێمان نه‌كردۆته‌وه، تاسه‌رده‌می دیاریكراو، و ئێمه ئه‌مانه‌مان به‌چاكترین ئه‌ندازه به‌دی هێنا له‌ناو چوون له‌ورۆژه‌دا ته‌نها بۆ به‌درۆخه‌ره‌وانه ئایا زه‌ویمان نه‌كردۆته كۆكه‌ره‌وه، بۆ زیندوان و مردوان، و له‌ودا كێوو چیای بڵند و پته‌ومان به‌دیهێناوه، و به‌ئاوێكی شیرین و سازگار ئێوه‌مان پاراو كرد له‌ناو چوون له‌و رۆژه‌دا ته‌نها بۆ به‌درۆخه‌ره‌وانه. ﴾المرسلات/٢٠-٢٨.

﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ، وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَارَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ، تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيـبٍ، وَنَزَّلْـنَا مِـنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكاً فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ، وَالنَّخْلَ بَاسِـقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ، رِزْقاً لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كَذَلِكَ الْخُرُوجُ: ئایا نه‌یان راونیوه‌ته ئه‌و ئاسمانه‌ی كه به‌راسه‌ریانه‌وه‌یه كه چۆنمان سازداوه‌و رازاندوومانه‌ته‌وه،

کەهیچ کون و کەلێنێکی تیادا نی‌یە و زەویمان پان و بەرین کردوە، گەلێ کێوی بتەومان تیادا داناوە، و هەموو روەکێکی دڵگیرمان بەجووت تیادانا، تا ببێتە رۆشنایی و پەند بۆ هەموو ئەو عەبدانەی کە ئارەزووی گەرانەوە دەکەن و لەوبەرزاییەوە ئاوی بەپیت و بەرەکەتمان پرژان و بەهۆی ئەو بارانەوە باخی میوەوە ئەو دانەوێڵەیەی کە دروێنەدەکرێن رواند، و دارخورمای بەرزی هێشووداری تێکسەراومان رواند، و بەو بارانە زەوی مردومان زیندوو کردۆتەوە زیندوو کرنەوەی مردویش لەزەوی هەربەم چەشنەیە.﴾ق/٦-١١.

﴿**أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ، وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ، وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ**: ئایا دوو چاو زمان و دوو لێومان پێنەبەخشیون تا بەهۆیانەوە رێگای چاکەو خراپە دەرك بکەن؟﴾البلد/٨-١٠.

﴿**إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ**: لەراستی‌دا ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروستکردوە.﴾القمر/٤٩.

﴿**إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ**: بێگومان پەروەردگاری ئێوە ئەو خودایەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لە شەش رۆژدا دروستکردووە لە پاشان دەستی کردوە بەسەقامگیر کردنی لەسەر عەرشەکەی، ئەو پەروەردگارە رۆژی بەشەو داپۆشی، و رۆژیشی بەردەوام دەکەوێتە شوێنی شەو خۆرو مانگ و ئەستێرەکان هەموویان لەژێر فەرمانی ئەو زاتە دان، بەئاگابن خەلقکردن و فەرمان هەر بەدەست خودای پەروەردگاری گشت جیهانە.﴾الأعراف:٥٤

﴿**وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَاباً ثِقَالاً سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَنْزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَى لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ**: هەر بەزەیی خوا خۆیەتی کە مزگێنی هەڵگرتنی با بۆ هەڵگرتنی ئەو هەورە بارگاویانەی کە بەرزیان دەکەنەوە بەرەو وولاتێکی مردو دەیخەنەرێ بەئاوەکەی هەموو جۆرە بەروبوومێ بێدەروێنین، هەربەم چەشنەش مردو زیندو دەکەینەوە، بەڵکو بێتەوە یاد تان.﴾الأعراف:٥٧

﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ: ئاخۆ ئەوان لەدام و دەزگای پڕ شکۆی ئاسمانەکان و زەمین و هەرچی خودا دروستی کردون، ناڕوانن؟﴾الأعراف:١٨٥

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا: هەرئەو ئێوەی لەیەك گیان بەدی هێناوە، و چمکەکەشی هەر لەو دروستکرد تا ئارام بگرن و بحەسێنەوە لەگەڵیدا.﴾الأعراف: ١٨٩

﴿أَيُشْرِكُونَ مَا لَا يَخْلُقُ شَيْئًا وَهُمْ يُخْلَقُونَ: ئایا ئەو شتانە دەکەنە هاوەڵپەرستی خودا کەتوانای خەلقکردنیان نییەو خۆشیان دروستکراون.﴾الأعراف:١٩١

﴿وَآيَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ، وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ، لِيَأْكُلُوا مِن ثَمَرِهِ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ، سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ، وَآيَةٌ لَّهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ، وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ، لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ: زەوی مرد و نیشانە و پەندە بۆ ئەوان، زیندومان کردەوە و دانەوێڵەمان تیادا رواند کە لێی دەخۆن.. هەر لەئەزەلیشەوە چەندین باخی خورما و رەزی زۆرمان وەدیهێنا و چەند کانیاومان لێهەڵقوڵاند.. تاکو لەبەروبوومی و لەبەری رەنجی شانی خۆیان بخۆن، کە چی هێشتا سوپاسی خودا ناکەن، هەر خودا خۆی پاك و بێگەردە کە هەموو شتێکی بەجووت دروستکردووە(نێرو مێ) مرۆڤ چ گوڵ و گیا چ زەڕاتی موجەب و سالب و هەستەی ئەتۆم لە ئەلکترۆنەکان)، چ لەوانەی کەلەسەرزەوی رووان و چ لەخۆیان و چ لەوشتانەی ئێوە ئێستا نایزانن، شەویش بۆ ئەوان یەکێکە لە نیشانەکان کە رۆژی لێدادەڕنین لەناکاو تاریکیان بەسەردا دێ، و خۆریش بەرەو بنکەی خۆی دەڕوا ئەمەیە فەرمانی خودای دەستەڵاتدارو زانا، مانگیش ئێمە بۆمان دانا بەچەند قۆناغا تێپەڕێ تاوای لێدێ وەك پەلی چەماوەی و شکەڵی داری خورما دێتە بەرچاو، نەخۆر

توانای هێندەی هەیە بگاتە مانگ، ئەشەویش پێش رۆژ دەکەوێ، هەموویان لەخولگەی خۆیاندا مەلەدەکەن.﴾یس/٣٣-٤٠

﴿**أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَاماً فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ، وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ، وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلا يَشْكُرُونَ**: ئایا ئەوانە نەیاندی کە بەدەستی خۆمان ئەنعام (وشتر و مەڕو و بزن و گا) مان بۆ خولقاندن جا ئەوان خاوەنیانن و بۆشمان دەستەمۆکردن جا هەندێکیان بەکاردەهێنرێن بۆ سواری و لەگۆشتی هەندێکیشیان دەخۆن و بۆ ئەوان لەوانەدا سودو خواردنەوە هەیە، هێشتا سوپاسی خودا ناکەن؟!﴾یس/٧١-٧٣

﴿**أَوَلَمْ يَرَ الْإِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ، وَضَرَبَ لَنَا مَثَلاً وَنَسِيَ خَلْقَهُ قَالَ مَنْ يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ، قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنْشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ، الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَاراً فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ، أَوَلَيْسَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ بَلَى وَهُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ**: ئایا مرۆڤ نازانێ کە ئەومان لە تنۆکێك خولقاندوە کە ئێستا بۆتە دوژمنێکی ئاشکرا، ئەو نموونەیەکی بۆ ئێمە هێنایەوە و خەلقکردنی خۆی لەبیرکرد و دەڵێت: کێ ئەم ئێسکە پواوانە زیندوودەکاتەوە، بڵێ کەسێ ئەوانە زیندوودەکاتەوە کەلەسەرەتاوە بەدی هێناون و ئەو بۆ هەموو پێکهاتەیەك زانا و بەئاگایە، زاتێ کەلەداری تەڕو سەوز ئاگری بۆ سازدان، و بەدەستەچیلکەیە ئاگر دەکەنەوە ئایا... زاتێ کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە ناتوانێ وێنەیان بخولقێنێ: بەڵێ دەتوانێ و هەر ئەویشە بەدیهێنەری زاناو بەئاگا.﴾یس/٧٧-٨١

﴿**وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً**: بەدیهێنەری هەمووشتێکە و رادەی بۆ داناوە﴾الفرقان: ٢

﴿**أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِناً ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلاً، ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضاً يَسِيراً، وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاساً وَالنَّوْمَ سُبَاتاً وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُوراً، وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُوراً، لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَاماً وَأَنَاسِيَّ كَثِيراً، وَلَقَدْ**

صَـــرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورا: ئایا نابینیت چۆن پەروەردگارت سێبەری كشاندەوە و ئەگەر بیوویستایە رای دەگرت و خۆری كردە بەڵگە بۆ ئەو سێبەرە، لە ئاكامدا كەمەكە بەرەو خۆمانی دەبەینەوە، هەرخۆیەتی كەبۆ ئێوە شەوی كردۆتە پۆشاك و خەوی بۆ حەسانەوەتان و رۆژیشی بۆ هەڵساندنتان داناوە، هەرئەویشە بای بۆ ناردن تامزگێنی بەزەیی خوداتان بۆ بێنن و ئەو ساتە لەو بەرزاییەوە ئاوی پاك و خاوێنتان بۆ بێتە خوارەوە، تازەوی مردوی پێ زیندو بكەینەوە و زۆر لەو خەلقانەی كەخۆمان دروستمان كردوون تێر ئاو بكەین، و جۆرایەتیمان لەنێوانیادا دانا... تابیربكەنەوە بەڵام زۆربەی خەڵك ناسوپاس و بێ باوەڕە.﴾الفرقان/٤٥-٥٠

﴿وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخاً وَحِجْـــراً مَحْجُوراً، وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَراً فَجَعَلَهُ نَسَباً وَصِهْراً وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيـــرا: خودا كە دوو دەریای لەكەناری یەكم داناوە یەكێكیان زۆر شیرینە و ئەوی دیكەیان سوێر و تاڵ و داغ و تفتە وەلەنێوانیاندا لەمپەرێك و بەرگێكی ئەستوری داناوە، و هەرخۆیەتی لەتنۆكی ئاو مرۆڤی بەدیهێناوە و كردوونێتیماڵی تۆرمەو خزم پەیدا بوون، پەروەردگارت هەمیشە بەتوانایە.﴾الفرقان/٥٣-٥٤

﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجاً وَقَمَراً مُنِيراً، وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورا: پاكی و بێ گەردی بۆ ئەو كەسەیە چەند بورجێكی لە ئاسماندا دامەزراندوە و لەناویدا چرایەك و مانگێكی رۆشنی جێكردۆتەوە، هەرئەویشە نۆرەی بەشەو و رۆژ دەكا بۆ كەسی كە بیەوێت بیركاتەوە یان سوپاسی خوا بكات.﴾الفرقان: ٦١-٦٢

﴿يَـــا أَيُّهَـــا النَّاسُ اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ هَلْ مِنْ خَالِقٍ غَيْرُ اللَّهِ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّـــمَاءِ وَالْأَرْضِ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُون: ئەی خەڵكینە لەبیرتان بێ خودا چەندی چاكە لەسەر ئێوە هەیە ئایا جگە لەخودا كەسێ تر هەیە لە ئاسمان و زەویدا بژێویتان بدات هیچ كەس شایستەی پەرستن نییە جگە لەخودا، چۆن لەرێی راستە لادەدرێن.﴾فاطر: ٣

﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ: هەر خودایە کە با کان بەڕێ دەکا و ئەوانیش هەور دەبزوێنن و ئەو ساهەور دەتاوژێنین بەرەو سەرزەمینیکی مردو، و زەوی مردوی پێ زیندوودەکەینەوە، و زیندوو کردنەوەی پاشە ڕۆژیش هەر ئاوایە.﴾فاطر:٩

﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجاً وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنْثَى وَلا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ وَمَا يُعَمَّرُ مِنْ مُعَمَّرٍ وَلا يُنْقَصُ مِنْ عُمُرِهِ إِلَّا فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ، وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِنْ كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ، يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمّىً ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ وَالَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مَا يَمْلِكُونَ مِنْ قِطْمِيرٍ: خوای ئێوە لە خاك پاشان لە تنۆکێك پاشان ئێوەی کردۆتەوە هاوسەری یەکتر (ژن و مێرد) و هیچ ژنێك دووگیان نابێ و نازێ مەگەر بەزانستی ئەو و تەمەنی هیچ کەس زیاد نابێ‌و ناگاتە پیری و لەتەمەنی کەسێ کەم نابێ کەهەموو بەگشتی لەکتێبی زانستی خودادا نوسراوە و ئەم کارانە بۆ خودا ئاسانە، دوودەریا هەن ئەو دوو دەریایە یەکسان نین، ئەوەتا ئەمەیان شیرینەو تونێتی دەشکێنێ ئەویشیان سوێرو تاڵ و تفتە، لەهەردووکیان گۆشتی تەڕو تازە دەخۆن و لەهەردووکیان خشڵی جوان دەردێنن و لەبەری دەکەن و خۆتانی پێدەرازێننەوە دەبینی گەمیەکان دەریاکە دەقڵێشێنن تا... ئێوە لەسایەی ئەودا ڕۆزی (رزق) پەیدا بکەن و شوکرانەی لەسەر بکەن، شەو دەخاتە ناو ڕۆژەوە و ڕۆژیش دەخاتە ناو شەوەوە، و خۆرو مانگی رام کردوە، و هەریەکەیان بۆ کاتی دیاریکراو دێن و دەچن، ئەوەیە خودای پەروەردگاری ئێوە، خاوەنی توانا و دەستەڵاتە، و ئەوانەی ئێوە هاوارو پەنایان بۆ دەبەن دەسەتەڵاتی بەدیهێنانی دەنکێ خورمایان نی‌یە.﴾فاطر/١١-١٣

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ:

ئاخۆ نەتدی، خودا ئاوی لەو بەرزیی‌یەوە باراندوە، میوە جاتی هەمەرەنگەمان پێڕواند؟ لەكێوانیش ڕێگە و بانی سپی و سوری جۆراو جۆری بەرەنگ جیای بەدیهێناوە رەشی وەك قەلەرەشیشیان تیادا هەیە، لەمەردم و جانەوەرو ئاژەڵیدا هەروەهایە، رەنگیان لەیەكتر جودایە لەناو عەبدانی خودادا هەر فرە زانایان دەیناسن و لێی دەترسن، هەر خودا خۆی خاوەن دەستەلاَت و خەتا پۆشە.﴾فاطر/۲۷-۲۸

﴿إِنَّ اللَّـــهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولا وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً: خودا ئاسمانەكان و زەوی راگرتووە كە نەكەون، گەر كەوتن جگە لەو كەسی تر نی‌یە راگیریان بكات، هەر خودایە كاری بەشێنەیی‌یە خەتا پۆشە.﴾فاطر: ٤١

﴿أَوَلا يَذْكُــرُ الْإِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئاً: ئەو مرۆڤە بۆ بیرناكاتەوە كەسەرەتا ئێمە ئەو مان دروستكردووە و هیچیش نەبووە.﴾مریم:٦٧

﴿قَالَ فَمَنْ رَبُّكُمَا يَا مُوسَى، قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَى كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَى، قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَى، قَالَ عِلْمُهَا عِنْدَ رَبِّي فِي كِتَابٍ لا يَضِلُّ رَبِّي وَلا يَنْسَى، الَّذِي جَعَــلَ لَكُـــمُ الْأَرْضَ مَهْداً وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجــاً مِـــنْ نَـــبَاتٍ شَتَّى، كُلُوا وَارْعَوْا أَنْعَامَكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِأُولِي النُّهَى: فیرعەون گووتی: كێ خودایە ئەی مووسا؟ مووسا فەرمووی: پەروەردگاری ئێمە ئەوكەسەیە، كە پێكهاتەی بوونی بەهەمووشتێ داوە، گوتی بەسەر هاتی پێشوان چی‌یە؟ گووتی/ زانینی ئەوە لای پەروەردگار لە كیتابێكدا نووسراوە، پەروەردگارم هەرگیز بزری ناكاو لەیادی ناكا، ئەو خودایەی كە زەوی بۆ ئێوە كردە جێی حەسانەوە (لانك) و فرە ڕێگای لەودا سازدا، و لەئاسمانەوە بارانی باراند، كەلەسوێنگەی ئەوەوە هەموو جۆرە گژوگیایەكی هاوەڵمان رواند و سەوزكرد، هەم خۆتان لێی بخۆن و هەم ئاژەڵەكانیشتان لێی بلەوەڕێن بەراستی نیشانە گەلێكی زۆر ئاشكران بۆ خاوەن عەقلەكان.﴾طـه:٤٩-٥٤

﴿نَحْـــنُ خَلَقْـــنَاكُمْ فَلَـــوْلا تُصَدِّقُونَ، أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ، أَأَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الْخَالِقُونَ: ئێمە ئێوەمان لەنەبوون دروست كردوە، ئەدی بۆ ئیمان ناهێنن و باوەڕناكەن

بەخوا ئایا بیر لەو تۆماوەی خۆتان دەکەنەوە کە تۆوی دەکەن لەناو رەحم دا، ئایا ئێوە دروستی دەکەن یان ئێمە. ﴾الواقعة/٥٧-٥٩..

﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ، أَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنزِلُونَ، لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجاً فَلَوْلا تَشْكُرُونَ، أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ، أَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنشِئُونَ، نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعاً لِّلْمُقْوِينَ، فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ، فَلا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ، وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ: ئایا بیردەکەنەوە لەو ئاوەی کە دەیخۆنەوە، ئایا ئێوە لەهەور باران دەبارێنن یا ئێمە دەی بارێنین، گەربمان وویستایە سوێرو تاڵمان دەکرد، ئیتر ئێوە بۆ سوپاسی خودا ناکەن، ئایا بیرناکەنەوە لەو ئاگرەی کەهەڵی دەکەن، ئایە ئێوە سوتەمەنی ئەم ئاگرەتان دروستکردوە یا ئێمە پێکهێنەرین، ئێمە ئەومان کردە هۆی بیرەوەری و بەرێوەچوونی ژیانی کەسانی ناو هەردەو بیابان، کەوایە ناوی پەروەردگاری مەزنی خۆت هەر بەپاکی و بەرزی بهێنە، جاسوێند بێ بەجێی ئەستێرەکان و جێی دەرکەوتن و، ئاوابونیان ئەمە سوێندێکە زۆر گەورەیە گەربیزانن. ﴾الواقعة/٦٨-٧٦

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ، إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ: ئایا ناڕواننە زەوی کە چەند جوتەی رووەکی بەرهەمدارمان تیادا ڕواندوە بێگومان لەمەدا نیشانەیەکی زۆر ئاشکرا هەیە لەسەر بوونی خودا کە چی زۆربەیان بڕوا ناهێنن. ﴾الشعراء/٧-٨

﴿أَمَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَنبَتْنَا بِهِ حَدَائِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنبِتُوا شَجَرَهَا أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ، أَمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَاراً وَجَعَلَ خِلالَهَا أَنْهَاراً وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً أَإِلَهٌ مَّعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ: ئایا کێیە ئەو زاتەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە؟ لە ئاسمانەوە بارانی بۆ باراند جابەهۆی ئەو بارانەوە باغ و بێستانی بەدیمەنی جوانمان بۆ سەوزکردن، لە کاتێکدا کە ئێوە تواناى سەوزکردنی دارەکەتان نی‌یە، ئایا خواوەندێکی تر لەگەڵ خودا داهەیە؟ ئایا کێ زەوی کردۆتە جێی قەرارگرتن و لەزەوی دا چەم و دۆڵ و کێوی پتەوی تیادا سازداوە، و لەنێوان دوو دەریای (سوێرو شیرین)دا بەرزەکی داناوە،

ئایا خواوەندێکی تر لە گەڵ خودادا هەیە، نا.... نی‌یە بەڵکو زۆربەی ئەو کەسانە نەزان و نەفامن.﴾النمل/٦٠-٦١

﴿أَلَـمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِـنُون : ئایا نابینن کە شەومان داهێنا تا ئارامی تێدا بگرن و ڕۆژیشمان ڕووناك کرد، لەمەدا نیشانەو پەند بۆ هۆزی بڕوادار هەیە.﴾النمل:٨٦

﴿وَتَـرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُون : کێوەکان دەبینی وا دەزانی وەستاوە و بێ جوڵەیە بەڵام وەك هەور دەڕۆن کێوەکان، کاری خودایە کە بەکارامەیی هەموو شتێکی ئەنجام داوە، و ئاگاداری هەموو کردەوەیەکتانە.﴾النمل:٨٨

﴿وَرَبُّـكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ: پەروەردگارت هەرچی بوێت خەلقی دەکات و هەڵیدەبژێری.﴾القصص:٦٨

﴿قُـلْ أَرَأَيْـتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِـيكُمْ بِضِيَاءٍ أَفَلا تَسْمَعُونَ، قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ النَّهَارَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِـيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ أَفَلا تُبْصِرُونَ، وَمِنْ رَحْمَتِهِ جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُون : بڵێ/ ئایا دەزانن (کەبە من بڵێن) ئەگەر خوا شەوتان تا ڕۆژی قیامەت بۆ درێژ بکاتەوە چ خوایەك هەیە بێجگە لە خوا کە ڕۆشناییتان بۆ بهێنێ ئایە بۆ گوێ ناگرن و پێیان بڵێ ئایە دەزانن ئەگەر خوا ڕۆژتان تا ڕۆژی قیامەت بۆ درێژ بکاتەوە چ خوایەك بێجگە لە خوا هەیە شەوتان بۆ بهێنێ کە تیایدا بحەسێنەوە و ئارامی تیادا بگرن، ئایا نابینن، و لەڕۆژیشدا بۆ بژیویتان کاربکەن و ئارامی تیادا بگرن لە سایەی بەخشندەکانی خودادا تاکوو سوپاسی خوا بکەن.﴾القصص/٧١-٧٣

﴿وَجَعَلْـنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً : شەوو ڕۆژمان کردە دوو نیشانە، جا نیشانەی شەومان سڕی‌یەوە و، نیشانەی ڕۆژمان ڕووناك

کرد تا رۆزی و بژێویتان تیابە دەستبهێنن تا ژمێرەی ساڵ و ژمارە بزانن و هەمووشتێکمان بەووردی شیکردۆتەوە﴾الاسراء:١٢

﴿رَبُّكُمُ الَّذِي يُزْجِي لَكُمُ الْفُلْكَ فِي الْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ إِنَّهُ كَانَ بِكُمْ رَحِيما: پەروەردگارتان زاتێکە گەمی لەدەریا بۆ ئێوە دەخاتە گەڕو جووڵە تالێی سوودمەند بن بەراستی خوا سەبارەت بە ئێوە بە بەزەییە.﴾الاسراء:٦٦

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً : بەحەقیقەت ئێمە ڕێزمان لەنەوەکانی ئادەم گرت و ئەوانمان لە ووشکایی و دەریایدا هەڵگرت رسق و رۆزی پاکمان پێدان، و زۆر فەزڵمان داون بەسەر زۆربەی زیندەوەرەکانی تر.﴾الاسراء: ٧٠

﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلاً: سەبارەت بە رۆح لێت دەپرسن بڵی رۆح شتێکە تەنها پەروەردگارم بە ئاگایە لێی، و کەمێك زانست بەئێوە دراوە، بەتایبەتی سەبارەت بەرۆح.﴾الاسراء:٨٥

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ، إِنَّ فِي اخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَّقُونَ : هەرخۆیەتی خۆری کردە تیشك و روناکی و مانگی کردە تریفەدار و چەند قۆناغی بۆ دیاریکرد تا... ژمارەی ساڵەکان و ژمێرە فێربن خودا بەهەق ئەمانەی دروستکردووە... تا بەڵگە بۆ ئەو کەسانە شی بکاتەوە کەزانان، بەراستی لە گۆڕینی شەوو رۆژو ئەو شتانەی لە ئاسمانەکان و زەوی‌دا دروستی کردون بەڵگەو نیشانەی رۆشن هەیە بۆ کەسانێ کەلەخوا ترسبن.﴾یونس: ٥-٦

﴿قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ، فَذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمُ الْحَقُّ فَمَاذَا بَعْدَ الْحَقِّ إِلَّا الضَّلَالُ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ : بڵێ چ کەسێ لە ئاسمان و زەوی رسق و رۆزیتان ئەدات کێ خاوەن و خولقێنەری گوێ و چاوە، کێ مردو لەزیندوو دەردێنێ و زیندوو لەمردو پەیدا دەکا؟ و چ کەسێ تەگبیری

كاروباری دونیا ده‌كا، جا ده‌ڵێن: خودا، بڵێ: كه‌واته بۆچی ته‌قوا ناكه‌ن و ناترسن، ئائه‌مه‌یه خوای په‌روه‌ردگاری راستی ئێوه ئایا له‌دوای هه‌ق بێجگه له گومرایی هیچی تر هه‌یه، كه‌واته بۆ چی له‌په‌رستنی خودا روو وه‌رده‌گێڕن.﴾یونس: ٣١-٣٢

﴿قُلْ هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَبْدأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ قُلِ اللّهُ يَبْدأُ الْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ، قُلْ هَلْ مِنْ شُرَكَائِكُمْ مَنْ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ قُلِ اللّهُ يَهْدِي لِلْحَقِّ أَفَمَنْ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ أَحَقُّ أَنْ يُتَّبَعَ أَمَّنْ لا يَهِدِّي إِلَّا أَنْ يُهْدَى فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ، وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنّاً إِنَّ الظَّنَّ لا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئاً إِنَّ اللّهَ عَلِيمٌ بِمَا يَفْعَلُونَ: بڵێ كه‌سێك له‌هاوه‌ڵه‌كانتاندا بتوانێت شتێكی نوێ دروستبكات و له‌پاشدا سه‌رله‌نوێ دروستیان بكاته‌وه كه‌واته چۆن له‌خودا روو وه‌رده‌گێڕن. بڵێ/ كه‌سێك هه‌یه له‌هاوه‌ڵه‌كانتان رێنمایی خه‌ڵك به‌ره‌و هه‌ق بكات بڵی هه‌رخودایه رێنمایی هه‌ق ده‌كا، ئایا ئه‌و كه‌سه‌ی، رێنمایی هه‌ق ده‌كات، شایسته‌تر نی‌یه كه خه‌ڵك له‌دووی كه‌وێت له‌و كه‌سه‌ی كه‌خۆی رێگه‌ی هه‌ق پێ نازانێ كه‌ده‌بێت رێنمایی بكرێت، جا ئێوه چۆن بڕیار ده‌ده‌ن، زۆربه‌ی ئه‌وان كه‌وتنه دووی وێڵی گومان، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا كه وێڵی گومان هیچ سودێك نابه‌خشێت به‌هه‌ق، خودا به‌ئاگایه له‌كرده‌وه‌كانتان.﴾یونس: ٣٤-٣٦

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ: خوایه‌كی ئه‌و تۆیه كه شه‌وی كردۆته جێی حه‌سانه‌وه‌تان و رۆژیشی كردۆته هۆی بینینتان، ئه‌مانه هه‌مووی به‌گشتی نیشانه‌ن بۆ كه‌سانێ كه گوێبیستبن.﴾یونس: ٦٧

﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا تُغْنِي الْآيَاتُ وَالنُّذُرُ عَنْ قَوْمٍ لا يُؤْمِنُونَ: بڵێ: بڕوانن كه‌له ئاسمانه‌كان و زه‌ویدا چی هه‌یه، كه چی ئه‌م هه‌موو نیشانه‌و ترسێنه‌رانه كارناكه‌نه سه‌ر كه‌سانی بێ بڕوا.﴾یونس: ١٠١

﴿وَلَئِنْ أَذَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَاهَا مِنْهُ إِنَّهُ لَيَؤُوسٌ كَفُورٌ: گه‌ر خۆشی و شادی به‌مرۆڤ ببه‌خشین و له‌پاشدا لێی وه‌ربگرینه‌وه نائومێدو ناسپاس ده‌بێت.﴾هود: ٩

﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ: چه‌ند زۆره نیشانه‌كانی خودا له ئاسمانه‌كان و زه‌ویدا كه‌چی ئه‌وان به‌لایدا ده‌ڕۆن و رووی لێوه‌رده‌گێڕن.﴾یوسف: ١٠٥

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ، وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَايِشَ وَمَنْ لَسْتُمْ لَهُ بِرَازِقِينَ، وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ، وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ فَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَسْقَيْنَاكُمُوهُ وَمَا أَنْتُمْ لَهُ بِخَازِنِينَ، وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَنَحْنُ الْوَارِثُونَ: زەویمان کشان و پان و بەرینمان کرد و چەموو کێومان تیادا سەقامگیر کرد و هەموو جۆرە رووەکێکمان بەئەندازە تیادا رواند.. مایەی گوزەرانی ئێوە و بوونە وەرانی جیا لە ئێوە.. کە ئێوە بژێو یان نادەن هەر لەوێدا پێکمان هێناوە.. گەنجینەی هەموو شتێك هەرلای ئێمەیە و ئەوەشمان هەر بەئەندازەی دیاریکراو ناردۆتە خوار.. هەروەها بامان نارد تا... پیتێن بکا، و لە ئاسمانەوە ئاومان باران بەوەش تێر ئاومان کردن و ناشتوانن ئەو ئاوە لای خۆتان بهێڵنەوە.. هەر خۆمانین گیان دەبەخشین و ئەیستێنینەوە، هەر ئێمەین خاوەنداری هەموو شتێك.﴾الحجر/١٩-٢٣.

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ صَلْصَالٍ مِنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ: ئێمە مرۆڤمان دروستکرد لە قورە رەشەی بۆ گەنی رەق هەڵهاتوو.﴾الحجر:٢٦

﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ: ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لەنێوەندا هەیە بەراستی و بەهەق بەدیمان هێناوە.﴾٨٥

﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ، هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ طِينٍ ثُمَّ قَضَى أَجَلًا وَأَجَلٌ مُسَمًّى عِنْدَهُ ثُمَّ أَنْتُمْ تَمْتَرُونَ: هەموو سوپاس بۆ خودا کە ئاسمانەکان و زەوی دا هێناوە و تاریکی و روناکی لەگەڵ ئەوەیشا بێ باوەڕان و کافران بۆ پەروەردگاری خۆیان هاوسەنگ و هاوبەشی بۆ دائەنێن.. هەرخودایە کە ئێوەی لە قوڕ دروستکردوە لەدوایدا کاتی نادیاری لای ئێوە بۆ مردنتان داناوە و ئاکامی دیار لای خۆیەتی، کەچی هەر خاوەن گومانن.﴾الأنعام:١-٢

﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ: هەر زیندەوەرەێ بەسەر زەویدا بڕوات و هەر مەلێك بەباڵ بفڕێت هەموویان کۆمەڵانێکی وەك ئێوەن.﴾الأنعام/٣٨

﴿وَكَذَلِـكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ الْمُوقِنِينَ، فَلَمَّا جَـنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ رَأَى كَوْكَباً قَالَ هَذَا رَبِّي فَلَمَّا أَفَلَ قَالَ لا أُحِبُّ الْآفِلِينَ، فَلَمَّا رَأَى الشَّـمْسَ بَازِغَـةً قَـالَ هَـذَا رَبِّي هَذَا أَكْبَرُ فَلَمَّا أَفَلَتْ قَالَ يَا قَوْمِ إِنِّي بَرِيءٌ مِمَّا تُشْـرِكُونَ، إِنِّـي وَجَّهْـتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفاً وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ : ئاوەها بارەگای ئاسمانەکان و زەویمان بە ئیبراهیم نیشاندا تابزانێ و لەریزی باوەڕدارە راستەقینەکان بێت، کەشەو بەسەردا هات و تاریکی کرد ئەستێرەیەکی بەدیکرد ووتی/ ئەمە پەروەردگاری منە، هەرکە لەبەرچاوی ئاوا بوو ووتی/ هەرچیەك ئاوابێ خۆشم ناوێت، وەکاتێك کە مانگی بینی هەڵهات ووتی/ ئەمە پەروەردگاری منە بەلام کاتێك کە ئەویش بزرو ئاوا بوو ووتی/ گەر پەروەردگارم رێنمایی رێگای راستم نەکات دەبمە یەکێك لەتاقمی گومرایان کاتێ کە خۆری دی هەڵهات ووتی/ ئەمە خودای منە کەلەهەمووان گەورەترە و کاتێك ئاوا بوو ووتی/ من دوورم لەو شتانەی کە ئێوە بەهاوەڵی خودای دادەنێن من رووی خۆم کردە ئەو خودایەی کە ئاسمانەکان و زەوی بەدی هێناوە بەدڵێکی پاکەوە و دوورم لەوانەی هاوبەشی و هاوەڵ بۆ خودا دروستدەکەن و هەرگیز لەوانە نیم.﴾الأنعام/٧٥-٧٩.

﴿إِنَّ اللَّـهَ فَالِقُ الْحَبِّ وَالنَّوَى يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَمُخْرِجُ الْمَيِّتِ مِنَ الْحَيِّ ذَلِكُمُ اللَّهُ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ، فَالِقُ الْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَناً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَاناً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ النُّجُومَ لِتَهْتَدُوا بِهَا فِي ظُلُمَاتِ الْبَرِّ وَالْبَحْرِ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ، وَهُوَ الَّذِي أَنْشَأَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ فَمُسْتَقَرٌّ وَمُسْتَوْدَعٌ قَدْ فَصَّلْنَا الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَفْقَهُونَ، وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِراً نُخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً مُتَرَاكِباً وَمِنَ النَّخْلِ مِنْ طَلْعِهَا قِـنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهاً وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انْظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ : خودا لەتکەری دەنك و ناوکە، زیندو لەمردوو دەردەهێنێ وەدەرهێنەری مردوە لەزیندو، ئەوەیە خودای ئێوە، ئیتر چۆن لەرێی لائەدەن، دادڕی سپێدەی بەیان و شەوی کردۆتە مایەی ئارامگرتن وخۆر و مانگی کردۆتە هۆی ژمێرەو ئەندازەگرتن، ئەمە تەقدیرو ئەندازەگرتنی خودای تواناو زانایە..

هەرئەوە، کە ئەستێرەکانی ئاسمانی بۆ ئێوە داناوە تالـەتاریکی ووشکانی و زەریـایی ڕێنمایی بکرێن و نیشانەکانی خۆمانبە ئاشکرایی بۆ کەسانی زانا بەدەرخستووە.. هەرئەویشە هەموو ئێوەی بەگشتی لەتاکە کەسێك خستەوە لەدوای ئەوە لەشوێنێك سەقامگیری کردن و لەدوایدا لە جێگایەکی تر دایمەزراندن، نیشانەکانمان بەروونی شیکردۆتەوە بۆ ئەو کەسانەی تێدەگەن.. هەرخۆیەتی لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندن، هەموو روەکێکمان پێرواند تا لە سەوزە گیاکەوە دەنك و کەلوی چڕ مان دەرهێنا، کلۆکی دارخورما و هێشووی چرۆ شۆڕەوە بوو و باخاتێکی زۆر لە رەزو زەیتوون و بنەهەناری هاو وێنەو لەیەك جیامان بەرهەمهێنا، وەختێ میوەیان پێدەگا سەیری بکەن، کە تیایاندا گەلێك نیشانە هەیە بۆ کەسانێ کە بروایان بەخودا هەیە. (الأنعام:٩٥-٩٩)

**﴿ذَلِكُـــمُ اللَّـــهُ رَبُّكُمْ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَاعْبُدُوهُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِـــيلٌ، لا تُدْرِكُـــهُ الْأَبْصَـــارُ وَهُوَ يُدْرِكُ الْأَبْصَارَ وَهُوَ اللَّطِيفُ الْخَبِيرُ:** بەڵی خودا پەروەردگاری ئێوەیە، هیچ خودایەك جگە لەونی‌یە بەدیهێنەری هەمووشتێکە کەواتە شایستەی پەرستنە و هەرخۆشی پارێزەرو تەگبیرکەری هەموو شتێکە ئەو بەچاو نابینرێ و چاو دەرکی ناکا و هەر خوایشە هەموو دیدەو چاوێك دەرك دەکا، هەرخۆی خاوەن لوتف و بە ئاگایە.﴾الأنعام:١٠٢-١٠٣

**﴿وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ جَنَّات مَعْرُوشَات وَغَيْرَ مَعْرُوشَات وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفاً أُكُلُهُ وَالزَّيْـــتُونَ وَالـــرُّمَّانَ مُتَشَـــابِهاً وَغَيْرَ مُتَشَابِه كُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَـــادِهِ وَلا تُسْـــرِفُوا إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ، وَمِنَ الْأَنْعَامِ حَمُولَةً وَفَرْشاً كُلُوا مِمَّا رَزَقَكُـــمُ اللَّـــهُ وَلا تَتَّـــبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ :** هەر ئەویشە باخو بێستانی بەدیهێناوە، هێندێکیان داربەست و کەپریان پێویستە و هەندێکی تریان پێویستیان پێی نی‌یە داری خورما و مەزراو کێڵگەی بەدیهێنا، کەلەخواردندا لە یەك جیاوازن، زەیتون و دار هەناریشی بەدیهێناوە کە بەروالـەت وەك یەکن ولـەتام و رەنگا جیاوازن، هەر کە هاتنە بەرهەم لێیان بخۆن و لە رۆژانی میوەچنیندا بەشێ جیاکەنەوە بۆ هەژاران، کارێك مەکەن کەلەئەندازە بەدەربێ خودا ئەوانەی خۆشناوێ کەزیادەڕۆی دەکەن لەبەکارهێناندا.. لەماڵاتیش برێکی بۆ بارلێنان و هەندێکی بۆ کوڵك و خوری بەدیهێنان و لەوەی کە خودا کردویەتیە رسق و رۆزی بۆ تان بخۆن و رێو شوێنی شەیتان ئەگرنە بەر، چونکە شەیتان بەئاشکرا دوژمنتانە.﴾الأنعام:١٤١-١٤٢

﴿فاستفتهم أهم أشد خلقاً أم من خلقنا إنّا خلقناهم من طين لازب : جا لە بێ باوەڕان بپرسە ئایا بەدیهێنانی دووبارەی ئەوان سەختترە یان ئەوی ئێمە خولقاندوومانە و ئێمە ئەوانمان لەقوڕێکی پتری پێکەوە لکا و بەدیهێناوە.﴾الصافات: ١١

﴿خلق السماوات بغير عمد ترونها وألقى في الأرض رواسي أن تميد بكم وبث فيها من كل دابة وأنزلنا من السماء ماء فأنبتنا فيها من كل زوج كريم، هذا خلق الله فأروني ماذا خلق الذين من دونه بل الظالمون في ضلال مبين : دەبینین ئاسمانەکانی بێ کۆڵەکە ڕاگرتووە و لەسەرزەوی چەندەها کێوی دارشتووە، تائێوە نەلەرزێنێتەوە هەموو جۆرە بونەوەرێکی تیادا بلاو کردۆتەوە ئاویشمان لە ئاسمانەوە بۆ ڕژاندن و هەر لەزەویدا جوتەی هەموو جۆرە ڕوەکێکمان سەوز کردوە.. ئەمە کارەکانی خودایە دەسا ئێوە نیشانم بدەن کەسانی تر جگە لە خودا چیان دروستکردوە، ئەوانەی ناهەقیان گرتۆتە بەر، بەئاشکرا ڕێ لەخۆیان هەڵەدەکەن.﴾لقمان: ١٠-١١

﴿ألم تروا أن الله سخر لكم ما في السماوات وما في الأرض وأسبغ عليكم نعمه ظاهرة وباطنة ومن الناس من يجادل في الله بغير علم ولا هدى ولا كتاب منير : ئایا نەتان دیوە خودا هەموو شتێکی ئاسمانەکان و زەمینی بۆ ئێوە دەستەمۆ کردوە بەئاشکراو بەنهێنی بەخشندەیی بەسەرتانا ڕژاندووە؟ هەر لەوانیش کەسانێ وا هەن بەبێ شارەزاییاخود بەبێ کتێبێ کە بۆیان ڕۆشن بکات موناقەشەگیری بوونی خودا دەکەن.﴾لقمان: ٢٠

﴿ولو أنما في الأرض من شجرة أقلام والبحر يمده من بعده سبعة أبحر ما نفدت كلمات الله إن الله عزيز حكيم: هەرچی دارو درەخت هەیە لەم زەوییەدا ببنە پێنوس و دەریاکانیش ببنە مەرەکەب بۆی، لەگەڵ حەوت دەریای تریش بخرێنە پاڵیان، هێشتا وتەکانی خودا نایانە کۆتایی، و هەر خۆی خاوەن دەسەلات و کاربەجێیە.﴾لقمان:٢٧

﴿ألم تر أن الله يولج الليل في النهار ويولج النهار في الليل وسخر الشمس والقمر كل يجري إلى أجل مسمى وأن الله بما تعملون خبير، ذلك بأن الله هو الحق وأن ما يدعون من دونه الباطل وأن الله هو العلي الكبير، ألم تر أن الفلك تجري في البحر بنعمت الله ليريكم من آياته إن في ذلك لآيات لكل صبار شكور:

ئایا نەت بینی خودا شەو دەخاتە ناو ڕۆژ و ڕۆژیش دەخاتە ناو شەو، خۆرو مانگیشی بۆ ئێوە رام کردوە و هەریەکەیان تا ماوەی دیاریکراو لەمەدارەکانی خۆیاندا دێن و دەچن خودا لەکارەکانتان بەئاگایە.. دەبێ ئەوە بزانن کە خودا هەقە و هەرشتێکی تر جگە لەو بەناو هاواری بۆ بەرن پووچەڵە، پایە بەرزو هەرە مەزن هەر خودایە ئایا نەتدیوە کە کەشتی و گەمیەکان لەزەریاکاندا بە بەخشندەیی خودا دەڕۆن... تا نیشانەکانی توانای خۆیتان پیشان بدات، ئەم نیشانانە بۆ هەموو ئارام گران و سوپاسکەرانە.﴾لقمان/٢٩-٣١.

﴿وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ: ئەو کەسانەی کەزانان باش دەزانن، ئەوەی کەبۆتۆ نێرراوە لەلایەن خوداوە هەقە و بەرەو ڕێگای راست و پەسەندت دەبا.﴾سبأ:٦

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى أَلَا هُوَ الْعَزِيزُ الْغَفَّارُ، خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنْزَلَ لَكُمْ مِنَ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلاثٍ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ فَأَنَّى تُصْرَفُونَ: خودا ئاسمانەکان و زەوی بەهەق خولقاندوە، شەوو ڕۆژ دە پێچێ، و ڕۆژیش لەشەو پێچێ، و خۆرو مانگی راهێناوە هەریەکەیان لەمەداری خۆیان تاکاتی دیاریکراو دێن و دەچن، چاك بزانن کە خاوەنی دەستەڵات و لێبوردوو هەرخۆیەتی.. خودا لەتاکە کەسێ ئێوەی دروستکردوە، پاشان جوتەکەشی هەر لەماکی ئەوەوە دروستبووە و بۆ ئێوە هەشت جووتی لەمەڕو مالات (ووشترو مەڕو بزن و گا لەنێرومێ) بەدیهێناوە ئێوە لە منداڵدانی دایکتاندا بەسێ قۆناغ تاریکیدا دەڕۆن و هەرلەوێدا ئەم دیوو ئەو دیوتان پێدەکا فەرمان تەنها لەدەستی خودای پەروەردگاردایە، جگە لەو خودای تر نییە ئیتر بۆچی وازی لێ دەهێنن؟﴾الزمر:٥-٦

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعاً مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرّاً ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَاماً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ: ئایا نەتدی خودا لەو بەرزاییەوە ئاو دەنێری لەزەویدا لە سەرچاوەکانەوە ڕەوانەی دەکا وەکشتوکاڵی هەمەرەنگی پێ دەڕوێنێ، پاش ماوەیەك زەردو ووشك

هه‌ڵده‌گه‌ڕێ ئه‌وسا ده‌یكاته‌وه پووش و په‌ڵاش، ئه‌وانه‌ی ژیرو خاوه‌ن عه‌قڵن له‌مه‌په‌ند وه‌رده‌گرن.﴾الزمر: ٢١

﴿اللَّـــهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ، لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالَّذِيـــنَ كَفَـــرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ، قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ: خودا به‌دیهێنه‌ری هه‌موو شتێكه له‌هه‌موو شتێك ئاگاداره، كلیلی ئاسمانه‌كان و زه‌وی به‌گشتی به‌ده‌ست ئه‌وه، ئه‌وانه‌ی كه بێ باوه‌ڕن به‌نیشانه‌كانی خودا، هه‌رخۆیان زه‌ره‌مه‌ند ده‌بن، بڵێ: فه‌رمانی په‌رستنی جگه له (خودا) م پێده‌كه‌ن ئه‌ی نه‌زانایان.﴾الزمر: ٦٣-٦٤.

﴿هُـــوَ الَّـــذِي يُرِيكُمْ آيَاتِهِ وَيُنَزِّلُ لَكُمْ مِنَ السَّمَاءِ رِزْقاً وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَنْ يُنِيبُ: خودایه‌كی ئه‌و تۆیه نیشانه‌كانی خۆیتان نیشان ده‌دا، له ئاسمانه‌وه رسق و رۆزیتان بۆ ده‌بارێنێ، و ته‌نها ئه‌وانه‌ی رووده‌كه‌نه خودا دێته یادیان.﴾غافر: ١٣

﴿اللَّـــهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يَشْكُرُونَ، ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَأَنَّى تُؤْفَكُونَ، كَذَلِكَ يُؤْفَكُ الَّذِينَ كَانُوا بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ، اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْـــأَرْضَ قَرَاراً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّـــهُ رَبُّكُـــمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ: خودا شه‌وگاری به‌دیهێناوه بۆ حه‌سانه‌وه‌تان و رۆژگاریشی كردۆته هۆی بینیتان، هه‌ر خودایه خاوه‌ن به‌خشنده و چاكه‌ی زۆر به‌سه‌ر خه‌ڵكه‌وه، به‌ڵام زۆربه‌ی خه‌ڵك ناسپاس، هه‌ر ئه‌و خودایه په‌روه‌ردگارتان كه دروستكه‌ری هه‌موو شتێكه، و جگه له‌و هیچ خودایه‌كی ترنی‌یه ئیتر بۆچی تاوانی بێ باوه‌ڕی ده‌خه‌نه پاڵ خۆتان، هه‌روه‌ها ئه‌وانه‌ش كه‌به‌نیشانه‌كانی خودا بێ باوه‌ڕن تاوانی بێ باوه‌ڕیان ده‌خرێته پاڵ، ئه‌و خودایه‌ی كه زه‌وی كردۆته جێنیشانتان و ئاسمانیشی له‌سه‌ر به‌رزكردونه‌ته‌وه، و وێنه‌ی كێشاونبه‌باشترین وێنه، له‌شتی پاك و پوخت رسق و رۆزی بۆ ره‌خساندوون، ئه‌وه‌یه خودای ئێوه به‌رزی و پیرۆزی بۆ ئه‌و خودایه‌ی كه په‌روه‌ردگاری هه‌موو بوونه‌وه‌رانه.﴾غافر/ ٦١-٦٤.

﴿هُـوَ الَّـذي خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَاب ثُمَّ مِنْ نُطْفَة ثُمَّ مِنْ عَلَقَة ثُمَّ يُخرِجُكُمْ طِفلاً ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخاً وَمِنكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى مِنْ قَبْلُ وَلِتَبْلُغُوا أَجَلاً مُسَمَّىً وَلَعَلَّكُمْ تَعقِلُونَ، هُوَ الَّذي يُحْيِي وَيُمِيتُ فَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ: هەروەها ئێوەی لە خاك دروستكردوە و پاشان تنۆكێك و پاشان پارچە گۆشتێكی بچووكی هەڵواسراو پاشان دەتانهاوێتە دەرەوە، بە ساوایی، پاشان بەخۆدا دێن تا دەگەنە تواناو هێزتان، پاشان بە پیری دەگەن، و هەندێكیشتان بەر لە پیری دەمرن، هەتا دەگەنە ئەو كاتەی بۆتان دیاریكراوە، تاوەكو عەقڵتان بەگەڕ بخەن، هەرخۆیەتی ژین دەداو دەش مرێنێ، هەر كارێكی بوێت هەرپێی بێژی: ببە ، دەبێ﴾غافر:٦٧-٦٨

﴿اللَّـهُ الَّـذي جَعَـلَ لَكُمُ الْأَنعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ، وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنْكِرُونَ: خودا ئەنعامی (ووشتر، مەڕ، بزن، گا) ی بۆ ئێوە خەلقكرد تاسواری هەندێكیان ببن، و لەهەندێكیان بخۆن، گەلێك سودی تریشیان بۆ ئێوە هەیە، ئەو نیازەی لەدڵتاندا هەیە بەهۆی ئەوانەوە پێكیان دەهێنن، و لەسەر كەشتیش هەڵدەگیرێن.. خودا زۆر لەنیشانەكانی خۆی دەخاتە بەرچاوی ئێوە، جا ئێوە حاشا لەكام نیشانەی خودا دەكەن؟﴾غافر:٧٩-٨١

﴿وَمِـنْ آيَاتِـهِ اللَّـيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلا لِلْقَمَرِ وَاسْـجُدُوا لِلَّـهِ الَّـذِي خَلَقَهُـنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ: شەو ڕۆژ و خۆرو مانگیش لەنیشانەكانی ئەون نەسوژدە بۆ خۆر بەرن نەبۆ مانگ، و سوژدە بۆ خودایەك بەرن كە ئەوانی بەدیهێناوە گەر ئەتانەوێ بەراستی ئەو بپەرستن.﴾فصلت:٣٧

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ : بەزوویی نیشانەكانی خۆمان لە ئاسۆی دنیاو لەنێو دەرون و گیانیاندا بەوان نیشان ئەدەین تا بۆیان دەركەوێ كەهەر ئەو قورئانە هەقە، ئایا ئەوە بەس نی‌یە كە پەروەردگارت ئاگاداری هەموو شتێكە.﴾فصلت:٥٣

﴿فَاطِـرُ السَّـمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَمِنَ الْأَنعَامِ أَزْوَاجاً يَذْرَأُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ : بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی‌یە

هەر لەخۆتان جوتەی لێپێکهێناون، و لەمالاتیش جوتەی دروست کردووە تا بەم شێوەیە زۆرتر پەرەتان پێبدات هیچ هاو وێنەیەکی نییە، و هەر خۆی بیسەرو بینایە.﴾الشوری/۱۱

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِنْ دَابَّةٍ: هەرلەنیشانەکانی ئەون ئاسمانەکان و زەوی و ئەو هەموو بونەوەرانەی لەنێوانیاندا بلاوی کردونەتەوە.﴾الشوری:۲۹

﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ، الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْداً وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ، وَالَّذِي نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَنْشَرْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كَذَلِكَ تُخْرَجُونَ، وَالَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْفُلْكِ وَالْأَنْعَامِ مَا تَرْكَبُونَ: گەرتۆ لەوان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردوە؟ پێت دەلێن- بێگومان خودای خاوەن دەسەلاتی زانا دروستی کردون، ئەو کەسێکە ئەم زەمینەی بۆ ئێوە کردە لانك و رێگەی بۆ تیادا کێشاون تا شارەزای بن، هەر ئەویشە بەئەندازە ئاوی بارانی ناردە خووار و سەرزەمینی مردومان پێ بوژاندەوە، ئێوەش ئاوەها لەگۆڕ دەخرێنە دەرێ هەرئەویشە ئەم هەموو جوتەی دروستکرد، و کەشتی و ئاژەلی وەهاشی بۆ ئێوە بەدیهێناوە، کە سواریان دەبن.﴾الزخرف:۹-۱۲

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ، إِنْ يَشَأْ يُسْكِنِ الرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَى ظَهْرِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ: هەر لە نیشانەکانی ئەون ئەو کەشتیانەی کە چیا ئاسا لەناو دەریادا دێن و دەچن گەر حەزکا ویستی لەسەر بێت با... رادەگرێ و لەسەردەریا بەقەتیسی دەمێننەوە، کەلەمەدا نیشانەیە بۆ ئارامگران و سوپاسکەران.﴾الشوری:۳۲-۳۳

﴿إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِلْمُؤْمِنِينَ، وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِنْ دَابَّةٍ آيَاتٌ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ، وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ رِزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ، تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ اللَّهِ وَآيَاتِهِ يُؤْمِنُونَ: لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانەکانی پەندوەرگرتن بۆ برواداران هەیە. لەخولقاندنی خۆتان و بلاوبونەوەی جولندەو خشۆك بەلگەن بۆ ئەوانەی لەبروادا بێگومانن، لەهاتو چۆی شەوو رۆژو لەو رۆزییەی کە

خودا لەحەواوە بەرێی دەکا و زەوی مردوی بە هۆیەوە زیندوو کردەوە. لەهەڵکردنی بایەکان نیشانە هەن بۆ ئەو کەسانەی تێدەگەن.. ئەمانە نیشانەی خودان کە بۆتی دەخوێنینەوە و هەموویان راستن ئیتر لە پاش باسی خوداو باسی نیشانەکانی ئەو: بەکام قسە بروا دەکەن. ﴾الجاثـیة:٣-٦

﴿**اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ، وَسَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ** : خودا دەریای بۆ ئێوە رامکرد، تاکو کەشتی تیادا هاتوو چۆ بکا بەفەرمانی ئەو، و لە بەخشندەیی خودا هۆی ژیان بخوازن بۆ ئەوەی شوکرانە بژێرن، خودا ئەوەی لەئاسمانەکان و زەویدایە بۆ ئێوەی رامکرد، لەمانەدا نیشانەی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی بیردەکەنەوە. ﴾الجاثـیة:١٢-١٣

﴿**مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنْذِرُوا مُعْرِضُونَ، قُلْ أَرَأَيْتُمْ مَا تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِنْ قَبْلِ هَذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِنْ عِلْمٍ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ** : ئەم ئاسمانەو زەوی و هەرچی لەنێوانیاندا هەیە بە هەق بەدیمان هێنان و ماوەیان دیاریکراوە، و ئەو کەسانەش خودایان نەناسیوە لەوەی لێی ترسێندراون روو وەردەگێرن، بڵێ ئایا دیوتانە ئەوانەی کە هانایان بۆ دەبەن بێجگە لەخودا بەمنی نیشان بدەن چیان لەزەویدا دروستکردوە وەیان لەبەدیهێنانی ئاسمانەکاندا چ بەشداریی یەکیان هەبووە، کتێبێك کەبەر لە قورئان هاتووە یا شوێنەواری زانستی لەرابوردوان بۆمن بێنن، گەر راستەکەن. ﴾الاحقاف:٣-٤

﴿**وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ، وَفِي أَنْفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ** : بۆ باوەڕداران بێگومان لەزەویدا نیشانەو پەندی زۆر هەیە هەروەها لەناو خۆشتاندا ئاخۆ لەخۆتان ناڕوانن. ﴾الذریات:٢٠-٢١

﴿**وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ، وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ، وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ** : ئاسمانانمان بەهێزەوە بنیاد ناوە ئێمە پەرەشی

پێدەدەین، زەویمان راخست و باشترین راخەرین، و لەهەموو شتێ جووتمان خولقاند تا.... بیربکەنەوە و پەد وەربگرن. ﴾الذريات:٤٧-٤٩

﴿أَفَلا يَنظُرُونَ إِلَى الْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ، وَإِلَى السَّمَاءِ كَيْفَ رُفِعَتْ، وَإِلَى الْجِبَالِ كَيْفَ نُصِبَتْ، وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ، فَذَكِّرْ إِنَّمَا أَنتَ مُذَكِّرٌ : ئایا لەووشتر ناڕوانن کە چۆن خولقێنراوە، و ناڕواننە ئاسمان چۆن هەڵدراوە و ناڕواننە چیاکان چۆن دامەزراوە، و ناڕواننە زەوی چۆن روتەخت کراوە ئیتر پەند دابدە کە تۆ تەنها پەندەری تۆ فەرمانڕەوای سەر ئەوان نیت. ﴾الغاشية:١٧-٢١

﴿قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً : هاوڕێ کەی پێی گووت لە کاتێکدا گفتوگۆی لەگەڵ دەکرد، ئایا بێ باوەڕی بەو کەسەی کە تۆی لە خاك پاشان لەتنۆکێك دروستکرد پاشان کردیتیە پیاو. ﴾الكهف:٣٧

﴿قُل لَّوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِّكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً : بڵێ گەردەریاکان ببنە مەرەکەب بۆ نووسینی وتەکانی پەوەردگارم دەریاکان تەواو دەبن بەر لەتەواو بوونی وتەکانی پەروەردگارم ئەگەر هاوشێوەی ئەو دەرییانەیش بهێنیتە پالیان. ﴾الكهف:١٠٩

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ تَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ، خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ، وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ الْأَنفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ، وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ : ئاسمانەکان و زەوی بەهەق بەدیهێناوە خودا لەوە بەرزترە کە ئەوان هاوەڵپەرستی بۆ دابنێن.. مرۆڤی لە تنۆکێکی بێ بایەخ بەدیهێنا جالە ناکاو بووە بەدوژمنێکی ئاشکرا.. مەڕو بزن و گا و ووشتری دروستکرد و بۆ ئێوە لەواندا پۆشاك و سودی تریان هەیە، و لە گۆشتی ئەوان دەخۆن.. لاتان جوان و رازاوەن، کاتێك دەیانبەن بۆ لەوەڕ و کاتێکیش دەیانهێننەوە، باری گرانتان رادەگوێزن بۆ جێگەی وا کە ئێوە زۆر بەزەحمەت دەیگەنێ و پەوەردگارتان زۆر

بە سوز و بەبەرەیییە.. ئەسپ و هێسترو کەریشی هەم بۆ سواری و هەم بۆ جوانی دروستکرد و شتی و هاش دروستدەکات کە ئێوە نایزانی.﴾النحل:٣-٨

﴿هُــوَ الَّذي أَنْزَلَ منَ السَّمَاء مَاءً لَكُمْ منْهُ شَرَابٌ وَمنْهُ شَجَرٌ فيه تُسيمُونَ، يُنْبتُ لَكُمْ به الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخيلَ وَالْأَعْنَابَ وَمنْ كُلِّ الثَّمَرَات إنَّ في ذَلكَ لَآيَةً لقَوْمٍ يَتفَكَّرُونَ، وَ سَخَّرَ لَكُمُ اللَيْلَ وَ النهارَ وَ الشَّمْسَ وَ القَمَرَ وَ النُّجومَ مُسَخَّراتٌ بأَمْره إنَّ في ذلكَ لأيات لقَوْمٍ يَعْقلُون، وَمَا ذَرَأَ لَكُمْ في الْأَرْض مُخْتَلفاً أَلْوَانُهُ إنَّ في ذَلكَ لَآيَــةً لقَوْمٍ يَذَّكَّرُونَ، وَهُوَ الَّذي سَخَّرَ الْبَحْرَ لتَأْكُلُوا منْهُ لَحماً طَريّاً وَتَسْتَخْرجُوا منْهُ حلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ مَوَاخرَ فيه وَلتَبْتَغُوا منْ فَضْله وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ، وَأَلْقَى فــي الْأَرْض رَوَاسيَ أَنْ تَميدَ بكُمْ وَأَنْهَاراً وَسُبُلاً لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ، وَعَلامَات وَبالنَّجْم هُــمْ يَهْــتَدُونَ، أَفَمَــنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لا يَخْلُقُ أَفَلا تَذَكَّرُونَ، وَإنْ تَعُدُّوا نعْمَةَ اللَّه لا تُحْصُوهَا إنَّ اللَّهَ لَغَفُورٌ رَحيمٌ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُسرُّونَ وَمَا تُعْلنُونَ، وَالَّذينَ يَدْعُونَ منْ دُون اللَّه لا يَخْلُقُونَ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ: ئەو کەسێکە لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندن کە خواردنەوەتان لەو ئاوەیە و هۆی سەوز بوونی گژوگیایە کە ئاژەڵی خۆتانی لێدەوەڕێنن.. هەر بەو ئاوە چاندەمەنی و زەیتون و رەزودار خورمای پێدەروێنێ، ئەمە بەڵگەی زۆر بۆ کەسانێ کەفکر بکەنەوە.. شەوو رۆژێ بۆ رامکردن، مانگ و خۆر و گشت هەسارەکان ملکەچی فەرمانی ئەون، لەمەشدا زۆر نیشانە هەن بۆ کەسانێ کە تێدەگەن.. لەم زەمینەش گەلێ شتی رەنگاو رەنگی بۆ ئێوە بەدیهێناوە لەمەدا نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی کە بیردەکەنەوە.. هەر ئەویشە زەریای بۆ رەخساندون تا گۆشتی تەرو تازەی لێبخۆن خشڵیش لێدێننەدەرێ و خۆتانی پێدەرازێننەوە و دەبینی کەشتیش سنگی دەریا لەت دەکات تالە بەخشندەیی ئەو بێبەش نەبن، بۆ ئەوەی شوکرانە بژێربن.. لەزەویدا کێوە بەرزەکانی کردە لەنگەر تا ئێوە نەهاژێنێ و رووبار و چەمی بەدیهێناو رێگا و بانیشی پیشاندان، تا ئێوە رێ وون نەکەن.. نیشانەی زۆر هەن و بە ئەستێرەش رێ دەدۆزنەوە.. ئایا کەسێك کەبەدیهێنەر بێت وەك ئەوە وایە کە بەدیهێنەر نەبێ، گەر هەرچی بەخشندەکانی خودایە بژمێری لەژماردن دوای نایە بەراستی خودا لە گوناح دەبورێ و بە بەزەییە.. خودا ئاگادارە لەوانەی کە دەیشارنەوە، و بەوانەی کە

ئاشکرای دەکەن، ئەو کەسانەی جگە لەخودا هانایان بۆ دەبەن، ناتوانن هیچ دروستبکەن و خۆیان دروستکراون. ﴾النحل: ١٠-٢٠

﴿إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ : وتەمان بەهەر شتێ کە بمانەوێ پەیدا ببێ، هەرئەوەندە پێی بڵێین ببە، دەبێ. ﴾النحل: ٤٠

﴿وَاللَّهُ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ، وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِلشَّارِبِينَ، وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ، وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ، ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ : خودا ئاوی لەو حەوایەوە دابەزاند، زەوی مردوی پێ ژیاندەوە کەلەمەدا بۆ ئەوانەی گوێبیست دەبن، نیشانەیە.. لەمالاتیشدا بۆ ئێوە پەندێکی گرنگ هەیە، لەناوسکیان لەنێوان ریخ و خوێندا شیرێکی پاك و رەوان دەرخوارتان ئەدەین بۆ ئەوانەی کە دەیخۆنەوە، لەبەرهەمی دارخورماو رەزەکانیش سەرخۆشکەرو بژێوی باش بەدەستدێنن لەمەشدا نیشانە هەیە بۆ ئەو کەسانەی تێدەگەن، خودا نیگای بۆ مێشە هەنگوین نارد کەلە نێوان دارانداو، شێونی ژینی خۆت هەڵبەستە، پاشان لەگشت بەرو بومێك بژێوت بمژە، ئیتر بەملکەچی، رێگەی راهێنەری خۆت بگرە بەر لەناو هەناوی هەنگدا خواردنەوەی هەمەرەنگ دێتە دەرێ و شفای بۆ خەڵك تێدایە، و پەندە بۆ کەسانێ کەبیردەکەنەوە. ﴾النحل: ٦٥-٦٩

﴿وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ، أَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا اللَّهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ، وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الْأَنْعَامِ بُيُوتًا تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثًا وَمَتَاعًا إِلَى حِينٍ، وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمْ بَأْسَكُمْ كَذَلِكَ يُتِمُّ

نِعْمَــتَهُ عَلَــيْكُمْ لَعَلَّكُــمْ تُسْلِمُونَ : خودا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێنا لەکاتێکدا هیچتان نەدەزانی بەڵام خودا گوێ و چاوو ئەقڵی بەئێوەدا، تاکو شوکرانەی بکەن.. ئاخۆ باڵندە نابینن کەلەئاسماندا رامکراون بێجگە لە خودا کەس ناتوانێ ئەوان لەهەوا رابگرێ لەمەدا گەلێك نیشانە هەیە بۆ کەسانێ باوەڕ دارن، و خودا لەماڵەکانتاندا جێی دانیشتن و حەسانەوەی بۆ داناون هەروەها لە پێستی ئاژەڵیش چادرو خانو گەلێکی بۆداناون کەلەبارکردن و لەدانیشتندا بە ئاسانی دەتوانن جێبەجێیان بکەن، و لە خوری و کوڵکو مووەکانیان پێویستی و کاڵای بۆ داناون و خودا لەوەی بەدی هێناوە سێبەری بۆ ئێوە سازداوە و لە نێو کێوەکاندا پەناگای دروستکردوە و جلکی بۆ داناون تالە گەرماو سەرما بتان پارێزێ و زریەی بۆ سازداون تا لە جەنگدا بتان پارێزێ. ﴾النحل:٧٨-٨١

﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَاراً، أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً، وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِــيهِنَّ نُــوراً وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً، وَاللَّهُ أَنْبَتَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ نَبَاتاً، ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْــرِجُكُمْ إِخْــرَاجاً، وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ بِسَاطاً، لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلاً فِجَاجاً : ئێوەی بەقۆناغی جیاجیا بەدیهێناوە، ئایا نابینن کە چۆن خودا حەوت ئاسمانی نهۆم لەسەر نهۆم داناوە، و مانگی لە نێوانیاندا کردۆتە هۆی رووناکی و خۆریشی کردۆتە چرا، خوا ئێوەی لەزەویدا وەك رووەك رواندوە، پاشان ئەتان گێرێتەوە بۆ ناو زەوی و جارێکی تر دەتانهێنێتەوە دەرێ، و خودا زەوی بۆ کردونەتە راخەر تارێگەی پان و بەرین و شیوو دۆڵی ئەودا برۆن. ﴾نوح:١٤-٢٠

﴿أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ : ئایا بەخوایەك کەبەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە گومانتان هەیە. ﴾ابراهیم:١٠

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ، تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ، وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٍ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ اجْتُثَّتْ مِنْ فَوْقِ الْأَرْضِ مَا لَهَا مِنْ قَرَارٍ : ئایا نەتدی خودا چۆن وتەی پاکی بەدرەختی پاك نموونە هێناوەتەوە کە رەگەکانی ئەو درەختە لەزەویدا پتەو راگیراوە، و لق و پۆپەکانی لە ئاسماندایە، هەموو کاتێك بەفەرمانی پەروەردگاری بەرو میوەکانی خۆی ئەدا.. خودا بۆ خەڵك نموونە دەهێنێتەوە، تاکو

بیربكه‌نه‌وه و په‌ند وه‌ربگرن.. وێنه‌ی وته‌ی نابه‌جێ وه‌ك دره‌ختێكی ناپاك وایه كه‌له‌زه‌وی هه‌ڵكه‌ندرابێ، ئارام و قه‌راری نه‌مابێ.﴾ابراهیم:٢٦

﴿اللَّــهُ الَّــذي خَلَــقَ السَّمَاوَات وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ منَ السَّمَاء مَاءً فَأَخْرَجَ به منَ الـثَّمَرَات رزْقاً لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بأَمْرِه وَسَخَّرَ لَكُمُ الْأَنْهَارَ، وَسَــخَّرَ لَكُــمُ الشَّــمْسَ وَ الْقَمَرَ دائبَيْنِ وَ سَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَ النَّهار : خودا زاتێكه ئاسمانه‌كان و زه‌وی سازداوه و له‌ئاسمانه‌وه ئاوی باراندوه جابه‌و بارانه میوه‌ی جیاجیای ده‌رهێناوه كردۆتیه رسق و رۆزی ئێوه و كه‌شتی رام و موسه‌خه‌ر كردوه و خۆر و مانگی بۆ ئێوه رام كردوه به به‌رده‌وامی له‌جمو جوڵدان و شه‌و رۆژیشی بۆ ئێوه موسه‌خه‌ر كردوه.﴾ابراهیم:٣١-٣٢

﴿أَوَلَــمْ يَرَ الَّذينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَات وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا منَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلا يُؤْمنُونَ، وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسيَ أَنْ تَميدَ بهِمْ وَجَعَلْنَا فيهَا فجَاجاً سُبُلاً لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ، وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفاً مَحْفُوظاً وَهُمْ عَنْ آيَاتهَا مُعْرِضُونَ، وَهُــوَ الَّــذي خَلَقَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ : ئاخۆ بێ بڕوایان ئه‌مه نازانن، كه ئاسمانه‌كان و زه‌وی یه‌ك پارچه بوون ئێمه لێكمان هه‌ڵوه‌شان و هه‌موو بوونه‌وه‌رێكی له ئاو به‌دیهێناوه ئاخۆ هێشتا باوه‌ڕ ناهێنن؟ له‌سه‌ر زه‌مینیش كه‌ژو كێومان بۆ به‌دیهێناون نه‌وه‌ك بله‌رزێ و چه‌ند رێگا و بانمان تیادا پێكهێناوه تاوه‌كو شاره‌زا بن.. ئاسمانیشمان كرده مێچێكی پارێزراو، كه‌چی ئه‌وان له‌و هه‌موو نیشانانه گوێنه‌ده‌رن، هه‌رخوا خۆشی شه‌وو رۆژو خۆرو مانگی به‌دیهێناوه كه‌له‌مه‌داره‌كانیاندا به به‌رده‌وامی دێن و ده‌چن.﴾الانبیاء:٣٠-٣٣

﴿وَلَقَــدْ خَلَقْــنَا الْإنْسَانَ منْ سُلالَة منْ طين، ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِين، ثُمَّ خَلَقْــنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عظَاماً فَكَسَوْنَا الْعظَامَ لَحْماً ثُــمَّ أَنْشَــأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالقينَ، ثُمَّ إنَّكُمْ بَعْدَ ذَلكَ لَمَيِّتُونَ، ثُمَّ إنَّكُمْ يَوْمَ الْقيَامَة تُبْعَثُونَ، وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَائقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَافلينَ، وَأَنْزَلْنَا منَ السَّمَاء مَاءً بقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإنَّا عَلَى ذَهَابٍ به لَقَادرُونَ، فَأَنْشَأْنَا لَكُــمْ بِــه جَنَّات منْ نَخيلٍ وَأَعْنَابٍ لَكُمْ فيهَا فَوَاكهُ كَثيرَةٌ وَمنْهَا تَأْكُلُونَ، وَشَجَرَةً

تَخرُجُ مِنْ طُورِ سَيْنَاءَ تَنْبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِلْآكِلِينَ، وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ : ئێمه مرۆڤمان له قوڕێکی خۆشکراو دروستکردووه، پاشان کردمانه تنۆکێك له جێگەیەکی پتەودا، پاشان هەر لەو تنۆکە خوێنی مەیوومان پێکهێناوە لەو خوێنەوە پلە گۆشتی جاوراومان سازداوە لەپلە گۆشتە جاوراوەکە ئێسکمان دروستکرد پاشان ئێسکەکەمان بەگۆشت دا پۆشی لە پاشدا کردمانە بوونەوەرێکی تر، بەرزی و پاکی و بێ گەردی هەر بۆ خودایە کە باشترین خولقێنەرە.. لە ئاکامدا هەموو دەمرن، و رۆژی سەلاش (قیامەت) هەموو زیندوودەبنەوە، و هەر ئێمە حەوت نهۆمی ئاسمانەکانی جیامان بەسەر ئێوە بەدیهێناوە و بەئاگاین لەهەموو دروستکراوەکانمان.. لەئاسمانەوە بەئەندازە ئاومان باراندووە لەزەویدا رامانگرت و ئێمە بۆ لەناوبردنی بەتواناین، هەربەو ئاوە بۆ ئێوە باخاتێکمان لە دارخورما رەز بەرهەم هێنا و زۆر میوەجاتان دەداتێ و لێی دەخۆن، وجۆرە دارێك لە توری سینادەردەچێ، کە بەرهەمی رۆنە، پێخۆریشە بۆ ئەوانەی دەیخۆن، دیارە مالاتیش بۆ ئێوە پەندە لەوە کەوا لەناوسکیانا پێیان دەنۆشین، سوودیان زۆرە و لێشیان دەخۆن، لە سەریان و لەسەر گەمی هەلدەگیرێن.﴾المؤمنون:١٢-٢١

﴿وَهُوَ الَّذِي أَنْشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ، وَهُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ، وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ وَلَهُ اخْتِلافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ أَفَلا تَعْقِلُونَ : ئەو زاتێکە گوێ و چاوو دڵی بۆ ئێوە دروستکرد بەڵام زۆرم کە سوپاسی دەکەن، هەر ئەویشە ئێوەی لەسەر ئەم زەمینە جێکردۆتەوە هەر لای ئەویش کۆدەکرێنەوە، ئەو زاتێکە زیندوکردنەوە دەکات و دەتان مرێنێ و هەرئەویش هاتوو چۆی شەوو رۆژ ئەنجام دەدا تاکەی تێناگەن؟﴾المؤمنون:٧٨-٨٠

﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنْسَانِ مِنْ طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُلالَةٍ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ، الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْإِنْسَانِ مِنْ طِينٍ، ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِنْ رُوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ : ئەو زاتێکە هەموو شتێ بەوپەڕی رێکوپێکیو لەباری دروستکرد مرۆڤیشی لەسەرەتادا لەماکی قوڕ بەدی هێناوە.. لەپاشان نەتەوەکەی لە پالاوتەی جۆرە ئاوێکی کەم بایەخ

وەدی هێناوە، لەپاشان قەدو بالای ڕێك كردو لەرۆحی خۆی فوی تێکرد بۆ ئێوە چاوو دڵی دروست کرد، لەگەڵ ئەوەیش کەم شوکرانە بێژن.﴾السجدة:٧-٩

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعاً تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنْفُسُهُمْ أَفَلا يُبْصِرُونَ : ئایا نەیان بینی کە بۆ زەویە ووشکەکان ئاودەنێرین جابە هۆی ئەو ئاوەوە کشتوکاڵ و گژوگیا دەڕوێنین کە ئاژەڵ بلەوەڕێ و خۆیشیان لێی بخۆن ئایە نابینن؟﴾السجدة:٢٧

﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ، أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بَلْ لا يُوقِنُونَ : ئایا ئەوان بەبێ هۆ بەدیهاتوون یاخۆیان خولقێنەری خۆیانن، یان ئەوانن ئاسمانەکان و زەمینیان وەدی هێنا؟ نەخێر دیارە نای سەلمێنن.﴾الطور:٣٥-٣٦

﴿تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ، الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ، ثُمَّ ارْجِعِ الْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنْقَلِبْ إِلَيْكَ الْبَصَرُ خَاسِئاً وَهُوَ حَسِيرٌ : مەزنێتی و پاك و بێ گەردی و بەرزی بۆ ئەو زاتەی هەموو بوونەوەر و جیهانی بەدەستە، ئەو زاتەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، ئەوە کە مردن و ژینی داهێناوە تا تاقیتان بکاتەوە کام یەکێکتان لە ئێوە چاکترە بەکردەوە هەر ئەویشە لێبوردەی خاوەن دەسەڵات، ئەو زاتەی حەوت ئاسمانی چین لەسەر چین سازداوە لەدەستکاری ئەو خودایەدا هیچ نارێکیەك نابینی جارێکی تر تەماشاکە ئاخۆ قلیشێکی تیادا هەیە دیسانەوە چاوی پیادا بخشێننەوە، سۆمای چاوت بەداماوی و بە ڕاماوی بەرەو خۆت دەگەڕێتەوە.﴾الملك:١-٤

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولاً : خودا زاتێکە زەوی بۆ ئێوە ڕام و ملکەچ کردوە﴾الملك:١٥

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَافَّاتٍ وَيَقْبِضْنَ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا الرَّحْمَنُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ بَصِيرٌ : ئاخۆ ئەوان ئەو مەلانەیان نەدیوە کەلە سەرویانەوە لەنگەر دەگرن و باڵە شەقێ دەکەن جگە لەخودا کێ دەتوانێ ڕاگیریان بکات خودا هەر بۆ خۆی بە هەموو شتێك بینایە.﴾الملك:١٩

﴿قُلْ هُوَ الَّذِي أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ : بلێ/ ئەوەی کە ئێوەی بەدیهێناوە و گوێ و چاوو دڵی پێداون ئێوە کەمتر شوکری دەکەن. ﴾الملك:٢٣

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْراً فَمَنْ يَأْتِيكُمْ بِمَاءٍ مَعِينٍ : بلێ/ نابینن ئاوەکەتان گەر رۆژ چووە ناخی زەوییەوە ئەو ساکێ ئاوی زوڵاڵی رەوانتان فریادەخا. ﴾الملك:٣٠

﴿فَلَا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، وَمَا لا تُبْصِرُونَ : جا سوێند ئەخۆم بەوەی ئەیبینن و بەوەی کە نایبینن. ﴾الحاقة:٣٨-٣٩

﴿فَلا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ : جا سوێند ئەخۆم بەدانەری خۆر هەڵاتەکان و خۆرئاواکان ئێمە بەتواناین. ﴾المعارج:٤٠

﴿أَلَمْ نَجْعَلْ الأَرْضَ مِهَادًا، وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا، وَخَلَقْنَاكُمْ أَزْوَاجًا، وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا، وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا، وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا، وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا، وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا، وَأَنزَلْنَا مِنْ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجًا، لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا، وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا: ئایا زەویمان نەکردۆتە جێگەی ئارامگە بۆ ئێوە، و کێوەکانیشمان نەکردۆتە گولمێخ، و ئێوەمان جووت جووت بەدیهێنا، و خەویشمان کردە هۆی حەسانەوەتان، و شەومان کردە پۆشاکتان، و رۆژیشمان کردە هۆی رسق و رۆزیتان، و لەسەر تانەوە حەوت ئاسمانی پتەومان دامەزراند، و کردمانە چرایەکی رونـاك و وورشەدار، لەو هەورانەی کە بارانیان پێوەیە ئاوی بەخورمان باراند، تاکو دانەوێلەو رووەکی پێبخەینە روو لەگەڵ باخ و بێستانی چڕ و پڕ. ﴾النبأ:٦-١٦

﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا، رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا، وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا، وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا، أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا، وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا : ئاخۆ دروستکردنی ئێوە سەختە یا ئاسمان کەخودا بنیاتی ناوە، قەوارەی بەرز کردەوە و لەباری کرد، و شەوی تاریك کردو رۆژیشی روونـاك کرد، و لە پاشاندا زەوی راخست، و ئاوی لێبەدەر خست و لەوەڕگەی بەدیهێنا، کێوە کانیشی بە پتەوی تیادا دامەزراند. ﴾النازعات:٢٧-٣٢

﴿يَــا أَيُّهَــا الْأِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ، الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ، فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ : ئه‌ی مرۆڤ چی تۆی له‌ ئاستی په‌روه‌ردگاردا له‌ خۆ بای كرد، ئه‌وه‌ی كه‌ دروستیكردی و ئه‌ندامه‌كانتی ویٚخست و ڕێكیانی كرد، و به‌ هه‌ر شێوه‌یه‌كیش ویستی دروستیكردی.﴾الإنفطار/٦-٨.

﴿أَوَلَمْ يَتفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَــلٍ مُسَــمًّى : ئایا ئه‌وان بیریان نه‌كردۆته‌وه‌ كه‌ خودا ئاسمانه‌كان و زه‌وی و ئه‌وه‌ی له‌نێوانیاندا هه‌ربه‌هه‌ق و بۆ ماوه‌ی دیاریكراو دروستیكرون.﴾الروم:٨

﴿فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ، وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِــيّاً وَحِــينَ تُظْهِرُونَ، يُخرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخرَجُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِــرُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتفَكَّرُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْــتِلافُ أَلْسِنَتِكُمْ وَأَلْوَانِكُمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِلْعَالِمِينَ، وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالــنَّهَارِ وَابْــتِغَاؤُكُمْ مِنْ فَضْلِهِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ، وَمِنْ آيَاتِهِ يُرِيكُمُ الْــبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيُحْيِي بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ : هه‌موو كاتی ئێواران و به‌ره‌ به‌یانیان په‌سه‌ندی پاكی خودا بكه‌ن.. سوپاس هه‌ر بۆ ئه‌وه‌ له‌ئاسمانه‌كان و له‌زه‌وی و هه‌روه‌ها له‌خه‌وتناندا و له‌كاتی نیوه‌ڕۆدا.. زیندوو له‌مردوو ده‌رده‌كا و مردوو له‌زیندوو ده‌ردێنێ زه‌ویش دوای ئه‌وه‌ی مراوه‌ گیانی و به‌ر دێنێته‌وه‌ ئێوه‌ش به‌م جۆره‌ دێنه‌ ده‌رێ.. له‌نیشانه‌كانێتی له‌خۆتاندا جوته‌ی پێكهێنا تا... له‌گه‌ڵیدا بحه‌سێنه‌وه‌وه‌ خۆشه‌ویستی و سۆزو به‌زه‌یی خسته‌ نێوانتان ئه‌مه‌ش نیشانه‌ی زۆره‌ بۆ ئه‌وانه‌ی بیرده‌كه‌نه‌وه‌.. هه‌ر له‌نیشانه‌كانی ئه‌ودا دروستكردنی ئاسمانه‌كان و زه‌وی و جیاوازی زمانی ئاخاوتنتان و ڕه‌نگ و ڕوتان، كه‌له‌مه‌دا به‌ڵگه‌ی زۆرن بۆ زانایان، هه‌ر له‌نیشانه‌كانێتی خه‌وی شه‌وان و ڕۆژانه‌تان و گه‌ڕانتان بۆ ده‌ستخستنی ڕسق و ڕۆزی كه‌له‌سایه‌ی به‌خشنده‌یی ئه‌ودایه‌ له‌مه‌دا به‌ڵگه‌ی زۆر هه‌یه‌ بۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی ده‌بیستن، هه‌ر له‌نیشانه‌كانێتی بروسكه‌تان پیشان ئه‌دا ترس و ئومێدی پێوه‌یه‌ له‌

ئاسمانیشەوە بارانتان بۆ دەڕژێنێ تازەمینی مردوی پێ زیندوو بکاتەوە لەمەدا نیشانەی زۆرن بۆ کەسانێ تێدە گەن.﴾الروم:١٧-٢٤

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ يُرْسِلَ الرِّيَاحَ مُبَشِّرَاتٍ وَلِيُذِيقَكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَلِتَجْرِيَ الْفُلْكُ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ : یەکێك لەنیشانەکانی ئەو ئەمەیە کە بای مزگێنی دەر بەرێدەکا تا... بەخشندەیی خۆی بە ئێوە بچێژێ، و گەمیە و کەشتیش بەفەرمانی ئەو بێن و بچن ولەسایەي بەخشندەیی ئەوەوە رۆزی و، بژێوی خۆتان پەیدا بکەن، تاکو شوکرانە بژێربن.﴾الروم:٤٦

﴿اللَّهُ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفاً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ فَإِذَا أَصَابَ بِهِ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ، وَإِنْ كَانُوا مِنْ قَبْلِ أَنْ يُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمُبْلِسِينَ، فَانْظُرْ إِلَى آثَارِ رَحْمَتِ اللَّهِ كَيْفَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ ذَلِكَ لَمُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ : هەر خودایە ئەو بایانە بەرێدەکا ئەوانیش هەور دەبزوێنن، ئەوسا هەرچۆنێکی بوێت ئەو هەورانە لە ئاسماندا پرش و بڵاودەکاتەوە و گەواڵە گەواڵە شیان دەکات دەبینی لەوانەوە دڵۆپە ئاو دێتە خوارەوە: گەرویستی لەسەر بێ بۆ هەرکامێ لەعەبدانی خۆی دەنێرێ ئیتر دڵخۆش دەبن، بەڵام پێش ئەوەی بارانیان بۆ ببارێت نائومێد بوون، و بڕوانە بەزەیی خودا چی کردوە! زەوی مرد و لەنوێ زیندوو دەکاتەوە، زیندو کردنەوەی مردووش کاری ئەوە، هەر خۆی توانای بەسەر هەموو شتدا هەیە.﴾الروم:٤٨-٥٠

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ: هەندێ لەخەڵك دەڵێن بڕوامان بەخودا هێنا بەڵام هەرکاتێ لەرێگای خودا ئازار بدرێن ئازاری خەڵك وەك سزای خودا حسابی بۆ دەکا؟﴾العنکبوت:١٠

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنْشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ : بڵێ/ گەشتێ بەسەر ئەم زەمینەدا بکەن و بڕوانن کە چۆن خودا بەدیهێنانی دەستپێکرد هەر بەم چەشنەش خودا جیهانی کۆتایی بەدی دێنێ، خودا بەسەر هەموو شتێکدا بەدەسەتەڵاتە.﴾العنکبوت:٢٠

﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنْكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتاً وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنْكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، إِنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيْءٍ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ، وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلا الْعَالِمُونَ: نموونەی کەسانێك جگە لە خودا دۆستانێکی تر بۆ خۆیان بگرن، هەروەکو نموونەی جاڵجاڵۆکە وەهایە کە خانووی تەنیوە و گەر بزانن لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە خودا دەزانێ چین ئەوانەی جگـە لەخودا خۆی کە هانایان بۆ دەبەن هەر خۆی خاوەن دەسەڵات و کاربەجێیە، ئەو نموونانە بۆ خەڵك دێنێتەوە و تەنها زانایان لێی تێدەگەن.﴾العنکبوت: ٤١-٤٣

﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ فَأَنَّى يُؤْفَكُونَ : هەرکاتێ لەوانە بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە و خۆرو مانگی رام کردووە، دەڵێن/ خودا، ئیتر چۆن لەپەرستنی خودا لائەدەن.﴾الغنکبوت: ٦١

﴿وَلَئِنْ سَأَلْتَهُمْ مَنْ نَزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِنْ بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْقِلُونَ : ئەگەر لەوانە بپرسی کێ لەئاسمانەوە بارانی ناردوە زەوی مردوی بەوە زیندو کردەوە دەڵێن خودا: بڵێ سوپاس شایەنی خودایە بەڵام زۆربەیان ئەقڵیان ناخەنەگەڕ.﴾العنکبوت: ٦٣

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ، الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشاً وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ فَلا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَاداً وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ : ئەی خەڵکینە پەروەردگاری خۆتان بپەرستن ئەو پەروەردگارەی کە ئێوە و خەڵکانی پێش ئێوەی خولقاند، بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن.. ئەو خودایە زەوی بۆ کردونە راخەرو ئاسمانی بۆ بەرزکردونەتەوە و ئاوی لەو حەوایەوە بۆ باراندن و هەموو جۆرە بەروبوومێکی بەهۆی ئەو ئاوەوە بۆ رواندون، ئێستا کە ئەوەتان زانیوە، هاوەڵو هاوبەش بۆ خودا دامەنێن.﴾البقرة: ٢١-٢٢

﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنْتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ، هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ : چۆن لەو خودایە حاشا دەکەن

که‌له‌نه‌بوو ژیانی داوه به ئێوه، له‌پاشان ده‌تانمرێنێ و دیسان زیندوتان ده‌کاته‌وه و، ئینجا به‌گشتی هه‌موو بۆلای ئه‌و ده‌گه‌ڕێنه‌وه، هه‌ر ئه‌و خودایه‌شه که ئه‌وه‌ی له‌زه‌ویدایه، بۆ ئێوه‌ی به‌دیهێناوه، له‌پاشا له ئاسماندا حه‌وت ئاسمانی دروستکردن خودا به‌ئاگایه له‌هه‌موو شتێك. ﴾البقرة:٢٨-٢٩

﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَإِذَا قَضَى أَمْراً فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ: راهێنه‌رو رازێنه‌وه‌ی ئاسمانه‌کانو زه‌وی خودایه، هه‌رکه ویستی کارێ ئه‌نجام بێ، فه‌رمان ده‌دا، ببه! ده‌بێ. ﴾البقرة:١١٧

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ: له‌دروستکردنی ئاسمانه‌کان و زه‌وی و هاتو چۆی شه‌وو رۆژو ئه‌و که‌شتیانه له‌ده‌ریا دێن و ده‌چن، که سوودیان بۆ مرۆڤ هه‌یه و ئاو که خودا له ئاسمانه‌وه باراندی، و به‌هۆی ئه‌و بارانه‌وه زه‌وی دوای مردنی زیندوکردووه، و هه‌موو جۆره گیانله‌به‌رێکی تیادا بلاوکردووه بای جولاند و هه‌وری رام کرد له‌نێوه‌ند ئاسمان و زه‌ویدا، هه‌موو به‌گشتی نیشانه‌ی زۆرن بۆ که‌سانێ که تێده‌گه‌ن. ﴾البقرة:١٦٤

﴿وَمَثَلُ الَّذِينَ كَفَرُوا كَمَثَلِ الَّذِي يَنْعِقُ بِمَا لا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَاءً وَنِدَاءً صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لا يَعْقِلُونَ: ئه‌قلی ئه‌و خوانه‌ناسانه وه‌ك ئه‌قلی ئه‌و ئاژه‌له‌یه‌که ده‌نگ ده‌درێ و جگه له‌خوڕینو چڕین هیچی تر نابیستن که‌ڕن، لاڵن، کوێرن. ﴾البقرة:١٧١

﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ: ده‌رباره‌ی مانگه‌کانی یه‌ك شه‌وه لێت ده‌پرسن، بلێ بۆ زانینی کات و چوونه حه‌جی خه‌ڵك سوود ده‌گه‌یه‌نن. ﴾البقرة:١٨٩

﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ لا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ، هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَاتٌ هُنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو

الْأَلْبَاب : هەرخودایە کە ئێوەی لەمندالدانی دایکدا لەسەر هەرشێوەیەك بوێت وێنەی دەکێشێ، جگە لەو خودا هیچ خواوەندێکی تر نی‌یە کە توانا و کاربەجێ بێت، هەرئەوە قورئانی بۆت ناردووە کەهەندێ ئایەتی فەرمان و بڕیارن ئەوانە سەرچاوەی قورئانن و ئایەتەکانی تریش هاوشێوەن و ئەوانەی دڵیان دەغەزدارە هەرئەوان لەدووی دەکەون بەمەبەستی هەڵخەڵەتاندن و هەرچۆنێ دڵیان بیەوێت لێکیدەدەنەوە.. تەنها خودا لێکدانەوەیان دەزانێت ئەوانەی کە زۆرزانان لەزانستدا ڕۆچوون دەڵێن باوەڕمان پێی هەیەو هەمووی لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە تەنها خاوەن عەقڵ و ژیر بیری قووڵی لێدەکەنەوە. ﴾آل عمران:٦-٧

﴿شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِماً بِالْقِسْطِ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ : خودا بۆ خۆی ئاگادارو فریشتەکانی و خاوەن زانست، باش دەزانن کەهەر خودایە ڕاگری دادەو هیچ کەسێ جگەلەو شیاوی پەرستن نی‌یە و هەرخۆی خاوەن دەسەڵات و کاربەجێ‌یە. ﴾آل عمران:١٨

﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَنْ تَشَاءُ وَتَنْزِعُ الْمُلْكَ مِمَّنْ تَشَاءُ وَتُعِزُّ مَنْ تَشَاءُ وَتُذِلُّ مَنْ تَشَاءُ بِيَدِكَ الْخَيْرُ إِنَّكَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، تُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَتُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَتُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَتَرْزُقُ مَنْ تَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ : بڵێ/ خودایە ئەی خاوەن هێزو دەسەڵات هەرکەسێ تۆ ویستت لێبێ دەسەڵاتی دەدەیتێ و کەی بتەوێ دەسەڵاتی لێدەسێنی: و هەرکەسێکیش بەرزدەکەیتەوە، و هەر کەسێکیش زەبون بکەیت، دەیکەیت، خۆت دەزانێ: چاکە هەر بەدەست خۆتەو تۆ بەتوانای بەسەر هەموو شتێکا شەو دەهاوێتە ناو ڕۆژ ڕۆژیش دەخەیتە ناو شەو، و زیندوو لەمردوو دەردەکەی، و مردوو لەزیندوو دەردەهێنێ و هەرکەسێ بتەوێ بێ ژمێرە رسق و ڕۆزی دەدەیتێ. ﴾آل عمران:٢٦-٢٧

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلاً سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ : لەبەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەویدا و لەگۆڕانی شەوو ڕۆژدا نیشانەن بۆ ئەوانەی ژیرو هۆشمەندن.. ئەوانەی هەمیشە ناوی خودا دەبەن چ بەوەستانەوە و چ بەڕاکشانەوە چ بەتەنیشتەوە

بیرده‌که‌نه‌وه له‌دروستکردنی ئاسمانه‌کان و زه‌وی، ده‌ڵێن/ ئه‌ی په‌روه‌ردگارمان تۆ ئه‌م ده‌زگایه‌ت به‌بێ هووده به‌دی نه‌هێناوه، پاکی و بێگه‌ردی هه‌ر بۆ تۆیه، بمانپارێزه له ئازاری ئاگر. ﴾آل عمران: ١٩٠-١٩١

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً : ئه‌ی خه‌ڵکینه ته‌قوای له په‌روه‌ردگاری خۆتان بکه‌ن و لێی بترسن که ئێوه‌ی له‌یه‌ك که‌س به‌دیهێناوه، و هه‌ر له‌و که‌سه‌ش جووته‌که‌ی خستۆته‌وه له‌و دوانه شه‌وه پیاوو ژنێکی زۆری خستۆته‌وه. ﴾النساء: ١

﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ : شه‌و ده‌هاوێته ناو رۆژو رۆژیش ده‌خاته ناو شه‌و. ﴾الحديد: ٦

﴿اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ : بزانن که خودا زه‌وی دوای مردنی زیندوو ده‌کاته‌وه و ئێمه نیشانه‌کانی به‌ڕوونی بۆ ئێوه به‌ده‌رده‌خه‌ین، تاکو عه‌قڵتان بخه‌نه‌گه‌ڕ. ﴾الحديد: ١٧

﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمًّى يُدَبِّرُ الْأَمْرَ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ بِلِقَاءِ رَبِّكُمْ تُوقِنُونَ، وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَاراً وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ، وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ : خودایه که‌ئاسمانه‌کانی راگرتووه بێ کۆڵه‌که ده‌یبینن و له‌پاشان نیشته‌جێی عه‌رشی خۆی بووه، خۆرو مانگیشی خسته‌گه‌ڕ هه‌ریه‌که‌یان بۆ ماوه‌یه‌کی دیاریکراو دێن و ده‌چن هه‌ر ئه‌و ته‌گبیری کاره‌کان ده‌کا، تاکو به‌دیداری خودا یه‌قین په‌یدا بکه‌ن، و هه‌ر ئه‌وه که پانتایی به‌زه‌وی داوه، چیاو زه‌ریایی تێدا داناوه، له‌هه‌موو به‌ر میوه‌یه‌ك جوته‌ی خولقاندووه، و په‌رده‌ی ره‌شی شه‌و ده‌کاته به‌ر رۆژ، ئه‌مانه به‌گشتی نیشانه‌ی زۆرن بۆ ئه‌وانه‌ی بیرده‌که‌نه‌وه.. له‌زه‌ویدا گه‌لێك پارچه‌ی جیاواز له‌ته‌ك یه‌که‌وه هه‌ن و گه‌لێك باخ و بێستان هه‌ن له‌ره‌زو کشتوکاڵ و دارخورمای له‌سه‌ریه‌ك و به‌جیان که هه‌موویان

بەیەك ئاو ئاو دەدرێن و لەتام و چێژدا هەندێکیان پەسەندو نازدار ترن بەسەر هەندێکی تریاندا ئەمانە بەگشتی نیشانەن بۆ ئەو کەسانەی هۆشمەندن.﴾الرعد:٢-٤

﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ : هەر ئەو خودایە بە بروسکەتان نیشان ئەدا کەهۆی ترس و ئومێدە و هەوری بار قورسی پڕ لەباران بەدی دەهێنێ.﴾الرعد:١٢

﴿قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ قُلِ اللَّهُ قُلْ أَفَاتَّخَذْتُمْ مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ لا يَمْلِكُونَ لِأَنْفُسِهِمْ نَفْعاً وَلا ضَرّاً قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي الظُّلُمَاتُ وَالنُّورُ أَمْ جَعَلُوا لِلَّهِ شُرَكَاءَ خَلَقُوا كَخَلْقِهِ فَتَشَابَهَ الْخَلْقُ عَلَيْهِمْ قُلِ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّارُ : بلێ/ کێ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە/ بلێ خودایە بلێ: ئایا چەند گەورەتان بۆ خۆتان داناوە کە دەسەتەلاتی هیچ سوودو زەرەرێکیان نییە تەنانەت بۆ خۆیانیش نەك بۆ ئێوە، بلێ ئایا بیناو نابینا وەك یەکن یان تاریکی و روناکی بەرانبەرن یاخود هاوبەشیان بۆ پەیدا کردوە بەشێوەیەك کەوەك خودا وایە کەبەمە سەریان لێ شێواوە، بلێ: هەرچی هەیە گشتی دەستکردی خودایە، هەر ئەویش تاك و تەنهایەو بەسەر هەموو شتێکا دەسەلاتدارە.﴾الرعد:١٦

﴿الرَّحْمَنُ، عَلَّمَ الْقُرْآنَ، خَلَقَ الْإِنْسَانَ، عَلَّمَهُ الْبَيَانَ، الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ : خودای بەخشندە، قورئانی فێرکرد، مرۆڤی بەدیهێنا، زمان و ئاخاوتنی فێرکرد، خۆرو مانگیش بەئەندازەیەکی دیاریکراو دێن و دەچن.﴾الرحمن/١-٥.

﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً، إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً : بێگومان ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەم مرۆڤەدا تێپەڕی، کەهیچ بوونێکی نەبووە تاباسبکرێ، ئێمە مرۆڤمان لەتنۆکێك ئامێتە دروستکرد تا تاقیبکەینەوە، ئینجا گوێی بیستن و سۆمای بینینمان پێبەخشی.﴾الانسان:١-٢

﴿قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْراً : خودا بۆ هەموو کارێ ئەندازەی داناوە.﴾الطلاق:٣

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَاماً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلالِهِ وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ جِبَالٍ فِيهَا مِنْ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشَاءُ وَيَصْرِفُهُ عَنْ

مَنْ يَشَاءُ يَكَادُ سَنَا بَرْقِه يَذْهَبُ بِالْأَبْصَارِ، يُقَلِّبُ اللَّهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِأُولِي الأَبْصَارِ، وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى بَطْنِه وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ : ئەتۆ نەتدی خودا هەور لەسەر خۆ دەبزوێنێ پاشان چەند پارچە یان لێکدەداو دەیانکا بەهەورێکی قورس و پڕ، ئەوسا ئەبینیت، دڵۆپ دڵۆپ بارانی لێدەبارێ، هەر خوداش لەکێوەکاندا لەبەرزاییەوە تەرزە دەبارێنێ، هەرکەسێ ئەو ویستی لێبێ بەری دەکەوێت و هەرکەس ئەو ویستی لێنەبێ بەری ناکەوێ، پروسکە و رشەدارەکەی لەوانتەیە سۆما لەچاوان بفرێنێ.. ئالوگۆری شەوو رۆژ خودا دەیکا کەلەمەشدا پەندێك هەیە بۆ ئەوانەی تێدەگەن و ژیرن.. خودا هەموو بوونەوەرێکی لەئاو بەدیهێناوە، هەیانە خشۆکەو هەیانە لەسەر دوو پێ دەڕوا، و هەیانە لەسەر چوار پێ دەڕوا، خوداش هەرشتێ ویست بکا سازو رێکی ئەخا، خودا بەسەر هەمو شتێکا توانای هەیە.﴾النور/٤٣-٤٥

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئاً وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّهُ يُحْيِي الْمَوْتَى وَأَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ : ئەی خەڵکینە گەر لەزیندوو بوونەوە بەگومانن، ئەوە بزانن ئێمە ئێوەمان دروستکردووە سەرەتا لەخاك پاشان لە تنۆکێك و پاشان لەپارچە گۆشتێکی هەڵواسراو ئینجا لەپارچە گۆشتێکی جویراوی بچم پێدراو یا بچم پێنەدراو، تائەم پلانەتان بۆ روون بکەینەوە و بیسەلمێنین و لەپاشدا لەمنداڵداندا چەندمان بوێت دەیهێڵینەوە، پاشان بەساوایی دەهێنرێتە دەرێ پاشان دەگەنە ئەو پەڕی تواناتان، و هەندێکتان دەمرن و هەندێکتان دەگەنە ئەو پەڕی پیری بەچەشنێك کەهیچ زانیاری و زانستێك سەبارەت بەخۆتان بەیاد نەیەتەوە، ئەم زەمینە دەبینی بێ هەست و مردوە، هەرکاتێك بارانمان بەسەرداباراند بەخۆدا دێت و گەشە دەکا، و هەموو جۆتێکی

رووەکی دیمەن جوان لەخۆیدا دەڕوێنێ هەروایە تەنها خوا ڕاستە و بێ گومان هەر ئەویش مردووەکان زیندوو دەکاتەوە بەسەر هەموو شتێکدا تواناداره.﴾الحج/٥-٦

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انْقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ: هەندێ لەخەڵکان هەن سەرزارەکی خواپەرستن گەر خێر رووی تێکردن لەخودا دڵنیا دەبێ و گەر دووچاری ناخۆشیەك بوو رووله‌خودا وەردەگێڕێ بەمەش دونیا و قیامەت لەدەست دەدا، ئەمەیە زەرەرمەندی گەورەو هەردوو دونیا لەدەست چوو.﴾الحج: ١١

﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا أَوْ آذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى الْأَبْصَارُ وَلَكِنْ تَعْمَى الْقُلُوبُ الَّتِي فِي الصُّدُورِ: ئاخۆ هێشتا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تابینە خاوەنی دڵ و بەهۆیەوە عەقڵیان بەگەڕ خەن یا بینە خاوەنی دڵ و بەهۆیەوە بیسەربن، لەراستیدا چاو کوێر نابێ بەڵکو ئەو دڵانە کوێر دەبن کەلەسنگدان.﴾الحج: ٤٦

﴿ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ، ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ هُوَ الْبَاطِلُ وَأَنَّ اللَّهَ هُوَ الْعَلِيُّ الْكَبِيرُ، أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَتُصْبِحُ الْأَرْضُ مُخْضَرَّةً إِنَّ اللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ، لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ، أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ وَالْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَيُمْسِكُ السَّمَاءَ أَنْ تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ إِنَّ اللَّهَ بِالنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ، وَهُوَ الَّذِي أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ إِنَّ الْإِنْسَانَ لَكَفُورٌ: چونکە هەر خودایە راستە و، هەر شتێك بێجگە لەو هاناو پەنا بۆ بەرن لەپڕو پووچ بەدەرنی‌یە، باڵا دەستی هەرە مەزن هەر خودایە.. ئەدی نەتدیوە خودا بارانی لەو حەوایە و باراندو زەوی سەوز هەڵئەگەڕێ، دیارە خودا لەهەموو ووردە کارییەك بەئاگایە.. هەرچی لە ئاسمان و زەمیندا هەیە موڵکی ئەوە، خودا بۆ خۆی بێ نیازە و شیاوی ستایشە، ئایا نەتدیوە هەموو شتێکی ناو زەوی بۆ رامکردون و گەمیەکان بەفەرمانی ئەو لە دەریادا دێن و دەچن و ئاسمانی راگرتووە کە هەتا بەسەر زەویدا نەکەوێت مەگەر بەفرمانی خۆی خودا بۆ خەڵکان زۆر بەسۆزو بەزەیی‌یە.. هەرخودایە

ژیانی پێبەخشیوون و لەپاشدا دەتان مرێنێ و دووبارە زیندوتان دەکاتەوە، بەراستی مرۆڤ زۆر بێ باوەڕە.﴾الحج/٦١-٦٦

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئًا لَا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ، مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ : ئەی خەلکینە پەندێك هێنراوەتەوە گوێبیستی بن، ئەوانەی پەناو هانا بۆ کەسانی جگە لەخودا دەبەن توانای دروستکردنی مێشێکیان نییە، و گەر مێشێك شتێکیان لێ بفڕێنێ ناتوانن لێی بستێننەوە، داواکەرو داوالێکراو چەند لاوازو زەبوونن، بەراستی بەو جۆرەی کە پێویستە خودا بناسن نەیان ناسی خودا زۆر بەتواناو بەدەستەڵاتە.﴾الحج/٧٣-٧٤

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ : ئاسمانەکان و زەوی بەهەق دروستکردوە و وێنەی بۆ کێشاون و جوانترین شێوەی پێبەخشیوون و لەکۆتایدا چارەنووستان بۆلای ئەوە.﴾التغابن:٣

حەیرانی کوری ئەزعەف دەڵێت/ کاتی تەواو بوونی خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە بەشێخ مەوزوونم ووت/ خودا پاداشتی چاکەت بداتەوە دەرهەق من، سوێندبێ بە خودا ئێستاکە ئەم ئایەتانەم خوێندەوە هەروەکو لەوەو پێش نەم خوێد بێتنەوە وایە و بەدووری نازانم کە هۆکەی بگەڕێنمەوە بۆ وازهێنانم لەبیرکردنەوەی قوڵ و لێکدانەوەی ئەم ئایەتانەم تەنها کە تەنها بۆ تعبد دەمخوێندنەوە.

شێخ/ خوێندنەوەی ئەم ئایەتانە بۆ جارێك و دووجار سوودمەند نابێت، بەڵکو پێویستە پۆلێنێکی تەواوی بکەیت و بیانخەیتە بەرچاوت لەو هەموو شتانەی کەخودا دروستی کردن و ئەو ئایەتانە کە ئاماژەیان بۆ کراوە، لەوانەیە هەندێکیان سەرتاسەری بێت بۆ زۆر شت، گەر دووبارەش بکرێتەوە قەیدی نییە ئێستا هەستە لە دەفتەرەکەی کە پڕت کردۆتەوە بیانووسەوە و بەیانی وەرەوە بۆ لام تا وتەکانمان تەواو بکەین.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت/ ئەو شەوەم بردە سەر بە نووسینەوەی ئایەتەکانی قورئان لەدەفتەرەکەمدا، و لەگەڵ سپێدەی بەیاندا خەو دایگرتم و بەدەنگی بانگدەری مزگەوت بەئاگاهاتم کە پێی ووتم/ ئەوا دوانیوەڕۆیە کوڕم، ئەم نووستنە دورو درێژە چی‌یە، لە جێگایەکەم راپەڕیم بەشڵەژاویی یەوە بەبێ بیرکردنەوە لێم پرسی - چۆن؟ و کێ دەرگای لێکردیتەوە؟ و بۆچی بەئاگات نەهێنام بۆ نوێژی بەیانی.

ووتی/ شێخی گەورەم دەرگای لێکردمەوە، و بەفەرمانی ئەو بەئاگام نەهێنای، دوای ئەوەی کە نوێژی بەیانیمان کرد شێخ بەرەو سەمەرقەندی ناردم، تاکو... ئەم هەموو کتێبەی بۆ بهێنم، و لەلای کتێب فرۆشەکە، پیرەمێردێکی کزەڵی داماوم بینی، پرسیاری شێخی گەورەمانی کرد، کتێب فرۆشەکەش ئاماژەی منی بۆ کرد؟ و پرسیاری شێخی لێکردم، وا دەری بڕی کە شێخ دەناسێت و برادەری خۆشەویستێتی و زۆر هەوڵی بێ ئەنجامدا کەدووری بخەمەوە و تێی بگەیەنم کە شێخ لەخەڵوەتدایە و دوور لەخەڵك دەژی، بەڵام ئەوەندە تکای لێکردم تا.... بێزاری کردم، ناچار لەگەڵ خۆمدا هێنام و جێ و ڕێی شێخم لە باخەکەدا نیشاندا، و گەڕامەوە بۆ ئەوەی ئەم کتێبانەت بدەمێ.

بە پیرەمێردەکەی هاوڕێم ووت/ ئەی باوکی محەمەد، ئەم کتێبانە بەزمانی بێگانە نوسراون و من لێیان تێناگەم.

لەپڕ گوێم لەدەنگی شێخ مەوزوون بوو دەرگاکەی کردەوە و پێی ووتم/ لە دواییدا فێریان دەبیت و، ئەمەش کەمتەرخەمیەکی زۆرەو نەتوانایەکی بەدە تیاتدا، چونکە تۆ یەکێکی لە پیاوانی ئاینی و، ڕێنمایی و ئامۆژگاریکردنی خەڵك دەخرێتە سەرشانی ئێوەی پیاوانی ئاینی، لەبەر ئەوە چۆن دەبێت نەزان بیت بەزمانی زانستەکانی ئەم سەردەمە.

حەیران/ من زمانەکەی خۆم و تورکی و عەرەبیش دەزانم، ئایا لەم زمانانەدا کتێبی زانست نی‌یە؟

شێخ/ بۆ وا ئەزانی ئەم زنجیرە باسانە لەو زمانانەدا هەیە؟ دوای ئەوە ئەم خۆ بە گەورە زانینە چی‌یە ئەی حەیران؟ نازانیت ئەو کتێبە زانستیانەی کەبەم زمانانە نوسراونەتەوە

لەگەڵ کەمیشیاندا هەموو لەزمانی بێگانەوە وەرگێڕاون، ئەی واچاکتر نی‌یە کەتوانای ئەوەمان هەبێت ئەم زانستانە لەزمانە بنەڕەتیەکەی خۆیانەوە وەربگرین، تاکو لە ڕۆیشتنە خێراکەی بەئاگا بین؟

ئەوەتا دەبینیت، ئەو کتێبانەی کە زاناکانمان وەریان دەگێڕنە سەر زمانی عەرەبی ئەوەندە زۆرو خێرا نین کە شان بەشانی زانست لەو وڵاتانەدا بڕۆن.

ئەم زنجیرە کتێبە بچووکانەی کەدەمەوێت بەهۆیەوە زانست ساکارو سادە بکەم بۆ هەموو خەڵك ئاسان بێت.

هیچ زانایەکت بینیوە لەزاناکانمان کە توانیبێتی کتێبێك لەسەر ئەو شێوەیە دابنێت؟ لەبەر ئەوەی زانایەك بەتەنها ناتوانێت ئەم کارە بکات، بەڵام لە ڕۆژئاوادا زانایان هەموو هاوکاری یەك دەکەن هەریەکەو لەو بوارەی کە تیایا پسپۆڕە و چاك لێی دەزانێ و دەزگا بڵاوکراوەکان ئەمە دەگرنە ئەستۆی خۆیان و پارەی زۆری بۆ تەرخان دەکەن، چ بۆ زانایان و چ بۆ چاکردنی و، دەزگاکە پاش فرۆشتنی بەخەڵك پارەیەکی باش بەدەست دەهێنێت، لەبەر ئەوە ڕێژەی خوێندەوار لای ئەوان زۆرە، بەڵام ئێمەی ڕۆژهەڵاتیەکان بەتایبەتی موسڵمانەکان، کتێبی زانستی بۆ نووسەرەکە تەنانەت پارەی چاپەکەشی بەدەست ناهێنێت.

حەیران/ بۆچی گەورەم؟

شێخ/ بەهۆی کەمی خوێندەواری کڕیارەوە، لەبەر ئەوە ئەم ئەرکە ئێستا کەو تۆتە ئەستۆی دەزگا میریەکان/ و بەتەنها خۆی دەتوانێت هەستێت بە گۆڕین و بڵاوکردنەوەی ئەم زنجیرە زانستی‌یە ساکارانە، و دابینی بکات بۆ خەڵك بەکەمترین نرخ، بۆ ئەوەی یارمەتیدەر بێت بۆ بەرزکردنەوەی ڕادەی ڕۆشنبیری...... و هەرچۆنێك بێت ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەنەتەوەکەمان پێویستی بەزمانی ڕۆژ ئاوا نەبێت، بەڵام تۆی پیاوی ئاین، فێربوونی یەکێك لەزمانە گەورەکانی ڕۆژ ئاوا پێویستە لەسەرت، گەر بتەوێت ببیتە ڕاوێژکارو بانگێژێکی ئاینی.

حەیران/ خودا، یارمەتیم بدا، فێر دەبم.

شێخ/ ئێستاش فەرموو با-دەست بەکارەکەمان بکەین ئایا ئایەتەکانت لەدەفتەرەکەتدا نووسیوە؟ دەمبینی بەدرێژی شەو دەتنووسین.

حەیران/ بەڵێ گەورەم، شەونخونیم کرد تا تەواوم کردن.

شێخ/ ئەی حەیران، گە رسەرنجێك بدەیتە ئەو ئایەتانە و بەقووڵی لێیان بكۆڵیتەوە لەسەر رۆشنایی زانیاریی‌یە سروشتی یەكان كە پێویستە ئاگاداریی‌یەكی فراوانت هەبێت دەربارەیان.

لەسەر رۆشنایی فەلسەفە بەئاشكرا دەبینیت قورئان هەموو شێوازەكانی بەڵگە خوازی لە خۆگرتووە، كە زانایانی ئاین و فەیلەسوفان پەیڕەویان كردوە، و خاڵی هەق پەروەری هەموویانی كۆكردۆتەوە و باسی تیۆری بەڵگە ئاوێتەكان دەكا (ألأدلة النظرية المركـــــبة) و بەڵگەی (پێویست) و هەروەها بەڵگەی (هۆ و هۆكارە تەواوەكانی) كەپابەندی (یاسای هۆ و هۆكارە) ئاشكراكانە، و زیاتر پەیڕەوی بەڵگەكانی سیستم دەكات كە پەیوەستە بەدروستكراوەكانی خودا لە جوانی و داهێنان و نەخشەدانان و رێكخراوو بڕیار و وردەكاری و بەئەندازەی و سنورداری و ڕیز بەندكردن و هاوپێوەری و زیاتر باسی بەڵگە بینراوەكان دەكات و دووبارەیان دەكاتەوە، و لەزۆر جێگادا تەئكیدیان لەسەر دەكات، چونكە ئەم بەڵگانە عەقڵ دەركیان دەكات بە ئاسانی و بەبێ ماندووبون وەریدەگرێت و بێ ئەوەی بچێتە ناو قوڵایی بەڵگە خوازیی یەكانەوە، یان دووچاری وێڵی ئەندێشە و نەتوانای و كولهوون بێتەوە، بەبێ هیچ موناقەشەیەك لادێ نشینێكی ساكار و زانایەكی فەیلەسوف وەك یەك دەبن لە لێكدانەوەیادا، چونكە (خودای بەئاگا لەنهێنیەكان) ئاگادارە ئەوانەی كە توانایان هەیە بچنە ناو قوڵایی عەقڵیە ئاوێتە ئاڵۆزەكانەوە تەنها كەمێكن لە زانایان لەوانەی كەبەسەرتا تێپەڕ بوون، كاربەجێی‌یی خودا وایە كە ووتەكانی بۆ خەڵك بەگشتی بە بەڵگەی سادە و ساكار و ئاشكرا بێت، رۆژ بەرۆژ، ئاشكرا تر دەبن بەگوێرەی پێشكەوتنی زانست و بەهۆی دەرخستنی شاراوەكانی سیستمەكانی گەردون لەلایەن زانایانەوە كە ئاماژەی یاسـاو رێكخستن دەكەن، تاكو راستی پەیمانی خودا بەدەربكەوێت كە دەفەرموێت:-

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾فصلت:٥٣

بەراستی پەیمانەكەی هەق و دیارە.

سەدە لەدوای سەدە خودا نیشانەكانی خۆی پیشانداون، كە ئاسۆكانی گەردون لە خۆیانیان گرتووە، و لە پێكهاتەی مرۆڤ خۆی كە چەندەها كتێبی دوورو درێژیان لەسەر نووسیوە. تا... هاتەدی ووتەی خودای بەخشندە كە دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾فاطر:٢٨

حەیران/ ئایا.... شێخی گەورەم دەفەرموێت بە ئاماژەکردنی ئەو ئایەتانەی کە خودا بە بەڵگە هێناونیەتیەوە لەسەر بوونی خۆی، بە بەڵگە ئاوێتەکانی عەقڵ وەك بەڵگەی پەیدا بوون و پێویست و هۆو هۆکار، چونکە کاتی خوێندنەوەیان نەم توانی دەست نیشانیان بکەم.

شێخ/ تۆ دەرکت نەکردن لەبەر ئەوەی بەکورترین و ناسکترین دەربڕین ئاماژەکراون، بۆ ئەوەی تەنها پسپۆڕانی خۆیان تێیان بگەن وەك چۆن لە باسی ئیبن روشددا بۆم بەدەرخستی، بیربکەرەوە ئەی حەیران لەم ئایەتانەی خوارەوە.

﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾الطور:٣٥

﴿أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ﴾الأعراف: ١٨٥

﴿أَوَلَا يَذْكُرُ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئاً﴾مريم:٦٧

﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئاً مَّذْكُوراً﴾الانسان:١

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَابَّةٍ﴾الشورى:٢٩

﴿وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾الجاثـية:٤

﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ﴾القصص:٦٨

﴿مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾الاحقاف:٣

﴿إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ﴾

﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾الحج:٨

﴿مَثَلُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ كَمَثَلِ الْعَنكَبُوتِ اتَّخَذَتْ بَيْتاً وَإِنَّ أَوْهَنَ الْبُيُوتِ لَبَيْتُ الْعَنكَبُوتِ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ﴾العنكبوت:٤١

﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ﴾العنكبوت:٤٣

سەرنج بدە لەم ئایەتانە ئەی حەیران، و بەراوردی بکە لەگەڵ وتەکانی زانایان و فەیلەسوفان کەبەسەرتا تێپەڕ بون.

نموونەی دیکارت، باسکاڵ، لیبنز... هەروەها ئیبن سینا و غەزالی و لەگەڵ زانایانی (ڕێبازی کەلام) سەبارەت بە بەڵگەی پەیدا بون و بەڵگەی پێویست و ئاشکرای یاسای

هۆ و هۆکار و بەڵگەی هۆ و هۆکاری تەواو،و چەسپاندنی سیفاتی ویست و لەناوبردنی بیرۆکە (پێویستە دروستکردن).

ئاشکرایی پەیدا بوونی گەردوون بەوەی کە دروستکراوە لەچەرخێکی دیاریکراو بۆ کاتێکی دیاریکراو.

گەر ئەمەت کردو چاوت خشاندەوە بەو ووتانەی کە زانایان ووتوویانە ئەو کاتە دەرکی نهێنی‌یەکانی ئیعجازی قورئان دەکەیت ئەوەی کە دابەزیووە بۆ مرۆڤێکی نەخوێندەوار لەکۆمەڵگەیەکی نەخوێندەواردا، پێش چوارده سەدە لە ئێمە، و پێش هەزار ساڵ لە دیکارت و باسکاڵ و لیبنز، تێدەگەیت کە تێگەیشتنی تەواو بۆ هەموو ئەوشاراوانەی کە ئەم ئایەتانەو ئەو نموونانە لەخۆیان گرتووە، تەنها بۆ زانایان ئاشکراو ئاسانە.

قورئان دەفەرموویێت هەروەك چۆن فەیلەسوفەکان و (ڕێبازانی کەلام) لەپاش ئەو دەڵێن (گەردوون پەیدا بووە) بەڵام بۆ چەسپاندنی پەیدا بوونی بەهۆی بەڵگە گۆڕاوەکانی وێنە لەسەر شێوازی ئەوان لائەدات.

چونکە خودای زانا و کاربەجێ بەئاگایە کە توانایی مێشك لە ئەندێشەکردنی زنجیرە گۆڕاوەکاندا بەدرێژی چەرخە دورو درێژەکان زەحمەتە بەدەر دەکەوێت سەبارەت بەم ماددە مردوانە کەنازانین لەسەرەتادا چی بوون. بەڵام ئێستا ئاسان بەدەر دەکەوێت بۆمان، بەڵکو دەبنە بەڵگەش، بەوەی کە پەیوەندیان بەدروست بوونی ژیانەوە هەیە لەسەر زەوی، بەتایبەتی لەرەگەزی ئاژەڵدا بەگشتی، و لەرەگەزی مرۆڤدا بەشێوەیەکی تایبەتی، ئەوەتا بۆ زانایان بەدەرکەوت کەوا چەرخێکی زۆر بەسەر زەویدا تێپەڕ بووە پێش دروستبوونی مرۆڤ و ئاژەڵ.

هەربۆیە قورئان زۆر ناوی ئاژەڵ و مرۆڤ دەبات، تاکو بیخاتەوە یادی مرۆڤ کە ڕێنمایی ئەو مەبەستی ڕێنمایی خودایە کە ﴿**هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا**: ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە کە هیچ شتێك نەبووە تاباسی بکرێت﴾الانسان: ١

لەمەوە وا ئاکامخواز دەکرێت کە ئاکامخوازیی‌یەکی سادەو ساکار بێت بەوەی کە (پەیدا بووە) و لە دەرککردنی ئاسانی یەکەمەوە بگەیتە دەرککردنی ئاسانی دووەم، ئەویش ئەوەیە کە ئەو ماددەیەی مرۆڤی لێپەیدا بووە دەبێت ئەویش هەر پەیدا بوو بێت چونکە قبولی گۆڕان دەکات، بەڵام (کۆن) (قدیم) ناگۆڕێت دوای ئەوەی کە قورئان باسی فەرمانی پەیدا بوونی مرۆڤ و ماددە و گەردون بەم شێوە سادە و ئاشکرایە

دەکات، بەرەو بەلگە خوازی عەقلّ ملدەنێ، لەسەر بنەمای (یاسای هۆو هۆکار) ئەو یاسایەی کەعەقلّ بە ئاشکرا بەکاریدەهێنێت و لەهۆو هۆکاری پەیدا بوونی گەرد ون و هۆکەی دەپرسێت.

بەشێوازێکی جوان و رازاوە و رەوان و کورت و پتەوو پڕ مانا پێشکەشی دەکات هەموو ئەو گریمانە مەحالانەی کەبێ باوەڕان و ئینکارکەران ئاماژەی بۆ دەکەن و موجادەلەی نەبوونی خودا دەکەن بەبێ زانست و رێپیشاندەرێ، کاتێك کە دەلێن:-

-گەردوون بەبێ هیچ هۆو هۆکارێك پەیدا بووە.

-یاخود لەخودی خۆیدا پەیدا بووە.

-یاخود گەردون و خودا یەك شتن.

-یاخوود ماددەی گەردون کۆنە وەك کۆنێتی خودا.

-یان دروستکراوەکان پەیدا بووی ناچارین بەبێ هیچ ویستێك و قورئان پێیان دەفەموێت:

﴿هَلْ أَتى عَلَى الإِنسانِ حينٌ منَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً﴾الانسان:١

﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾الطور:٣٥

﴿أَوَلا يَذْكُرُ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْئاً﴾مريم:٦٧

﴿أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لا يخلق أَفَلا تَذَكَّرُون﴾

﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ﴾القصص:٦٨

﴿مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمّىً﴾الاحقاف:٣

سەرنج بدە کە چۆن بەم رەوانبێژییە رازاوەیە عەقلی بێ باوەڕان و ئینکارکەران بەئاگا دەکاتەوە بۆ مەحالێتی گریمانەکانیان، و سەرنج بدە کە چۆن پالّ بەعەقلەوە دەنێت کە داوای هۆ و هۆکاری تەواو بکات و بەدوایدا بگەڕێت، و بڕیاری پێویستە بوونی بکات و پێویستە خاوەنی سیفاتی تەواو بێ بۆ پەیدابوونی ئەم گەردونە و دروستکردنی.

سەرنج بدە چۆن بەئاگایدەکاتەوە بۆ جیاوازیکردن و جیاکردنەوە لەنێوان خوداو گەردوندا سەبارەت بە حەقیقەت و خودو سیفاتیان بۆ مەحالکردنی بەوەی کە (هۆکارو هۆ) یەك شت بن یاخود هۆکار بەشێك بێت لەهۆ، پاشان سەرنج بدە کە خودا چۆن لەهەندێ ئایەتی تردا ئاماژەی پووچەلّی ئەو ووتانە دەکات کە دەلێن (دروستکردنی گەردون لەلایەن خوداوە پێویستە) (ضرورة).

چونکە دەبێت وەسفی خودای بەخشندە بەویستی بکرێت کە تەنها بەهۆی ئەو ویستەوە هەڵبژاردنی دیاریکردنی کاتی دیاریکراوی داناوە، کە ویستوویەتی گەردوونی تیادا پەیدا بکات... و (پێویستە دروستکردن) دەمانگێڕێتەوە بۆ ئەو ووتەیەی کە دەڵێت: گەردوون و مرۆڤ کۆنن.

﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً﴾الانسان:١

بەڵێ، هەر ئەمەیە کە زانست سەبارەت بە ژیانیش بەشێوەیەکی گشتی چەسپاندوویەتی، کەواتە پەیدا بووە و دروستکراوە، و (شیاوە بوونە)، نەك (پێویستە بوون)، و هەموو شتێکی بارەگاکانی ئاسمان و زەوی پەیدا بووە، چونکە ماددەیە و تێکەڵەیە و لەبەر ئەوەی دەگۆڕێت (شیاوە بوونە) و (پێویستە بوون) نی‌یە....

ئایا بە بێ هیچ شتێك دروستکراوە؟ یان بەبێ هۆ و هۆکاری تەواو پەیدا بووە؟ و ئەمەش مەحاڵە کە لایبنز و زۆر لە زانایانی تر ووتویانە و قورئانیش پێش ئەوانە بەهەزار ساڵ دەفەرموێت

﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾الطور:٣٥

ئایا دروستکراو دروستکەر یەك شتن؟.... و ئەمەش دووبارە مەحاڵە، چونکە ئەمە پێچەوانە لە عەقڵدا دروستدەکات وەك لایبنز و ئەوانی تر ددان دەنێن بەمەحاڵێتی یەك بوونی و یەك شتی هۆ وهۆکار.

﴿أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لا يَخْلُقُ أَفَلا تَذَكَّرُونَ ؟﴾النحل:١٧

ئایا (خودا گەردونی بەبێ هیچ ویستێك پەیدا کردوە؟)

چونکە سیفاتی تەواوی پێویستە بوونی خودا لەلای عەقڵ پوچەڵ دەکاتەوە، ئەوەی کە وویست و هەڵبژاردنی نەبێت خواوەند نی‌یە، و ووتەی بەوەی کەدروستکراو (پێویست) دروستیکردوە نەك وویست، وا دەگەیەنێت کە مرۆڤ کۆن بێت.... و سەلمێنراوە کە مرۆڤ پەیدا بووە

﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ﴾القصص:٦٨

ئایا گەردونی ئەزەلی وەك دروستکەرەکەی وایە، (وەك هەندێ باوەڕیان وایە) و ئەمەش دووبارە مەحاڵە، چونکە (پێویستە دروستکراو) نی‌یە بەڵکو بەهۆی وویستێکی ئەزەلی‌یەوەیە کەدیاریکردنو ناوی کاتی دروستکردنەکەی بردوە.

گەر (پێویستە دروستکردن) بوایە دەبوایە کۆن بوایە، بەڵام (پەیدا بووە)

﴿مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُسَمًّى﴾الاحقاف:٣

ئەمەیە وتەی راستی کەهیچ گومانێکی لە خۆ نەگرتووە، و هەموو ووتەیەکی تر جگە لەم وتەیە لاوازو بێ هێزە، هەروەك (مالی جالجالۆکە) کەبە روو کەش رێکخراوە و رێك ووردەکاریی‌یە کە جالجالۆکەکە لەناو خۆیدا دەیچنێت، تا.. بەهۆیەوە راوی مێروە بچووکەکان بکات.

هەروەك چۆن موجادەلەکەرەکان سەبارەت بەخودا بەبێ هیچ زانست و رێنمای بەك ووتەی نابەجێ دەچنن و دەینەخشێنن بەنیمچە گومانی لاوازیان کە تەنها لە سکی خۆیاندا دەریدەهێنن تاکو خاوەن ئەقڵی لاوازی پێ راو بکەن.

بەم چەشنە ئەی حەیران قورئان باسدەکات کە نێراوە بۆ مرۆڤێکی نەخوێندەوار لەدوور گەیەکی نەخوێندەوار ئەم هەموو بەڵگە بڕەرانەی عەقڵ، و بەڵگە رۆشنە پتەوەکان کە زانایان و دانایان تەمەنی خۆیان تیادا بەسەر بردوە تا پێی گەیشتوون و تیایدا بەیەك گەیشتوون (بەهۆی رێنمایی قورئان یان خودا کە عەقڵی بۆ رووناك کردونەتەوە)

کەبەرەوانترین دەربڕین و کورترین ئاماژەیی ناسکترین ئاگاداری و راسترین لێکچوون بەشێوازێك کە موعجیزەی لەخۆ گرتبێت، و تیایدا ئەو بەڵگانە بەدەردەخات کە بگونجێت لەگەڵ دەرك کردنی نەزاندا، و هەندێکی بەشاراوەیی دەمێنێتەوە لە قولایی‌یەکی زۆردا بۆ وەچەیەك کە تەنها زانایان بتوانن بچنە ناخیەوە.

حەیران / تەنها زانایان.... تەنها زانایان.. ﴿وَتِلْكَ الأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلاَّ الْعَالِمُونَ﴾العنكبوت:٤٣

شێخ/ سوپاس بۆ خودا ، ئەی حەیران تێپەڕ بووین بەسەر تاقیکردنەوەکەدا و خەریکە دەرکی ئەوە بکەیت کە چۆن عەقڵ و زانست و قورئان یەکیان گرتووە.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت: ئەو ڕۆژەم بردە سەر بە پێدا چوونەوەی ئایەتەکانی قورئـان و بەراوردکردنیان لەگەڵ وتەکانی ئیبن سینا و غەزالی لەسەددەی دوانزەو سیانزەی زاینی، و دیکارت و باسکال و لایبنز لەسەدەی حەڤدەهەمدا، موچرکەیەکی خۆشی و سەر سورهێنەرە بەلەشمدا هات لەئەنجامی بەیەك گەیشتنی ئەم عەقڵانە لەگەڵ قورئاندا کەهەردوو لایان یەك ڕێگای بەڵگە خوازیان گرتبوە بەر.

کاتی وانەکانم چوومە لای شێخ، دەبینم چەند دەرزییەك لەبەردەمیدایە و هێڵی ڕەنگاو ڕەنگی پێدە نەخشاندن، وەختێ سلاوم لێکرد بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی/:-

شێخ: چیتە ئەی حەیران، لات وایە شێخت لە مامۆستاوە بۆتە بەرگدروو فالچی؟!.

حەیران/ خودا نەکا گەورەم.

شێخ/ بەڵێ ئەمانە دەرزین، بەڵگەکانی پێنەدورم، دوومەڵ و برینی خاوەن ئەندێشەوێڵەکانی پێتیمار دەکەم و خەوالوە بێ ئاگاکانی پێئاگادار دەکەمەوە، و سیحری فالچی و جادو کەرانی پێ پووچەڵدەکەمەوە.... و زۆر کاری تری پێدەکەم.. لەدوایدا، بۆت بەدەردەکەوێت ئەی حەیران!.

حەیران: ئایە بە بەڵگە دەدوێ گەورەم؟

شێخ/ بەڵێ، بەڵگە هەروەك قوماش پێویستی بەدانانی پێوەر و شێوە هەیە، بەگوێرەی پێوەری عەقڵی کەسی بەرامبەر، وەك چۆن بەرگدورێك قوماشەکە بە پێوەری لەشی خاوەنەکەی دەبڕێت، و بەهۆی بنەما سەرتاییەکانی دوورین و ووردەکاری بەرگدرو کە پارچەکانی پێکەوە دەلکێنێ ئایا... ئێمە فەرمانمان پێنەدراوە کە گفتوگۆ بکەین لەگەڵ خەڵکدا بەگوێرەی ئەقڵیان؟

حەیران:ئەمە شێوازێکی نوێی بەڵگە هێنانەوەیە.

شێخ/ ئەمە شێوازێکی نوێ نییە بەڵکو هەندێ لە زانایان باسیان کردوە تا بەڵگە بهێننەوە بۆ دورخستنەوەی (لەبیرۆکەی ڕێکەوت) بەلام من بەشێوەی مەتەڵی تازە بۆم

دارشتوویت.

حەیران/ ئەو مەتەڵە تازەیە چی‌یە گەورەم؟

شێخ/ ئەمە مەتەڵێکە کۆتایی دێت بە بەڵگەیەکی ژمارەیی کە ئەمەش بیرۆکەی رێکەوت دوور دەخاتەوە.

ئەو رێکەوتەی کە مادیەکان سەبارەت بەدروستکردنی گەردوون و ئەوشتە جۆراو جۆرانەی کەلەخۆی گرتووە باسیدەکەن.

حەیران/ مەتەڵێك کە بەبەڵگەی ژمێرەیی کۆتایی دێت!

شێخ/ تا... ئێستاش گاڵتەت بەمەتەڵە عەقلیەکان دێت... ئایا نایەتەوە یادت مەتەڵی کاغەزە پارچە کراوەکان.... بۆم بەدەرخستنی جیاوازی نێوان ئەندێشەو بەگەڕخستنی عەقڵ؟

ئێستا با... دەستپێبکەین و لەدەفتەرەکەتدا ئەم پرسیارە بنووسە.

گەر پرسیارکەرێك پرسیاری لێکردیت سەبارەت بەم هەموو شتە بینراوەانەی گەردون، چۆن پێکهاتوون و چۆن یەکیان گرتووە؟ چۆن دروستکراون؟ و ئەو گریمانانە چین کە بتوانین ئەندێشەیان بکەیت؟

حەیران/ مەبەستی ئەم پرسیارە تێنەگەیشتم گەورەم، پاش ئەم تاقیکرنەوەیەی کە بەسەرمدا تێپەڕی دەتوانم بڵێم ئەم شتانە هەمووی بەتوانای خودا بووە.

شێخ/ جارێ با.... باوەڕهێنان بخەینە ئەو لاوە، وای دابنێ کە گەڕاویتەوە بۆ گومانی یەکەمجارت کەلەدڵتدا پەنگی خواردبۆوە،/ و ئەو رۆژەی کە هاتیتە لام.

حەیران/ ئایا شێخم دەیەوێت تاقیکردنەوە سەبارەت بە چەسپاندنی پەیدا بوونی گەردون و پووچەڵکردنەوەی کۆنێتی یەکەی دووبارە بکاتەوە؟

شێخ/ نەخێر... نەخێر، من پرسیارت دەربارەی ئەمەت لێناکەم، واز لەو ماددە بنەڕەتە هیولانیە بهێنە کە دروستکراوەکانی لێپەیدا بوون، و دووبارە واز لەو لێکۆڵینەوانە بهێنە کە گوایە پەیدا بووە یاخود کۆنە، من ئێستا پرسیارت لێدەکەم وەك چۆن قورئانیش پرسیار دەکات، لەوانەی کەلەبارەگای ئاسمانەکان و زەویدا هەیە لەو شتە پێکهاتەو جۆراو جۆرانەی کەهەیە، چۆن دەگونجێت ئەم شتانە دروستکراو و پەیدا بووبن؟

ئەم وێنە و شێوازە جۆراو جۆرە پێکهاتانە بەگشتی زیندووەکانیان وەك رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ بەتایبەتی، نەعەقڵ دەڵێت ئەمانە کۆنن، چونکە مەحاڵە لەبەر ئەوەی

تێکەڵە و گۆڕانیان لەخۆ گرتووە مەحاڵە کۆنێتیان. و نەزانستیش دەڵێت کۆنن، چونکە چینەکانی زەوی بەدەریخست کە پەیدا بوون وە پەیدا بوو، ئەوە دەگەیەنێت کە ئەمانە پێکهاتەو دروستکراون پاش ئەوەی نەبوو بوون، کەواتە چۆن دەگونجێت بووترێت ئەمانە دروستکراوو پێکهاتەن لێرەدا تەنها سێ گریمان (فرضية) هەیە و هەرگیز نابێت بە چوار.

یەکەم/ دەبێت لەدروستکراوی خودا بێت.

دووەم/ ئەمانە هەمووی دروستکراون لە گەردیلە و بەش و توخمەکانی مادده بەهۆی (وویست و نیازو مەبەستەوە) واتە توخمەکانی مادده بنەڕەتیەکانی لە خودی خۆیاندا بیریان کردەوە و ڕەخساندنیان و ڕێکەوتن لەسەر دروستکردنی جۆراو جۆرایەتی شتەکانی ناو گەردون بەم وێنە و شێوازانەی کە دەیبینین.

سێهەم/ دەشێت ئەم جۆراو جۆرایەتی‌یە بە (ڕێگای ڕێکەوت) دروست بوو بێت واتە گەردیلە بەیەك گەیشتن و کۆمەڵبوون لەسەر ڕێژەی حاڵاتی تایبەتی بەڕێگای ڕێکەوت بەمەش توخمە ڕەسەنە بنەڕەتیەکان دروستبوون پاشان توخمەکان یەکیانگرتو و کۆمەڵ و تێکەڵبوون بەڕێکەوت بەڕێژەی لەبارو گونجاو بە (ڕێکەوت) و لەماوەیەکی پێویستدا بە (ڕێکەوت) و بارودۆخی گونجاو بە (ڕێکەوت) بەمەش جۆرایەتی دروستبوو و ژیانیش لەم (ڕێکەتانەوە) پەیدا بوو.

حەیران/ بەڕاستی گریمانی چوارەم نیە تا بتوانێت ئەندێشەی بکرێت؟

شێخ/ سەبارەت بە گریمانی یەکەم باوەڕداران بەخودا باوەڕیان پێی هەیە.

ئیتر، باوەڕهێنانیان لە ڕێی ئاینەوە بێت یاخود لە ڕێی عەقڵەوە، گریمانەی دووەم هەرگیز هیچ کەسێك باوەڕی پێی نی‌یە نەباوەڕداران و نە ماددیی‌یەکان، بەڵکو زیاد لەوە ماددیی‌یەکان ئینکارێکی بڕەری دەکەن، بەوەی کە توخمەکانی مادده لەخودی خۆیاندا خاوەن ویست و نیازو مەبەستن کەواتە ئێمە لەبەردەمی دوو گریمانین کە سێهەمی نی‌یە، یان دەبێت گەرون و جۆرایەتیەکانی تەنها لەدەستکردی خودا بێت، یاخود لە ئاکامی ڕێکەوت بێت.

چی‌یە، حەیران، لە چاوەکانتا هەندێ تەمو مژی بیرەکانت دەخوێنمەوە کەلە کەلێنەکانی عەقڵدا هاتوو چۆدەکەن... ئایا لەم باسانەی کە ئێستا دەیلێم هیچ کەلێنێکی تیادا بەدی دەکەیت کەبەرەو کەمترین بێ باوەڕیت بەرێت.

حەیران/ نەخێر گەورەم... سوێند بێ بەخودا... هەموو ووتەکانت ئاشکرایە، بەڵام ئایا (ڕێکەوت) کارێکی مەحاڵە لەلایەن عەقڵەوە و یاخود کارێکە لە چوارچێوەی تواناداپە؟

شێخ/ دەتوانیت لەهەمان کاتدا بە بەڵێ و بەنەخێر وەڵام بدەیتەوە، ڕێکەوت هەندێ جار شیاوە، و هەندێ کاتیش لەلایەن عەقڵەوە کارێکی مەحاڵە، کەواتە دەبێت شێوازی پرسیارەکەت بگۆڕیت و چاکتر وایە بڵێیت، بەهای ڕێکەوت چەندە لە پێوەری عەقڵی ساغدا؟

حەیران/ کەواتە بەهای ڕێکەوت چەندە لە پێوەری عەقڵی پوختدا؟

شێخ/ ئێستا... نۆرەی دەرزییەکان هاتووە، ئەم لەو حەیە بگرەو دەرزیەکی تیا بچەقێنە و لەکونی هەمان دەرزی، دەرزیەکی تر دابنێ.

ئێستا پێم بڵێ ئەی حەیران/ گەر مرۆڤێکی ژیر ئەم دوو دەرزییە بەم چەشنە ببینێ و پرسی چۆن دووەم دەرزی چۆتە کونی دەرزی یەکەمەوە، و مرۆڤێکی ڕاستگۆی بەناو بانگ پێی ڕاگەیاند کەوا پیاوێکی کارامەی لێهاتوو لە دووری (١٠م) دەرزی دووەمی هەڵداوە کەوتۆتە کونی دەرزی یەکەمەوە، و پیاوێکی ڕاستگۆی تر پێی ڕاگەیاند کەوا منداڵێکی بەزگماك کوێر، دەرزی دووەمی هەوڵداوە بەڕێکەوت چۆتە کونی دەرزی یەکەمەوە، ئایا چ کام لەم دوو هەواڵە شیاوی باوەڕن.

حەیران/ گومانی تیادا نییە کە باوەڕ بەهەواڵی یەکەم دەهێنرێت بەڵام بەرامبەر ڕاستگۆیی هەردوو هەواڵنێرەکە، دەبینرێت ڕێکەوت شیاو بێت، و ناتوانرێت ڕاستی هەواڵێکیان بسەپێنرێت بەسەر ڕاستی هەواڵەکەی تریاندا.

شێخ/ گەردمان دەرزی سێهەم لەهەمان حاڵەتدا کراوە بەکونی دەرزی دووەمدا، ئایا نەبوونی ئەم زاڵبوونە وەك خۆی دەمێنێتەوە.

حەیران/ نەخێر.... لایەنی مەبەست و نیاز بەسەر ڕێکەوتدا زاڵدەبێت بەلام هەرچۆنێك بێت زاڵبوونێکی لاوازە.

شێخ/ گەر پیاوێك (دە) دەرزی بینی یەك بەدوای یەکدا کراون بەکونی یەکتردا، ئایا بیرۆکەی زاڵبوونی مەبەست و نیاز بەلاوازی دەمێنێتەوە؟

حەیران/ نەخێر، ئەو کاتە زاڵبونی بیرۆکەی مەبەست و نیاز پتەو دەبێت بەچەشنێك کە وەختە بیرۆکەی ڕێکەوت لەناوبچێت.

شێخ/ بەلام گەرپیاوێك ئەم فەرمودەیەی قورئانی بەراستی تیادا بەدیکرا ﴿وَكَانَ الْإِنسَانُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلاً : مرۆڤ لە هەموو شتێ زیاتر موجادەلەی لەخۆ گرتووە﴾الكهف: ٥٤

دەستیکرد بەموجادەلەکردن لەگەلیدا دەربارەی مانای مەحالی لەلای عەقڵ و مانای مەحالی ئاسایی لەگەلیدا، و بە بەلگە بۆی بەدەربخات کە (ڕێکەوت) مەحاڵ نی‌یە نەلەلایەن عەقڵەوە نەلەلایەن نەریتەوە، بەلام هەندێ جار ئەم ڕێکەوتە دوورە، و هاوڕێ ژیرەکەمان پێویستە ملکەچی ئەم ڕاستیە بێت.

حەیران/ بەڵێ، عەقڵ ملکەچی دەبێت بەلام دڵ هەر بەلای مەبەست و نیازدا دەڕوات.

شێخ/ گەر زیاتر ئالۆزی مەتەلە کە ئاسان کەین،وتمان هەردە دەرزیی‌یەکە نمرەیان پێدراوە، بەهێڵێك کە هەریەکەیان ژمارەی خۆیان پێوەیە، لە (١) تا.... (١٠) و پێمان ڕاگەیەنرا کەوا منداڵە کوێرەکە کیسەیەکی دراوەتێ کە (١٠) دەرزیی یەکەی تێدایە بەتێکەلاویی و پرشو بلاوی و دەستدەکات بەکیسەکەدا و هەر (١٠) دەرزیی‌یەکە یەك بەدوای یەك بە پێی ژمارەکانیان دەردەهێنێت بە ڕێگەی ڕێکەوت. و هەلیدەدات و دەکەوێتە کونی ئەو دەرزیی‌یە کەوا لە لەوحەکەدا چەقێنراوە و دووەم دەکەوێتە یەکەمەوە، و سێهەم دەکەوێتە چوارهەمەوە... و بەم چەشنە تا (١٠) دەرزیی‌یەکە یەك بەدوای یەکدا دەکەونە ناو یەکەوە بە پێی ژمارەکانیان دەردەهێنێت بەڕێگەی ڕێکەوت، و ئەو مرۆڤە کە هەمیشە هۆگری موجادەلەیە هەولئەدات کە بەبەلگە بیسەلمێنێت کە (شیاوی ڕێکەوت) تا... ئێستا بوونی هەیە و مەحاڵ نی‌یە بۆ عەقڵ، جا هەلوێستی هاوڕێ ژیرەکەمان چۆن دەبێت لەگەڵ ئەم موجادەلە گیرەدا.

حەیران/ گومانی تیادا نی‌یە کە باوەڕی پێناکرێت، چونکە ڕێکەوت بەم یەك بەدوای یەکەدا، گەر مەحاڵ نەبێت گومان لێکراو دەبێت.

شێخ/ بەلکو لە بواری ژمێرە زۆرەکاندا ئەم مەحالی‌یە بە ئاشکرا دەردەکەوێت.

حەیران/ باوەڕم وایە ئەم بەلگە ئاشکرایانە دەستماندەکەوێت لە ئەنجامی ئەزموونەکانی ژیانماندا کە زۆر بەکەمی (ڕێکەوت) بەم چەشنەیەك بەدوای یەکە دووبارە دەکاتەوە.

شێخ/ نەخێر، بەڵام ئەم ئاشکرایی‌یە لە ناخی عەقڵی نادیاردا پەنادەبات بۆ یاسای عەقڵی ژمێرەیی کە دەرباز بوون نیە لێی.

حەیران/ ئەو یاسایە چی‌یە گەورەم.

شێخ/ ئەو یاسای ڕێکەوتە کەدەڵێت/ بەشی ڕێکەوت واناسراوە کە زیادو کەم دەکات بەرێژەی پێچەوانەیی ژمارەی (هاولەبار) (متکافئ)و (بەیەکدا چوو) (متزاحم) چەند ژمارەی شتە بەیەکدا چووەکان کەم بێتەوە، ئەوەندە بەشی ڕێکەوت لەسەرکەوتندا زۆر دەبێت، و بەپێچەوانەوە چەند زیادی کرد ئەوا بەشی ڕێکەوت کەم دەبێت، گەر ئەم ململانێ‌یە لەنێوان دۆستی هاولەباردا بوو ئەوا کەم دەبێت، گە ئەم ململانێیە لەنێوان دوو شتی هاولەباردا بوو ئەوا بەشی ڕێکەوت بەرێژەیی (یەك بەدوو دەبێت، و گەر ململانێ لەنێوان) (١٠) شتدا بوو بەشی ڕێکەوت بە ڕێژەی (١ بۆ ١٠) دەبێت، چونکە هەریەکەیان هەلی سەرکەوتنی وەك هەلی سەرکەوتنی ئەوی تریان دەبێت، بێگومان بەبێ کەمترین جیاکردنەوە، ئالێرەدا سەرکەوتن بۆ بەشی ڕێکەوت نزیك دەبێت لەو دوو شتەی کەململانێ کەیان لەنێواندایە گەر (١٠) بن یاخود (١٠٠٠)، بەڵام تا.... ڕێژەی ژمێرەیی ژمارەیەکی زۆر و بێ کۆتایی بێت بەشی ڕێکەوت نەبوو دەبێت، بەڵکو مەحاڵ دەبێت، گەر ڕێکەوت بۆ منداڵە کوێرەکە یەکەمجار ژمارەی یەکەمی بەیەکدا چووەکانی تردا بەرێژەی (١ بە ١٠) گەر بۆ ڕێکەوت کە دوو ژمارە ڕابکێشێت (١، ٢) یەك بەدوای یەکدا دەڵێین، ڕێکەوت بۆ ژمارەی دووەم بەرێژەی (١ بە ١٠٠) دەبێت، پلەی دەهەم ململانێی پلەی دووەم دەکات کەدژی دەهەمە، ئەو کاتە ململانێ لەنێوان پلەی سەداندا دەبێت، و گەر بۆ منالە کوێرەکە ڕەخسا کەوا هەرسێ ژمارەی (١، ٢، ٣) یەك بەدوایەکدا ڕاکێشا، دەڵێین بەشی ڕێکەوت بە ڕێژەی (یەك بەهەزارە) چونکە هەریەکە لەدەیەکان ململانێی خانەی سەددان دەکەن گەر دووبارە وامان دانا کەمنالەکە دە دەرزیی‌یەکەی بەپێی ڕیزبەندی ژمارەکان ڕاکێشا، ئەو کاتە بەشی ڕێکەوت بەرێژەی (یەك بە دەملیار) دەبێت.

حەیران/ یەك بەدەملیار!!.....

شێخ/ ئەمەیە مەتەڵی ژمێرەی ساکار، هەروەك مەتەڵی کاغەزە تەنکە پارچەکراوەکە بۆ ٤٨ کەرەت بەمەش قەوارەی دەگاتە مانگ تاقیبکەرەوە و هەموو جارێك ئەنجامەکەی ژمارەی (١٠) ی بکە.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت/ دەستم کرد بە ژمێرەکردن لەکۆتاییدا ڕاستی وتەکانی شێخم بۆ بەدەرکەوت و پێم ووت.

حەیران/ بەڕاستی گەورەم بەشی ڕێکەوت بەڕێژەی یەك بە (١٠) ملیار دەبێت لەگەڵ بوونی ئەم ڕێژە لەبەك دووره لەگەڵ ئەوەشدا وا ئەندێشەی دەکەم کە ڕێکەوت لە ڕامێشانی ئەم (دە) دەرزییەدا بەپێی ڕیزبەندی ژمارەکانیان، شیاوە و مەحاڵ نییە.

شێخ/ ئێستا دەچینە سەر ڕیزبەند و شێوەیەکی ترو ژمارەیەکی زۆرتر. گەر گریمان تۆ . خاوەنی چاپخانەیەکی (بریتی بێ لە (نیو ملیۆن پیت) و ئەو پیتانە دانرابێ لەناو سندوقەکاندا، گومەلەرزەیەکی گەورە هات و سندوقەکانی قلبکردەوە و پیتەکانی برش و بلاوو تیکەڵ بەیەکتر کرد، گەر ڕێکخەری پیتەکان هات و بینی لەئەنجامی تێکەڵبوونی ئەم پیتانە بەڕێکەوت (دە)وشەی جیاوازی پێکهێناوە کە ماناکەیان لەیەکترەوە دوورن، ئایا باوەڕت دەکرد؟

حەیران/ بەڵێ ، باوەڕم دەکرد.

شێخ/ بەلام گەر ووترا ئەم (دە) ووشەیە یەك ڕستەی چڕو تێری دروستکردووە، ئایا باوەڕت دەکرد؟

حەیران/ ئەمە بەدوور دەزانم بەلام وەك نموونەی (١٠) دەرزییەکە بەمەحاڵ نازانم.

شێخ/ بەلام گەربێت ڕاگەیەنرا کەوا پیتەکانی چاپخانەکە بەگشتی لەدوای تێکەڵبوونیان بەڕێکەوت کتێبێی (٥٠٠) لاپەڕەیی پێکهێنا کە هەموو یەك پارچە هونراوەیەکی تەواوی ڕێك و پێکی پڕمانا و یەك قافیەو یەك کێشە، ئایا باوەڕت بەمە دەکرد ئەی حەیران؟

حەیران/ هەرگیز باوەڕی پێناکەم گەورەم.

شێخ/ بۆچی باوەڕی پێناکەیت ئەی حەیران.

حەیران/ چونکە، لێرەدا مەحاڵ بەئاشکرایی دەبینم.

شێخ/ بۆچی ئەی حەیران؟

حەیران/ نازانم گەورەم، بەلام نموونەی (١٠) دەرزییەکەو ڕاکێشانیان بەپێی ژمارەکانیان بەڕێکەوت، مەحالی ئاشکرا نەبوو تیایدا، بەلام لەنموونەی ئەم کتێبەدا مەحاڵ زۆر ئاشکرایە.

شێخ/ دەزانیت هۆی ئەمە چییە ئەی حەیران؟

حەیران/ نەخێر گەورەم.

شێخ/ هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ یاسای ڕێکەوت خۆی بەیەکدا چوون لەنێوان (دە) دەرزیی‌یە ژمارەکراوەکاندا ڕوودەدات بۆ (١٠) پلە، بەمەش بەشی ڕێکەوت بەرێژەیەك بە (١٠) ملیار دەبێت، و ئەم ڕێژەیە لەگەڵ بوونی دووریان لەیەکتر ئەوەندە نی‌یە تاکو لە عەقڵتدا ئەو ئاشکرایی‌یە دروستبکات کە دەرك بەمەحاڵیەکەی بکەیت.

بەڵام بەیەکدا چوونی پیتەکانی کتێبەکە لەنێوان (٥٠٠) هەزاردا بۆ دروستبوونی نزیکەی (١٢٥) هەزار وشە، بەشێواز و ڕیزبەندیەکی وەها کە نەژمێرەو نەئامار بکرێت.

ئەمەش وا لەبەشی ڕێکەوت دەکات کەیەك بەرامبەر ژمارەیەکی زۆر زۆر بێت گەر بڵێیت ژمارەکە ملیار ملیارە هێشتا هەر کەمە.

تەنها ئەوەت بەسە کە زۆری ژمێرەکە دەرك بکەیت بەوەی کە ئەگەر ژمارەی دەرزیی‌یەکان لە جیاتی (١٠) ، (١٢) بێت ئەو کاتە بەشی ڕێکەوت (یەك بەرامبەر هەزار ملیار) دەبێت و گەر دەرزیی‌یەکان (٢١)بن ئەوا بەشی ڕێکەوت (یەك بەرامبەر هەزار ملیار ملیار) دەبێت، ئالێرەدا ئەندێشە بکە ئەی حەیران بەشی ڕێکەوت چەند دەبێت گەر بەیەکدا چوون ڕووبدات لەنێوانی (٥٠٠) هەزار وشەدا بە شێواز و ڕیزبەندییەکی وادا کە نەژمێرە و نەئامار بکرێت...

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت/ ئالێرەدا، شێخ بێدەنگ بوو و هەردوو چاوەکانی نوقاندو خۆیدا بە دەست خامۆشیەکی زۆر قوڵەوە بەشێوەیەك کەوای لێکردم منیش بۆ چەند ساتێك بێدەنگ بم و بیر کەمەوە....

بەلام ئەوەندەی پێنەچوو بێدەنگی‌یەکەی بچڕاندو ووتی

شێخ/ ئەمە سەبارەت بەکتێبی چاپخانەکەو ووشە دیاریکراوە ژمێراوەکان ئەی حەیران، ئەی ووتەت چۆن دەبێت بەرامبەر بە کتێبی خودای مەزن و ووشەکانی کە دەربارەیان خودای گەورە دەفەرموێت:-

﴿قُلْ لَوْ كَانَ الْبَحْرُ مِدَاداً لِكَلِمَاتِ رَبِّي لَنَفِدَ الْبَحْرُ قَبْلَ أَنْ تَنْفَدَ كَلِمَاتُ رَبِّي وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِ مَدَداً﴾الكهف:١٠٩

دەفەرموێت:-

﴿وَلَوْ أَنَّمَا فِي الْأَرْضِ مِنْ شَجَرَةٍ أَقْلامٌ وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِنْ بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾لقمان:٢٧

حەیران/ ئایا مەبەستی شێخی گەورەم لە کتێبی خودا قورئان و ووتەکانێتی؟.
شێخ/ تکام وایە تێگەیشتنت بۆ قورئان لەمە قوڵترو بەرزتر بێت، ئەی حەیران و ووشەکانی قورئان کەلەنێوەندی ئەم دوو بەرگەدایە، دیاریکراوو ژمێراوە، لەبەر ئەوە پێویستی بەو هەموو مەرەکەبە نی‌یە کە دەفەموێت ئاوی دەریاکانیش هێشتا کەمە بۆ نووسینەوەیان، و یان پێویستی بەو هەموو قەڵەمەنی‌یە کە دەفەرموێت گەر دارەکانی سەر زەوی هەموو ببنە قەڵەم.
حەیران/ سوێند بێت بەخودا منیش هەمان رام هەبوو.
شێخ/ نەخێر ئەی حەیران، بەڵکو مەبەستم لە کتێبی خودا، لێرەدا هەموو گەردونە بەگشتی و مەبەستم لە ووشەکانی خودا، هەروەك خودا خۆی دەیەوێت هەمو شتەکانی ناو بارەگاکانی ئاسمانەکان و زەوی شتە لەو هەستدارانەی کە تایبەتە بەجیهانی دروستکراوەوە، یاخود ئەو شتانەی کە عەقڵ باوەڕی پێیانە و نەبیراون و چۆن ووشەکانی خودا لەبن دێت ئەی حەیران گەر هەموو گەردیلەیەکی ناو ئەم دەریایانەو درەختەکانی سەرزەوی بەگشتی لە ووشەکانی خودا بن، بەڵکو هەموو شتەکانی گەردون لەگەردیلە و توخمە و ڕێکخستن و یاسا و سیستم و بەرێژەو بەستن و پەیوەندی و دیرایکراو قەوارەو کێشەو ماوە و کات و چەرخ و وێنە و شێواز و ڕەنگ و جووڵە و بێ جوڵە و حاڵەتی جۆراو جۆر وەرەگەزەکان و پۆلێنەکان و جۆرەکان هەموو بەگشتی لە ووشەکانی خودا بن.
حەیران/ خودای مەزن ڕاستی فەرمووە.
شێخ/ ئێستا گەیشتینە ناوەرۆکی باسەکەمان، وەرە ئەی حەیران، با... پێکەوە ئەندێشەو پێشبینی ژمێرەی گەردون بکەین لەو شتە دروستکراوانەی ناو بارەگاکانی ئاسمانەکان و زەوی هەر لە گەردیلەوە تاکو... مەجەرەکان، و ژمێرەی ئەو پەیوەندیانە بکە کە لەجیهانی ئەندێشە و فەرماندا هەیە بە گوێرەی بەستن و پەیوەندیان لەسەر جیاوازی سیستمەکانیان و دیاریکراوەکان و ماوە و وێنە و جووڵە و حاڵاتیان، لەپاشدا لەسەر ڕۆشنایی (زانست و قورئان) هەندێ لە شتەکانی ناو گەردونە سەبارەت بەرێژەو کێشەو ڕێکخستن و پۆلێنکردن و بڕیارو ووردەکاریی، تاکو بزانین بەشی ڕێکەوت چەندە لە پێکهاتنیاندا؟!.
هەندێ لەو کۆمەڵە ئایەتانەی کە تێپەڕبوو بەسەرماندا ئەمانەن:-
﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾القمر: ٤٩

﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيراً﴾الفرقان:٢

﴿وَكُلُّ شَيْءٍ عِنْدَهُ بِمِقْدَارٍ﴾الرعد:٨

﴿وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾الحجر:١٩

﴿وَإِنْ مِنْ شَيْءٍ إِلَّا عِنْدَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ﴾الحجر:٢١

﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ﴾المؤمنون:١٨

﴿صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾النمل:٨٨

﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾السجدة:٧

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾التين:٤

﴿مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ﴾الملك:٣

﴿قُلِ انْظُرُوا مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾يونس:١٠١

﴿وَكَأَيِّنْ مِنْ آيَةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ﴾يوسف:١٠٥

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾فصلت:٥٣

ئەمە ئەی حەیران هەندێ لەفەرموودەکانی خودایە کەبۆ بەندەو نێراوی خۆی محەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) کە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار لە زنجیرەی خێڵە نەخوێندەوارەکان و پەروەردەی کۆمەڵگای نەخوێندەوارە پێش چواردە سەددە.

وەرە با... سەرنجێك بدەین وەك خودا فەرمانمان پێدەکات لە هەندێ لە شتەکانی ئاسمانەکان و زەوی لەسەر رۆشنیای زانست تا... ببینین ئایا لەدروستکراوەکانیدا ئەو دیرایکراویی و کێشە و وردەکاری و قەشەنگی و راست و رێکی هەیە، کە خودا لە قورئاندا ناویان دەبات، تا ببێتە بەڵگە بۆ مەبەستە دروستکراوەکانی دژ بەرێکەوت وەتاکو ببینین ژمێرەی ئەو شتانە چەندە کەبەیەکدا چوون (لە گەردیلە و تۆخمەکان و شێوە پێوەر و کێشەو تایەبەتمەندی و سروشتی و سیستم و ماڵات و بارودۆخ و ماوە و چەرخ و کەش و هەوا) بۆ دروستبوونی ئەم گەردونە و لەپاشدا دەپرسین:

ئایا لای عەقڵ مەزەندە دەکرێت کە سەرکەوتن بەدەستبێت بۆ هەموو ئەم ڕیزبەندی‌یە سەرتاسەریی‌یە بەتەواوی ووردەکاریی و دیرایکراوی و هاوکێشەیی و وردەکاریی و ڕازاوە، تەنها بەهۆی ڕێکەوتەوە؟ لەبەرامبەر ژمارەیەکی زۆری ممکناتی تر، کە دژی یەك پێش بڕکێ دەکەن زانست چی دەڵێت بەشتەکانی ناو گەردون لەدیاریکراویی و ڕیزبەندی و کێشەداری و وردەکاری و ڕازاوەی و هەروەها ئەو یاساو سیستمانەی کە تیایەتی؟

من ناتوانم ئەی حەیران هەموو ئەو شتانەت پێ بڵێم کە زانست باسیدەکات چونکە من هەموو شتێکی زانست ئاگادارنیم تۆ شتێك دەزانیت و منیش شتێکی تر دەزانم، لێرەدا تەنها باسی ئەوە دەکەین کە هەردوکمان دەیزانین لە سنوری ئەو ئاماژەیەی کە قورئان پێی ڕاگەیانوین لە نیشانە پرشنگدارە دروستکراوەکانی خودا خۆی، تا...
سبەینێ چاوەڕوان بە ئەی حەیران.

# لە ئاسۆکاندا

﴿سَنُرِيهِمْ ءَايَـٰتِنَا فِى ٱلْـَٔافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ
أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ﴾ فصلت: ٥٣

# پێڕاوەکانی دەستی ڕاستی

## — بەشی یەکەم —

شێخ/ ئێستا ئەی حەیران بەچ ئایەتێکی خودا لەسەر دروستکراوەکانی دەستپێبکەین.

حەیران/ هەڵبژاردن بەدەستخۆتە، گەورەم و دروستکراوەکانی خودا لە ئاسمانەکان و لەسەر زەوی، و گەلێك لەوە زۆرترە کە ئامار بکرێن، ئایا هیچ رێگایەك هەیە بۆ باسکردنی هەمووی بەگشتی؟

شێخ/ هەڵبژاردن بۆ من نی‌یە بەڵام لەسەر پەیڕەوو پرۆگرامی قورئانی پیرۆز دەڕۆین، و ئەوە هەڵدەبژێرم کە خودای زانا و کاربەجێ هەڵیبژاردوە قورئان هانمان ئەدا بۆ سەرنجدانێکی سەرتاسەری تەواو کاتێك دەفەرموێت:- ﴿أَوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ﴾الأعراف:١٨٥

بەم سەرنجدانە سەرتاسەری‌یە تەواو دابەش دەکات کاتێك کە دەفەرموێت:- ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾فصلت:٥٣

ئەو ئایەتانەی هەڵدەبژێرێت سەبارەت بە ئاسۆو خودی خۆمان و چەند شتێکی تر، کە تایبەتمەندیان دەکات بەناو بردنیان لەبەر ئەوە چاکتر وایە بۆ ئێمە هەمان دابەشکردن و ریزبەندی بگرینە بەر بەڵام هیچ رێگا چارەیەکمان نیە، وەك وتت ئەی حەیران، لەلێکدانەوە و شیکردنەوەی ئەو ووتانەی کە سەبارەت بەو شتانەی کەلە ئایەتە قورئانیەکاندا هاتوون، پێویستە ووتەکانمان تایبەتمەند بێت لە چوار چێوەی ئەو شتانەی کە قورئان ناویان دەبات، تاکو بیانکەینە رێباز بۆ سەرنجدانە سەرتاسەریەکەمان هەروەك خودای زانا و کاربەجێ دەفەرموێت.

حەیران/ کەواتە یادەست بەو ئایەتانە بکەین کەتایبەتمەندن بە ئاسۆکانەوە

شێخ/بەڵێ لە ئاسۆکاندا.

حەیران/ لە ئاسمانەوە دەستپێدەکەین.

شێخ/ بەڵێ لە ئاسمانەوە دەستپێدەکەین ئەی... حەیران تاکو ببینین لەسەر رۆشنایی قورئان و زانست بەشی رێکەوت چەندە لەم دروستکراوە مەزنانەدا.

خودای مەزن لەکتێبە پیرۆزەکەیدا دەفەرموێت:

﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾الذريات:٤٧

﴿أَوَلَمْ يَنْظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِنْ شَيْءٍ﴾لأعراف:١٨٥

﴿أَفَلَمْ يَنْظُرُوا إِلَى السَّمَاءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِنْ فُرُوجٍ﴾ق:٦

﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾الرعد:٢

﴿وَ جَعَلْنا السَماءَ سَقْفاً مَحْفُوظاً وَهُمْ عَنْ آياتِها مُعْرِضُون﴾الانبياء:٣٢

﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً مَا تَرَى فِي خَلْقِ الرَّحْمَنِ مِنْ تَفَاوُتٍ فَارْجِعِ الْبَصَرَ هَلْ تَرَى مِنْ فُطُورٍ﴾الملك:٣

﴿أَأَنْتُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا، رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا﴾النازعات:٢٧-٢٨

﴿إنَّ اللهَ يُمْسِكُ السموات وَ الارْضَ أنْ تَزُولا﴾فاطر:٤١

﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجاً وَقَمَراً مُنِيراً﴾الفرقان:٦١

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ، وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ، لا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾يس/٣٨-٤٠

﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَوَاقِعِ النُّجُومِ، وَإِنَّهُ لَقَسَمٌ لَوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ﴾الواقعة/٧٥-٧٦

وەرە ئەی حەیران باسەرنج بدەین، وەك خودا فەرمانی پێداوین لەسەر رۆشنایی زانست بۆ ئەوشتانەی کەلە ئاسماندا هەیە بەبێ جیاوازی، بارەگای بەرزی بێ پایەی پێداوە لەگەڵ بنمیچی پارێزراوی دوور لە قڵیش و ئەستوورییەکی بەرزی بێ درز و لەسەر ئەمانەوە ئەو فراوانی و پانتاییەی کە پێی بەخشراوە خودای دروستکەری ئاسمان بەهەموو دەستەڵات و مەزنی خوداوەندێتی خۆیەوە دەفەرموێت ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾الذريات:٤٧

لەهەمان بارەگادا چەندەها ئەستێرە هەیە کە نەژمێرەو نەئامار دەکرێن و جێگەیان شایانی ئەوەیە کە سوێندی پێ بخورێت وەك چۆن خودا سوێندی مەزنیان پێ دەخوا.

سەبارەت بەچی... لە پانتایی ئاسمان باست بۆ بکەم، ئەی حەیران؟ ئەو پانتایی‌یەی کە ئێستا زانست پێی گەیشتووە هیچ کاتێك بە خەیالی هیچ کەسێکدا نەهاتووە لەو سەردەمەی کە قورئانی پیرۆزی تیا دابەزیووە.تۆ دەزانیت کە روناکی لە چرکەیەکدا ١٨٦ هەزار میلە واتە (٣٠٠ هەزار کلم) دەبڕێت واتە لە دەقیقەیەکدا (١١ ملیۆن و ١٦٠ هەزار) میل دەبڕێت و بەساڵێك لە ساڵانی ئێمە (٦ملیۆن ملیۆن) میل دەبڕێت یاخود نزیکەی (٦ هەزار ملیار) میل دەبڕێت.

ئەم ماوە دورو درێژە لە زاراوەی زانست پەروەراندا بەساڵی روناکی ناودەبرێت تاکو بەهۆیەوە زۆری دووریيەکانی ئاسمانی پێدەربڕێت، گەر پێمان ووترا ئەستێرەیەك ساڵە رروناکیەك لێمانەوە دورە واتە بەمانای ئەوەی کە (٦ملیۆن ملیۆن میل) لێمانەوە دوورە.

مانگ کەنزیکترین هەسارەی ئاسمانی‌یە لە گۆی زەوی رووناکی‌یەکەی لە ٢ چرکە کەمتر پێماندەگات، چونکە دووریی‌یەکەی لەزەویی‌یەوە ٢٤٠ هەزار میلە.

بەڵام خۆر رووناکیەکەی لەماوەی ٨ دەقیقەدا پێماندەگات چونکە دوریەکەی لە زەویی‌یەوە نزیکەی (٩٣) ملیۆن میلە، ئایا ئەزانیت ئەی حەیران نزیکترین ئەستێرە لێمانەوە دوای خۆر چەند لێمانەوە دوورە؟

حەیران/ دێتەوە یادم لەقوتابخانەدا فێر بووم کە رووناکی خۆر دوای _(٨) دەقیقە پێماندەگات و بەبیرم نایەت کە چیمان پێوتراوە دەربارەی مانگ و ئەستێرە.

شێخ/ نزیکترین ئەستێرە بۆ زەوی نزیکەی چوار ساڵی روناکی دورە.

واتە: دووریی‌یەکەی نزیکەی ٢٣ ملیۆن ملیۆن میلە.

حەیران/ ئەمە شتێکی سامناك و زۆرە

شێخ/ ئەمەشتێکی هیچە لەچاو (هەڵۆی بەرزە فڕ) (النسر الطائر).

کەلەدوای ئەمەوە دێت و دووریی‌یەکەی لێمانەوە ١٤ ساڵی روناکی‌یە وەك (هەڵۆی وەستاو) (النسر الواقع) کە ئەمیش ٣٠ ساڵی روناکی لێمانەوە دوورە و (ماسیگری رمدار) (السماك الرامح) کە ٥٠ ساڵی روناکی لێمانەوە دورە واتە نزیکەی ٢٩٤ ملیۆن ملیۆن میلە.

حەیران، بەراستی شتێکی کەمبوولە چاو ئەماندا.

شێخ/ هەروەها ئەمەش شتێکی هیچە و لەدوای ئەمانەوە ئەستێرەی وەها هەیە کە هەزارساڵی روناکی لێمانەوە دوورە و لەدوای ئەم کۆمەڵە هەسارانەی ئێمەوە بۆشایی سەدیم دێت، و یەکێك لەوانە سەدیمی (ئافرەتی زنجیردار) (المراة المسلسة) کە ملیۆن ساڵە روناکی لێمانەوە دوورە، و لەپشت ئەمانەشەوە سەدیمی تر هەیە کە بە بۆچوونی زانایان زۆر دوورە لێمانەوە و ئایا ئەمە دادت ئەدات بۆ تێگەیشتان ئەی حەیران!؟

مانای ئەم هەموو دووبارە کردنەوەیە، کە دروستکەری مەزن کە سەبارەت بە پانی و بەرینی ئاسمان دەفەرموێت ﴿وَالسَّمَاءَ بَنَيْنَاهَا بِأَيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ﴾الذريات:٤٧

حەیران/ پاك و بێگەردی هەر بۆ خودای دروستکەرو مەزن... چەند پاکو بێگەردە.

شێخ/ ئەمە سەبارەت بە پانتایی ئاسمانەوەیە بەڵام دەربارەی ژمارە ئەستێرەکان چیت بۆ باسبکەم... ؟ لەکۆندا ژمێرەی ئەستێرەکانیان بە هەزارەها دادەنا و لەپاشدا بەملیۆنەها ناویان دەبرد تاگەیشتە (٢ملیار) و ئەمڕۆ تەنها لە مەجەرەی خۆمان کە تیایدا دەژین ژمارەی ئەستێرەکان بە ٣٠ ملیار رێژە دەکرێت.

حەیران/ ٣٠ ملیار تەنها لەمەجەرەکەی خۆماندا؟

شێخ/ بەڵێ ٣٠ ملیار لەمەجەرەکەماندا کەبە (رێی کاکێشان) (درب التبان) ناو دەبرێت، و لای فەرنسییەکان بە (رێی شیری ناو دەبرێت) (الدرب اللبنـــية) و ئەم مەجەرەیە کە کۆمەڵەی خۆری ئێمە کەوتۆتە لایەکیەوە کە لەدوای ئەم مەجەرەیەوە (سەدیم) دێت کە (ئافرەتی زنجیردار) یەکێکە لەتێکڕایی ئەو سەدیمانە، بەڵکو... جیهانی سەدیمەکان کەتاکو... ئێستا بەهۆی ئامێری وێنەگرتنەوە (٥٥) هەزار سەدیم وێنە گیراوە لە پاشدا ووتوویانە گەر ئەم ئامێرانە پێشکەوتوو ترو زیاتر ووردەکاریی تیا بووایە، لەملیۆنێك سەدیم زیاترمان دەبینی،.

حەیران/ چەند سامناکە، پاك و بێگەردی بۆ دروستکەری مەزنە.

شێخ/ سەبارەت بە جێگەی ئەستێرەکانەوە چیت بۆ باسبکەم ئەی حەیران؟ زانایان وادەبینن کە ئەم ئەستێرانە جێگەی تایبەتی خۆیان هەیە کە نەجێگۆڕکێ دەکەن و نەدەگۆرێن لەبەر ئەوە لایان وابوو کە چەسپاون لە جێگاکانی خۆیاندا وەبە (چەسپاوەکان) ناویان دەبردن، کە خۆری ئێمە یەکێکە لەوان، کە چەسپاویش نییە، وەك چۆن لەم سەردەمەدا زانایان بەدەریانخست، بەڵکو هەموویان بەگشتی دەخولێنەوە و دێن و دەچن و هەریەکەیان لە سنوری قەرارگای خۆیاندا لەدوو هاتوو چۆی

جیاوازدان، کە هەریەکەیان دەچێتە ناو ئەوی تریان هەروەك دوو لەشکری هەنگ تێکەڵاو بووبن وایە، بەڵام ئەم هاتوو چۆیە هەمیشەو بەردەوامە لە جێگەو مەدارەکانی خۆیاندا کەنەجێگۆڕکێ دەکەن و نەدەگۆڕێن، بەرێژەی تایبەت بۆ هەریەکێکیان بەدرێژایی ئەم چەرخە ئەم سیستمە سەر سوڕێنەرە.جێگەی سوێندی مەزنی خودایە.

حەیران/ هەروەها خۆریش لە هاتو چۆدایە لەگەڵیاندا.

شێخ/ چۆن نا... کەخۆر ئەستێرەیە لەتێکڕای ئەستێرەکانی ئەم مەجەڕەڕەیە و هەروەك ئەوان هاتو چۆ دەکات و هەروەها کۆمەڵێك لە هەسارەکان بەدوای خۆیدا رادەکێشێت، و زەویش یەکێکە لەو کۆمەڵەیە.

حەیران/ خودا دەروت لێبکاتەوە وەك دەروت لەمن کردەوە، و زانست وا دەریخستووە کە ئەستێرەکان جێگیرو چەسپاون، و هەروەها خۆریش چەسپاوە، و من موجادەلەی مامۆستاکانم دەکرد لەمانای فەرموودەی خودا ﴿**وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ**﴾یس:٣٨

هەروەها فەرموودەی ﴿**وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ**﴾یس:٤٠.

شێخ/ لەهەموو ئەو باسانەی کە کردمان ئەی حەیران، کەوا راستییەکانی زانست بەهیچ جۆرێك لە راستییەکانی ئاین دوورناکەونەوە، ئەستێرەکان هەموو بەتێکڕایی دەخولێنەوە و هاتوو چۆ دەکەن و خۆریش لەگەڵیاندا دەخولێتەوە و هاتو چۆ دەکات و لەکۆندا وایان زانیوە کەلە (٢٦) رۆژدا یەکجار رۆژ بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بەڵام لایان وا بووە کە (چەسپاوە) نەجێگۆڕکێ دەکا و نەدەجولێ، و ئەمڕۆ بەچەشنێك بۆیان بەدەرکەوتووە کەهیچ گومانێکی تیا نییە، کەوا هەموو هاتوو چۆ دەکەن کۆمەڵەی خۆر لە ئاسماندا هاتو چۆ دەکات وەك چۆن هەموو ئەستێرەکانی مەجەڕەکەمان دەجولێن، و ئەوانەی لەدوای ئەمانیشەوە دێن هەموو بەگشتی هاتو چۆیەکی سەرسوڕهێنەر دەکەن لەناو جێقەرارگەی خۆیاندا، هەروەك قورئان دەفەرموێت ﴿**وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ**﴾یس:٣٨

بەهۆی جێگەی ئەستێرەکانەوە زانست بەدەریخستووە کە هەریەکەیان قەرارگەی تایبەتی خۆیان بۆ دانراوە، و جێقەرارگەی چەسپاویان هەیە کە بەهۆی روناکیو ژمارەیانەوە زانراوە، لە چەرخێکی زۆر کۆندا لەسەر شەش قەرارگە وەستا بوون و زانست هەر لە دۆزینەوەدایە تا... گەیشتنە ٢ قەرارگە، و لە پاشدا گەیشتنە ٢١

قەرارگە، و ئەوەی کە جێی سەر سوڕماندنە لەم قەرارگانەدا بەشێوەیەکی بەرزوو نزمی جوولە دەکەن بەگوێرەی ژمارەی ئەستێرەکان لەهەندێ کاتدا و هەندێ کاتی تر بەگوێرەی روناکیان بەرێژەیەکی سەیر بە پێی زۆر بوونی ژمارەی ئەستێرەکان یەك لەدوای یەك جێقەرارگەش زیاد دەبێت، بەم شێوەیە ژمارەی ئەستێرەکانی جێقەورارگەی یەکەم ١٤ ئەستێرە بوو و لەپاشدا بەرەو زیاد بوون چوو تا... گەیشتە قەرارگەی (٢٠) کە ژمارەی ئەستێرەکان تیایدا بوو بە (٧٦) ملیۆن ئەستێرە.

لە جێقەرارگەی (٢١)دا دەگاتە ٢ ملیار ئەستێرە و توانایی روناکی شتێکی سەیرە کەلەو جێقەرارگانەدا بەردەوامی لە جێقەرارگەی یەکەمەوە بەرەو زیاد بوون دەچێت و هەر کاتێك ژمارەی ئەستێرەکانی قەرارگەیەك زیاد دەکات، بەڵام دوای جێقەرارگەی (دەهەم) ی بەپێچەوانەوە توانای روناکی بەرەو کەمبوون دەچێت.

هەمان رێژەی دووری لەکۆمەڵەی خۆردا دەبینین، تۆ دەزانیت کەلە کۆمەڵەی خۆردا هەشت هەسار هەیە روناکی نین و بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە کە بچوکترینیان (عەتارد)ە و دوای ئەو مەریخ و ڤینوس و زەوی و ئۆرانموس و نیپتۆن و زوحەل و موشتەری و بلۆتۆ یەك لەدوای یەك دێن و (بلۆتۆ) ٣٠ ساڵ دەبێت کە دۆزراوەتەوە، و هەسارێکی نەشازە لە بچووکی قەوارەو دووری لە خۆرەوە لەبەر ئەوە ناگونجێت بیکەینە هۆیەکی (بڕەر) بۆ پوچەڵکردنەوەی ئەو رێژە سەر سوڕهێنەرەی کەلە پاشدا بۆت باسدەکەم سەبارەت بە دووری هەسارەکان لە خۆرەوە ئەمە دەربارەی قەبارەکانیان، بەڵام دووریان لە خۆرەوە هەسارەکان بەم پۆلێنە دێن، نزیکترینیان (عەتارد)ە کەرێژەی مام ناوەندییە دوورییەکەی لە خۆرەوە (٣٦ ملیۆن میلە، لە پاشدا (ڤینۆس) کەرێژەی مام ناوەندییە دووریەکەی ٧٦ ملیۆنە و زەوی مامناوەندییە دوورییەکەی ٩٣ ملیۆن و (مەریخ) دورییەکەی ١٤٢ ملیۆنە میلە و موشتەری دورییەکەی مام ناوەدییە ٤٨٤ ملیۆن میلە، و زوحەل دورییەکەی ٨٨٧ ملیۆن میلە، ئۆرانوس (١٧٨٢ ملیۆن میلە، و نیپتۆن نێوەندە دوورییەکەی لە خۆرەوە ٢٧٩٢ ملیۆن میلە.

ئەمانەی کەناوم بردن سەبارەت بە دووری قەبارەکانیان تاکو بە شتێکت بناسێنم کە تۆش دەتوانی لە ساکارترین کتێبەکانی گەردووناسەکاندا بەدەستبهێنێت و مەبەستم لە باسکردنیان بۆت تا بەدەریبخەم کە دوورییەکانیان بە رێژەیەکی وا دیاری کراوە کە عەقڵ بەرامبەری سەرسام دەبێت و زانایان بەدەریانخست کە دووری ئەم هەسارانە لە خۆرەوە بەرێژەیەکی دیاریکراو بەردەوامە بە گوێرەی ٩ پلە دەڕوات کە یەکەمیان

(سفر)ە وە لەپاشدا (٨) پلەی تر دێت کە لەژمارەي (٣) ەوە دەست پێدەکات بە شێوەی توانی دووبارە بەرەو ژوور دەبێتەوە : (٣-٦-١٢-٢٤-٤٨-٩٦-١٩٢-٣٨٤) گەر ژمارەی (٤) بخرێتە سەر هەریەکێك لەمانە و ئاکامی کۆکردنەوەیان لە ٩ ملیۆن میل بدرێت، رێژەی دووری ئەو هەسارانە دەردەچێت کەلەپلەی ئەم ژمارانەدا هەن : واتە بەزیادکردنی (٤) بۆ هەموو پلەکان و پلەی (٩) بەمجۆرەی لێدێت (٤-٧-١٠-١٦-٢٨-٥٢-١٠٠-١٩٦-٣٨٨) گەر ژمارەي ئەم پلانەمان وەرگرت هەریەکەیانمان لە (٩) ملیۆن دا دووری هەسارەکانمان لە خۆرەوە بۆ دەردەکەوێت.

بۆ نموونە هەسارەی (عەتارد) نێوەندە دوریی‌یەکەی لە خۆرەوە ٣٦ ملیۆن میلە هەروەك باسکرا، و لەبەر ئەوەی پلەی یەکەمە لەدووریدا ژمارەکەی (٤) دەکات، گەر ٤ ٩ ملیۆن بکرێت ئەنجامەی لێکدانەکە ٣٦ ملیۆن میل دەکات، بەم چەشنە رێژەی دووری هەسارەکان لە خۆرەوە دیاری دەکرێت لەگەڵ جیاوازیی‌یەکی کەمدا.

بەڵام سەرسام بوون کە چۆن ئەم پلانەی کەبۆ رێژەی دووری دیاریکراون (٩) پلەن لەکاتێکدا کەوا ناسراوە (٨) هەسار بێت دۆزیویانەتەوە کە پلەی (٢٨) هیچ هەسارێکی تیادا نی‌یە بەڵکو لەدوای مەریخەوە کەلەژمارەی (١٦) دایە هەساری مشتەری دێت کە خاوەنی ژمارە (٥٢)ە، ئایا نهێنی چی بێت، لە بوونی ئەم بۆشایی‌یەدا؟

یان ئەوەتا ئەم رێژەی‌یەی کە دۆزراوەتەوە بەبەردەوامی نی‌یە، و یاخود هەسارێك هەیە لەپلەی (٢٨) دا و نەبینراوە لەدوری ٢٥٢ ملیۆن میل لەخۆرەوە، واتە لەنێوان (مەریخ و موشتەریدا) و لەشتە سەرسوڕێنەرەکانی ئەم گەردونە عەقڵ رفێنەرە شتێکیان لەم بۆشایی‌یەدا دۆزیی‌یەوە کە بوونی پێویستە، بەڵام هەسارێکی گەورە نەدۆزرایەوە بەڵکو هەساری بچووکی زۆریان تیادۆزیی‌یەوە کەدەکەونە نێوان مەریخ و موشتەری‌و، لەو بۆشایی‌یەی کەوایان دەزانی هیچ هەسارێکی تیادا نی‌یە.

ئایا ئەم رێژانەی کە دۆزراونەتەوە سەبارەت بە جێگەی ئەستێرەکان و جێقەرارگەکانیان و جێگەی هەسارەکان و دووریی‌یەکانیان هەموو لەکاریگەری رێکەوتی کوێرانەیە ئەی حەیران؟

حەیران/ زیاتر باسی ئەم شتە سەرسوڕهێنەرانەم بۆ بکە گەورەم.

شێخ/ لەمەزیاتر چیت بۆ باسبکەم، کتێبێك لەبارەی گەردونەوە بخوێنەرەوە، باوەڕو ملکەچیت بۆ خودا پتر دەکات، ئەی حەیران چیت بۆ باسبکەم؟ ئەتەوێت باسی قەبارەی

ئەستێرەکانت بۆ بکەم یاخود ئەو خۆرانەی کە عەقڵ دەڕفێنن؟ یاخود ئەو روناکیانەی کە رۆشنایی چاو دەڕفێنن؟ هەروەك باسی خۆری خۆمانت بۆ بکەم وایە.

حەیران/ کەواتە ئەستێرەی وەها هەیە کەروناکیەکەی رۆشنایی چاو زیاتر دەڕفێنێ وەك لە خۆری خۆمان

شێخ/ روناکی و قەبارەی خۆری خۆمان چی‌یە بەرامبەر ئەستێرە گەورەکانی تر؟ بە بۆچوونی زانایانی روونـاکی خـۆری خۆمـان (٣) هـەزار ملـیۆن ملـیۆن ملـیۆن ملـیۆن روناکی مۆمـە، ئەی وتە چۆن دەبێت کەبزانیت روناکی ئەستێرەی ناوبراو بە (شەعرای یەمانی) کە روناکی یەکەی (٢٦) کـەرەت لـە روناکی خـۆری خۆمان زیاترە.... و لە ئەستێرە دوورەکانی تـردا خـۆری وایان هەیـە کە رووناکی‌یەکەی بە (١٠٠) کەرەت لە رووناکی خۆر زیاترە.

حەیران/ چەند سامناکە!!

شێخ/ دەربارەی ئەمە چی دەڵێیت کە زانست ئەمڕۆ ئەستێرەی وای دۆزیوەتەوە کە روناکی‌یەکەی بە (٥٠٠) هەزار جار لە روناکی خۆری خۆمان زیاترە... ؟

حەیران/ لەهەمووی سامناکترە؟

شێخ/ سـامناکی زۆر سـەبارەت بـە قـەبارەو کێشـی ئەسـتێرە گـەورەکان بلـێ ئـەی حەیران... قەبارەی زەوی ئێمە لە (ملیۆن ملیۆن کم٢) زیاترە.

خۆر لـە قەبارەکەیدا لـە زەوی بـە (ملیۆنـێك و ٣٠٠ هەزار) جار گەورەترە، چونکە ناوەندە تیرەی زەوی بریتیە لـە (١٢٧٥٦) کـلم لـە کاتێکدا کـە نـاوەندە تـیرەی خۆر لە ملیۆنێك و ٣٩٠ هـەزار) کـلم، بەمـەش رێژەی تیرەی زەوی بەرامبەر رێژەی تیرەی خۆر رێژەی (١ بـۆ ١٠٩) وایە، و وازانـراوە کەقەبارەی بازنـە رێدە کەوێت لەگەڵ سێ جای تیرەکانیدا بەمـەش قـەبارەی خـۆر (١٠٩ سێ جا) واتە (ملیۆنێك و ٣٠٠ هەزار) جار لە قەبارەی زەوی گەورەترە.

کێشی زەوی (٥ هەزار ملیۆن ملیۆن ملیۆن) تەنە، بەڵام خۆر ناتوانم پێت بڵێم کێشی چـەندە، بـەڵام پێـت رادەگەیـەنم کە بارستایی خـۆر (Massa) بەمانای بارستایی یەکە لە بارستایی زەوی گـەورەترە بە رێژەی (٣٣٢) هەزار جار، کەواتە کێشی زەوی لە (٣٣٢) هەزار بدە، و دوای ئەوە بزانە کە ئەنجامی لێکدانەکەت بۆ دەخوێنرێتەوە.

ئێستا دوای ئەوەی کە قەبارەو تیرەو کێشی خۆرت زانی بەگوێرەی زەوی چەندە، من پێـت دەڵـێم تـیرەی ئەسـتێرەی نـاو بـراو بـە (شـانی دوانـە) (متکب جوازء) بە (٤٦٠) جار

درێژترە لە تیرەی خۆر بەمەش قەبارەکەی نزیکە ی (١٠٠ ملیۆن جار) لە قەبارەی خۆر گەورەتر دەبێت.

حەیران، ئای لەم هەموو سامناکی‌یە!

شێخ/ ئەمەش دووبارە کەم و بێ نرخە بەرامبەر بە قەبارەی (سەدیمی ئافرەتی زنجیرەدار) کە زانایان بە نموونە دەیهێننەوە، تاکو ئەو جیاوازی‌یە گەورەیەی کەلەنێوان قەبارەی خۆردا) هەیە پێت بناسێنن، پێت رادەگەیەنن (ئەو ووردە تۆزو خاك و خۆڵانەی کەلەناو تیشکی خۆردایەو بەکلاو رۆشنەی ژوورەکەدا دێتە ژوورەوە، ئایا دەزانیت قەبارەی ئەو ووردە تۆزو خاك و خۆڵە چەندە گەر بەراورد بکرێت لەگەڵ رێژەی قەبارەی زەویدا؟ بەم چەشنە دەبێت قەبارەی کێشی خۆر سەبارەت بە قەبارەی کێشی (سەدیمی ئافرەتی زنجیرەدار) و ناهەقیان نی‌یە کە ئەم نموونەیە بهێننەوە، چونکە بارستایی سەدیمی ئافرەتی زنجیرەدار واتە کێشەکەی زیاتر لە رادەی بارستایی خۆر نزیکەی هەزار ملیۆن جارە، بەڵام قەبارەکەی ئەی حەیران گەلێك زۆرترە... و بۆ ئەوەی (سەدیمی ئافرەتی زنجیرەدار) بە گوێرەی قەبارەی خۆر بە نزیکەی هەزار ملیۆن جار، بەڵام (ئافرەتی زنجیرەدار) بەگوێرەی قەبارەی خۆر بزانێت، پێویستە رادەی تیرەکەی بزانیت بە گوێرەی تیرەی خۆر وەك لەمەو پێش باسکرا کە درێژی‌یەکەی ملیۆنێك و (٣٩٠) هەزار کیلۆمەترە، ئێستا دەزانیت درێژی تیرەی سەدیمی ئافرەتی زنجیرەدار چەندە، پێوەرەکەی نزیکەی (٣) هەزار سالی روناکی‌یە... بەمانای قەبارەی ئەم سەدیمە دەکات بەگوێرەی رادە قەبارەی خۆر بە ملیۆن ملیۆن ملیۆن ملیۆن جار یاخود هەزار ملیار ملیار ملیار کەرەت..

حەیران/ ئای لەم هەموو سامناکی‌یە... پاك و بێگەردی هەر بۆ خودای مەزنە.. چۆن ئەم قەبارەو کێشە زۆرانە لەم بۆشایە بەو ئاستە یەکسانانە راگیراون؟

شێخ/ قورئانی پیرۆز وەڵامی دەداتەوە و دەفەموێت:- ﴿اللَّهُ الَّذِي رَفَعَ السَّمَاوَاتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا﴾الرعد:٢

دەفەرموێت:- ﴿إِنَّ اللَّـهَ يُمْسِكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ أَنْ تَزُولا وَلَئِنْ زَالَتَا إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ بَعْدِهِ إِنَّهُ كَانَ حَلِيماً غَفُوراً﴾فاطر:٤١

بەڵام زانست دەڵێت ئەو وەستانە بەهۆی هێزی راکێشانەوەیە، کە زانایان کاریگەرەکەیان بینیەوە و ئاماری قۆناغەکانیشیان کردوە، و بەرجەستەی روتەختەکانیان

کردوه، بەڵام نەچوونەتە ناو قوڵایی‌یەکانیەوە و یاساو سیستمەکانی شارەزا بوون بەڵام تا ئێستا نهێنی ئەم هێزەیان نەزانیوە.

سوێند بێت بەخودا، راستە ووتوویانە/ هێزی راکێشان راستە و یاساکانی زانراوە و پێوراو و دروست و پتەوو ووردە، ئایا دەگونجێت ئەی حەیران ئەم یاسا ووردو پتەوە لەگاریگەری رێکەوتی کوێرانە بێت.... ؟

﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ وَالْأَرْضُ جَمِيعاً قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ: خودایان نەناسی بەگوێرەی راستی رادەی خۆی و زەوی هەمووی لەچنگی دایە دوا رۆژ، ئاسمانەکانیش پێچراونەتەوە لەلای راستی، چەند پاك و بێگەردو بەرزە، و دورە لەوانەی هاوەڵی بۆ دادەنێن.﴾الزمر:٦٧

شێخ/ وئێستا ئەی حەیران با بێینە سەر باسی زەوی، و لەسەر رۆشنایی قورئان و زانست لە رووی پێكهاتن و دروستكردنیەوە بەدەربیخەین كە چەندە نیشانەكانی سیستم و بڕیارو پێچراو ووردەكاریی و كاربەجێیی و بەخشندەیی لە خۆگرتووە و لە پاشدا، بپرسین تا چ..رادەیەك بەشی ریكەوتی كوێرانەی چەوتی تیادا بەدی دەكەین لە پێكهاتەی ئەم دروستكراوە سەرسوڕهێنەرە مەزنەدا.

خودای گەورە دەفەرموێت:-

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ﴾ابراهیم:٣٢

﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْداً وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ﴾الزخرف:١٠

﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجاً سُبُلاً لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾الانبياء:٣١

﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْداً وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلاً وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ أَزْوَاجاً مِنْ نَبَاتٍ شَتَّى﴾طـه:٥٣

﴿ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَاراً﴾غافر:٦٤

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾الحجر:١٩

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ق:٧

﴿وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ، وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾الذریات/٤٨-٤٩

﴿أَلَـمْ نَجْعَـلِ الْـأ رْضَ كِفَاتــاً، أَحْيَاءً وَأَمْوَاتًا، وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتاً﴾المرسلات/٢٥-٢٧

﴿أَمَّـنْ جَعَـلَ الْأَرْضَ قَرَاراً وَجَعَلَ خِلالَهَا أَنْهَاراً وَجَعَلَ لَهَا رَوَاسِيَ وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزاً أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾النمل:٦١

﴿أَوَلَـمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾الانبياء:٣٠

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾النمل:٨٨

﴿إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِلْمُؤْمِنِينَ﴾الجاثـية:٣

چەندەها ئایەتی تر کە ناوی پێکهاتنی زەوی تێدایە و بەجۆرێك دروستیکردووە کە ژیـان گونجاو بێت تیایدا، وەرە ئەی حەیران! هەروەك خودای گەورە پێمان دەفەرموێت و هـەروها لەسـەر رۆشـنایی زانسـتیش بـزانین چـۆن و بۆچـی زەوی تـەنها هەسـارێکە کەرەخساوە بۆ گونجاندنی ژیـان تێیدا و تایبەتمەند کراوە لەچڕی و هێزی راکێشان و جوتـەو ئـاوو هـەوا؟! و چەندەها هۆکـاری تـری ژیـان، ئایا ئەم هەموو شتە لە کاریگەری رێکەوتە یاخود لە کاریگەری مەبەست و بایەخدان و سیستم و بڕیارە؟

ئێمە لـە بەرامبەر حـەوت هەساری گـەرۆکی گـەورەی تـرداین، کـە تیایاندا هەیە لە زەوی نزیکترە بۆ خـۆ یـاخود دوورترە و هەروەها تیایاندا هەیە گەورەترە لە زەوی، و یان بـە پێچـەوانەوە بچوکترە، و هەیانـە خێراترە لـە خولانـەوەی بەدەوری خـۆر و بەدەوری خۆیـدا لـە زەوی، و یـان بـە پێچـەوانەوە و هـەموویان بەگشـتی بەگوێـرەی ئـەو رادانـە تەقدیرانەی ساخیانی کردۆتەوە، کەمن وادەزانم کە زانسـت بەهەڵـە دا نەچووە هەموو هەسارەکان یەکێکە لەم دوانە، یا لە ئاسمانەوە کەوتوو نەتەوە، وەك قورئان دەفەرموێت و یاخود لە خۆر جیابوونەتەوە وەك زانست دەڵێت.

هەردووکیان یـەك مانـا دەبەخشـن، کەواتـە بۆچـی تـەنها زەوی ئێمە لەناو ئەو هەموو هەسارانەی تردا شیاوە بۆ ژیان؟

بـۆ نموونـە (عـەتارد) هـەروەك زەوی بـەدەوری خـۆی و خـۆردا دەخولێـتەوە، خولاندنەوەکـەی بـەدەوری خۆیـدا بـە (٨٨) ڕۆژ تەواو دەبێت، و بەهەمان ماوە بەدەوری خـۆردا دەخولێـتەوە واتـە هـەروەك (خولاندنـەوەی مـانگ لەگـەڵ زەویـدا) هەمیشـە

رووەیەکی (عەتارد لە خۆرە، هەر لەبەر ئەوەشە نیوەی زەمهەریرە و نیوەکەی تریشی هەتاوە.

چڕیی‌یەکەی نیوەی چڕی زەویی‌یە لەبەر ئەوە هێزی راکێشانی کەمە، و هەروەها هەوایشی تیادا نی‌یە لەبەر ئەوە شیاوی ژیانی تێدا نی‌یە.

زوهـرە کـە ووتـراوە مـاوەی خولاندنـەوەی بـەدەوری خۆیـدا بـەڕادەی مـاوەی خولاندنەوەیـەتی بـەدەوری خـۆردا کـە (٢٢٥) رۆژ دەخایەنێـت، کـە ئەمـیش هەمیشـە هـەروەك مـانگ رووبەکی بەرەو خۆرە کە گەرمایی‌یەکەی (٩٠ پلە) و رووەکەی تری بە بەردەوامی (٢٠پلـە) لـە ژێـر سفردایە و ئەمیش بێ ئـاو و هەوایـە بەڵکو هەڵمێکی چڕی تێدایە زۆر بە ئاشکرا بەدەردەکەوێت کە شیاوی ژیان نی‌یە. وَ سەبارەت بەمەریخ هەندێ لـە لـێکۆلـەرەوان ئەندێشەیان وابوو کە زیندەوەری تیادا دەژی و هەروەك زەوی لەماوەی (٢٤) کاتژمێردا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، بەڵام خولاندنـەوەی بـەدەوری خۆردا (١٨٧) رۆژ دەخایەنێـت- و دوری لە خۆرەوە (١٤٢) ملیۆن میلە- و گەرمایی‌یەکەی لە رۆژدا چـەند پلەیـەك لەسەرو سفرەوەیە، بەڵام لە شەودا پلەی گەرما دەچێتە (٧٠پلە) ژێر سفر.

رووتـەختی ووشـکایی و دەریـایی تیادا نی‌یـە، و لـە راستیشـدا وای بۆ ئەچن کە ئاوی تیادا نـەبێ، و هـەوا کەشی لـە گازێك پێکهاتووە کە چڕترە لە گازی ئۆکسجین و هێزی راکێشـانی سێ‌یەکی هـێزی راکێشـانی زەویی‌یـە لەبـەر ئـەوە ناگونجێـت بـۆ هێشـتنەوەی ئۆکسـجین لـە هەواکـەیدا، لـە بـەر ئـەم هۆکارانـە هەرگیز، ژیان تیایدا شیاو نی‌یە، و ئەمە راو بـۆ چوونی لێکۆڵەوەرەکانن لە زانایان، و مشتەری خولاندنەوەی بەدەوری خۆردا بە (١٢) سـاڵ تـەواو دەبێـت و لـە هـەموو (١٠) کاتژمـێرێکدا کـە رەتـێك بـەدەوری خۆیـدا دەخولێتەوە، و دوریی‌یەکـەی لـە خـۆر (٤٨٤) ملیۆن میلە و پلـەی گەرما تیایدا (١٣٠ پلـە) ژێر سفرە..... و چڕیی‌یەکەی چواریەکی چڕی زەوی‌یەو زانایان وای بۆ دەچن کە بریتیبێت لە تۆپێکی گازیو مادده توێنەرەوەکان، هەروەها ئەمیش زۆر ئاشکرایە کە ژیان ناگونجێت تیایدا.

(زوحـەل) خولاندنەوەی بەدەوری خۆردا لە ماوەی (٢٩) ساڵ ونیودا تەواو دەبێت، و خولانـەوەی بـەدەوری خۆیدا (١٠) کاتژمێر دەخایەنێت، و دووری لە خۆرەوە (٨٨٧) ملـیۆنە مـیلە (٩/١) ی گـەرمای خـۆر کـە دەگـات بـەزەوی بەزوحەلـیش دەگـات و

چڕیی‌یەکەی کەمترە لەچواریەکی چڕی زەوی و بۆ زانایان بەدەر کەوتووە کە ماددەی رووبەرەکەی شلەیەو دەجولێت هەروەها زۆر ئاشکرایە کە شیاوی ژیان نی‌یە.

(ئۆرانوس و نیپتۆن و بلۆتۆ) هۆکار زۆرە بۆ نەگونجاندنی ژیان تیایاندا، بەتایبەتی (ئۆرانوس) کە خولاندنەوەی بەدەوری خۆردا (٤٨) سالْ و (٧) رۆژ دەخایەنێت، و لەماوەی (١٠) کاتژمێردا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، و دوری لە خۆرەوە (١٧٨٢) ملیۆن میلە، و خولاندنەوەی نیبتۆن بەدەوری خۆردا نزیکەی (١٦٩) سالْ دەخایەنێت و لە (١٠) کاتژمێردا بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، و دووری لە خۆرەوە (٢٧٩٢) ملیۆن میلە، و پلۆتۆ، خولاندنەوەی بەدەوری خۆردا (٢٤٧) سالْ دەخایەنێت و دووریەکەی ( ٣٦٧٠) ملیۆن میلە.... رات چی‌یە ئەی حەیران... سەبارەت بە ژیان لە هەسارێکی گەرۆکدا کە زستان تیایدا ٤٢ یان ٤٨ یان ١٢٣ سالْ بێت و هەروەها هاوینی بەهەمان شێوە بێت، و رۆژ (٥) کاتژمێر بخایەنێت و شەویشی (٥) کاتژمێر بخایەنێت؟

ئەو زەویی‌یەی کە خودا پێی بەخشیوین چەندەها نیشانەی ئاشکرای زۆر لە بەڵگەکانی تیادایە، و ئەیخاتەوە یادمان کە ئەم دروستکردنەی زۆر لە بەڵگەکانی مەبەست و کاربەجێی‌ی و سیستمی لە خۆ گرتووە و تەنها هەسارێکە کە خودا گونجاندنی بۆ ژیان.

لە بەرئەوە دووری لە خۆرەوە مام ناوەندیی‌یەو هەروەها ئەو گەرمایی‌یەی کە پێمان دەگات مام ناوەندیی‌یە، و چڕیی یەکەی لە هەموو هەسارەکانی تر زیاترە تەنانەت لە خۆریش، و هێزی راکێشانی مام ناوەندیی‌یە، و خولاندنەوەی رۆژانەی دووبارە مام ناوەندیی‌یە و گونجاوە بۆ رودانی رۆژوو شەو کەمام ناوەندین و شیاون بۆ کۆشش و حەوانەوە، و خولاندنەوەی سالانەی شیاوو گونجاوە بۆ روودانی وەرزەکان کەشیاوە بۆ سەوز بوونی کشتوکالْ و پێگەیشتنیان، و بەئاو و هەوای شیاو جیادەکرێنەوە.

ئایا کۆ بوونەوەی ئەم هەموو هۆکارە شیاوانەی ژیان لە کاریگەری رێکەوتن ئەی حەیران؟

حەیران/ پاکی و بێگەردی بۆ دروستکەری مەزن.... بەلام شێخی گەورەم ئاماژەی بۆ حەوت سیفەت کرد کەوای لە زەوی کردوە شیاوی ژیان بێت، و قورئان تەنها دانایی لە دروستکردنی زەوی و گونجاندنی بۆ ژیان بەگشتی باسدەکات.

ئاماژەی نزیکی و پلەی گەرمی و چڕی و هێزی راکێشان و هەردوو خولاندنەوەکەی ناکات.

شێخ/ ئەو سیفاتانەی کە بۆم باسکردی ئەی حەیران، ئەوانە بەگشتی سیفاتی سەرکی بوون، و لەمەو دوا باسی ئەو شاراوانەت بۆ دەکەم کەلەپشت ئەم سیفات و تایبەتمەندانەوە دێن، و سەبارەت بەحەوت سیفاتەکە قورئان بەجۆرێك باسیکردووە کە زانایان لەناوە رۆکەکەی تێبگەن، و نەزانیش لەرووکەشەکەی تێبگات، و نزیکیو پلەی گەرمی مام ناوەندی یەکەی بە شێوەیەکی ناراستەو خۆ ئاماژەی بۆ کراوە، بەوەی کە زەوی شیاوی ژیان و کشتوکاڵە.

چڕی و هێزی راکێشان بە ئاشکرا ئاماژەیان بۆ کراوە بەفەرموودەی خودا ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَاراً﴾غافر: ٦٤، گەر هێزی راکێشان نەبوایە، نەئێمەو نەهیچ شتێك هەرگیز نەمان دەتوانی سەقامگیر بین لەسەر رووی ئەم زەمینە.

خولاندنەوەی رۆژانەی بە ئاشکرا ئاماژەی بۆ کراوە بەناوبردنی (شەوو رۆژ) و هەروەها دەفەرموێت:-

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ إِنَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَفْعَلُونَ﴾النمل:٨٨

(تێپەڕ بوونی کێوەکان وەك تێپەڕبوونی هەورەکان) و بەناوبردنی سێبەرو ئاوابوونی خۆر، و خولاندنەوەی ساڵانەی بەئاشکرا ئاماژەی بۆ کراوە بەناوبردنی باران، ئایا دەتەوێت خودای زانا و کاربەجێ بەووردی لێکدانەوەی یاساکانی هێزی راکێشان و چڕی و خولاندنەوەی ساڵانەو شێوەی جێقەرارگە و لاربوونەوەی زەوی شیتاڵ و شیکار بکات، لەسەردەمێکدا مرۆڤ هیچ زانیاریەکی لەم بوارانەدا نەبووە و ئاخاوتن لەگەڵ گەلێکدا کە خاوەنی هیچ جۆرە زانستێك نەبوون تا.... دەرکی ماناکانی بکەن.

ئەو ئاماژانەی کەباسی خولاندنەوەی رۆژانەی تێدایە کەبەهۆیانەوە شەوو رۆژ دروست دەبێت ئایەتی قورئانی زۆر لەسەر هاتووە، بەتایبەتی ئەم ئایەتانەی خوارەوە.

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ﴾آل عمران: ١٩٠

﴿إِنَّ فِي إِخْتِلَافِ اللَيْلِ وَ النَّهارِ وَما خَلَقَ اللهُ فِي السَمواتِ وَ الارْضِ لآياتٍ لِقَوْمٍ يَتَّقُون﴾یونس/٦

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾لقمان:٢٩

﴿يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾الزمر:٥

﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً﴾لأعراف:٥٤

﴿وَلَهُ اخْتِلافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ أَفَلا تَعْقِلُونَ﴾المؤمنون:٨٠

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنْتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾فصلت:٣٧

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ صُنْعَ اللهِ الذي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ﴾النمل/٨٨

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِناً ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلاً، ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضاً يَسِيراً، وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاساً وَالنَّوْمَ سُبَاتاً وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُوراً﴾الفرقان/٤٥-٤٧

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا، وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا﴾الشمس/١-٤

﴿أَلَمْ يَرَوْا أَنَّا جَعَلْنَا اللَّيْلَ لِيَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾النمل:٨٦

﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِتَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلاً﴾الاسراء:١٢

﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُوراً﴾الفرقان:٦٢

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾يونس:٦٧

و چەندەها ئایەتی تر کە خودا تیایدا بەخشندەیی بۆ بەندەکانی خۆی بەدەرخستووە بەناوبردنی شەوو رۆژو گۆڕانیان وەرە ئەی حەیران با... سەرنجێك بدەین وەك خودا

دەفەرموێت و لەسەر رۆشنایی زانست بزانین لە دروستکردنی شەوو رۆژدا چ سیستم و دانایی‌یەکی تێدایە، و بەشی رێکەوت لەم دروستکردنەدا چەندە؟

تۆ دەزانیت ئەی حەیران، قەبارەی زەوی ملیۆنێك و (٣٠٠) هەزار جار لە خۆر بچووکترە، و بارستایی‌یەکەی، واتە کێشەکەی لە خۆر بەنزیکەی (٣٣٢) هەزار جار کەمترە.

لەهەموو هەسارەکان تەنانەت خۆریش چڕترە چونکە چڕی (خۆر) چواریەکی چڕی زەوی‌یە، و قورسایی جۆرایەتی هەموو جەستیەك لە خۆردا سوکترە لە قورسایی جۆرایەتی هەمان جەستە کاتێك کەلەسەر زەوی‌یە، و دووری‌یەکەی لە خۆرەوە (٩٣) ملیۆن میلەوە خولاندنەوەی رۆژانەی لە (٢٤) کاتژمێردا روودەدات و خولاندنەوەی سالانە بەدەوری خۆردا لە (٣٦٥) رۆژو چارەکە رۆژێکی تەواو دەبێت.

شێوەی جێقەرارگەی بەدەوری خۆردا هێلکەیی‌یە، خێرایی خولاندنەوەکەی بەدەوری خۆیدا (١٠٠٠) میلە لە کاتژمێرێکدا و خێرایی خولاندنەوەکەی بەدەوری خۆردا، (١٨) میلە لە چرکەیەکدا، واتە بە رێژەی (٦٥) هەزار میل لە کاتژمێرێکدا، وەستانی لە جێقەرارگەی بە گۆشە (٢٣ پلە) لاردەبێتەوە، زانست دەڵێت گەر قەبارەی خۆر گەورەتر بوایە لەم قەبارەیەی ئێستای یاخوود بچووکتر بوایە یان بارستایی و چڕی‌یەکەی کەمتر بوایە یان زۆرتر بوایە، ئەو کاتە مانای ژیان دەگۆڕاو تێکدەچوو، چونکە قەبارەکەی گونجاوە لەگەڵ خێرایی و خولاندنەوەکەیدا و قورسایی‌یەکەی دەگونجێت لەگەڵ هێزی راکێشانیدا.

گەر قەبارەکەی زیاد کەمی بکردایە (خێرایی و ماوە) دەگۆڕا، گەر هێزی راکێشانی کەم بێت ئەوا ئۆکسجینی تیادا نەئەما، و ئەگەر خولاندنەوەی رۆژانەی نەبوایە شەو و رۆژ بەهەمیشەیی و بەچەسپاوی نەدەبوون.

گەر خێرایی خولاندنەوەی بەدەوری خۆیدا لە (١٠٠) میل لە کاتژمێرێکدا زیاتر یان کەمتر بووایە، وەك لەهەموو هەسارەکانی تردا هەیە، بۆ نموونە گەر (١٠٠) میل زیاد بکات، درێژی رۆژ دەبووە (١٢٠) کاتژمێر، ئەو کاتە هەموو کشتوکاڵمان بەگڕی ئاگر دەسوتا و لە زەمهەریری ساردی شەودا دەیبەست ، بەمە ماوەی کارکردن لە رۆژدا و حەوانەوە و نوستن لە شەودا تێکدەچوو، بەڵام ئەم خێرایی‌یە چەسپاوو نەگۆڕە، لەهەزاران ملیۆن ساڵەوە یەك چرکە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، و گەر هێزی راکێشان نەبوایە کە ئێمەی بەزەوی‌یەوە بەستۆتەوە لەسەر زەوی خۆمان و ماڵمان پرش و

بلاودەبووینەوە و دەفڕین و گەر ئەم هاویەکبوونە سەرسوڕێنەرەی نێوان هێزی راکێشان (کەبەهۆیەوە بەزەوییەوە بەندین) و هێزی دووری لە بنکەوە (کە دوورمان دەخاتەوە لە رووتەختەکە) نەبووایە ئەوا خۆمان و ماڵمان دەفڕین بەرەو هەردوو جەمسەرەکانی زەوی دەرۆشتن.

ئایا ئەم هەموو دروستکراوە مەزنانە و وردەکارییە سەر سوڕێنەرە پێورراوە وردانە... لە کاریگەری رێکەوتن؟.

حەیران: پاکی و بێگەردی بۆ خودای مەزن.

شێخ: گەر سەرنج بدەین لەو ئایەتانەی کە ناوی (خڕبوونەوە و چوونی شەو بۆ ناو رۆژ و بەپێچەوانەوە و چوونی رۆژ بۆ ناو شەو، و داواکاری هەریەکەیان بۆ ئەوەی تریان بە بەردەوامی، و تێپەڕ بوونی کێوەکان وەك تێپەڕ بوونی هەور) بە ئاشکرا پێش (١٤) سەددە بە رونکردنەوەی دەتبینی، هێلکەی زەوی و جوولەی رۆژانەی کەبەهۆی هەردووکیانەوە شەوو رۆژ پێکدێت و جیاواز دەبن، چونکە خڕبوونەوەیەی بەبێ هێلکەیی زەوی و جوولەی رۆژانەی مانای نابێت و هیچ ئاشکرا نابێت.

گەر ئێمە وائەندێشەی بکەین کە زەوی راخراوو رووتەختە و خۆر تیایادا هەڵدێت و ئاوا دەبێت، وەك هەمان رای زانایانی پێشوو.

چونکە فەرموودەی خودای بەرز **﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾**الحج:٦١، **﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾**الأعراف:٥٤

لەمەدا هەموو ماناکانی یەك بەدوا یەکی تیادا بەدەردەکەوێت و خڕبوونەوەی هەریەکەیان بەدوای ئەوی تردا لەیەك ساتدا روودەدەن، هەرکاتێك شەو خۆی پێچایەوە بەناو رۆژدا لەلایەکی زەوی بەهەمان چەشن رۆژیش بەناو شەودا خۆی دەپێچێتەوە لەبەشەکەی تری زەوی، و ئەم مانایە ناگونجێت لەگەڵ ئەندێشەکردنی زەوی کە راخراوو رووتەخت بێت، چونکە گەر خۆر لەیەك سات و بەیەك کەرەت هەڵهاتایە رووناکییەکەی هەموو زەوی دەگرتەوە، و بەهەمان شێوە ئاوا بوونەکەی هەموو زەوی بەیەك جار تاریك دەکرد، و سەبارەت بە فەرموودەی خودا **﴿وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ:** تێپەڕبوونی کێوەکان وەك تێپەڕبوونی هەور﴾النمل:٨٨، ئەمەش دەقێکی ئاشکرایە .

سەبارەت بە خولاندنەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا سەرنج بدە ئەی حەیران.

حەیران/ گەورەم، زیاترم پێ ببەخشە، زیاتر.

شێخ/ بەڵام خولی ساڵانەی سەرسورهێنەر کەوەرزە جیاوازەکان، بەهۆیەوە پەیدا دەبێت، و لای ژیرو زانایان ئاماژەی بۆ کراوە.... بەدووبارە بوونەوەی ناوبردنی باران لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئان، کە لەدوایدا باسیان دەکەین، و گەر ئەم خولی ساڵانەیە نەبوایە، وەرزو باران و ژیان نەدەبوو.

وەرە لەسەر رۆشنایی زانستەوە سەرنج بدەین چ سیستم و پۆلێنێك هەیە لەدوای ئەم بارانەوە، سەبارەت بەشێوەو خولاندنەوە و شێوازی زەوی... تاکو بزانین بەشی رێکەوت چەندە لە دروستکردنی ئەم سیستم و پێکهاتانەدا؟

زانست دەڵێت خێرایی زەوی لەخولاندنەوەکەی بەدەوری خۆیدا کە (١٨) میلە لە چرکەیەکدا، گەر لە ساڵێکدا چرکەیەك زیادو کەم بکات بۆ (١٠) ساڵ ئەم سیستمە. تێکدەچوو، چونکە خولاندنەوەی پاش ملیۆنەها ساڵ یان زۆر درێژ دەبوو یان کورت دەبوو، بەمەبەش سیستمی چوار وەرزەکە تێکدەچوو بەتێکچوونی ئەو رێژە درێژ بوونەوەیەی کە بۆی دانراوە بەمەش سیستمی بارانی سەسورهێنەر تێکدەچوو.

گەر ئەو گەردونەی کەزەوی بەهۆیەوە بەدەوری خۆردا دەسورێتەوە درێژتر وەیان کورتر بوایە، وەك چۆن لە هەسارەکانی تردا هەیە ئەوکاتە تێکچوون لەوەرزو باراندا روویدەدا.

گەر شێوەی ئەم گەردونە کە زەوی بەهۆیەوە دەخولێتەوە بەدەوری خۆردا هێلکەیی نەبوایە، سیستمی هەر چوار وەرزەکە تێکدەچوو و گەر زەوی ئەم لاربوونەوەیەی تیا نەبوایە واتە شێوازی زەوی لەجێقەرارگەکەی بە گۆشەی (٢٣ پلە) لارنەبوایەوە، سیستمی هەر چوار وەرزەکە تێکدەچوو کەبەسەر زەویدا دەگوێزرێتەوە، و بەمەش ناوەراستی زەوی دەشت و بیابانی دەبوو و بەهۆی هەمیشە هاوینە و دەسوتا، و باکورو باشووری زەوی دەچوونە ژێر سەهۆڵ بەندان و بەفرەوە.

گەر پلەی ئەم لاربونەوەیە زیاتار بوایە لەوەی کە ئێستا تیایەتی، هەردوو باکورو باشور هاویەك دەبوون وەك هەردوو جەمسەرەکە، یان لەشەوێکی دورو درێژو زستان درێژ یاخود رۆژێکی درێژو هاوین درێژ دەبوو.

پلەی خواربوونەوە، پلەی پێویستی بریاردەرە بۆ ئەم سیستمەی سەرسورهێنەرە.

کۆبوونەوەی ئەم هەموو هۆکارانە بەگشتی لە خێراییەوە بۆ پانتایی و بۆ ماوە و شێوەی زەوی و شێوەی جێقەرارگەکان و خواربوونەوە و چەندەها شتی تر کەلەمەو پێش باسکران چوار وەرزو هەردوو هاویەکبوون و بەهەڵمبوونی ئاوەکانی دەریاکان

رووی نەئەدا کەباکان ئاوە بەهەڵمبووەکان بەهۆی تۆزو خۆڵەوە هەڵیان دەگرێو بڵاویان دەکاتەوە، و بەرەو جێگای سارد دەیانبات تاکو چڕیان زیاد بکات، بەمەش دڵۆپە باران پەیدا دەبێت و هەورە تریشقەکان بەدەنگ دێن و بروسکەش تروسکایی ئەدا، لە کۆتایدا باران دەبارێت کە زەوی زیندوو دەکاتەوە پاش مردنی.... ئایا ئەم هەموو سیستم و ڕیزبەندی و بڕیارانە لە کاریگەری ڕێکەوتن ئەی حەیران؟

حەیران/ پاکی و بێگەردی بۆ خودای مەزن... بەراستی دایکی زەویمان چەماوە و لارە، پاکی بۆ ئەو خودایەی کە چەمانۆیەوە تاکو بەسۆز بێت بۆمان.... و بێگەردی بۆ ئەو خودایە کە بۆمانی چەمانۆتەوە.... تاکو ئێمەو زیندەوەران بپارێزێت.

شێخ/ ئەی ئەم مانگە، برای بچووکمان، جوان و رازاوە دڵڕفێنە وەتا ئێستا لێی نزیکدەبینەوە بەجۆرێك خەریکە پێیدا دەکەوین وەدەستمانکرد بە بێزار کردن و موشەك باران کردنی....

بابزانین ئەی حەیران مرۆڤی ئارەزوومەند بۆ زانینی هەموو شتێك چی دەربارەی ئەم مانگە دەزانین لە نهێنی و جیاوازی قۆناغ و شێوەکانی جێقەرارگەو رادە دیاریکراوەکانی و ئاوابوون و هەڵهاتنی؟

قورئانی پیرۆز سەبارەت بەمانگ دەفەرموێت.

﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً، وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُوراً وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجاً﴾نوح:١٦

﴿تَبَارَكَ الَّذِي جَعَلَ فِي السَّمَاءِ بُرُوجاً وَجَعَلَ فِيهَا سِرَاجاً وَقَمَراً مُنِيراً﴾الفرقان:٦١

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ لا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِنْ كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾فصلت:٣٧

﴿وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِي لِأَجَلٍ مُسَمّىً﴾الرعد:٢

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ دَائِبَيْنِ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ﴾ابراهيم:٣٣

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا، وَالْقَمَرِ إِذَا تَلاهَا، وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا، وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا﴾الشمس/١-٤

﴿فَالِقُ الْإِصْبَاحِ وَجَعَلَ اللَّيْلَ سَكَناً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ حُسْبَاناً ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ﴾الأنعام:٩٦

﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾الرحمن:٥

﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ﴾يس:٣٩

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ مَا خَلَقَ اللَّهُ ذَلِكَ إِلَّا بِالْحَقِّ يُفَصِّلُ الْآيَاتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ﴾يونس:٥

ئەمە هەندێ لەفەرموودەکانی قورئانی پیرۆز سەبارەت بەمانگ و زانایان هاتن ئاماژەکراوەکانی نهێنییەکانیان بەدەرخست، و بۆیان دەرکەوت، ئەم مانگە لەخودی خۆیدا هەسارێکی روناك نییە بەڵکو روناکی لەروناکیدانەوەی خۆر وەردەگرێت کەلە خودی خۆیدا رۆشنە و مانگیش دووبارە ئەو رووناکییە لەلای خۆی دەداتەوە بەزەوی، وەك قورئان دەفەرموێت، بەم شێوەیە زانرا کەمانگ تایبەتمەندە بەزەوی کە بەدرێژایی لەگەڵیدا و هەروەك زەوی دەخولێتەوە لە خۆرئاواوە بۆ خۆرهەڵات، و بەهەمان شێوە دوو خولانەوەی هەیە خولاندنەوەیەك بەدەوری خۆیدا لەیەك ساڵدا تەواو دەبێت واتە لەیەك ساڵدا (٣٦٥) خول بەدەوری خۆیدا دەسورێتەوە..

بەڵام خولی مانگ بەدەوری خۆی و زەویدا یەك (مانگی قەمەری) دەخایەنێت، واتە لەوماوەیەی کەبەدەوری زەویدا دەسورێتەوە یەك کەرەت بەدەوری خۆیدا دەخولێتەوە، و هەمیشە بە بەردەوامی یەك رووی بەرەو دایکی زەوییە و هەرگیز پشتی تێناکات زانایان بۆیان بەدەرکەوت کەیەکێك لەدروستکراوە قەشەنگەکانی داهێنەری دانا ئەوەیە کەمانگ لەخولە مانگانەکەیدا هەموو رۆژێك (١٣ پلە) دەبڕێت و (٤٩) چرکە دوا دەکەوێت لە خۆرهەڵات تاکو... بەشە روناکراوەکەی بەشێوەی پلە بە پلە و قۆناغ بە قۆناغ بۆمان بەدەربخات، یەکەم جار مانگی یەك شەوە واتە (هیلال) و بەرە بەرە... تا.... دەبێتە مانگی (١٤) واتە (بەدر) و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ پەلی یەکەمی دار خورما، تاکو... وون بێت و پاش (٢٩) رۆژ و هەشت سەعات بە شێوەی هیلالێکی نوێ دەربکەوێتەوە بەمەش ژمارەی ساڵ و ژمێرەی پێدەزانین.

هەروەها زانیان کەمانگ لەهەموو هەسارەکانی تر نزیکترە بۆ زەوی و تەنها نزیکەی (٢٤٠) هەزار میلە دووریەکەی، و بارستاییەکەی بەشێکە لە ٨٠ بەشی بارستایی زەوی.

هەروەها بۆیان بەدەر کەوت کەهەسارەکانی تریش مانگی خۆیان هەیە کە تیایاندا هەیە زۆر بچووکە و تیرەکەی چەند میلێکە، و تیایاندا هەیە زۆر گەورەیە کە تیرەکەی (٣٢٠٠) میلە، و تیایاندا هەیە زۆر خێرایە کە خولەکەی بەدەوری هەسارەکەیدا بە (٦)

کاتژمێر تەواو دەبێت و تایایندا هەیە زۆر هێواشە کەخولەکەی لە ماوەی دوو ساڵدا تەواو دەبێت.

بۆیان بەدەر کەوت کە جگە لەمانگی زەوی هیچ مانگێکی تر نی‌یە کە خولەکەی یەك مانگ دەخایەنێت، خودای گەورەو بەخشندە ساڵێکی زەوی بەگوێرەی چوار وەرزەکە کردۆتە (١٢) مانگ پاش ئەم هەموو نهێنیانە نەیان زانی کە قورئان ئاماژەی بۆ کردووە بۆیان بەدەر کەوت ئەم هەموو سیستم و بڕیارانە بەدوور نین لە کاربەجێیی و بەخشندەیی خودا لەبەر ئەوە، وتیان:- گەر خولی مانگ بەدەوری خۆی و زەویدا لەیەك کاتدا نەبوایە، و گەر هەموو رۆژێك ١٣ پلەی لەخولەکەی نەبڕیایە وەبەرەو خۆرهەڵات (٤٩) چر کە دوانەکەوتایە هەر گیز لە جێقەرار گە جیاوازیەکانیدا هاتوو چۆی نەدەکرد تاکو رووە گۆڕاوەکانی ببینین، و کاتێك کەلە مانگێکدا خولەکەی تەواو دەکات، و خۆ ئامادە دەکات بۆ مانگێکی نوێی تر تا.... بەهۆیەوە ژمارەی مانگ و ساڵ و ژمێرە فێر بین.

گەر ماوەی نێوان مانگ و زەوی زیاتر یان کەمتر بوایە لەوەی کە هەیەتی یاخود قەبارەی گەورەتر یان بچووکتر بوایە، و یاخود خولەکەی درێژتر یان کورت تر بوایە، ئەم سیستمە تێکدەچوو تەنانەت لەوانەیە مانگ هەمووی نەمایە، چونکە گەر زەوی زیاتر نزیك بووایە ئەوا هێزی راکێشانی زەوی بۆ مانگ زیادی دەکرد بەمەش هەڵچوونی ئاوی دەریاکان زاڵ و زۆر داردەبوو و هەموو وشکایی دەگرتەوە، و گەر زیاتر نزیك بووایە زەوی رایدەکێشا بۆلای خۆی بەجۆرێك کەبەسەریدا بکەوتایە، و گەر دووریی‌یەکەی لە زەویی‌یەوە زیاتر بووایە بەمەش هەڵچوونی و داچوونی دەریا زۆر کەم دەبوو بەهۆی کەمی هێزی راکێشانی زەوی بۆ مانگ و گەر دوورتر بووایە لە زەویی‌یەوە ئەوا هەسارێکی تر بەلای خۆیدا مانگی رادەکێشا و ئێمەشی بێبەش دەکرد لەبەخشندەیی مانگ وە گەر قەبارەکەی لەمە گەورەتر بوایە هێزی راکێشانی زیاتر دەبوو و گەر قەبارەکەی بچووکتر بوایە هێزی راکێشانی کەمتر دەبوو، و گەر خولاندنەوەیەکی وەك خولاندنەوەی مانگی هەسارەکانی تری هەبوایە، کە زۆر زۆر خێران و لەچەند کاتژمێرێکدا تەواو دەبێت و یاخود زۆر زۆر هێواشن کە چەندەها ساڵ دەخایەنن و ئەم سیستمە تێکدەچوو کە خودا بۆی کردوینە تە ژمێرەر بەمەش مانگی قەمەری هەفتەیەك دەبوو یان دوو ساڵ دەبوو ئایا ئەم هەموو سیستم و بڕیارانەی کە خودا تایبەتمەندی کردوە بەمانگەوە لە جوولە ژمێرراوەکانی خولە بڕیاردراوەکانی و جێقەرارگە

دیاریکـــراوەکانی، و ریـــژەی رامکـــراوەکانی و رووناکـــیە وەرگیراوەکـــانی و قۆناغــە چاوەڕوانکراوەکانی هەموو لە کاریگەری ڕێکەوتی کوێرانەیە ئەی حەیران... ؟

حەیران/ بێگەردی بۆ دروستکەری مەزن، سوێند بێ بەخودا ئەم هەموو شتانە بە ڕێکەوت کۆنابنەوە، بەڵام من وا لەقسەکانی شێخ تێگەیشتووم کە نزیکە گاڵتەی بەو زانایانە بێت کە هەوڵ و کۆششی گەیشتنە سەر مانگ دەکەن.

شێخ/ چۆن ئەمەت زانی؟

چۆن ئەندێشە دەکەیت کەمن گاڵتەم بەزانست و زانایان بێت لە کاتێکدا ئاماژەی بوونی خودات بەهۆی ووتەکانی زانست و زانایانەوە بۆ دەکەم؟ و گەر گاڵتەم پێیان بێت، تەنها بەوانەیە کە زۆر زانستەکەیان هەڵیاندەخەڵەتێنێ وەلایان وایە ناردنی مووشەك بۆ سەرمانگ یاخوود ناردنی مرۆڤێك بۆ گەردوون، جۆرێکە لەهاوبەشی کردنی خودا لەمەزنێتی و دەستێوەردانی بارەگاکەی.... جگە لەزانایان و گەر ئەوانە ژیرو عاقلبوونایە دەر کیان دەکرد کەمەزنێتی و لێهاتووی تەنها بۆ ئەو خودایەیە کە مرۆڤی دروستکردووە بەجوانترین شێوە و بە روناکی عەقلی ڕێگای راستی نیشانداوە.

دروستکەری ئەو مانگەیە کە ئێوە خۆتانی بۆ ئامادە دەکەن بۆ چوونە ناوی، و بۆ پێگەیشتنی هیوا و ئاواتی لەسەر بنهات دەنێن، و هەرکاتێك خودای بێگەرد بیەوێت کەرت و بڵاوەی پێدەکات و لەگەڵ ئەستێرەکاندا ووردو خاشیان دەکات، بەمەش دیاردەی ناهێڵێت، ئەو کاتە ئەم مرۆڤە نرخ و رێژەی دانراوەکەی خۆی دەزانێ.

شێخ/ ئەم ئینبیقە (ئامێری دڵۆپە کەری ئاو) مەزنە ئەی حەیران کە خودای بەرز کەروە چەسپاندۆیتی و دایناوە و بەرزیکردۆتەوە لەنێوان ئاسمان و زەویدا، دەریاکانی لەناویدا ڕووتەخت کرد، و ئاگرەکانی داگیرساند لەژێریدا و هەڵمەکانی بڵاوکردەوە، و هەورەکانی قورس و بارگاوی کرد و ڕێڕەوەکانی ئاسانکرد، کێوەکانی بۆ قەرارگە کرد و تیایاندا ڕوباری هەڵقوڵاندوە بەهۆیانەوە جێقەدارگەکانی نویێ کردەوە، ئایا... کێ بڕیاردەری ئەم نهێنیانەیە؟

لەکاتی باسکردنی خولانەوەی ساڵانەی زەوی باسی بارانم بۆ کردیت و هەندێ لەنهێنیەکانیم بەدەرخست، ئێستا گوێبیستی قورئان بە بزانە چی دەفەرموێت سەبارەت بەکرداری باران کەبەهۆی ئەم ئینبیقە مەزنەوە ڕوودەدات.

﴿أَفَرَأَيْتُمُ الْمَاءَ الَّذِي تَشْرَبُونَ، أَأَنْتُمْ أَنْزَلْتُمُوهُ مِنَ الْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ الْمُنْزِلُونَ﴾الواقعة:٦٨-٦٩

﴿اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَأَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقاً لَكُمْ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الْأَنْهَارَ﴾ابراهيم:٣٢

﴿اللَّهُ الَّذِي يُرسِلُ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَيَبْسُطُهُ فِي السَّمَاءِ كَيْفَ يَشَاءُ وَيَجْعَلُهُ كِسَفاً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلالِهِ﴾الروم/٤٨

﴿وَاللَّهُ الَّذِي أَرسَلَ الرِّيَاحَ فَتُثِيرُ سَحَاباً فَسُقْنَاهُ إِلَى بَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَحْيَيْنَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا كَذَلِكَ النُّشُورُ﴾فاطر:٩

﴿وَاللَّهُ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾النحل:٦٥

﴿وَهُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ﴾الأنعام:٩٩

﴿وَهُوَ الَّذِي يُرسِلُ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ حَتَّى إِذَا أَقَلَّتْ سَحَاباً ثِقَالاً سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ كَذَلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَى لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾الأعراف:٥٧

﴿وَهُوَ الَّذِي أَرسَلَ الرِّيَاحَ بُشْراً بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُوراً، لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَاماً وَأَنَاسِيَّ كَثِيراً، وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَى أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُوراً﴾الفرقان/٤٨-٥٠

﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكاً﴾ق:٩

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ﴾المؤمنون:١٨

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاءً ثَجَّاجاً، لِنُخْرِجَ بِهِ حَبّاً وَنَبَاتاً، وَجَنَّاتٍ أَلْفَافاً﴾النبأ/١٤-١٦

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا﴾فاطر: ٢٧

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ﴾الزمر:٢١

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُزْجِي سَحَاباً ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُ ثُمَّ يَجْعَلُهُ رُكَاماً فَتَرَى الْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَالِهِ﴾النور: ٤٣

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعاً تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلا يُبْصِرُونَ﴾السجدة:٢٧

بیربکەرەوە ئەی حەیران لەم ئایەتانەو ئەو ئایەتانەی کە تێپەڕبوون و لەسەر ڕۆشنایی زانست سەرنجێکی قوڵبدە لەکرداری بارینی باران، وا ڕاهاتووین کە زۆر بەسادەیی دەیبینین و بەلایدا تێپەڕ دەبین بێئەوەی بزانین چ سیستەم و بڕیارێکی سەرسوڕهێنەری لەخۆ گرتووە.

ئایا جێی سەرسوڕمان نییە ئەم ئینبیقە دڵۆپێنەرە ئاسمانییە مەزنە کەخوا دروستیکردو ڕێکیخست، و بەهۆی ئەو سیستمانەی کەباسمانکردن، و بەهۆی نهێنی یاساکانی گەرماو بەهەڵمبوونی چڕی و تواندنەوەی هەموو بەگشتی وایان لەکرداری باران بارینکردوە کە ڕۆشتنێکی ئاسایی‌و کاتی دیاریکراوی هەبێت لەزنجیرە گۆڕانێکا، کە هەمیشە نوێ دەبێتە، کە هەندێکیان ئاودەری هەندێکی تریانن و هەندێکیان ئاو لەهەندێکی تریان وەردەگرن، هەموو ساڵێك ئەم کردارە دووبارە دەبێتەوە، بەبێ هیچ دواکەوتن و پاشگەزبوونەوەیەك لەپەیمانەکەی و بەبێ کەم و زیاد لە دڵۆپێك، ڕاسپاردەکەی خۆی دەداتەوە.

هەرگیز ئەم بارانە سەرسوڕێنەرە گەورەیە بەو شێوەیە ڕێك و دیرایکراو نەدەبوو گەر ئەم هۆکارانەی تێدا کۆنەبووایە لەنموونەی جووڵە و جێقەرارگە و دانان و لاربوونەوە.و پانی و بەرینی ڕووتەختی دەریاکان و پلەی گەرمای‌و خۆر و بەهەڵمبوون و چڕی‌و تواندنەوە و کۆبوونەوە و ئارەزوومەندێتی‌و بارگاویکردن و باو بروسکە.

ئایا باوەڕ ئەکرێت ئەی حەیران کۆبوونەوەی ئەم هەموو هۆکارەو سیستم و یاسایانە بەتێکرای‌و بەیەکجار لە کاریگەری ڕێکەوتی کوێرانە بن؟

حەیران/ پەنا بەخوا... هاوار بۆ ئەو کەسانەی کەخۆ بەزل دەزانن..

شێخ/ ئەم دەریا سەرسوڕهێنەرە ئەی حەیران کەهەندێ لە بەشەکانی ئینبیق پێکدەهێنن، چۆن چۆنی باسی نهێنییەکانیت بۆ بکەم؟ کە خودا بەیادمان دەهێنێتەوە بەناوبردنیان لەچەندەها ئایەتی قورئانیدا تاکو بەئاگابین لەتوانا مەزنە بەخشندەکانی، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾الجاثـية:١٢

﴿رَبُّكُمُ الَّذِي يُزْجِي لَكُمُ الْفُلْكَ فِي الْبَحْرِ لِتَبْتَغُوا مِنْ فَضْلِهِ إِنَّهُ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً﴾الاسراء:٦٦

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ﴾لقمان:٣١

﴿وَآيَةٌ لَهُمْ أَنَّا حَمَلْنَا ذُرِّيَّتَهُمْ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾يـس:٤١

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلامِ﴾الشورى:٣٢

﴿وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ﴾البقرة:١٦٤

﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْماً طَرِيّاً وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾فاطر:١٢

ئەم ئایەتانە ئەی حەیران زیاتر بەخشندەیی و کاربەجێیی لەخۆ گرتووە:

لەوانە کاربەجێیی دروستکردنی دەریا لەخودی خۆیدا و لەسەر ئەو شێوازەی کە هەیەتی. و کاربەجێیی بەوەی کە سوێرە لەگەڵ ئەوەشدا ئاوی دەریاچە و ڕووبارەکانی سازگارکردوە، و بەخشندەیی پڕکردنیان بەماسی کەباشترین خواردەمەنیە بۆ مرۆڤ، بەڵکو بەگەورەترین و دەوڵەمەنترین عەمباری خواردن دادەنرێت کە بەدرێژایی چەرخ دەمێنێتەوە و دانایی بەوەی کە گەمیێ هەڵدەگرێت و بەخشندەیی هەڵگرتنی مرۆڤ لەلایەن ئەو گەمیانەوە بۆ بەدەستهێنانی ڕق و ڕۆزی لەڕێگای بازرگانیەوە.

حەیران/ لەبەخشندەیی دروستکردنی ماسی تێگەیشتم، و هەروەها بەخشندەیی ڕۆشتنی خەڵك لەدەریاکاندا بۆ بازرگانی بەڵام لەدروستکردنی دەریا لەخودی خۆیدا تێنەگەیشتووم هەروەها بەخشندەیی بەوەی کە گەمیێ هەڵدەگرێت.

شێخ/ بەڵێ دروستکردنی دەریا خۆی لەخۆیدا و بەو شێوازەی کەهەیەتی دەگەڕێتەوە بۆ گەورەترین و مەزنترین دانایی‌و بەخشندەیی گەر ئەم ڕوتەختە مەزنەی ئاو نەبوایە کەسێ بەشی زەوی گرتۆتەوە و جیاکەرەوەی کیشوەرەکانە لەیەکتر، بەم شێوەیە کرداری بەهەڵمبوون ڕووی نەئەدا و هەروەها کرداری خولی بارانیش نەدەبوو، کەبۆتە پایەکانی ژیان لەسەر ڕووی زەوی گەر ئاوی دەریا شیرین بوایە ئەوا زۆر زوو بۆگەن دەبوو تێکدەچووە دەبووە هۆی نەمانی هەموو ئەو زیندەوەرانەی کەلە خۆی گرتووە، بەهۆی زۆر لەوشتە پیسانەی کە لەوشکانیەوە دەڕژێتە ناوی گەر ئەم دەریایانە لەلایەکی دابڕاوی زەوی بوونایەو بەو شێوەیە جیاکەرەوەی کیشوەرەکان نەبوونایە، بەئاسانی کرداری بەهەڵمبوون و بەرزبوونەوە، و گەڕانەوەیان جارێکی تر بۆناو دەریاکان بەهۆی ڕووبارەکانەوە تێکدەچوو، بەمەش ووشکایی دەبووە زەلکاو بۆ ئاوی ڕووبارەکان، سەرنجبدە ئەی حەیران.

بەڵام ناوبردنی گەمیێ و ڕۆشتنی لە دەریاکاندا بە بەخشندەیی خودا، قورئان بەمە دەیەوێت ئاماژەی شارراوەی دانایی‌و نهێنی ئەو یاسا سەرسوڕهێنەرە بکات کەبە (یاسای

ئەشیمد) ناسراوە کەلەسەر بنەمای ئەم یاسایە گەمێ دروستبووە و ماسی مەلەدەکات ئایا ئەم یاسا بڕیاردەرە پێوراوە ووردەکاریی‌یە، کەوا لەهەمو جەستەیەك دەکات کەنوقمی ئاو بێت هەر لەخوارەوە تا سەرەوەی بە پاڵێکی شاقولی کێشی ئاوەکە یەکسان دەبێت بەقەبارەی جەستەکە، کەکێشی جەستەکە زۆر تربوو لەکێشی ئاوەکە ئەوا نوقمی ژێر ئاوەکە دەبێت، و گەرکێشی جەستەکە کەمتر بوو ئەوا جەستەکە سەر ئاو دەگەوێت، ئەم یاسایە کە بەهۆی نهێنی‌یەکەوە ماسی‌یەکان مەلەدەکەن، و مرۆڤ دەتوانێت پاپۆڕ هێندەی کێو دروستبکات لەکێشو قەبارەو بەرزی و فراوانیدا، و گەر حەز بکات لە ئاسن دروستیدەکات و لەناویدا چی بووێت لە بارستایی هەڵیدەگرێت... بتوانێت بەم هەموو کێش و بارەوە دوور بێت لەنقوم بوون.

ئایا ئەم یاسایەش یەکێکە لە کاریگەرەکانی ڕێکەوت؟ ئەی حەیران..

حەیران/ بەڕاستی ئێمە بێ ئاگابووین لەنهێنی گەمێ و هەڵگرتنی لەدەریادا و بە ئاماژەکردنی ئەم یاسایە بۆیان.

شێخ/ بەمجۆرە دەبینینت ئەی حەیران خودای بێگەرد، داهێنەر و دروستکەری سیستمەکانە، و بەهۆی تواناو کاربەجێیی خۆی وای لەم سیستمانەکردووە کەبەیەك بگەن، و سەپاندنی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا و یاخود هەندێکی تریان پشتیوانی هەندێکی تریان دەکات، لەبەردەوام بون و ژۆینشتنی ئامێری ئەم گەردوونە مەزنە ئاوی کردۆتە بنەمای ژیانی ڕووەکو ئاژەڵ، و بارانی خولی کردۆتە هۆ کارێك بۆ ئاودانی زەوی لەکاتە پێویستیەکانیدا، هەمیشە دەریای کردۆتە سەرچاوەی باران، و بەهەڵمبوون و چڕێنی کردۆتە دوو هۆکار بۆ دروستبوون و بەرزبوونەوە و گەڕاندنەوەیان، و دەریای لەخودی خۆیدا کردۆتە عەمباری خواردەمەنی و ڕێگای بازرگانی و بەهەڵگری گەمێ‌و کەشتی کەدەڕوات بۆ سوودمەندی خەڵك لەسەر یاسا یەك کەئاو و هەوا پابەندێتی، بەبێ هیچ جیاوازی‌یەك پاپۆڕی مەزنی قورس هەڵدەگرێت وەك چۆن بەهەڵمبووە سوکەکان هەڵدەگرێت، دەگونجێت ئەی حەیران کۆبوونەوەی ئەم هەمووە هۆکارو سستمی پەیوەستدارانە بەیەکترەوە لەکاریگەری ڕێکەوت بن ئەی حەیران؟

حەیران/ سوێند بێت بەخودا ئەمە شتێکی مەحاڵە ئەی گەورەم.

شێخ/: ئەی، ئەم کێوانەی کەقورئان لەچەند ئایەتێکدا ئاماژەیان بۆ دەکات، ئایا بەشی ڕێکەوت چەندە لە پێکهاتن و وەستاندن و بەرزکردنەوەو ئەستووریی‌و لەتکردن و قولایی‌یەکانی؟

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت:

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلالاً وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَاناً﴾النحل:٨١

﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَاراً﴾الرعد:٣

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتاً، أَحْيَاءً وَأَمْوَاتاً، وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُمْ مَاءً فُرَاتاً﴾المرسلات/٢٥-٢٧

﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِهِمْ وَجَعَلْنَا فِيهَا فِجَاجاً سُبُلاً لَعَلَّهُمْ يَهْتَدُونَ﴾الانبياء:٣١

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ شَيْءٍ مَوْزُونٍ﴾الحجر:١٩

ئەمە هەندێ لە فەرموودەکانی قورئانە سەبارەت بەکێو شاخەکان، بەڕاستی ئاماژەی ئەوە دەکات لەشێوەی سنگ و پێچکەدابن کە چۆن بێشکەو لانکەکانی پێوە بەندە، و بوونەتە ئەوە پشتگرو بەربەستی باوە جێگەی بەفری سەرکێوەکانن لەبەرزاییەکانیانداو پالێوەری ئاوەڕۆکانی قەدەکانیانن، و لەشانەکانیان و قوڵاییەکانیان و ئەشکەوتەکانیان عەمبارن بۆ ئاو، و لەخوارەوەیان و قەراغەکاندا سەرچاوەو ڕووبارن، بەڵام زانست دەڵێت: گەر کێوەکان نەبوونایە کانی و سەرچاوەکان هەمیشەو بەردەوام نەدەبوون، و ئەو ڕووبارانەی کە زەوییەکانمان ئاودەدەن بەدرێژای ڕۆژەکانی ساڵ نەدەبوون لە کۆتایدا بەپاك و بێگەردی دەڕژێنە ناو دەریاکان، گەر زەوی هەمووی لەشێوەی بێشکەی نزمدا بووایە یاخود ڕووتەخت و ڕاخراو ئەوا بەفرو باران و ساردو سۆڵی بەئاسانی دەبارینە سەری‌و پرش و بلاودەبوونەوە، و یان لەبەشێکی قوڵایی زەویدا کۆدەبوونەوە ئەو کاتە ڕێگا نەدەبوو بۆ پەیدا بوونی سەرچاوەو ڕووبارەکان تاکو بڕژانایەتە ناو دەریاکانەوە، بەڵکو بەوەستاوی‌و نەجووڵاوی دەمانەوە،

سیستمی ئاودانی زەوی و کرداری باران لەبنەمادا تێکدەچوو گەر ئەم کێوانە نەبوونایە.

حەیران/ سوێندبێ بە خودا هەرگیز نەدەهات بەخەیاڵمدا کەوا شاخ و کێو ئەو هەموو سودانەی هەبێت.

شێخ/ منیش، سەرم سەوڕما بوو لەمنەتکردنی خودای پاك و بێگەرد بەسەر بەندەکانیدا سەبارەت بەناوبردنی کێوەکان، و قورئانی پیرۆز بۆی بەردەرخستم، هەر کەناوی کێوەکان دەبات لەگەڵیاندا ناوی ڕووبارو ئاوو ڕوەکدەبات.

دەرکم کرد گەر دروستکردنی ئەو کێوە بەرزانە نەبوایە، سیستمی ئاودان تێکدەچوو بەوەی کە بوونەتە رووتەختێك بۆ باران، و جێگەو پاڵیوەری بەفرە کە بەشێنەیی دەتوێنەوە و بوونەتە عەمبارە گەورەو بەرز بۆ ئاوەڕۆکان، و سەرچاوەی ڕوبارن کەلێیانەوە دینەخوارێ بۆ سەرزەوی، هەروەك چۆن زانستیش بەدەریخستووە و دەڵێت کرداری ئاوەدانی زەوی و گەڕانەوەی باراناوەکان بۆ دەریاکان تێکدەچوو، بەڵکو کرداری باران لەبنەمادا تێکدەچوو، ئایا... ئەم هەموو ڕێکخستن و سیستمە لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانەیە ئەی حەیران؟

حەیران/ چەند پاك و بێگەردە خوای پەروەردگار.

شێخ/ ئێستا وازبهێنە لەو هەموو ڕێکخستنە سەر سوڕهێنەرەی کە کردارە بارانیان ئاسانکردووە، و لە خۆت بپرسە ئەی حەیران، سەبارەت بەو ئاوەی کە قورئان دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾الانبیاء: ٣٠، و زانست دەڵێت: ئاو سەرچاوەی ژیانە بۆ هەموو زیندەوەرێکی سەرزەوی ئایا بەشی ڕێکەوت چەندە لە پێکهێنانی دوو ڕەگەزەکەی کەبۆتە سەرچاوەی ژیان؟

ئەم ئاوەی کەسەرچاوەی ژیانە، وەك زانست دەڵێت پێکهاتووە لە (ئۆکسجین و هایدرۆجین) بەڵام ئەم دوو ڕەگەزە لە پلەی گەرمای زۆردا یەك ناکەون وەك چۆن لەپلەی گەرمای نزمدا یەك ناکەون.

کەواتە چۆن (ڕێکەوت) بۆ ئەم زەوییەو بۆ هەسارەکانی‌تر، ڕێنەکەوت کەوا پلەی گەرمای گونجاو برەخسێنێت بۆ یەکگرتنی ئەم دوو ڕەگەزە و دروستبوونی ئەو ئاوەی کەسەرچاوەی ژیانە.لەوانەیە بڵێیت بەڕێکەوت ئەم یەکگرتنە پەیدا بووە، بەڵام بۆتی بەردەرخەم لەکاتی باسکردنی ڕەگەزەکاندا، کەوا یەکگرتنیان تەنها لەسەر بنەمای یاسای خولەی چەسپاو پەیدا بووە کە یەکێك لەسیستمەکانی ئەوەیە کە ژمارەی ئەلەکترۆنی گەردیلەکانی نابێت لە (٨) ئەلکترۆن زیاتر بێت، و هیچ کاتێك ئەم ڕەگەزانە لەگەڵ ڕەگەزێکی تردا یەك ناگرن تا... ژمارەی ئەلکترۆنەکانی یەکسان

نەبێت بەژمارەی بەتاڵی بارگەی ڕەگەزی بەرامبەر ئایا ئەم یاسایە لەکاری ڕێکەوتە؟ و لەکاریگەری ڕێکەوتە کەڕەگەزی ئۆکسجین بتوانێت ڕەگەزی هایدرۆجین بۆ لای خۆی ڕابکێشێت و یەك بگرن، بەمەش ئەم ئاوە دروستبکەن کە سەرچاوەی ژیانی هەموو زیندەوەرێکی زەوییە!!؟

شێخ/ ئەم هەوایە کەبەهۆیەوە زیندوین و دەژین لەگەڵ هەموو زیندەوەرەکانی سەر زەوی لە ئاژەڵ و ڕووەك ئایا بەشی ڕێکەوت چەندە لە پێکهێنانی ئەم هەوایەو . دەستەبەرکردن و ئاسانکردنی بۆ ژیان، لە کارگەیەکدا کەوەستانی نی‌یە، وەتا کۆتایی ژیان بەخشندەیی یەکەی بەردەوامە.

حەیران/ ئەی شێخی گەورەم باسی ئینبیقی مەزنت بۆ کردم (کارگەی ئاو)ی سەر سوڕهێنەر، بەڵام نەم زانیوە کە هەواش کارگەی هەیە، بەڵکو ئەوە دەزانم کە هەوا شتێکەو بوونی هەیە چواردەوری زەوی گرتووە... کەواتە مانای چی‌یە کە (کارگەی) هەیە نەلە جووڵە دەوەستێت و نە سوودمەندیی‌یەکەی کۆتایی دێت... ؟

شێخ/ ئەی حەیران دەزانیست کە ئۆکسجین لەڕێژەی (٢١) لەهەوادا هەیە و نایترۆجین بەڕێژەی (٧٨)، و هەندێ لە گازەکانی تر و ئۆکسجین گازێکی سوکەو بەخێرا بەرز دەبێتەوە و بڵاودەبێتەوە لەتوانایدایە بەرزبێتەوە و لەلایەن زەوییەوە هەڵبمژرێت کەواتە بۆچی تەنها لەسەر ئەم هەسارەی ئێمە دەمێنێتەوە لەسەر هەسارەکانی تر نامێنێتەوە؟ و بۆچی کە بەڕێژەی (٢١) لەهەوادا بێ زیادو کەم بمێنێتەوە کە ئەمە ڕێژەیەکی پێویستە بۆ ژیانی هەموو زیندەوەرێك، گەر ڕێژەکەی زیاتر بووایە ئەوا هەموو کشتوکاڵ و درەخت و باخمان دەسووتان بەکەمترین گڕ لەهەوادا، و گەر ڕێژەکەی کەمتر بوایە ئەوا هەمو زیندەوەر دەخنکا، ئایا دیاریکردنی ئەم ڕێژەیە لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانەیە ئەی حەیران؟

بەڵام کارگەی هەوا نهێنی دروستکردن و ڕێکخستنی زۆر وردتر و مەزنترە، و دانایی لەبەرهەمەکەیدا گەلێك سەرڕوهێنەرتر و داڕێژراوتر.

چونکە جەستەمان هەمیشە پێویستی بەدروستبوونی وزەی بەردەوام هەیە، و بێگومان وزەش پێویستی بەسووتەمەنی هەیە، و سووتەمەنیش بریتییە لەو ئۆکسجینەی کە بەهۆی هەردوو سیەکانمانەوە هەڵیدەمژین بەمەیش خواردنەکەمان دەسووتێن، بەڵام ڕێژەی

ئۆکسجین لەهەوادا، دیاریکراوە لەبەر ئەوە واچاوەڕوان دەکرێت، کەدوای چەرخێکی زۆر کۆتایی پێبێت، چونکە ئەو ئۆکسجینەی کە هەڵیدەمژین بەهۆی سوتاندنەوە لەگەڵ ئەو کاربۆنەی کەلە خواردنەکانماندا هەیە یەکدەگرن.

دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دروستدەکەن کە ژەهرێکی کوشندەیە و بەهۆی هەناسەدانەوە خۆمانی لێدەربازدەکەین.

گەر بەم شێوەیە بڕوات (ئۆکسجین)ی ناو هەوا بەرەو نەمان دەڕوات ئەو کاتە چارە نی‌یە؟

لەدانایی دروستکەردا وای لەڕووەك کردوە کەهەمیشە پێویستی بە (کاربۆن) هەبێت بۆ ژیان و خواردنەوەی و بەرهەمهێنانی بەروبوومەکەی.

ناتوانێت ڕاستەخۆ لەسروشتەوە وەریبگرێت بەڵکو وای بۆ دانراوە کەلە (دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەوە) وەریبگرێت بەڵام هەر ئەبێت ڕێژەی (دووەم ئۆکسیدی کاربۆن) بەرەو تەواو بوون بچێت. ئەو کاتە چارەی چی‌یە؟

ئا... لێرەدا دانایی داهێنەری مەزن زۆر بەسەرسوڕێنەری لەکرداری ئاڵوگۆڕکردن لەنێو ئێمەو ڕووەکدا بەدەردەکەوێت دووەم ئۆکسیدی کاربۆن وەك زانیت ژەهرێکی کوشندەیە و لەهەمان کاتدا ژەمە خۆراکێکە، کە ژەهر بۆ ئاژەڵ وە خۆراکە بۆڕووەك و ئەمەش بەیەگرتنی کاربۆن لەگەڵ ئۆکسجیندا پەیدا دەبێت بەکاریگەری سوتاندن.

ئێمە کاتێك ئۆکسجین هەڵدەمژین و خواردنەکەمان دەسوتێنین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دەردەکەین و بەهۆی هەناسەدانەوە خۆمان لەم ژەهرە کوشندەیە ڕزگار دەکەین و دەیکەینە دیاری بۆ جیهانی ڕووەك کە پێویستیێتی بۆ بەردەوامی ژیانی و خۆراك و بەرهەمهێنانی بەرووبوومی و گەڵاکانی ئەم ژەهرە کوشندەیە هەڵدەمژن، بەهۆی شیکارێکی کیمیایی سەرسوڕهێنەری سەوزە ماددەی گەڵا کە لەگەڵ ڕوناکی خۆردا یەکدەگرن کەبەمەش دووەم ئۆکسیدی کاربۆنەکە دەبێتەوە دوو ڕەگەز (ئۆکسجین و کاربۆن) کاربۆنەکە دەتوێتەوە بەهۆی ئەو ئاوەی کەڕەگی ڕوەکە کەهەڵی دەمژێت تاکو بەهۆیەوە دیاری‌یە نایابەکانمان پێشکەش بکات لەگوڵ و بەرو بوم، و ئەویش (ئۆکسجین)مان دەداتەوەو دەیکاتە شنەی ژیان.

ئابەم چەشنە (توانای دروستکەری) ئەم ڕێکخستنە سەرسوڕهێنەرەی داهێناوە (کارگە) کەهەمیشە ئۆکسجین بەئێمە دەدات و (کاربۆن)یش بەڕووەك ئەدات، و گەر ئەم ئاڵو گۆڕە سامناکە نەبوایە ژیان لەسەر زەوی نەدەما.

ئایا... ئەمانە هەمووی لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانەن ئەی حەیران؟

حەیران/ پاك و بێگەردی بۆ خودای مەزنە، بەڕاستی کاریگەریەکی سامناکە وەختە سەرسوڕهێنەر ترو داڕێژراوتر بێت لە (کاریگەری باران).

شێخ/ ئایا... ئەمەش یەکێکە لەکاریگەرەکانی ڕێکەوت ئەی حەیران، کە قورئان پێش سیانزە سەدە بەخەڵکی فەرموو ﴿وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِراً نُخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً مُتَرَاكِباً﴾الأنعام:٩٩

حەیران/ گەورەم تێنەگەیشتم.

شێخ/ چونکە بەتەواوی سەرنجی ئایەتەکەت نەداوە، خودا دەفەرموێت (فَأَخْرَجْنَا بِهِ) (بەهۆیەوە دەرمانهێنا) واتە بەهۆی ئاوەوە ڕووەکی هەموو شتێکمان دەرهێنا، و هەروەها دەفەرموێت (فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ) لێمان دەرهێنا واتە لە (ڕووەکمان دەرهێنا) (خضرا) (سەوزی) و لەپاشدا دەفەرموێت (نُخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً) (ناوکی لێدەردەهێنین) ئەم ڕاناوە بۆکێ دەگەڕێتەوە بەفەرموودەی (نُخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً) ئایا دەگەڕێتەوە بۆ ئاو یان بۆ ڕووەك یان بۆ سەوزە مادده؟ حەیران: دیارە کە بۆ (سەوزە مادده) دەگەڕێتەوە بەڵام مانای چی‌یە کەخودا ناوك لەسەوزە دەربهێنێت.

شێخ/ ئا..لێرەدا نهێنی موعجزەکانی ئایەتەکانی قورئان بەدەردەکەوێت، ئەی حەیران، بەڵکو ئاماژەیە بۆ ئەو نهێنی‌یەی کە تا..ئێستا لای زانایان بەشاراوەیی ماوەتەوە؟ زانست وادەریخستوە وەك پێم وتی: پێکهێنانی ڕووەك و خۆراك لە کاربۆنەوە وەردەگرێت، و هەروەها زانست بەدەریخست کەڕووەك دووەم ئۆکسیدی کاربۆن شیکار دەکات بۆ هەردوو ڕەگەزی (ئۆکسجین و کاربۆن) کاربۆنەکە وەردەگرێت و بەهۆی ئەو ئاوەی کە لەڕەگ و لقەکانیەوە دەیمژێت دەتوێتەوە، و بەمەش خۆی پێدروستدەکات و بەرهەمەکەشی بەردەگرێت، بەڵام ڕوەك چۆن دووەم ئۆکسیدی کاربۆن شیکار دەکات بۆ دوو ڕەگەز؟

سەرسوڕهێنەرەکە ئالێرەدایە، زانایان بەدەریانخست کە ئەم شیکارە ڕوودەدات لە ئەنجامی کارلێکی کیمیاوی سەرسوڕهێنەر لەنێوان (ڕووناکی خۆر) و (سەوزە مادده) کە لەخانەی گەڵاکاندا هەیە و بە (کلۆرۆفیل) ناو دەبرێت.و ئەم وشەیە وشەیەکی یۆنانی‌یە کە پێکهاتووە لەدوو برگە (کلۆرۆ) واتە سەوز، و (فۆلۆن)واتە گەڵا.

بەڵام چۆن ئەم کارلێکە کیمیایییە ڕوودەدات لەنێوان ڕوناکی خۆرو سەوزە ماددەدا، ئەم نهێنییە کەزانست بەیەکێك لەسەر سوڕهێنەرەکانی خودای دروستکەری دادەنێت.

زانایان تەنها ئەوەیان زانیوە گەر سەوزە ماددە نەبوایە ئەم کارلێکە کیمیایە ڕوی نەئەدا، و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن شیکار نەدەبوو بۆ هەردوو ڕەگەزی (کاربۆن و ئۆکسجین) و ڕوەکیش خۆراکی وەرنەدەگرت و بەرو بوومیشی نەدەبوو.

ئایا دروستوونی ئەم کارگەی هەوایە و دروستبونی ئەم سەوزە ماددەیە و گۆڕینی ژەهر بەهۆی ئەو سەوزەوە بۆ خۆراك و ڕێکخستنی ئەم گۆڕینەوە دیارییە لەناو دراوسێکاندا بەشێوەیەکی خولی، ئاوا بەڕێك و بێ کەم و کوڕی ئایا ئەمانە هەموو لەکاریگەری ڕێکەوتن ئەی حەیران؟

شێخ ئەی ئەم میوانخانەیەی کە خاوەنەکەی بۆمانی دروستکردووە و چەسپاندۆیەتیو پارێزراوی کردوە، و جیایکردۆتەوەو نەخشانلۆیەتیو بەرزو نزمی تیادروستکردووە، و بەهەموو پێویستیو بەخشندەییەك ئامادەیکردوە، ئایا بەشی ڕێکەوت چەندە تیایدا؟
حەیران: کام میوانخانەیە، گەورەم؟
شێخ/ میوانخانەی ئەم زەوییەیە لەهاتنماندا تیایدا دادەبەزین هەر لەبێشکەوە تاکو گۆڕ..ئەم میوانخانەیەی کە ئارامگا و سۆز و گەرمیو ئاگرو ڕوناکی لەخۆگرتووە لەگەڵ ئەو چێشتخانەیەی کە جۆرەها خواردن و خواردنەوەمان پێشکەشدەکات لە گۆشت و شیرەمەنی و میوە و سەوزە، تەنانەت شیرینیش مان پێشکەشدەکات و جۆرەها پۆشاك کەلەسەرمای زستان و گەرمای هاوین. دەمانپارێزێت، ئایا نەخشەدانان و بایەخدان و ووردەکاری تیادا بەدی ناکەیت ئەی حەیران؟
سەرنجیدە لەبەردە زۆر بچووکەکانی..کە ئەم میوانخانە گەورەیان لێپێکهاتووە، ئەو ماددەیەی کەوورد و خاش و شیکار کرا تا گەیشتتە گەردیلەکەی و بەرەو ناوکی گەردیلەکان چون و توانیان لەتی بکەن ووزەی لێبەدەست بهێنن بەمەش کاولکاری سوتاندن و لەناوبردن و کوشتاریان کرد.
ئایا پاش ئەم هەموو کارە ڕاستی ماددەیان بۆ بە دەر نەکەوت یاخود تا ئێستا نەزانن لێی؟
ئایا بینینی هەموو ئەو پێکهاتووە ڕێکخراوە سەرسوڕهێنەرانە و ئەو لێکچوونە دلڕفێنانەو نەخشە ڕازاوانە، ئاماژەی ئەوە دەکەن کەلەدیاردەی ڕێکەوتی کوێرانە بن؟
نەخێرو نەخێر..ئەی حەیران، پیاوانی زانستی سەردەمی پێشوو تەنها سەرنجی ڕوکەشی ماددەیان ئەدا نەدەچوونە ناو ناوەڕۆك و قولاییەوە و ڕەگەزەکانیان بەشێوەجیاکانی ماددە بەدیان دەکرد، و نەدەزانرا هۆکاری لێکجیابوونەوەیان و پێکەوەلکانیان، و ڕەنگە جۆراو جۆرەکانی رووناکی دەبینی بەڵام نەیدەزانی هۆی نهێنی جۆراو جۆریەکی چییە.بەڵام لەم سەردەمەدا دەچنە ناو قولایی یەکانەوە و لێهاتوویی

خوای بۆ بەردەردەکەوێت گەر زانایەکی سەردەمی کۆن پرسیاری لێبکرایە لەچ ماددەیەك ئەم گەردوونە پێکهاتووە، وەڵامی دەدایەوە کە لە گەردیلەی چوار ڕەگەز دروستبووە ( خاك و ئاو و ئاگرو هەوا)، پاشان زانست پەرەی پێدراو پێشکەوت، و بۆیان بەدەرکەوت کە ئەم چوار ڕەگەزە خۆیان لەخۆیاندا لەچەندین ڕەگەزی تر پێکهاتوون و ئەم ڕەگەزە زۆرانەش لەبەشی هێجگار بچووك پێکدێن کە نەدەبینرێن نەکەرت دەکرێن، و لەسەدەی نۆزدەهەمدا زانست هەنگاوێکی گەورەی نا، و بەدەریخست ئەو پارچە بچووکانەی کەلایان وابوو کەرت ناکرێت لەبەر ئەوەی بچووکترین شتن گەر ئەندێشە بکرێت، ئەمانیش پێکهاتوون لەبەشی زۆر بچووکتر کەبە (گەردیلە) ناودەبرێن، و ڕادەی بچووکیان ئەی حەیران کە تیرەی هەریەکەیان بەڕێژەی (پێنچ ملیۆن بەش) لەئینجێك و کێشەکەی بەگوێرەی ڕەگەزەکانی دەگۆرێت بەنزیکەی لەنێوان دووبەش و (٣٩٥) بەش لەملیۆن ملیار ملیار بەش لە گرامێك.

حەیران/ چەند سەیر و سامناکە!.

شێخ/ ئەم قەبارەیەش زانایان بەگەورەی دادەنێن بەگوێرەی ئەلەکترۆنەکان و پرۆتۆنەکان کە گەردیلەیان لێپێکدێت، و تاکو بۆمانی نزیك بکەنەوە و بتوانین ئەندێشەی ئەو جیاوازییە بکەین، نموونەیەکیان بۆ هێناوینەتەوە گەر ئەلەکترۆنەکان دابنێن بەگەردێ، پرۆتۆن لەچاویا بەقەد گۆی زەوی دەبێ، گەردیلەش لەچاوی‌دا بەقەد سەدیمی ئافرەتی زنجیرەداردەبێ ، گەر بیتەوەیادت، و دەڵێن: جیاوازی نێوان قەبارەی گەردیلە هەمووی بەگشتی و ئەو ئەلەکترۆنانەی کەتیایەتی، وەك جیاوازی نێوان گەردیلەی تۆز و ئەم ژوورەی کە ئێمەی تیاین وایە ئەی حەیران؟

حەیران/ ئای لەم سەرسوڕهێنەرە سەرسوڕهێنەرە!!.

دەگونجێت ئەم گەردیلە بەو هەموو بچووکیەوە (بۆشاییو بەشی )هەبێت؟

شێخ/ بەڵێ ئەی حەیران، بۆیان بەدەرکەوت کەوا گەردیلە بەرگی هەیەو لەناویدا ناوکێك یان چەند ناوکێك دەخولێنەوە و بارگەکانیشیان ئەلەکترۆنێك یان چەند ئەلەکترۆنێك بەگوێرەی ڕەگەزەکانیان هەڵدەگرن، و ناوکیش لەلای خۆیەوە پێکهاتووە لە پرۆتۆنێك و یان چەند پرۆتۆنێك و یەك نیوترۆن و یان چەند نیوترۆنێك، تەنها لەهایدرۆجیندا نەبێت کەنوترۆنی نیە.

حەیران/ ئەم ئەلەکترۆن و نیوترۆن و پرۆتۆنانە چین

شێخ/ ئەلەکترۆن بریتی‌یە لە یەکەیەکی بارگاوی سالب، و پرۆتۆنیش بریتی‌یە لەیەکەیەکی بارگاوی موجەب، و نیوترۆنیش بریتی‌یەلە لەیەکەیەکی بارگاوی بێ لایەن نەموجەبەو نەسالب.

حەیران/ کەواتە مادده و گەردون بەگشتی و ئێمەش لەگەڵیاندا بریتین لەچەندەها . یەکەی بارگاوی کارەبا؟

شێخ/ ئەمە، راستیەکەیەتی ئەی حەیران، و ئەو ماددەیەی کە گەردوون و ئێمەی لێپێکهاتووە، بریتی‌یە لە وزەی کارەبای جامکرا و بەشێوەی گەردیلە و رەگەز، و زانای گەورە (ئەنیشتاین) تیۆری (نسبی) دۆزیەوە و بەجیهانی ووت (ماددەو وزە یەك شتن) راستی ووتەکەی بەدەرکەوت کاتێك کە توانرا ئەتۆم لەتبکرێت و ماددەکەی بگۆردرێت بۆ ووزە، وەك چۆن بەکردەوە بەدەرخرا لە ئەنجامی لەتکردنی گەردیلەدا، هیچ رێگرێك نی‌یە کە ئەمرۆ ووزە بکرێت بەماددە؟

شێخ/ ئەمە بەدوور نازانرێت، ئالێرەدا نابینیت کە زۆر نزیك بوویتەوە لەباوەرهێنان بە ئیمکانی دروستکردنی ماددەی گەردون لەنەبوونەوە (هەمو وزەو هێزێك بەگشتی بۆخودایە) ئەی حەیران (إن الله قوي عزيز) (خودا بەتواناو بەهێزە).

حەیران/ شێخی گەورەم تا ئێستا باسی فەلسەفی (نسبی) بۆ نەکردوم.

شێخ/ (نسبی) فەلسەفە نی‌یە، بەڵکو تیۆری زانستی روتە، گەر ئارەزووت لێبێت بۆتی باسدەکەم، بەڵام ئێستا باسی گەردیلەت بۆ تەواو دەکەم تاکو بزانیت چەند رێکخستن و . کرداری لەخۆ گرتووە، رێنماییکردن بۆ دەرککردنی بوونی رێکخستن بەتەنها مەبەست و ئامانجە.

حەیران/ فەرمان بۆ تۆیە گەورەم.

شێخ/ یەکێك لە سەرسوڕهێنەرەکانی سیستم و رێکخستن ئەوەیە کە ژمارەی ئەلکترۆنەکانی بەرگی دەرەوەی گەردیلە یەکسانە بەژمارەی پرۆتۆنەکانی ناوکە گەردیلە، گەرلە ناوکدا یەك پرۆتۆن هەبێت ئەوا یەك ئەلەکترۆنیش لەبەرگەکەیدا دەبێت، تەنها لەهایدرۆجیندا نەبێت و گەر دوو پرۆتۆن هەبوو ئەوە دوو ئەلکترۆنیش دەبێت، بەمجۆرە یەك لەدوای یەك ژمارەکان بەرەو ژوور دەڕوات، لەسوکترین بارستایی گەردیلەی رەگەزەکانەوە بۆ بەرزترین بارستایی، و رەگەزی یۆرانیۆم قورسترینیانە، و بەهۆی ئەم یەکسانبوونەی نێوان ئەلەکترۆنی سالبی بارگە و پرۆتۆنی موجەبی ناوك بارگەی کارەبایی گەردیلە یەکسان دەبێت، بەڵام نیوترۆنی بێ بارگە لەناوکدا ژمارەی زۆر بێت یان کەم بێت یەکسان نابێت بەژمارەی ئەلەکترۆنی بارگە، چونکە نیوترۆن بێ

بارگەیە، سەرنجبدە. . ئەی حەیران لەم سیستەمە سەرسوڕهێنەرە و لەمەش گەورەتر و سەرسوڕهێنەرتر ئەو یاسا خولییەی کە پۆلێنکردنی بەرگەکانی گەردیلەی لەسەر بەندە بەمەش کاریگەر دەبێت لەسەر دروستبوونی ئەلکترۆنی ڕەگەزە جیاوازەکان و پێکهاتنیان، بەگوێرەی پۆلێنی ئەلەکترۆنەکان و ژمارەیان و زانایان وایان بۆ بەدەردەکەوتووە جێگای ئەلەکترۆنەکان لەبەرگەکانی گەردیلەدا ڕێکدەخرێ بەگوێرەی پۆلێنی هەشتی، گەر ژمارەی ئەلەکترۆنەکان لەبەرگی ڕووتەختی گەردیلەکدا هەشت بوو ئەوا بەرگەکە پڕ دەبێت و هەر ئەلەکترۆنێك لەسەر کورسیەکەی لەهەشت کورسیەکانی ئەو بەرگە جێگەی خۆی دەکاتەوە گریمان ڕەگەزێ (٩) ئەلەکترۆنی هەبێت ئەوا هەشتیان لەبەرگی یەکەمدا جێی خۆیان دەگرن و نۆهەم لەبەرگی یەکەمدا جێگەی نابێت و دەڕوات بۆ بەرگی دووەم لەوێ جێگەی خۆی دەگرێ ئیتر هەروەها یەکەم و دووەم و سێیەم بەهەشت هەشت پڕ دەبنەوە، ئیتر چوارهەمیش هەروەها و تاکۆتایی هەرە بەهەشت هەشتی پڕ دەبێت.

لەمەش سەرسوڕهێنەر تر یەکگرتنی ئەم ڕەگەزانەیە لەگەڵ یەکتردا لەسەر بنەمای پۆلێنی هەشتی کەزۆر لەنەریتی میوانداری تیادا بەدی دەکرێت چونکە یەکگرتنی ڕەگەزەکان ڕوودەدات بەگوێرەی یەکگرتنی ئەلەکترۆنەکانیان.

گەر ژمارەی ئەلکترۆنی بەرگی ڕەگەزە میوانەکە لەهەشت کەمتر بێت، واتە خانەیەکی بەتاڵی هەبێت، ئەو کاتە بەسەنگێکی فراوانەوە دەتوانێت میوانداری ڕەگەزێکی تر بکات بەمەرجێك ژمارەی ئەلەکترۆنەکانی یەکسان بێت بەخانەی بەتاڵی بەرگی ڕەگەزەگە کەلەهەشت ئەلەکترۆن کەمتری هەیە.

ئەو ڕەگەزەی کەلەبەرگی دەرەوەیدا تەنها (٨) ئەلەکترۆن هەیە ناتوانێت میوانداری هیچ ڕەگەزێکی تر بکات، کەبەمەش لێبوردراوە بەلام ئەوەی (٧) ئەلەکترۆنی لەبەرگی دەرەوەیدا هەیە، دەتوانێت یەك بگرێت لەگەڵ ڕەگەزێکی تردا کەلەبەرگی دەرەوەیدا تەنها یەك ئەلەکترۆنی هەیە و ئەوەی کە (٦) شەش ئەلەکترۆنی لەبەرگی دەرەوەدا هەبێت، بەم چەشنە.

لەبەر ئەوەی جیاوازی ڕەگەزە بنەڕەتیەکان بەگوێرەی جیاوازی ئەلەکترۆنیەکانیان، وەك باسکرا، و چ کاتێك بارستایی گەردیلەی هەر ڕەگەزێك زانرا، ئەوا هەموو سیفاتە تایبەتمەندیەکانی دەزانرێ.

(مەندەلیف)ی زانای ڕوسی توانی پۆلێنی ڕەگەزەکان بەگوێرەی بارستایی گەردیلەکانیان بکات، بەمەش خشتیەکی نمرەداری بەرەو ژووری دانا، بەلام زۆر

بەکتوپڕی بەرەنگاری ئەو بۆشاییە بۆوە کە گەردوون ناسەکان دووچاری بونەوە کەلەنێوان مەریخ و موشتەریدا بوو، گەر بێتەوە یادت... حەیران.

(مەندەلیف)ی زانا دۆزییەوە کەنمرەی بەرەوژووری هەر ڕەگەزێك بەشێوەیەکی ئاسایی دەڕواو هیچ بۆشاییەکیان تیادا نییە، تەنها لەسێ ڕەگەزدا نەبێت، یان ئەوەتا ئەم (یاسایی خولەییە) ئاسایی و ڕاست نییە، و یاخود ڕاستە و بوونیان هەیە ئەو کاتە دەبێت بوونی ئەم ڕەگەزە ونبوانە بەگوێرەی بۆشاییەکانیان بن.

جێگای سەرسوڕمانە کە (مەندلیف)ی زانا کەباوەڕی بەڕاستی (یاسای خولەیی) هەبوو، چەسپاندی کە ئەم سێ ڕەگەزە ونبوانە پێویستە بوونیان لەسەر زەوی هەبێت بەڵکو توانی لەسەر بنەمای بارستایی گەردیلەکانیان کە لەپلەکانی بۆشایدا هەن سیفاتە کیمیاییەکانیان دیاریبکات، کەهەیانە هەروەك خۆی بینیبێتی وابێت.

لەوە سەیرتر حەیران (مەندلیف) زۆر خۆشبەختانە توانی پێش مردنی لەساڵی ١٩٠٧ دا ڕاستی پێشبینیە زانستیەکەی ببینێ سەبارەت بەدۆزینەوەی ڕەگەزە وونبوەکان لەلایەن زانایانەوە، و هەریەکە لەوسێ ڕەگەزانە کێشی گەردیلە و سیفاتی کیمیاییان هەبووە کە (مەندلیف)ی زانا پێشبینی کردبوو ئایا، دەشێت ئەی حەیران ئەم سیستەم و پۆلێنە سەرسوڕهێنەرانە لە گەردیلە و مەجەڕەکاندا، بەبێ هیچ جیاوازییەك لەنێوانیانداهەموو لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانە بن؟

حەیران/ شێخی گەورەم ڕاستی فەرموو، کەوتی: زانا بەچونی لەماددەوە بۆ ناوەڕۆکی، خودای بەدیکرد

شێخ/ ئەو ڕوناکیەی کە قورئان لەزۆر لە ئایەتەکانیدا، ئامـاژەی بـۆ دەکـات، ئایا.. بەشی ڕێکەوت لەدروستبوونیو پێکهاتن و ڕێکخستنی یاساو سیستەمەکانی و جۆرایەتی ڕەنگەکان و گۆڕانیان لەبەرچاودا چەندە؟

قورئان دەفەرموێت:

﴿الْحَمْدُ للّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾الأنعام: ١

﴿وَمَا يَسْتَوِي الأَعْمَى وَالْبَصِيرُ، وَلا الظُّلُمَاتُ وَلا النُّورُ، وَلا الظِّلُّ وَلا الْحَرُورُ﴾فاطر/١٩-٢١

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَداً إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُمْ بِضِيَاء أَفَلا تَسْمَعُونَ﴾القصص: ٧١

﴿فَلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، وَمَا لا تُبْصِرُونَ﴾الحاقة/٣٨-٣٩

کەواتە ئەو ڕوناکیە چی‌یە کەبەهۆیەوە شت دەبینین و ئەوە چی‌یە کەخودا سوێندی پێدەخوا بەوەی کە ئێمە دەیبینین و نایبینین، خودا تواناکانی ئاشکرایە ولەقورئانی پیرۆزدا تەنها سوێند بەنیشانە بەرزە دروستکراوەکانی دەخوات، ئەو نیشانەی کە ڕاستەوخۆ لەخۆرەوە، و یان لەورشەدارە نەبینراوەکانەوە دەگەنە سەرزەوی،هەروەك دەڵێن، لەبەرینەوەیەکی جۆراو جۆرو بەگوێرەی ژمێرەکەیان، واتە بەشەپۆلی جۆراو جۆر لەدرێژاییەکانیاندا، بەڵام چاومان تەنها بەشێکی کەمی ئەم شەپۆلانە دەبینینێت، و ئەو شەپۆلانەش ئەوانەن کەکۆلکە زێڕینە کەبەهۆی سێبەری خۆرەوە، حەوت ڕەنگی بەدەردەکەوێت، و ئەو شەپۆلانە لەژێر سورو سەرو وەنەوشەین چاومان نایان بینێت، چونکە چاومان بەنەتوانایی دروستکراوە بۆ بینینی ئەم شەپۆلانە، بەڵکو ئەم شەپۆلانە بۆ بینین و دەرککردن دروستنەکراون.

جیاوازی شەپۆلەکان لەدرێژیاندا دەبێتە هۆی جیاوازی لەڕەنگ و کاریگەریاندا، و درێژترین شەپۆل کەبەچەندەها میل ڕێژە کراوە و کورترینیان (٦) شەپۆلە لە ئینجێکدا، کە کاردەکەنە سەر (ئامێری لاسلکی) گەر لەمەکورترین، گەرمی دروستدەکەن، و بە (شەپۆلی گەرمایی تاریك) ناودەبرێت، و نەبینراوە چونکە درێژە شەپۆلەکەی بریتی‌یە لەبەشێك لە ٣٠ هەزار بەشی ئینجێك، و گەر بەهەمان خێرایی خۆی لەو سنورە تێپەڕی، ئەوکاتە کاریگەری لەسەرمان دەبێت و و ئەمەش بە (شەپۆلی ڕوناکی) ناودەبرێت. و بەهۆیانەوە حەوت ڕەنگی کۆلکە زێڕینە دروستدەبێت، وەڕەنگەکانی ئەم شەپۆلە بینراوانە دەگۆڕێن بەگوێرەی جیاوازی لەخێراییەکاندا گەرلەیەك ئینجدا خێراییەکەی بگاتە (٣٤) هەزار شەپۆل ئەوا ڕەنگی (سور) دروست دەبێت، گەرلەمە کەمتر بوو ڕەنگی (پرتەقاڵی) پەیدا دەبێت و لەپاشدا (زەرد و سەوزو شین و نیلی) و گەر لەمانە زۆر کەمتر بوون بەچەشنێك بگاتە (٦٠) هەزار شەپۆل لەئینجێکدا ئەوا ڕەنگی وەنەوشەیی دروستدەبێت، گەرلەمەش کورتر بوو ئەو کاتە نەبینراو دەبێت.

ئەو ڕەنگانە دروستدەبن کەبە (لەسەرو وەنەوشەییەوە) ناو دەبرێن و کاریگەرییان لەسەرە ماددە کیمیایەکان بەدەردەکەوێت.

لەدوای ئەمانە شەپۆلە پۆلێنکراوی تر زۆر دێت و جیهانی بینراوەکان زۆر کەمتر لەچاو جیهانی نەبینراوەکاندا و شەپۆلە ورشەدارە ناسراوەکان تا..ئەمڕۆش زیاتر لە (٢٧) پلەدا، ڕێکدەخرێن، کە بینراو تیایاندا یەك پلەیە، و پلەکانی تر نەبینراون.

ئێستا تێدەگەیت، ئەی حەیران مانای فەرموودەی خوای مەزن ﴿**فَـلا أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ، وَمَا لا تُبْصِرُونَ**﴾.

ئایا جێی بڕوایە ئەی حەیران ئەم هەموو پۆلێن و سنوورداێ و ڕێکخستنە لەکاریگەری ڕێکەوتن بن؟

حەیران/ پاکی و بێگەردی بۆ دروستکەری مەزنە، بەڵام شێخی گەورەم وادەبینم کە ئینکاری بوونی (ورشە) (ألأثیر) بکات کە زانایان لەسەر بوونی ڕێکەوتوون.

شێخ/ هیچ کامێك لەو زانایانەی کە ووتوویانە (ورشە) بوونی هەیە، نازانن ڕاستی وورشە چی‌یە بەڵام بەگریمان بونیان سەپاندووە، چونکە خۆیان بەرامبەر هەندێ شت بینیەوە کەلایان وابوو تەنها هۆکار بۆ بوونی ئەم شتانە (ورشەیە) و پێوەری ڕوناکییان لەسەر دەنگ کرد، بۆیان بەدەرکەوت کەپێویستە، بوونی نێوەندێك هەبێت لەنێوان ئەم شتانەدا بۆ گواستنەوەی کاریگەر لەتەنێکەوە بۆتەنێکی تر.

بۆ نموونە کاتێك لە جێگەیەکی دورەوە تۆپێك دەتەقێنرێت و دەنگەکەی دەگاتە ئێمە، دەپرسین چی ئەم دەنگەی لەتۆپەکەوە گەیاندۆتە گوێی ئێمە، هیچ شتێك نابینین، بەڵام دیارە کە نێوەندێك لەنێوان ئێمە و تۆپەکەدا هەیە کە ئەویش هەوایە، بەهۆی تەقاندنی تۆپەکەوە دووچاری لەرینەوە بوو، بەمەش لەرینەوەکە دەگاتە گوێی ئێمە، و ئەو هەوایەی کە گونجاوە بۆ گواستنەوەی ئەم دەنگە نێوەندێکی گونجاوی نی‌یە بۆ گواستنەوەی ڕوناکی گەر سەرنجی ڕوناکی گلۆپێکی کارەبا بدەین لە جێگایەکی دوورەوە وەك شتێك دەبینرێت لەنێوەندە هەوایەکی خامۆشدا و گەر گەردەلولێکی ڕەش هەڵیکرد دەبینین هیچ کاریگەرێکی نی‌یە لەسەر ڕوناکی ئەم گلۆپە، وەك ئەو کاریگەریەی کە هەیەتی لەسەر دەنگی تۆپەکە، گەر تۆپێکی شوشەیمان لەهەوا بەتاڵکرد وەزەنگێك و گلۆپێکمان تیادانا، و تەزوویەکی کارەبامان بەزەنگەکەوە بەست بەهیچ جۆرێك گوێمان لەدەنگی زەنگەکە نابێت، و گەر تەزووەکەمان لەسەر گلۆپەکە بەست کتوپڕ گلۆپەکە دادەگیرسێت، بەمە دەرك دەکەین کەهەوائەو نێوەندە گونجاوە نی‌یە بۆ گواستنەوەی ڕوناکی، و ئەم نێوەندە کە زانایان بە(ووشە) (ألأثیر) ناوی دەبەن بەبێ ئەوەی ڕاستیەکەی بزانن.

بەڵام تاقیکردنەوە زانستیەکان نەبوونی وشەیان سەلماند و پێوەر لەنێوان دەنگ و ڕەنگدا لەگەڵ جیاوازیدا.

لەڕاستیدا دەنگ بریتی‌یەلە پێکداداني لەگەڵ هەوادا و بەلەرینەوەی جۆراو جۆر دەیلەرێنینەوە تا..دەگاتە گوێمان گەر هەوانەبوایە دەنگیش نەدەبوو، بەڵام ڕوناکی شەپۆلی تیشکەکانی بەبێ پێویستی بەهیچ نێوەندێك بەئاسانی بەبۆشایدا دەڕوات.

هیچ جیاوازی نی‌یه گەر (وورشه) بوونی فیعلی هەبێت و یاخوود بوونێکی گریمانی سەپێنراو بێت، ئەوەی کەهەمیشە لای من گرنگە ئەی حەیران، ئەوەیە کە لەلایەنەکانی دانایی و سیستم و دروستکردنت بۆ بەدەرنجەم، ئایا لەو جیاوازیی‌یە بەئاگایت کە خودا لەگواستنەوەی دەنگ و ڕوناکیدا دروستیکردوە.

ئایا چۆنت ئەندێشە دەکرد گەردەنگ وەك ڕوناکی بگەیشتایە گوێمان، لەخۆر و هەسارو ئەجرامە ئاسمانیەکانی ترەوە یاخود بەپێچەوانەوە بووایە ڕوناکی بەهۆی هەواوە بگەیشتایەتە بەئێمە، بەمەش بیستن و بینینمان تێکدەچوون.

ئایا ئەم جیاکاری‌و سیستم و دانایی‌یە هەموو لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانەیە ئەی حەیران.

حەیران/ بەخشندەیت زیاتر بێت ئەی گەورەم.

شێخ/ ئەی ئەم ئاگرە، ئەی حەیران.

حەیران/ بەڵام شێخی گەورەم پەیمانی داپێم باسی (ڕێژەیی) (نسبیه)م بۆ بکات.

شێخ/ دەبینم زۆر سوری لەسەر بیرۆکەی (ڕێژەیی) وەك مێشکت خولیای بوو بێت وایە.

حەیران/ چۆن خولیای نابم کەئەو هەمو سەرتایی‌یە عەقلیە ئاشکراکانی سەرو ژێرکرد، کاتێك ئینکاری ئەوە دەکات کە کورتترین هێڵی ڕاست ئەو هێڵەیە کەدەکەوێتە نێوان دوو خاڵەوە و لای وایە کە دووریی‌یەکان سێ دووری نی‌یە بەڵکو چوارە و یەکێکیان لەو چوارە (کاتە) و زۆر شتی تری سەرسوڕهێنەرە.

شێخ/ ئەمانەت لەکوێوە زانی؟

حەیران/ لەڕۆژنامە گەڕۆکەکان خوێندوومەتەوە،و یاخود لەلایەن خەڵکەوە گوێبیستی بووم.

شێخ/ ڕاستی زانستەکان لەهەواڵی ڕۆژنامەکانەوە وەرمەگرە، و بێجگە لەزانایان لەکەسی تر وەری مەگرە، و مەهێڵە عەقڵت چەواشەی لایەنە سەرەتایی‌یەکان و ئاشکراکان بێت، گەر بەگشتی هەموو زانایان هەواڵی چەواشەی عەقڵت بکەن باوەڕت نەبێت کەزانایەکی مەزنی وەك ئەنیشتاین پێچەوانەی عەقلی خۆی بکا و ئینکاری شتە سەرەتاو ئاشکراکان بکات، چونکە ئەنیشتاین بیروباوەڕی سەروژێرنەکردوە، بەڵام هەندێ لایەنی تێدا ڕاستکردۆتەوە، ئینکاری ئاشکراکانی عەقلی نەکردوە، بەڵام بەئاگامان دەکاتەوە کەوا لەتێگەیشتنو دەرك کردنماندا ڕادەیەك بۆ جێگا و کات و جوولە دابنێین کەدەرك کراوەکانیان تیادایە، بیرۆکەی (ڕێژەیی) کاتێك دەڵێت (هێڵی

ڕاست نزیکترین هێڵە لە نێوان دوو خاڵدا، چونکە ئەو ڕێژەیە بۆ لاربوونەوەی زەوی دادەنێت کە هێڵە ڕاستەکەی بەسەردا دەڕوات و هەرگیز ناتوانین بۆ نموونە ئەندێشەی کورتترین هێڵی نێوان نیۆیۆرك و پاریس بکەین، لەکاتێك ئەو هێڵە لەسەر زەوییەکی چەماوەدا دەڕوات، گەر لەناخی زەویدا هەمان قیاسی بکەین لە نێوان ئەو خاڵەی کەنیۆیورك لەسەریتی و ئەو خاڵەی کە پاریس لەسەریتی، و ئەو ئاشکرایەی کەدەڵێت هێڵی ڕاست کورتترین ماوەیە لە نێوان دوو هێڵدا وەك خۆی بەڕاستی دەمێنێتەوە و کاتێك (ڕێژەیی) دورییەکان) (سێ) دووری نین و (چوارن) کە یەکێکیان (کاتە) ئەمەش بەسەر تەنی جولاودا دەچەسپێت نەك بەسەر تەنی وەستاو، و سەبارەت بە (جێگا)و (کات) کەسێکی دەرك کەر پێیان هەڵدەستێت، و لەبەر ئەوەی زانست سەلماندنی هیچ تەنێك لەگەردوندا لە گەردیلەوە بۆ مەجەرەکانی هەموو بەگشتی لەجوولەیەکی بەردەوامدان بەخێرایی جیاواز، و هەروەها سەلماندیان هەموو تەنێك کەم و گرژدەبێتەوە لەهێڵێکی بەئاراستەی خێراییەکەی بەگرژ بوونێکی (ڕێژەیی) بەگوێرەی خێرایی تەنەکەی چەسپاوە کەلەنێوان بارستایی‌و ووزەدا گونجانێکی بێ ڕادە هەیە، واتە ووزە یەکسانە بەبارستایی لێدراو بە چوارینەی خێرایی ڕوناکی، و ژمارەی یەکەکانی بارتاییەکەی لەژمارەی چەسپاو دراوەکە چوارینە خێرایی ڕوناکییە.

لەبەر ئەم گونجاندنە چەسپاوە لەنێوان ووزەو بارستایدا واتە لەنێوان هێزو ماددەدا هەردووکیان دەکا بەیەك شت و هەرکاتێك بارستایی زیادیکرد ووزەش زیاد دەکات،و هەرکاتێك ووزە لەتەنێکدا نەما بارستایی یەکەی کەمدەبێتەوە و بەمەش ماددە شیاوی ئەناو چوونە، و لەبەر ئەوەی (کات) جیاوازی هەیە لەنێوان دوو کەسی دەرك کەردا کە یەکێکیان لەهەسارێك ئەوی تریشیان لەهەسارێکی تر بەمەرجێك خێرایی ئەم دوو هەسارە جیاواز بێت، چونکە وەك دەزانێت کات بەدوای جوولەدا دێت، و بەمەش (قیاسی) ڕێژەیی دەبێتە دەستکەوتی ئەم کورتکراوە زانستیانەی کە گەیشتینە ئەنجامە زانستیەکانی، وەك یەکێك لەوانە ئەندێشەمان بەوەی دووری تەنە جولاوەکان ناگونجێت بەکارهێنانی لەسەر بنەمای سێ دوورییەکانی جێگا کەئەمانەن (درێژی)، (پانی) (بەرزی)، وەك دەیزانین، بەڵکو پێویستە لەگەڵ ئەم سیانەدا ڕەگەزی (کات)یش هەبێت، واتە ڕەگەزی خێرایی کە درێژی‌و بارستایی ماددەو ووزەکەی پابەندێتی، بەمەش کاردەکاتە سەر درێژی ماوەی مانەوەو لەناوچوونی...

بەم چەشنە سەرنجمان بۆ ماددەو درێژی‌و بارستایی‌و ووزەو جێگاو کات ناتوانین سەرنجدانێکی جیاوازو چەسپاوی بەڕادەمان هەبێت، بەڵکو پێویستە سەرنجدانمان بۆ شتە

دەرککراوەکان، سەرنجدانێکی ڕێژەیی بێت لەگەڵ دووریی‌یەکاندا ڕادە بۆ کات و جێگا و جوولەو خێرایی مادده دابنێین، و ئەمەیە مانای (ڕێژەیی) (النسبیه) (Relativite) ئایا حەیران هیچ شتێکت تیادا بینی کە مەعقول و ئاشکراکان ئینکار بکات؟

وادەزانی خۆم لەباسی (ڕێژەیی) دووردەخەمەوە لەبەر ئەوەی باوەڕ هێنان دوورم دەخاتەوە.

حەیران/ بەڵێ وام دەزانی.

شێخ/ نەخێر، نەخێر ئەی حەیران (ڕێژەیی) بڕیاری نەبوونی بێ ڕادەیی کات و جێگای نەداوە، بەمەش وتەکەی غەزالی ڕوونکردەوە کەپێش هەزار ساڵ ووتبووی و نزیکی خستەوە لە باوەڕهێنان بەخوداوە بڕیاری بوونی یەکگرتنی نێوان ماددەو هێزی داوە، و بە گۆڕانی مادده بۆ ووزە و لەناوچوونی، و بەمە گەیشتە نەمریی کە مەحاڵ نی‌یە دروستکردن و نەمان لە نەبوونەوە بە پێچەوانەی ئەو ووتەیەی کە دەڵێت: (هیچ شتێك لەسروشتدا نەدروستدەکرێت و نەلەناو دەچێت)

ئەو بیرۆکەیەی کە زاڵبوو بەسەر عەقڵماندا و زەحمەت بوو لەلامان باوەڕهێنان بەدروستکردن لەنەبوونەوە... ئەم (ڕێژەیی)یە نزیکی کردینەوە بەم هەموو شتە بۆ باوەڕهێنان و نزیك بوونەوەی زیاتر لە خودا.

حەیران/ کەواتە ئەنیشتاین لەباوەڕداران بوە بەبوونی خودا.

شێخ/ نەك تەنها باوەڕدار بوو بەڵکو لای وابوو هەموو زانایەکی دانا کە دەچێتە ناو قوڵایی هەندێ نهێنی دانایی و سیستم و دروستکردنی باوەڕهێنانی بەبوونی خودا مەزنتر دەبێت، بەڵکو وای بۆ دەچێت کە زانست ڕێڕەوی ڕاستی نابێت گەر باوەڕی لەگەڵدا نەبێت، و باوەڕیش بەبێ زانست پڕشنگدار نابێت، و لەم ڕوانگەیەوە دەڵێت و چەند جوانە ووتەکەی:

جوانترین موچوڕکە کە بەلەشماندا دێت ئەو کاتەیە کە دەوەستین لەسەر سەکۆی شاراوەی بەردەرگای نهێنی یەکان، کەناوەرۆکە بۆ زانینی ڕاستی‌یەکانی بۆ هەموو هونەرو هەموو زانستێك و ئەو کەسەی مردوە گەر ئەم هەستە لەلای نەبزوێت، وزە لەژیانێکی داخراوو ترسدا دەژی، بێ ئەوەی بەشداری جوانی سەرسوڕهێنەر بێت، ناوەرۆکی جەوهەری هەستمان بە ئاین، لەناخدا ئەوەیە کە دەبێت بزانین ئەو کەسەی کە ڕێگای زانینی خودی ئەو نازانرێت، و هیچ ڕێگایەك نیە بۆ زانینی کونهی ئەوشتە بوونی هەیە.

بەداناترین نیشانەوە بەرازاوەترین جوانی زاتی ئەو بەدەردەکەوێت لەم جیهانەدا، کە ئامێرە داماوەکانی عەقڵمان تەنها دەرکی وێنە ڕوو کەشیەکان دەکات لەڕووتەختەکاندا بێ چوونە ناو ووردەکاری قوڵاییەکانەوە.

بانگێشی باوەڕی ئەو زانایە دەکات کەدەرکی هاوکاری نێوان باوەڕ بە بوونی خوداو زانست دەکات، (واتە بوونی ئەو باوەڕە قووڵەی بەو داناییەی کە ئەم گەردونەی لەسەر دروستکراوە، ئەوەش باوەڕی کلپەرو نیوتن بوو، چ تامەزرۆیەك دەگاتە تامەزرز گردارەکەی ئەم دوانە بۆ بینینی تروسکای ئەو بلێسە کەدەردەکەوێت لەڕوناکی عەقڵ لەم گەردوونەدا؟

من هەرگیز ناتوانم ئەندێشەی زانایەك بکەم کەنەزانێت بە بنەما دروستەکانی بوونی گەردوونی کەوەستاوە لەسەر داناییەك و ئەوەش لەلای عەقڵ دەرك کراوە، (زانست) بێ باوەڕ ڕێڕەوێکی چەوت دەگرێت و باوەڕیش بەبێ زانست، هەروەك کوێر دەست ئەکوتێ).

حەیران/ ئەمە زۆر گرنگە گەورەم.

شێخ/ ئێستا ئەی حەیران بابگەڕێینەوە بۆ میوانخانەکەمان کە خاوەنەکەی ئاگری لەچێشتخانە و ژوورەکانیدا داناوە.

ئەو ئاگرەی کە قورئان لەهەندێ ئایەتدا ئاماژەی بۆ کردووە، و منەتمان بەسەردا دەکات تاکو بەیادمان بهێنێتەوە مەبەستە بوون و دانایی لەدروستکردندا، پێم بڵێ ئەی حەیران بەشی ڕێکەوت چەندە لەدانانی ئامرازو ئامادەکردنی ڕەگەزەکانی، و بەدەستهێنانی مادەکانیو ئاسانکردنی بەشێوەیەکی شارراوە، و بەکارخستنی مرۆڤ بۆ بەکارهێنانی لەکاتی پێویستدا، بەگوێرەی سیستەمە دیارکراوەکان و سیفاتە تایبەتمەندەکانیان؟

قورئان دەفەرموێت:

﴿أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ، أَأَنْتُمْ أَنْشَأْتُمْ شَجَرَتَهَا أَمْ نَحْنُ الْمُنْشِئُونَ، نَحْنُ جَعَلْنَاهَا تَذْكِرَةً وَمَتَاعاً لِلْمُقْوِينَ، فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ الْعَظِيمِ﴾الواقعة/٧١-٧٤

﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمْ مِنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَاراً فَإِذَا أَنْتُمْ مِنْهُ تُوقِدُونَ﴾یس: ٨٠

بەڵام زانست دەڵێت: ئاگر بریتییە لەدیاردەی ئەو زیادە گەرمیەی کەلە ئەنجامی سوتاندنی هەندێ لەتەنەکان بەدەر دەکەوێت، و (سوتاندن) بەمانا گشتییەکەی بریتییە لەدیاردە کیمیاویەکان کە ڕوودەدات لەئەنجامی یەکگرتنی تەنێك لەگەڵ ئۆکسجیندا

بەڵام ئەو سوتاندنەی کە گەرمی پەیدا دەکات لە ئەنجامی یەکگرتنی ئۆکسجینە لەگەڵ کاربۆن، و ئەم کاربۆنەش لە تەنە جیاوازە بێ گیانەکان و گیانلەبەرەکانی ناو سروشتدا هەیە، بەڵام زۆرترین و گەورەترین بوونی کاربۆنی لەڕووەکدا هەیە وەك دەزانیت خانەکانی رووەك بەگشتی لەکاربۆن پێکهاتووە، بەڵکو دەتوانین بڵێین کاربۆن تەنها رەگەزە لەپێکهاتنی ڕووەکەکە خۆیو خۆراك و بەرووبوومەکەی ئێستا دەرکت کرد ئەی حەیران کەئەم ئایەتانە چیان لەخۆ گرتووە، چەند مەزن و ئاشکران، بۆ بەردەخستنی توانایی و کاربەجێیی خودا (ئاگر گەورەترین پێویستی ژیانی مرۆڤە بۆ گەرمکردنەوەی خۆراك و کارەکانی، و گەر بەشێوەی ئاوا بوونی زۆر بووایە، ژیان لەناو دەچوو، یاخود مەترسیەکی هەمیشەیی دەبوو لەسەر ژیان سەرنجبدە چۆن خودا سیستم و ڕەگەزەکانی بۆ داناوە، و درەختی سەوزی بۆ ڕەخساندووە، و کردۆتیە شوێنی حەشاردانی وزەو ئێمەی زاڵکردووە بەسەریدا بۆ بەکارهێنانی لەکاتی پێویستیدا بەگوێرەی پێویست، و کردۆتیە جێی خۆشحاڵی بوونمان بۆ ئەوەی وەك یادنامەیەك بمێنێتەوە کە هەرگیز لەیادمان نەچێت.

(کاتێ کە دەریدەهێنین لەشوێنە شاراوەکەی خۆیدا کە ئەویش لەناو درەختی سەوزو تەڕو ئاودارەکاندایە کە هەرگیز بەیادماندا نایەت کەلەو شوێنەدا خۆی حەشاردابێت)

ئەو توانا مەزن و داناو دڵڕفێنەی کەداری ئاگری بۆ دروستکردووین ئەم بەیادهێنانەوەیە کابرایەکی لادێ نشینی سادە سەرسام دەکات و توانایی خودای پیشان دەدات، هەروەك چۆن زانایەکیش سەرسام دەکات و دەرکی ئەوەدەکات کەلەپشت ئەم توانایەوە چ نهێنییەکی گەورەو دانایی و سیستم و مەبەست و نەخشەدانان هەیەئەی حەیران ئایا ئەم ئاگرە راستەوخۆ لەکردارێکەوە دروست نەبووە تابوترێت لەدروستکەری رێکەوتی کوێرانەیە؟ بەڵکو ئامادەو دانراوە بۆ پێکهێنانی وزەیەك کە وەستاوە لەسەر کاتێك کە بەئەنجامی ئەدا دەریدەهێنێت لەشوێنە شاراوەکەیدا لەکاتی پێویستدا بەگوێرەی سیستمێکی وورووژێنەر).

ئایا ئەم ئاگرە کەخودا پێی بەخشیوین و کردۆتیە بەڵگە لەسەر بوونی خۆی، دەشێت لەکاریگەری رێکەوتی کوێرانە بێت ئەی حەیران؟

حەیران/ پاك و بێگەردی بۆ خودای مەزنە.

شێخ/ ئەم رووداوانە کەلەقورئانی پیرۆزدا لەگەڵێك ئایەتدا ئاماژەیان بۆدەکات، و جیاوازی لەڕەنگو بەروبوومەکانیاندا دووبارە دەکاتەوە، ئایا بەشی رێکەوت چەندە لەدروستبوونیاندا بەو جۆرو شێوازو چێژو بۆن و تایبەتمەندی و سوودەی کەهەیانە، و

هەموویان بەگشتی لەیەك خاك دەڕوێن و بەیەك ئاو ئاو دەدرێن؟
قورئان دەفەرموێت:

﴿وَفِي الْأَرْضِ قِطَعٌ مُتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِنْ أَعْنَابٍ وَزَرْعٌ وَنَخِيلٌ صِنْوَانٌ وَغَيْرُ صِنْوَانٍ يُسْقَى بِمَاءٍ وَاحِدٍ وَنُفَضِّلُ بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ فِي الْأُكُلِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾الرعد: ٤

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا﴾فاطر: ٢٧

﴿وَهُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ نَبَاتَ كُلِّ شَيْءٍ فَأَخْرَجْنَا مِنْهُ خَضِراً نُخْرِجُ مِنْهُ حَبّاً مُتَرَاكِباً وَمِنَ النَّخْلِ مِنْ طَلْعِهَا قِنْوَانٌ دَانِيَةٌ وَجَنَّاتٍ مِنْ أَعْنَابٍ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُشْتَبِهاً وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ انْظُرُوا إِلَى ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَيَنْعِهِ إِنَّ فِي ذَلِكُمْ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾الأنعام: ٩٩

﴿هُوَ الَّذِي أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَكُمْ مِنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ، يُنْبِتُ لَكُمْ بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالْأَعْنَابَ وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾النحل/ ١٠-١١

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ، تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُنِيبٍ، وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُبَارَكاً فَأَنْبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ، وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَهَا طَلْعٌ نَضِيدٌ، رِزْقاً لِلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَيْتاً كَذَلِكَ الْخُرُوجُ﴾ق/٧-١١

﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَى ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ، فَأَنْشَأْنَا لَكُمْ بِهِ جَنَّاتٍ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ لَكُمْ فِيهَا فَوَاكِهُ كَثِيرَةٌ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَشَجَرَةً تَخْرُجُ مِنْ طُورِ سَيْنَاءَ تَنْبُتُ بِالدُّهْنِ وَصِبْغٍ لِلْآكِلِينَ﴾المؤمنون/١٨-٢٠

﴿فَلْيَنْظُرِ الْإِنْسَانُ إِلَى طَعَامِهِ، أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبّاً، ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقّاً، فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبّاً، وَعِنَباً وَقَضْباً، وَزَيْتُوناً وَنَخْلاً، وَحَدَائِقَ غُلْباً، وَفَاكِهَةً وَأَبّاً، مَتَاعاً لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾عبس/ ٢٤-٣٢

سەرنجبدە کە چۆن قورئانی پیرۆز بەڵگە بڕە بەرزەکان لەسەر بوونی خوداو تواناکانی بەدەردەخات بەجۆرەها ئایەتی جیاواز کە ئاماژەی دروستکردنی دەدەن بەوەی کە لەکاریگەری مەبەست و وویست و داناییە، نەك لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانە.

زانست بەسەر سامییەوە بەرامبەر ئەم توانایە دەوەستێت کەوای لەزەوی کردووە بەتەنها لەخاکەکەیدا جۆرەها ڕووەکی تیادا بڕوێت، زانایان دەڵێن: ئەو ڕەگەزانەی کەوا ڕووەکیان لێپێکدێت ئاشکران هەمویان خۆراکیان لەزەوییەوە دەمژن لەسەر یەك خاك دەڕوێن و بەیەك ئاو ئاودەدرێن، و یەك هەواش دەمژن و خۆراك و بەروبوومیان لەیەك کاربۆن دروستدەکەن.

نزیك بۆ ڕێکەوت ئەوەیە کە هەموو ڕووەك بەگشتی، یەك جۆربن، کەواتە ئەو نهێنییە چییە کەهەندێکیان جیاوازین لەهەندێکی تریان لەبەرووبووم و خواردنیاندا وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت، تەنانەت لەپانتاییەکدا کەلە مەترێکی چوار گۆشە زیاتر نەبێت، شیرین و ترش و تاڵ و ژەهراوی بچێنرێت و بەیەك ئاویش ئاو بدرێن، هەریەك لەم ڕووەکانە بەبێ هیچ تێکەڵاو بوونێك بەروبوومە جیاکراوە تایبەتمەندەکەی خۆیان بە بەردەهێنن.

انستی ئەمڕۆ بەدەریخستووە کە چۆن خودای بەتوانا لەگەرای ئاژەڵدا ڕەگەزی نەخشە بۆ ماوەییە سەرسوڕهێنەرەکانی داناوە، هەروا هەمان نەخشەی لەتۆوی ڕوەکەکاندا داناوە جا ئایا ئەم نەخشە کێشانە لەکاریگەری ڕێکەوتن، ئەی حەیران؟

سەرنجبدە کە چۆن قورئان لەملیۆنەها جۆری ڕووەك و دانەوێڵە و زەیتوون و دارخورماو تریو هەناری هەڵبژاردوە بەتایبەتی لەنێو هەموو ڕووەکە بەسوودەکانی تردا باسیکردوون بۆ ئاماژەکردنی بوونی (مەبەست)و (بایەخدان) لەدروستکردندا.

تۆ دەزانیت ئەو خۆراکەی کەلەشمان پێویستی پێیەتی پێکهاتووە لەمادده نیشاستە شەکرییەکاربۆنیەکان، و چەوریەکان و سەبارەت بەپرۆتینیش، قورئانی پیرۆز لەباسکردنی ئاژەڵدا ناوی دەبات.

بەڵام سیانەی یەکەم ، لەوانە نیشاستەکان لەهەموو جۆرەکانیدانەوێڵە دەردەهێنرێت، و شەکرییە کاربۆنیەکان لەتریو خورماو هەناردا دەردەهێنرێت و چەورییەکان لە (زەیتەوە) دەردەهێنرێت.

بیربکەرەوە ئەی حەیران لەنهێنی ئەو ووتانە، خودای مەزن گفتوگۆ لەگەڵ عەرەبدا بەو نتانە دەکات کەتیی بگەن و هەرتیایدا گفتوگۆ هاتووە بۆ نەتەوەکانی پاش ئەوان کەخودا بەپەیدابوونیان دەزانێت کەلەدوای ـەوەی بەزیاتر لە هەزار ساڵ پەیدا دەبن و

لەتێگەیشتنی باسکردنی ئەم جۆرانە لەلایەن قورئانەوە بۆی بەدەردەکەوێت کەچ ڕەگەزێکی خۆراکی سەرەتایی گرنگیان لەخۆ گرتووە بۆ مرۆڤ بێجگە لەئاژەڵ کەخودا لەباسی گژووگیادا ناویان دەبات.

حەیران/ دەبینم قورئان ناوی زەیتون زۆر ئەبات، و بە پیرۆزی دادەنێت، و کردۆتیە نموونە لەسەر هێنانەوەی ڕوناکی خودا.

شێخ/ هەر لەکۆنەوە لای هەموو نەتەوە جێنشینەکانی دەریای ناوەڕاست ئەم درەختە پیرۆز و مووقەدەس بووە لای ئەوان نیشانە و هێما بووە بۆ (دانایی)و (پیت و بەرەکەت) وەزیاتر لەو دەڤەرە ناوەندەدا دەڕوێت کەخودا سەبارەت ئەم جێگایە دەفەرموێت (نەخۆر هەڵاتیەو نەخۆر ئاواییە) و ئەو دەوروبەری زەوییە پیرۆزانە دەگرێتەوە کە جێگەی لەدایکبوونی شارستانیەت و ئاینە ئاسمانیەکان بووە بەگشتی؟

چۆن پیرۆزنابێت کەخودا پیرۆزی پێبەخشیوە کاتێك لە جیهانی ڕووەکدا سەرسوڕهێنەر ترین نیشانەی دروستکردنی خۆی تێدایە لەتوانایی و کاربەجێیی و بایەخدان کە بەگشتی خۆراك و گەرمی و ئاگرو ڕووناکی تیادا کۆکردۆتەوە، هیچ کاتێك بەخەیاڵماندا نەهاتووە و ئەندێشەمان نەدەکرد کە ئەم هەموو شتە شاراوانە لەم درەختە هەمیشە گەڵا سەوزەدا کۆ بووبێتەوە، کەچەوری لێوە دەردەهێنن کەسەرچاوەی خۆراکی لەشمانە و تام و چێژە بۆ خواردنەکانمان و گەرمیە بۆ دەروونمان و ئاگرو ڕوناکی لەزەیتە کە دەردەکەین کە بەبێ ئاگریش نزیکە زەیتەکە خۆی ڕوناکی بخاتەوە وەك خودا دەفەرموێت ﴿**نُورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ**: ڕوناکی لەسەر ڕوناکی دەیکاتە ڕێنمایی بۆ ئەو کەسانەی کەبیەوێت﴾النور:٣٥، ئەی حەیران.

حەیران/ ﴿**نُورٌ عَلَى نُورٍ يَهْدِي اللَّهُ لِنُورِهِ مَنْ يَشَاءُ**﴾النور:٣٥

شێخ/ ئەم ئاژەڵانە ئەی حەیران لە پێدارو باڵندەکان، کە قورئان لەزۆر ئایەتدا ناویان دەبات، و ئاماژەی جیاوازیەکانیان دەکات لەگەڵ ئەوەی لەیەك بنەڕەتەوە دروستبوون کە ئەویش (ئاوو خاکە) بەشی ڕێکەوت چەندە لەدروستکدرنیان و پێکهاتنیان و جیاوازی لەجۆریان و شێوازیان و ڕێژەیان و ئەندامیان و هێزیان و ڕەنگیان و دەنگیان و سودمەندیان و زەرەمەندیان؟

قورئان دەفەرموێت:-

﴿**وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ فَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى**

رِجْلَيْنِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾النور:٤٥

﴿أفَلا يَنْظُرُونَ إلى الإبلِ كَيْفَ خُلقَت﴾الغاشية:١٧

﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلا طَائِرٍ يَطِيرُ بِجَنَاحَيْهِ إِلَّا أُمَمٌ أَمْثَالُكُمْ﴾الأنعام:٣٨

﴿إنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّه لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَو اجْتَمَعُوا لَهُ﴾الحج:٧٣

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجْنَا بِهِ ثَمَرَاتٍ مُخْتَلِفاً أَلْوَانُهَا وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ، وَمِنَ النَّاسِ وَالدَّوَابِّ وَالْأَنْعَامِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ﴾فاطر٢٧-٢٨

زانست دەڵێت: ئەو ڕەگەزانەی کەئەم لاشانەی لێ پێکدێت زانراون و هەموو ئاژەڵێك لەبنەڕەتدا لەئاوو خاکی ئەم زەوییە دروستبووە پاشان جۆرایەتیو گەشەی بەسەردا هاتووە بەپێی یاسای (پێکهاتن و گەشەکردن) کەلەمەو پێش باسمانکرد، و لەوانیە ئەم بۆ چوونە ڕاست بێت، چونکە دروستکردنی ڕاستەو خۆ زیاتر بەڵگەی تیادا نییە لەسەر بوونی خودا لەدروستکردنی بەپێی یاسایی پێکهاتن و گەشەکردن، هەروەك جسر دەڵێت: (ئەم سیستمانەی کە ژیان دەبەن بەڕێوە لە پێکهێتنی زیندەوەر و گەشەکردنیان و لەجیاوازیان و لەیەکچوونیان و بۆ ماوەییان و جۆرایەتیان هەموو بەگشتی یاسا و سیستمن وەك دەڵێت یاساو سیستمن واتە، دیاردەن لەدیاردەکانی نەخشە دانان و وویست و دانایی، ئایا جێی بڕوایە ئەمانە لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانەبن، ئەی حەیران؟

تۆ دەزانیت هەموو گیانلەبەرێك لەهێلکەی مێیەو پیتاندنی لەلایەن نێرەکەی دروست دەبێت، و زانست بەدەریخستوە کە هەموو جۆرەکانی گیانلەبەر بۆماوەیی بنەڕەتیان هەڵگرتووە کەخودا دروستیکردوە لەهێلکە و لەپیتێنەرەکەدا هەیە، هۆی ئەم نەخشە بۆ ماوەییە سەرسوڕهێنەرانە و هەموو ڕەگەزێك بەسیفات و تایبەتمەندی خۆی جیادەکرێتەوە لەڕەگەزەکانی تر، هەرچەندە کە هەموو گیانلەبەرێك لەئاو دروستبووە وەك قورئان دەفەرموێت ، جا ئایا دەگونجێت ئەم ڕێکخستنەو تایبەتمەندي و جیاکەرەوەییە لەدیاردەی ڕێکەوت بن؟

چ ڕێکەوتنێکە کە فیل و مێشوولەو ئەسپی دەریاو بۆق و نەهەنگ و کرمی هەڵواسراو تیمساح و ئاسك و کەرکەدەن و وشترمەل و کۆترو پەپوولە و بازو کوللەو تاوس و شێرو مەڕو مێرووولە ووشترو دووپشکی ژەهراویو هەنگ بەهەنگوینە سوود مەندترەکەی دروستدەکات ئەی حەیران؟

حەیران: پەنا بەخوا لەڕێ وونبوونی، سوێندبێ بەخوا هەر لە منداڵیمەوە بیردەکەمەوە کە چۆن هەنگ ئەم هەنگەوینەمان بۆ دروستدەکات کە زۆرم حەز لێدەکرد تەنانەت کاتێ یاریەکانم دەکرد لەکێلگەدا دەمپرسی بۆچی پەپولە وەك هەنگ هەنگوین دروست ناکات: گەروابوایە دەرهێنانی بۆ ئێمە ئاسانترو کەمتر مەترسیدار دەبوو.

شێخ/ پەپوولە لەکوێ هەنگوینی بۆ دروست دەکرێت؟ کێشە کە تەنها مژینی شەکری دوو تۆی گوڵ نییە تاکو پەپوولەو هەنگ وەك یەکبن بەڵام زۆر لە غەریزەی سەسوڕهێنەر هەیە کەخودا تایبەتمەندي کردووە بەهەموو گیانلەبەرەکان بەوویستی خۆی پێی بەخشیوون کەهەریەکەیان لەگەڵ شێوە لەشیاندا بگونجێت بۆ گەیشتن بەو ئامانجەی کە ئاراستەیکردوون.

قورئانی پیرۆز ئاماژەی ئەم غەریزانەی کردووە بەتایبەتی لەباسکردنی هەنگدا، چونکە ئاشکراترین بەڵگەیە بەوەی کە خودا، دروستیکردوە و ڕێی پیشاندا و پەیام و نیگای پێ بەخشیوە و شارراوەکان و خۆشیەکان بەهەڵمەت بوون بۆشتە ئاسوودەکانیان بەمرۆڤەوە بەستەوە، تاکو بێتەوە یادی کە خۆی مەبەستە بۆ ڕێپیشاندان، و بیربکاتەوە لەم دروستکراوە سەر سوڕهێنەرانە کە مەحاڵە دروستکردنیان بەم شێوەیە تەنانەت جۆرەکانی مێشیش ناتوانرێت بەڕێگای ڕێکەوتی کوێرانە دروست بکرێن.

**﴿وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ، ثُمَّ كُلِي مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلاً يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾**النحل/٦٨-٦٩

حەیران/ پاك و بێگەردی بۆ خودای مەزنە.

شێخ/ ئایا چێشتخانەی ئەم میوانخانە گەورەیە مەزن نییە ئەی حەیران.

حەیران/ هیچ خودایەك نییە تەنها خۆی نەبێت.

شێخ/ سەرنجبدە ئەی حەیران لەغەریزەی هەنگ و گیانلەبەرەکانی تری گەردون و پێم بڵێ بەشی ڕێکەوت چەندە تیایاندا؟

هەندێ لەزانایان سەبارەت بەغەریزە وتوویانە/ بەشێکە لەبەگەڕخستن کە پلە بەپلە بەرەو گشەکردن دەڕوات، و لەوانەیە هەندێ لەگیان لەبەران لەپلەکانی گەشەکردندا خاوەن عەقڵی سەرەتایی بن وەك دەڵێن: بەڵام زۆر لەگیانلەبەرە بچووکەکان دەبینن کە دەبوایە لەبچووکترین پلەکانی گەشەکردندا دابنرانایە هەڵدەستن بەهەندێ کار کە زۆر لەگەورە گەشەکراوەکان ناتوانن پێی هەستن، بەمەش مانای بەڵگەکەیان پێچەوانە بێتەوە و پلەکانی گەشەکردن سەرژمێر دەبێت، تەنانەت ئەم گیانلەبەرە بچووکانەش نەنزیکن و نەهاویەکن لەهەندێ هەڵسوکەوتی غەریزیی‌یە ئاڵۆزەکانیاندا هەندێکیان تەنها دەزانن کە بەدوای خواردندا بگەڕێن و هەندێکی تریان کارەکانیان سەرسام دەکات و مێروولە و هەنگ و جاڵجاڵۆکە باڵندەکان ، و لەبەردەم ئەم تایبەتمەندي و جیاوازیانە (بەڵگەکانی گەشەکردن) تێکدەچێت.

بەمەش غەریزە، ڕێسایەکی تایبەتمەندی نابێت و عەقڵی ساغ ناچاردەبێت کە باوەڕبەوە بهێنێت کە ئەمانە هەموو بەگشتی لەکاریگەری وویست و کاربەجێی خودایە کە بە ویست ئەم جیاکراوانەی بەخشیوە بەهەندێ گیانلەبەری لاواز تاکوو ببنە بەڵگە بۆ بوونی خودا لەتوانا و دەستێوەردان لە دروستکراوەکان بە ویستی خۆی ئەم هەنگە کە خودا لە قورئاندا ئاماژەی بۆ کردو سەرنجبدە ئەی حەیران کە چۆن هەنگوینمان بۆ دروستدەکات، و چۆن شانە دروسدەکات و بەسیستمێکی ئەندازەیی سەرسوڕهێنەر دابەشی دەکات بۆ چەند ژوورێك، هەندێك لەو ژوورانە بچووکن بۆ کرێکارەکانیان و یان گەورەن بۆ نێرەهەنگ و ژووری تایبەتی بۆ شاهەنگە دووگیانەکان، و سەرنجبدە وەك چۆن ژوورەکانیان دابەشکراوە، ئاوەهاش کارەکانیان دابەشکردووە هەندێکیان هەڵاڵە و شیرینی دووتۆی گوڵەکان کۆدەکەنەوە، و هەندێکی تریان خواردن بۆ بێچوەکانیان ئامادە دەکەن، هەنگوینیان بۆئەچوون تاکو بۆ خواردنیان ئاسان بێت، تا دەگەنە ئەو تەمەنەی کە پێویستیان بەو دایکانە نامێنێت، و بەم نازداری‌یە دەمێننەوە تاکو بۆ پووردان ئامادە بکرێن، و ئەم هەرەوەزو هاوکاریی‌یە کۆمەڵی‌یە بەردەوامە بەبێ هیچ تێکچوون و گۆڕینێك، بەدرێژایی ساڵەکان و ڕۆژەکان بەووردیەك کە ناتوانرێت ببینرێت، کە باشترە لەو فەرمانگەی کۆمەڵایەتی‌یەیی کەمرۆڤی ژێر سەرپەرشتی دەکات.

ئەی مێروولە کە شتی زۆر سەرسوڕهێنەری لێدەبینین وەك هاوکاریان بۆ کۆکردنەوەی خۆراکیان و دروستکردن و پێکهێنانی ماڵ و شارەکانیان و دابەشکردنی کارو کاسپیان و ئارامگرتن و فرۆفێڵیان بۆ گواستنەوەی خواردنەکانیان و هەڵگرتن و بڵاوکردنەوە و وشکردنەوەیان و کۆکردنی دانەوێڵەکان تاکو لە شوێنی شێدارەکاندا

نەڕوینەوە بەچ عەقڵێك و بەچ غەریزەیەك هەڵدەستێت بەم كارانەی كە ئەو ئاژەڵانەی كەزۆر بەرزن لەپلەی گەشەكردندا وەك فیل و ئەسپ و شێر و مەیموون ناتوانن پێی هەستن.

جالجالۆكە ماڵەكەی بەلیكی خۆی بەو شێوە ئەندازە سەرسوڕهێنەرە دەچنێ، تاكو بیكاتە تۆڕو دەزولە و خۆراكی پێڕاو بكات.

پلەی چەندە لەپلەكانی گەشەكردندا تاكو بتوانێ بەم كارە ووردو سەرسوڕهێنەرو فێلاویی‌یە هەستێ.

ئەی ئەو باڵندەی كە باسدەكرێن تیماری خۆیان دەكەن گەر لاقیان شكا گرتنەوەی بۆدەكەن، لەشوێنی شكاندنەكەیدا قوڕوپوش كۆدەكاتەوە و لەبەرخۆر دەوەستێت تاكو ووشك دەبێتەوە و ئەو قوڕو پووشە زۆر بەتوندی یەكدەگرن هەروەك بۆی گیرابێتەوە وایە، واتە دوو پارچە ئێسكە شكاوەكە یەكدەگرنەوە ئەو قوڕو پووشەی لەسەر دەمێنێتەوە.

ئەو ئاژەڵە ئاوویەی كە بەقوندر ناو دەبرێت، وای دەگێڕنەوە كە كارە سەرسوڕهێنەرەكانی لە دروستكردنی ماڵ و پەندا و بۆ هەڵگرتنی خۆراك تیایدا بەدرێژایی زستان درەختەكان بەددانی دەبڕێت و لە پاشدا لق و پۆپی دارەكە لە ڕێڕەوی ئاوەكەدا ڕادەكێشێت بۆ ئەو جێگایەی كە بەنداوەكەی تیادا دروستدەكات، تاكو پەنداوەكە بەرز بكاتەوە و قوڕ و گەڵا و توێكڵی دارەكەی بەلق و پۆپی داراكەوە دەلكێنێت و هەردوو نێرو مێی قندور لەسەر بەنداوەكە هەڵدەستن بەدروستكردنی ماڵەكەیان بەهۆی چیلكەو چەواڵ و بەردو لق و كە هەموویان بەیەكەوە دەچنن و بەمە ژوورێكی گومەزی بەقوڕ دروستكراوی دوو دەرگا دروستدەكەن، و زەوی ژوورەكەش بەتەختەی ووشك ڕادەخەن و خۆراكیان لەلق و پۆپ دەهێنن و دەیخەنە حەوزی ژێر ژوورەكە كەشوێنی هەڵگرتنە، وچ كاتێك پرسیان بێت خۆراك لەوێ دەهێنن دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی حەوانەوەو خەوتنیان كەبە بێدەنگی و دڵنەواییو گەرم و گوڕی دەمێننەوە.

چ عەقڵێك و چ غەریزەیەك كەبەهۆیەوە ئەم ئاژەڵانە هەڵدەستن بەم كارە سەرسوڕهێنەرانە كەفیل و ئەسپ و مەیموون نەتوانان لەئەنجامدانی، ئایا پلەی گەشەكردن چ پەیوەندیی‌یەكی هەیە بەمێروولەو هەنگ و جالجالۆكەو سەگی دەریاوە... ؟

حەیران/ فەرموودەی خوا ڕاستە ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ: پەروەردگارت دروستكردن بە ویستی خۆی دەكات و هەڵیان دەبژێرێ﴾القصص:٦٨.

شێخ/ ئەی ئەم چوار ئاژەڵە کە (بزن و مەڕ و حوشتر و ڕەشە وڵاخ) کە قورئان لەچەندەها ئایەتدا ناویان دەبات لەبەر سوودمەندی زۆریان پێم بڵێ ئەی حەیران بەشی ڕێکەوت چەندە لەدروستکردن و پێکهاتن و دەستە مۆکردنیان و خۆراکیان گژو گیابێت کەدەبنە عەمارێك بۆ پرۆتین و چەوریی‌یەکان و بەتواناکرنمان بۆ وەرگرتنی جۆرەها سوودمەندیان لەشیرەمەنی و گۆشت و خوری و موو پێست و ئێسکیان، جگە لەبەکارهێنانیان بۆ کێڵاندنی زەوی و بۆ هەڵگرتنی خۆمان و بارمان و ڕاکێشاندنی قورساییەکان،

قورئان دەفەرموێت:

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُمْ مِمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَا أَنْعَاماً فَهُمْ لَهَا مَالِكُونَ، وَذَلَّلْنَاهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ، وَلَهُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلا يَشْكُرُونَ﴾يس/ ٧١-٧٣

﴿وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَناً خَالِصاً سَائِغاً لِلشَّارِبِينَ﴾النحل: ٦٦

﴿وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ سَكَناً وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الْأَنْعَامِ بُيُوتاً تَسْتَخِفُّونَهَا يَوْمَ ظَعْنِكُمْ وَيَوْمَ إِقَامَتِكُمْ وَمِنْ أَصْوَافِهَا وَأَوْبَارِهَا وَأَشْعَارِهَا أَثَاثاً وَمَتَاعاً إِلَى حِينٍ﴾النحل: ٨٠

﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ، وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ﴾غافر: ٧٩-٨٠

ئەمە هەندێکە لەو سود مەندیانەی کە قورئان بەئاشکراو بەچڕی باسیان دەکات لەگەڵ کورتە فەرموودەیەك بۆ سوودمەنە نهێنی‌یەکان)

زانست سەبارەت بەم چوار ئاژەڵە چی دەڵێت:

زانست وەك فەرموودەی قورئان دەڵێت : ئەم ئاژەڵە شیردەرانە کە خۆراکیان گژو گیایە لەپلەیەکی سوودمەندی بەرزدان بۆ مرۆڤ لەیەکترەوە شیرو گۆشت و خوری و مووی دەداتن ، جگە لە پێستو ئێسك و شاخەکانیان، و زانست دەڵێت: مرۆڤ بۆ پاراستنی ژیانی پێویستی زۆری بە پرۆتین و کاربۆهیدرایەت چەوری و خوێ کانزاییەکان و ڤیتامینەکان هەیە، و پرۆتین بەشی (تەواو) و (ناتەواو)ی هەیەو و

گەورەترین سەرچاوە بۆ (پرۆتینی تەواو) گۆشت و شیرەمەنی‌یە و ماددەی چەوری دەوڵەمەندترین خۆراکە بۆ بەرهەمهێنانی ووزە کە باشترین سەرچاوە بۆی (ڕۆن و کەرەو شیرو گۆشتە) کە ئەمانەش لەم چوار ئاژەڵەدا هەن، و هەروەها گرنگترین جۆرەکانی ڤیتامین دووبارە لەگۆشت و شیردا هەیە.

زانست دەڵێت: تەنها ئەم چوار ئاژەڵە لەنێوان ئاژەڵە شیردەرەکانی تردا بە بەردەوامی شیردەدەن، و تەنها ئەوان سیفەتی توانایی کێلاندن و بارهەڵگرتن و ڕاکێشانیان هەیە.

چ توانایەکە ئەم توانایەی کە تایبەتمەندە بەم چوار ئاژەڵەوە لەنێوان ئەوەی خۆراکیان گژوگیابێت و بەئاسانی بەدەست بێت بۆیان، و دەستەمۆکردنیان ئاسان بێت و لەگەڵ ئەوەی عەمارێکی هەمیشەیین و کارێکی چالاك بن بۆ دەستەبەرکردنی شیرو ڕۆن و گۆشت کەهەموو بەگشتی سەربە ماددە پرۆتینەکان و وا چاوەڕوان دەکرا لەبەر ئەوەی کە خۆراکیان تەنها گژوگیایە (کەبریتی‌یە لە کاربۆن) ماددە کاربۆهیداراتە نیشاستەیەکان بە بەرهەم بێنن نەك مادە پرۆتینەکان لەگەڵ گۆشت و شیرو ڕۆن و کەرەو بەزدا هەیە؟

ئایا ئەمانە هەموو بەگشتی لەکاریگەری ڕێکەوتنن ئەی حەیران؟

چ توانایەکە ئەو توانایەی کە ئەم سیفاتانەی لەم ئاژەڵەدا کۆکردۆتەوە وەك قورئان ئاماژەی بۆ کردووە لەبێ دەسەڵاتی و دەستەمۆیی و لێخورین و ئاسان دەستکەوتنی خۆراکیان بەبێ ئەرك لەگژو گیادا، و ئەو هێزە مەزنە تەواو کەرە بۆ کێڵاندنی زەوی و ڕاکێشانی قورسایی و بارکردنیان، و هەروەها تیایاندا کۆیکردۆتەوە خۆراکی مرۆڤ و پۆشاك و گەرمکردنەوەی ماڵ و کەل و پەلی، و هەڵگرو کێڵەری، بەشێوەیەك گەر کەسێك تەنها مانگایەکی هەبێت دەتوانێت پێویستیەکانی ژیانی پێ ئەنجام بدات، بەبێ هیچ خۆماندو کردنێك تەنها ئەوە نەبێت بەرەڵای دەشت و نزاری کات بۆ خواردنی ئەو خۆراکەی کەخوا پێی بەخشیوە کە دەفەرموێت ﴿وَمَا مِنْ دَابَّةٍ فِي الْأَرْضِ إِلَّا عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا﴾هود: ٦

ئایا ئەم هەموو شتە بەگشتی لەدیاردەی ڕێکەوتە ئەی حەیران؟

حەیران/ خوا پەنامان بدات لەگومرایی ئاشکرا، خودا پاداشتی ئەم داناییەت بداتەوە گەورەم کاتێك زەویی جێنشینمانت بە (میوانخانەی گەورە) ناو برد، بەڕاستی وایە میوانخانەیەکی گەورەیە.

خودای گەورە هەموو هۆکارەکانی پشوودان و حەوانەوەی بۆ تیادا ئامادە کردووین لەجێگەو پۆشاك و گەرمی و ئاگرو ڕوناکی، و هەموو بەتام و چێژێك بۆ دروستکردنی خواردەمەنی و خواردنەوە و میوە و تەنانەت شیرینیش.

شێخ/ لەیادت چوو باسی وێنە جوانەکانی بکەی ئەی حەیران.

حەیران/ لەیادم نەچووە گەورەم ئەم وێنە جوانە دڵڕفێنانە و هەرگیز پشتگوێیان ناخەم؟

شێخ/ ئەزانم پشتگوێی ناخەیت و لەیادت نەکردوە، بەڵام ئایا بەیادتا هاتووە جارێك بوەستیت بەرامبەر ئەم نەخشو نیگارو سێبەرانە بەدڵێکی پڕخۆش و خرۆشەوە سەرنجبدەیتە کازیوەی یاقوتی و خۆر ئاوا بوونی زێڕی و سەوزی زمموردی کێڵگەکان و ئاوە زیویی‌یەکان و گەڵای گوڵەکان، و باڵی پەپوولەکان وپەڕی مەلەکان و کلکی تاووسەکان، و بپرسیت لە حەیقەتی جوانی ئەمانە، کەنیشانە ڕازاوەکانی سەرسامان دەکات، یاخود بپرسی ئاخۆ بەشی ڕێکەوت چەند بێت لە پێکهاتنی وێنەو ڕەنگەکانیان و هێڵ و پێوەر و وێنەکانیان و ئەو شتانەی کەلەخۆیان گرتووە لەبەخشندەیی و وردەکاریی و ڕێکو دروستی هەڵسەنگێنی و هاویەکبوونی و هاوگونجاوی هاو شیاوی و هاوجوانی و هاو چێژی.

حەیران/ نەخێر گەورەم.

شێخ/ ئەو جوانی‌یە چی‌یە ئەی حەیران؟ ئایا مانەیەکە نسبی و ڕادەیی لەخۆگرتووە یاخود وێنەیەکە و لەلای عەقڵمان دروستبووە؟ یان شتێکەو بوونێکی خودی و دەرەکی هەیە کە هەستیارەکانمان چێژی دەکەن و عەقڵمان دەرکیان دەکەن وەك چۆن وێنە دروستکراوەکانی تر دەرکدەکات؟ ئایا ئەم ئاسوودەییەمان لە ئەنجامی جوانی ئەم وێنانەیە کە لەخودی خۆیاندا بەسەرماندا دەسەپێنن وەك قورئان ئاماژەی بۆ دەکات؟

یاخود ئەم دڵخۆشیەمان لە ئەنجامی جوانی ئەم هاوسودمەندیمان لێیان وە ئارەزوو چێژو سۆزو هەستمان بۆیان وا ڕاهاتووین لەکاریگەری ئەمانە بەجوان ناویان بەرین؟

حەیران/ تێناگەم چۆن جوانی بوونی خوودی هەیە لەدەرەوەی؟

شێخ/ مەبەست ئەوە نی‌یە لێرەدا شتێکی دەرەکی سەربەخۆ هەبێت و بەجوانی ناو ببرێت بەوێنەی ئاوو هەوا بێت، بەڵام ئالێرەدا دەپرسین ئایا شێوەو پێوەرو ڕەنگی بەڕادەو بەڕێژەی دیاریکراو هەیە کاتێك کۆببنەوەو هاوگونجاوبن، جوانی لەخودی خۆیدا دروست دەبێت یاخود ئەم جوانی و ڕادەیی‌یەو بەتەنها لە عەقڵماندا دروست بووە،

بەپەیام و نیگای هاو سوودمەندی و ئارەزوو سۆز هەستمان بۆیان، بۆ نموونە ڕەنگی سور لامان جوانە چونکە هەمیشە واڕاهاتووین هێمایەك بێت بۆ ڕووی ئەو کەسانەی کە تەندروستیان باشە، و ڕەنگی سەوزەی زەموردی لامان جوانە چونکە وا ڕاهاتووین کێڵگە سەوزە پڕ موژدەکانی تێراو بەپیت و فەڕ بینین، وەیان ئەم (جوانی)یە تێکەڵەیە لەبوونێکی ڕاستەقینەی دەرەکی لەگەڵئەو خەیاڵانەی کەهەست و سۆزی یادگاریەکانمان دروستی دەکەن وەپاڵ بەعەقڵمانەوە دەنێن کە باوەڕبەبوونی ئەم ڕاستی‌یەبکات لەڕاستیدا ئەم ووتەیەی دوایی ڕاستەو لەجێی خۆیەتی. زۆرجار جوانی ڕاستەقینە دەبینین کە عەقڵمان دەرکی پێدەکات و هەستێکی ماددی پێدەکەین، و گەر خەیاڵمان بۆزیادکرد کەلە هەست و سۆزو یادگاریەکانماندا دروست دەبن بەمەش هەستمان بەو جوانی‌یە زیاتر دەبێت، و ئاڵێرەدا نهێنی جیاوازی چێژی جوانی لەنێوان منداڵ و گەورەدا بەدەردەکەوێت.

بەڵی زۆر حاڵەت هەیە کە خەیاڵی سۆزو چێژەکان زاڵدەبن بەسەر حەقیقەتێکی جوانی ڕەسەندا بەجۆرێك کەنزیکە هەستکردن و دەرکردنمان نەمێنێت بەپێوەری دروستی ئەو جوانی‌یە.

بەمەش هەستمان بەرامبەر (جوانی) تێکەڵاو ئاڵۆز دەبێت بەڵام ئەم جوانی‌یە لە هەندێ وێنەی تریدا بەڕون و ئاشکرایی دەمێنێتەوە گەر نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی زەوق و عادەتەوە کە تیایدا لەگەڵ مرۆڤێکی نەزان و منالێکی شیرەخۆرەدا بەڵکو تەنانەت لەگەڵ ئاژەڵێکی بێ زماندا بەرامبەر دەبین بەرامبەر ڕەنگە دڵڕفێنەکان و جوانی گوڵ و پەپوولە باڵندەکان کەواتە لەدەرەکیدا جوانی ڕاستەقینەی ڕەسەن هەیە و ئێمە لەدەرك کردنی ئەم جوانی‌یە ڕەسەنەدا بەرامبەر بەکرداری هەست عەقڵمانی بۆ بەگەڕ دەخەین وەك چۆن هەست و عەقڵمان بەکار دەهێنین بۆ بوونی هەموو وێنە ماددیی‌یەکانی تر.

کەواتە ئەو جوانی‌یە ڕەسەنە چی‌یەو ڕەگەزەکانی لەچی پێکهاتووە؟

دیارە بریتی‌یەلە وێنەکانی هاوڕێکی (تناسق) و هاوبینایی (تناظر)و (هاوسترانی) (تناغم) لەشێوەو ڕەنگ و دەنگدا لەژێر سیستمێکی چەسپاودا بەڕێژەی دیاریکراو پێکدێن کە کەمترینە لە پارچە مۆسیقایەك کە پێکهاتووە لەچەندەنگێکی ڕەسەنی جیاوازی دوور لەیەك، و ئێمە بەڕێژەی دیاریکراو لەمۆسیقاوستارن تێکەڵاویان دەکەین بەپێی سیستمێکی چەسپاوی ئاشکرا.

بەمەش ستراتیکی بەسۆزو هەستی لێ پێکدێت، بەمجۆرە ڕەنگ و وێنەکان بۆ دروستبوونی وێنەی جوانی کەلەسروشتدا بە بەرچاو دەکەون کە ملکەچی ڕێژەی دیاریکراو یاسای چەسپاون کەبەکاریگەری توانایەك دروستبووە بۆ پێکهاتنی (جوانی) کەواتە ناتوانین ئەو جوانییەی کەلە گەردوندا دەیبینین بڵێین ئەندێشەیەو عەقڵمان دروستی کردوە، بەڵکو بوونێکی ڕاستەقینەی دەرەکییە هەستی پێدەکەین وەك چۆن هەست بەقەبارەو شێواز و بارستایی و چێژو بۆن دەکەین کە ئەمانەش هەموویان بەگشتی بەرێژەی دیاریکراو لە ڕەگەز و گەردیلەکان دروستبوون.

گەر ئێمە بە پۆشاکێکی چنراو سۆزو یادگاریەکانمان وێنەی ئەم جوانییە ڕەسەنە دا بپۆشین، بەم زیادکردنە خۆشیو کامەرانیمان زیاد دەکات، وەك چۆن منداڵێك بەپۆشاکێکی سور دڵخۆش دەبێت گەرپێی ووترا ئەمە پۆشاکی جەژنتە، و لە ڕۆژانی تردا لای جوان بووە بەڵام بەهۆی یادگاری جەژنەوە زۆر زیاتر لای جوان دەبێت.

ئایا دەشێت ئەی حەیران ئەم یاسا چەسپاوە دڵڕفێنە کە جوانی دروستدەکات بەم بەخشندەییو ووردەکارییو ڕێك و دروست و پێوراوە، وهاوڕێژەو هاویەکسانیو هاوجوانییە، لەکاریگەری ڕێکەوتی کوێرانە بێت؟

حەیران/ خودا پەنامان بدات لەگومڕایی.

شێخ/ دەگونجێت ئەم میوانخانە مەزنە، بەو هەموو شتەی کە تیادایە لەسیتەم و دەسەڵات و بایەخدان و داهێنان و تەواویو جوانییە لە پێکهاتەی ڕێکەوتی کوێرانە بێت؟

حەیران/ بەڕاستی میوانخانەیەکی مەزنە.!!

شێخ/ لەمە مەزنتر ئەوەیە کە خاوەنەکەی داوای کرێمان لێناکات و تەنها سوپاسی دەوێت.

حەیران/ چەند کرێیەکی ئاسانەو چەند ڕەزامەندە.

شێخ/ ئای چەند لەیادی دەکەین و لە وانەشە لەیادی نەکەیت چونکە ئێمە لەکۆتایدا هەربۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە.

لە خودی خۆیاندا: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنْفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾فصلت:٥٣

شێخ/ ئەم سیستمە سەرسوڕهێنەرە (سیستمی دوانی‌یە) سەرتاسەری‌و ئاسایی لەهەموو زیندەوەرێکدا کەزۆر، لە ئایەتە قورئانیەکاندا باسکراوە تا ئاماژەی مەبەست و دانایی بکات لەدروستکردندا، بەشی ڕێکەت چەندە لەدروستکردن و پێکهاتن و ڕێکخستن و هەمیشەیکردن و ئاسایکردنی لە ئاژەڵ و ڕووەکدا؟

قورئان دەفەرموێت:

﴿وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَى﴾النجم:٤٥

﴿سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لا يَعْلَمُونَ﴾يس:٣٦

﴿وَ اللهُ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْواجاً﴾فاطر:١١

﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَاراً وَمِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ﴾الرعد:٣

﴿وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾الذريات:٤٩

ئەمە هەندێ لەو ئایەتە قورئانیانەیە سەبارەت بە سیستمی جووتەیی، کە ئاماژەی سەرتاسەری‌و ئاسایکردن لەهەموو زیندەوەرێکدا دەکات، چ ئاژەڵ و ڕوەك یاخود مرۆڤ بێت زانست بەرامبەر بەم سیستمە سەرسوڕهێنەرە چی دەڵێت؟ ئەو سەرسوڕهێنەرەی کە لەلای ئەوان جێی خۆی گرتووە زانایان دەڵێن سیستمی جووتەیی ئاسایی و سەرتاسەری‌یە بۆ هەموو زیندەوەرەکانی ئاژەڵ و ڕووەك، کە بەگشتی بەیەك ڕێگاو یەك گونجاندن، نزیکە ئەندامەکانیان هاووێنە بێت و هەروەها پیتاندنە کانیشیان نزیکە وەك یەك بێت و دەپرسی چۆن ئەم سەرتاسەری و ئاسایی و هاو وێنەیە و یەکیانگرتووە لەهەموو زیندەوەرێکدا؟

ئەم ئاسایکردن هەمیشە سەرسوڕهێنەرە زیاتر هۆشمەند و ژیری کردووم، هەروەها لەمەو پێش باسمانکرد ئەی حەیران بەهۆی خوێندنەوەم بۆ نووسراوەکانی فەیلەسوفی ئەم سەردەمە (هنری برگسون) لەوەو پێش دەرکی ئەم داناییەم نەدەکرد لە دووپاتکردنەوەی وشەی (دوانەیی) لە قورئانی پیرۆزدا لە نێرومێدا، وامدەزانی ئەم دووبارە کردنەوەیە تەنها بۆ ئەوەیە کە خودا بەخشندەیی خۆی بەسەر بەندەکانیدا بەدەربخات.

تێنەدەگەیشتم کە ڕووداوەکانی بەخشندەیی لەدروستکردنی (جووتەیدا) کە هۆکارن بۆ مانەوە ژیان، تا خودا ویستی هەبێت بۆ بەردەوامی ژیانیان لەسەر گۆی زەوی بەهۆی پیتاندن و زۆر بوونەوە، بەڵام لە پاش ئەوەی بیرۆکەکانی (برگسون) حاڵی بووم و دەرکم کرد کە دووبارەکردنەوەی وشەی (جووتەیی) مەبەستی خودا منەتکردن نییە بەسەربەندەکانیدا بەڵکو مەبەستی شتێکی مەزنە، تاکو بەئاگامان بکاتەوە لەئاسایکردنی (دوانەیی) لە ڕوەك و ئاژەڵ و مرۆڤدا تابینە بەڵگە بۆ بوونە مەبەست و پووچەڵکردنەوەی ڕێکەوت.

ئەم ئاسایکردنە هەمیشەییەی کە دوێنێ باسمکرد بۆت لە تیۆرەکانی برگسون وەرگیراوە، دوای ئەوەی باسی هەستیاری بینینی کرد و بە دوری زانی ئەم ئاسانکردن و هەمیشەییە لە مرۆڤ و هەموو ئاژەڵدا هاو وێنە و هاو دروستکراو بن، دیاردە لەکاریگەریەکانی ڕێکەوت، گەرواامان دانا کە ئەم ڕێکەوتە دەشێت ڕوبدات لە دروستبوونی هەستیاری بینیندا لە گشت ئاژەڵدا و بڵێین کە ئاژەڵەکان بەگشتی بۆ یەك ڕەگەز دەگەڕێنەوە و سەبارەت بەڕووەك چی بڵێین کە لە ڕەگەزێکی ترەوە شێوازەکانی زۆر جیاوازترە لە شێوازەکانی دروستبوونی ئاژەڵ، گەر ئێمە وامان دانا کە ڕووەك و ئاژەڵ لە کرداری پیتاندن و زۆر بووندا یەك شێوازیان گرتۆتە بەر، چۆن ئاژەڵ و ڕووەك ڕێکەوتن کە بەهەمان شێوازوو ڕێکەوت نێرو مێ پێکبهێنن؟

حەیرا/ فەرموودەی قورئان ﴿**سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنْفُسِهِمْ وَمِمَّا لا يَعْلَمُونَ**﴾یـس:٣٦، سبحانە.

(بێگەردی بۆ ئەو کەسەیە کە جووتەی دروستکردووە لەوانەی کەلەزەویدا دەڕوێن وەلەخودی خۆیاندا) چەند پاك و بێگەردە.

شێخ/ ئەم پێکهاتە منداڵیەی مرۆڤ کە قورئانی پیرۆز ناوی بردووە زیاتر لە (١٠) ئایەتدا بە ئاشکرا، ئەی حەیران ئەیا بەشی ڕێکەوت لەوێنە کردن و پێکهاتنی لە هێلکەو

سپێرم و پارچە گۆشت و ئێسك و داپۆشین سەقامگیرکردن لە جێگای تایبەتیدا، بۆ دیاریکردن و کاتی خۆی..لەکەلێنە تاریکەکاندا چەندە... ؟

قورئان دەفەرموێت:

﴿يَــا أَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُــمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلاً﴾الحج:٥

﴿إِنَّا خَلَقْنَا الْأِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾الانسان:٢

﴿يَــا أَيُّهَــا الْأِنْسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ، الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ فِي أَيِّ صُورَةٍ مَاشَاءَ رَكَّبَكَ﴾الانفطار:٧

﴿أَوَلَمْ يَرَ الْأِنْسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِنْ نُطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُبِينٌ﴾يــس:٧٧

﴿قُــتِلَ الْأِنْسَــــانُ مَــا أَكْفَــرَهُ، مِنْ أَيِّ شَــيْءٍ خَلَقَــهُ، مِنْ نُطْفَةٍ خَلَقَــهُ فَقَدَّرَهُ﴾عبس:١٧-١٩

﴿قَــالَ لَــهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً﴾الكهف:٣٧

﴿أَلَمْ نَخْلُقْكُمْ مِنْ مَاءٍ مَهِينٍ، فَجَعَلْنَاهُ فِي قَرَارٍ مَكِينٍ، إِلَى قَدَرٍ مَعْلُومٍ، فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ الْقَادِرُونَ﴾المرسلات/٢٠-٢٣

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْأِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ، ثُمَّ خَلَقْنَا الــنُّطْفَةَ عَلَقَــةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَاماً فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْماً ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقاً آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾المؤمنون:١٢-١٤

﴿الَّــذِي أَحْسَــنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْأِنْسَانِ مِنْ طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُــلَالَةٍ مِــنْ مَاءٍ مَهِينٍ، ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِنْ رُوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾السجدة:٧-٩

﴿هُوَ الَّذِي يُصَوِّرُكُمْ فِي الْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَاءُ لا إِلَهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾آل عمران:٦

﴿يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقاً مِنْ بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلاثٍ﴾الزمر:٦

ئەمە هەندێ لەفەرموودەکانی قورئانە ئایا زانست چی دەڵێت؟ هێلکەیەك لەهێلکەکانی مریشك زۆر بچوکتر بێت تیرەکەی لە نێوان بەشێك و دووبەش لە (٢٤٠) بەش لە قیراتێك، واتە بەشێك یان دووبەش لە (١٠) بەشی میلیمەترێك، و کێشی یەك بەش یان دووبەش لە (١٠) ملیۆن بەشی گرامێك کە زەردێنەکەی تێدایە و لەزەردێنەکەیدا زیندەوەری یەك خانەی زۆری تێدایە کە تیرەکەیان دەگاتە بەشێك بە (٧٠٠) بەشە قیراتێك و لەوێدا چەقی زیندەوەرە یەك خانەیەکان هەیە، کە تیرەی دەگاتە بەشێك لە (٣) هەزار بەشی قیراتێك.

ئەم هێلکەیە لەتاریکایی هێلکەداندا پێکدێت لە زیندەوەرێکی یەك خانەیی کەلەشلەی ئەلیۆمینی مەلە دەکات، گەر ئەم زیندەوەرە یەك خانە گەشەو نەمایکرد،.و ئەو شلەیەی کە لە ناویدایە زیادیکرد پەردەکە دەکشێت و تەنگ دەبێت تاکوو هێلکە لەپەردەو هێلکەدان ڕزگاری ببێت.

ئایا ئەم هێلکە خنجیلانە فەریکە بەڕێزە بەتەنها لەو تاریکییەدا بۆ کوێ دەچێ؟ چاوەڕوانی ئەو کاتە دیاریکراوەیە کەتێیدا لەگەڵ هاودەمەکەیدا دەگەیەنەیەك بیئەوەی یەکتریان بینیبێت و یەکتر بناسن، هەردووکیان پەرۆشی بەیەگەیشتنن و لە ڕێگادا بەیەکدەگەن، پێکەوە دەست لەمل و ئاوێزان بەدوانەیی بەرەو لانەی جووتەیی ڕێدەکەون تاکو شوێنێك بڕەخسێنن و ئامادەی بکەن بۆ دروستبوونی مرۆڤێکی تری وەك خۆیان بەڵام ئەم ڕێگایە کە تیایدا بەیەکدەگەن شێوەیەکی درێژکۆلەی تاریکی زۆر تەسك و باریکە تیرەکەی تیرەی موویەکە، کەلە پشت مندالدانەوە خۆی حەشارداوە و درێژدەبێتەوە بەرەو هێلکەدان، لەکوێ و بۆچی ئەم دوو خۆشەویستە بەیەکدەگەن؟

ئەم سپێرمە زیندەوەری نێرە زۆر زیرەك و بەئاگایە و چالاك و فێڵبازەو سەرکێشە ئەی حەیران... زۆر چاك دەزانێت کە هێلکەکە چاوەڕێیەتی لەدەمی شێوە درێژ کۆلەکەدا واتە: لەدەمی بووقەکەدا و دەزانێت تەنها ڕێگا بۆی مندالدانە هەر بۆیە ئاوڕناداتەوە لەهیچ تا دەگاتە هێلکەکە خۆی زۆر بە بچووکی دەبینێتەوە بەرامبەر ئەم هێلکە گەورەیە، درێژی هەر سپێرمێك بریتییە لە (٦٠) بەش لە هەزار بەشی ملیمەترێك.

سپێرمەكە دەزانێت گەر ئەو سەرە قوچەكی‌یە تیژە نەبوایە نەیتدەتوانی دیواری ئەو هێلكەیە ببرێت و گەر مەلەكرنەكەی سست و هێواش بوایە وەك مەلەكردنی هێلكە ئەوا دوا دەكەوت لە كاتی دیاریكراوی بەیەكگەیشتنیان و دەزانێت مەلەكردنەكەی خێرا دەبێت گەر جوولەیەكی پێچاو پێچی هەبێت و بۆی دەركەوت كە مەلەكردنی خێرا تەنها بە خۆ پیادانە بەشلەییەكەیدا.. و زانی كە چالاكی مەلەكردنەكەی لەسەریدایە نەك لە كلكی دا پاش ئەوەی ئەم سپێرمە زیندەورە بچووكە ئەم هەموو شتەی زانی وای لەسەری كرد شێوەیەكی قووچەكی تیژی هەبێت و ملێكی پێچاوپێچی بەسەری بەخشی و كلكێكی درێژی بەملیەوە بەست تاكو بەو شلەیەدا بكێشێت كەمەلەی تیادا دەكات، و ئەم كلكە بەگرێ بەملەوە بەستراوە بۆ ئەوەی لەكاتی چوونەناوەوەی هێلكەكە بترازێ و ئەم هێلكەی مێینە ژیرو بە وەفاو بێگەردوو پارێزراوە ئەی حیران، ئەمیش دەزانێت كە خۆی تەنهایە و نێرەكان زۆر زۆرن و ژمارەیان دەگاتە (٢٠٠) ملیۆن كەململانێ و و پەرۆشن بۆ گەیشتن پێی، و بەدەوری دیوارەكەیدا دەخولێنەوە گەر یەكێك بەتواناو خێرایی پێی گەیشت، ڕازی دەبێت بیكاتە هاووجوتی خۆی و دەرگایەكی تایبەتی دڵی خۆی بۆدەكاتەوە كە بە (دەرگای ڕاكێشەر) ناو دەبرێت هەركە سپێرمەكە هاتە ژوورەوە دەرگاكە دادەخات و هێزی ڕاكێشانەكەی نامێنێت و بە پارێزراوی خۆی دەهێڵێتەوە و بەرپەرچی ملیۆنەها سپێرمی داواكاری تر دەداتەوە ئەوانیش لەلای خۆیانەوە لەغەم و پەژارەدا سەردەنێنەوە.

ئەم مندالدانە (لانەی دوانەیە) بۆ میوانەكەی زۆر بەسۆزو بە بەزەییە ئەی حەیران، هەموو مانگێك ئامادەیە بۆ پێشوازیكردنی ئەو بووك و زاوایەو پەنادانیان و خۆراك دانیان، بەمەش خانەی پەردەی دەوروبەری دەئاوسێت و دەزوولەو موولوولەی خوێنەكانی گەورە دەبێت.

ڕژێنەرەكانی چالاك دەبن، گەر هاوجووت بوون ڕویدا، ئەوا هەردووكیان بەخۆشحالیەوە پێشوازیان لێدەكرێت، و گەر ڕێگر هەبوو بۆ هاوو جووت بوونیان بەهەر هۆكارێك بێت ئەوا بەرق و كینەوە جیادەبنەوە و لەداخدا هێلكەدانەكە دەدڕێت و گریانێكی خویناوی دەڕژێت بۆ نەمانی هێلكەكەی.

حەیران/ ئای... چەند سەرسوڕهێنەرە، پاكو بێگەردی بۆدروستكەری مەزنە.

شێخ/ ئەوەی كە لەمە زیاتر بەسەر سوڕهێنترو سامناك ترە كە ئاماژەی زیاتر تیادایە بۆ موعجزەكانی قورئان و یارمەتیدەر بێت بۆ تێگەیشتنی نهێنیەكانی، ئەوەندەی پێناچێت

هاوجووت بوونه که تەواو دەبێت هەتا کارێکی هاوبەش دەسپێدەکات بۆ دروستکردنی مرۆڤێکی نوێی تر، و هەردوو هاوکار دەکەونە تێکەڵکردنی ئەو نەخشە کرۆمۆسومانەی کەهەیانەو ئەو جیناتانەی کەلەخۆیان گرتوە کە خودای پەروەردگار نەخشەو دروستکردن و دروستی پێبەخشیوە کەبەهۆی فاکتەری بۆ ماوەییەوە پشت لەدوای پشت لەنەوەوە بۆنەوەی تر بەردەوام دەبێت لەباو باپیرانەوە بۆنەوە و نەوەکان بەردەوام دەبێت (زنجیرەی دروست بو لەقوڕ) (سلالة من طين) لەپاشدا (زنجیرەی ئاوی بێ نرخ) (سلالة من ماء مهين) و لەم تێکەڵ بوونەوە تنۆکەی هاوبەشی تێکەڵە دروست دەبێت کە خودای دروستکەر ئاماژەی بۆ کردووە.

حەیران/ ئەم کرۆمۆسۆم و جینانە چین؟

شێخ/ وەك پێناسەم بۆکردیت پێکهاتووە لەڕەگەزی نەخشە دانان و دروستکردن و دروستی کەبەهۆیانەوە پارچە گۆشتی جۆراو جۆر پەیدا دەبێت تاکو ببێتە مرۆڤێکی نوێ و جیاکراوە لەوانی تر لەڕووی سیفاتی جەستەو عەقڵی شێوەو قەدو باڵاو ڕەنگ و نێری و مێی و جوانی و توانایی و ژیری و ڕەوشت، هەموو بەشدار دەبن بۆ دانانی هێڵی یەکەمی بەختی ئەم مرۆڤە لەژیانیدا.

لەکۆندا خەڵك وایان دەزانی کە (جنین) لە (پیتێنی نێوان هێلکەی مێیەو شلەی نێرە) دروست دەبێت و زۆر لەسیفاتی باو باپیرانی وەردەگرێت، بەڵام نەیاندەزانی سپێرمی زیندەوەر چی‌یە وەهێلکە چیە و پێکهاتنیان چی‌یە وخانەکانیان چی‌یە و جۆرو کاریان چی‌یە و پیتاندن چۆن ڕوودەدات و بۆ ماوەیی چۆن دەبێت، و لێکدەرەوەکانی قورئان سەریان سوڕما بوو لەلێکدانەوەی (پارچە گۆشتی جوراوی دروستکراو دروستنەکراو) (المضغة المخلقة – وغير المخلقة) کاتێك کەخانەکانیان دۆزییەوە و کاری هەربەشێکیان بەدەرخست، و بەچاوی خۆیان بینینان ئەو شتانەی کە سپێرم لەسەری دا هەڵی دەگرێت لەڕەگەزەکانی ئەو نەخشانەی کەباسمان کرد دەرکی ئەو جیاوازیە یان کرد کەلەنێوان پارچە گۆشتی جوراوی دروستکراو کە (جنین) لەوێدا دروست دەبێت و پارچە گۆشتی جوراوی دروسنەکراو کە پاراستن و خۆراکدانی پێدەسپێرێ بەم دۆزینەوەیە زانایان زیاتر ملکەچی خودا بوون، کە خودا ئەم ملکەچی‌یەی تایبەتمەند کردووە بە بەندە زاناکانیەوە ئەی حەیران!

حەیران/ لە پێناوی خودای مەزندا زیاتر بەخشندەکانتم بۆ بەدەر بخە.

شێخ/ ئەم هێلکەیە کەدەبێتە تنۆکێك بەهێواشی و سستی لەشێوە درێژکۆلەکەدا دەڕوات پاش (٨) یان (١٠) ڕۆژ دەگاتە منداڵدان لەوێدا دەست بەدابەشکردنی خۆی دەکات زیادە زیادە، لەدوای زیادە تاکو هەموو بە شێك ئامادە بکات بۆئەو ڕۆڵەی کە پێی هەڵدەستێت لەکاتی پێکهاتنی (جنین) یاخود ئامادەیان بکات بۆ پاراستن و چاودێری خۆراکدانی (جنینەکە) و تنۆکەی هێلکەکە دەگاتە لانەی دوانی‌یە کە بۆی ئامادەکراوە بەدیوارەکەیەوە دەلکێت و خانەدابەشکراوەکان هەڵدەستن بەکارە مەزنەکانیان بەهاوکاری لەگەڵ خانەکانی دیواری منداڵدان، لە چواردەوری جەنینەکەدا پەردە لەدوای پەردە دروست دەکەن پەردەی یەکەمی دەرکەوتووە کە چواردەوری هەموو خانە و پەردەکانی تری داوە، و بەکیسەی منداڵ (السلي) ناودەبرێت لەولایەی کەبەدیواری منداڵدانەوە لکاوە کردۆتیە هۆکارێك بۆ خۆراکی سەرەتایی و دروستبوونی ویلاش ئەو لایەی کە بەدیواری منداڵدانەوە لکاوە دەیکاتە هۆکار بۆ پاراستن و چاودێری (جەنینەکە) ساوا شاراوەکە، و پەردەی دووەمی ناوەوە کە لەژێر (کۆربۆنەوە) دروستدەبێت تاکو بەتەواوی چواردەوری جەنینەکە بدات لەدوای پەردەیەکی شلەیی کە ڕاستەوخۆ چواردەوری جەنینەکە دەدات تاکو لەگەڵ دووپەردەکەی تردا لەهەموو کتو پڕ و کاردانەوەیەکی دەرەکی، (جەنینە) بپارێزن ئەی خودایە ئەم خانانە چەند ژیرو چەند بەئاگان بۆ ژیانی ئەم جەنینە، و لەهەمان کاتدا خانەی، زیندەوەرە دروستکراوەکان) کە جەنین شێوازی گەشەکردنیان دەداتێ لەتنۆکێك بۆ پارچە گۆشتێکی هەڵواسراو بۆ چارچە گۆشتێکی جوراو

بەو ڕیزبەندیەی کە قورئان ناوی دەبات، و لەم گۆشتە جوراوە دروستکراوە نەخشە هەڵگرەوە و بەم کرۆمۆسۆمە تێکەڵەیەوە لەگەڵ جەنینەکاندا، دەستدەکەن بەدروستکردنی ئەندامەکانی و سك و ناوەخنەکەی، وەك چۆن پەردەکانی پاراستن و چاودێری‌و خۆراکدان لەخانە دروستکراوە ڕووکارەکان و هەندێ لەخانەی (زیندەوەرە دروستکراوەکان هەڵدەستن بەپێکهاتنی ناوەخنەکانی سك وەك گەدەو دەسگای هەناسەدان و میزکردن و زۆر بوون..و لەلایەکی ترەوە دەست دەکەن بەدروستکردنی ئێسکەکان هەریەکە لەچوار چێوەی پسپۆڕی خۆیدا ناگاتە مانگی دوو کەنزیکە گۆشتە جووراوەکە ببێتە مرۆڤێکی تەواو بەهەموو ئەندام و ناوەخن و دەمارەکانیەوە ئەی خودا چی ئەم خانانەی فێری ئەم کارەی دروستکردنانە کردووە و بەتوانایی پێی بەخشیون ،

ئەی حەیران، چەند بەتوانایە کاتێك کە ئەم مرۆڤە تەواو دروست دەکات ئەم مرۆڤە نەتوانایە لەدروستکردنی مێشێکدا.

حەیران/ خودا چەند پاك و بێگەردە.

شێخ/ سوێندبێ بەخودا ، چەند ژیرن خانەکانی کوریوون و خانەکانی دیوارو ووێلاش بۆ جەنینە نازدارەکەو، زۆر باش دەزانێ کە ساوا نوێکە گەر بووە گۆشتی جوراو و ئەندامەکانی پێکهات پێویستی بەرێگایەکی ترەو دەچێت بۆ خۆراکدانی جگە لەرێگاکانی مژینی ساکاری دلۆپەیی کەڕوودەدات لەنێوان ریشوەکانیلا کۆربۆن و گیرفانە خوێنیەکانی منداڵدان، چونکە پێویستی جەنین بۆ خوێن تاگەورە بێت زیاتر پێویستی پێدەبێت و پێویستی خوێن بۆ پالاوتن بەزۆر بوونی خوێنەکەی زۆر دەبێت.

دەزانێت کە خوێ‌ی دایك نابێت راستەوخۆ بەجەنین بگات بەلکو پێویستە ئەو خوێنەی کە دەگات بەجەنینەکە پالێوراو بێت لەهەموو ئەو ژەهرو پیسیانەی کە تیایەتی وەك چۆن هەموو ئاژەڵێك خۆی لێ رزگار دەکات.

پێویستە کەوا ئامێرێکی گەورە دروستبکرێت بۆ ئەم پالاوتن و وەرگرتن و دەرچوونە لەنێوان خوێنی دایکی وەرگیراوو خوێنی جەنینی دەرچووی ژەهراوی بۆ ئەم مەبەستە وێلاشی سەرسورهێنەر پێك هات کەلەلەپ و ریشەکانی (کۆریۆن)و گیرفانە خوێنیەکانی منداڵدا دروستبووە بەشێوەیەك گەیەنراو بێت بەناوکی جەنینەوە بەهۆی پەپکێك کە خۆراکە بنەماکان و ئۆکسجین لەناوك بگوێزێتەوە بۆ وێلاش کەخۆی لەخوێنی ژەهراوی دایك رزگار دەکات لەپاشان بەهۆی پەتکێکەوە لەجەنینەکەوە بەرەو وێلاش دەچێت لە موولوولەیەکی تردا و ئەو ژەهروو پیسایییەی کە لەپێکهاتنی جەنینەوە دروست بوە لەووێلاشدا کۆدەبێتەوە تاکو جەنینەکە لەسێ تاریکیەکە بەرەو دونیای روونا کی‌و هەواو شیری مەمك بچێت و بتوانێت بەهۆی سیەکانیەوە هەناسە بدات و خۆراك بەهۆی هەردوو لێوەکانیەوە بمژێت و بتوانێت پاشماوەی خۆراکەکانی بەهۆی ریخۆلەکانیەوە بسوتێنێ و لەگەروودا بیانهاوێژێت تاوای لێدێت وێلاش دەبرێت و بەهۆی شیردانەوە پێویستی بەو وێلاشە نامێنێت، وبەم جۆرە ئەو پەتکە لەمنداڵەکە دەپچرێت و دەرگای ناوك تاهەتایە دادەخرێت.

حەیران/ پاکو بێگەردی بۆ خودای مەزن.

شێخ/ ئەم هەموو بەهرەمەندی و رێکخستن و داهێنان و نەخشەدانانەی کە قورئان ئاماژەی بۆ کردوون لە پێکهاتەی مرۆڤ و شێوە پێدانی لەهێلکەو تنۆکێك و پارچە

گۆشتێکی هەڵواسراو و پارچە گۆشتێکی جوراوو ئێسك و داپۆشینی، وێلاش و ناوکی، و ئـارام گـرتن و، بەتواناکـردنی بـۆ کـات و مـاوەی دیاریکـراوی خـۆی لەکەلێـنە تاریکەکاندا.

ئەمانە هەموو بەگشتی لەکاریگەری رێکەوتی کوێرانەن ئەی حەیران.

حەیران/ پاك و بێگەردی بۆ خودای مەزن.

شێخ/ ئـەی ئـەو خۆشەویستیەی کـە هـەموو کەسێك دلڕفێن و سـەرخۆ شـدەکات سۆزیان دەیان سوتێنێت ئایا بەشی رێکەوت لە پێکهاتنیدا چەندە؟

ئـەو خۆشەویستیەی کـە ڕادە بـۆ ڕێژەکـەی دانەنراوە، و ئەو ئاگرەی کەهەڵنەکراوە، تـەنها بـۆ مەبەستێك نەبێـت کـە قورئـان بەجوانترین و ناسکترین و داناترین و دروسترین و شـەرەفمەنترین و سـاکارترین و قوڵترین و دەربـڕین کەدەفەرموێـت ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَـوْمٍ يَـتَفَكَّرُونَ﴾الـروم: ٢١، ئەم خۆشەویستیەی کەلەکاردانەوەیدا سۆزو هەست لەهـەموو ئامێزو دڵێکدا دروستدەکات و لەدڵنیای یەکەیەوە دڵنەوایی و ئارامی لەهەموو دەروونێکدا جێگیر دەکات و لەبەزەییەکەیەوە بەزەیی بۆ هەموو دڵێك بەخشندە دەکات.

ئـەو خۆشەویستیەی کـە دووهاوسـەر لەڕیشـاڵ و دەزولـە کـانی لانکـی سـاواکەیان دروسـتدەکەن.. کـە جوانتریـن و ڕازاوەتـرین و پیرۆزتـرین بەخشـندەیی خودایـە کەبەزیندەوەرەکانی ئاسمان و زەوی داناوە.

کاتێـك کـە پیاوەکە وەك دڕندەیـەك ڕەوشـت دەنـیوێنێ لـە پاشـدا دەبێـتە مرۆڤێك و ئافرەتیش وەك بووکە شووشەیەك لە پاشدا بەهەشت دەچێتە ژێر پێیەوە.

ئـەو هێلانەیەی کـە ئارامی باڵی بەسەردا ڕادەکێشێ و بەزەیی تیایدا گەشە دەکات و سـۆز تـیایدا گـوڵ دەکـات لـەوێوە پەرستنی خـودا بـە بەرهـەم دێـت، یەکـەم پاڕانـەوەی ڕاستەقینە دەست پێدەکات بۆ داواکردنی بارانی بەزەیی خودا بۆ سەر جگەر سۆزەکانمان کـە خـودای دروسـتکەر خۆشەویستیەکەیان لای ئێمە لەخۆشەویستی جگـەر مـان زیاتر کردووە.

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا فَلَمَّا تَغَشَّاهَا حَمَلَتْ حَمْلاً خَفِيفاً فَمَرَّتْ بِهِ فَلَمَّا أَثْقَلَتْ دَعَوَا اللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنْ آتَيْتَنَا صَالِحاً لَنَكُونَنَّ

مِــنَ الشَّــاكِرِينَ﴾الأعراف:١٨٩، ئەو خۆشەویستیەی کەبەهۆی نهێنیەکەیەوە فێری خۆشەویستی منداڵەکانمان و هاوسەرو خێزانمان و دایك و باوکمان و کەس و کارو خوشك و برایان و دۆستان و هاوسێکانمان بوین بۆ هەموو برایەکی هاو مرۆڤیمان تەشەنە دەکات، تەنانەت بۆ ئاژەڵێکی بێزمانی لاوازیش کە چاومان پێیان کەوێت کاتێك کەهاودەم و بەچکەکانیان وونکردبێت بەچەشنێك کەبەزەیکەمان وەختەبمان گرێنێت بۆیان،

ئەو خۆشەویستیەی کەلەپێناویدا خودا هەمو جوانی بەگشتیدروست کردووە و لەپێناوی خزمەتکردنیدا مرۆڤ هەمو جوانیەکی دروستکردووە لە ئازایەتی و بەخشندەیی بەرزی و دۆستی و رێزلێنان و بەسۆزی ووتەی شیرین و ووتنی سرودو گۆرانی و هۆنراوەو داتاشین و وێنەگرتن.

بەمانەش وادەزانێ کە ئەوین و خۆشەویست دەپەرستێت بێ ئەوەی بزانێت کە لەناخیدا ئەو کەسە دەپەرستێت کە ئەو نهێنیە سەرسوڕهێنەرەی بەم خۆشەویستیەیی بەخشیوە ئەو خۆشەویستی‌یەی کە خودا پێی بەخشیوین و لەسەرەتادا وەك تێربوونی ئارەزوویەك لەلامان دەست پێدەکات، و بەخودا پەرستی کۆتایی دێت پێم بڵێ ئەی حەیران، بەشی رێکەوتی کوێرانە چەندە لە دروستکردنی ئەم نیشانانەدا، و بوونی زۆر کردنی هۆکارو هۆکان، و پاڵپێوەنانی بۆ بەرزترین و مەزنترین ئامانج و ئاوات؟

ئایا ئەم هەموو سیستەم و نەخشە دانانە سەرسوڕهێنەرانە لە دروستکردنی دووهاوسەری‌یەوە بۆ دروستکردنی ئەو هەست و سۆزە غەریزی‌یە ڕاستەوخۆ سەرسوڕهێنەرە و دەسەڵات دارە زۆردارانە بۆ دروستکردنی مرۆڤ لە پشتی پیاوانەوە... و هێلکەو جینەکانی لەمنداڵدانی ئافرەتانەوە.

ئایا ئەمانە لە کاریگەری رێکەوتی کوێرانەن ئەی حەیران؟

شێخ/ ئەی ئەم (بیستنە) ئەی حەیران! کە قورئانی پیرۆز لەگەڵێك لە ئایەتەکانیدا لەگەڵ (بینیندا) ناویان دەبات کە دەفەرموێت:

﴿هَـــلْ أَتَى عَلَى الْأَنْسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً، إِنَّا خَلَقْنَا الْأَنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾الانسان:١-٢

﴿وَهُوَ الَّذِي أَنْشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾المؤمنون:٧٨

﴿الَّـــذِي أَحْسَـــنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْأَنْسَانِ مِنْ طِينٍ، ثُمَّ جَعَلَ نَسْلَهُ مِنْ سُـــلالَةٍ مِـــنْ مَاءٍ مَهِينٍ، ثُمَّ سَوَّاهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِنْ رُوحِهِ وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ قَلِيلاً مَا تَشْكُرُونَ﴾السجدة:٧-٩.

ئـەم بیسـتنە ئـەی حەیـران، بەشـی رێکـەوت چـەندە لەدروسـتکردنی کەڵێـنە سەرسوڕهێنەرەکانی لە دەرکەو بەستنەکانی و لە کـڵاو رێژنـەو پەردەو ئێسکەکانی، و ئەشکەوت و کوێرەڕێکانی، و رێچکەو رێگاکـانی، و دەمـارو پەتکە بەستنەکانیان و لە وشکە هەڵات و ئاودارەکـانی و لە پلیکانەو کەناڵەکانی و لەپێنچ پەناکانی و لەکیسەو گیرفانەکانی و لەبەردو چەوەکانی... ؟

حەیران/ ئەم ئەشکەوتە سەرسوڕهێنەرە چیلایە کەلەئەشکەوتی جنۆکەکان دەچێت لە پێچی روتەختی دەریا یاخود ئەشکەوتی شەیتانەکان لە گومڕێ چۆڵەوانیەکانیدا.

شێخ/ ئەی حەیـران دوورنیـت لـە بۆ چوونی ئەندێشەکانت، هاوبەشی ئەو خەیاڵەت ئەکەم.

حەیران/ چۆن؟

شێخ/ بەزمانحاڵی ئەجینەو شەیتانەکان بۆتی وەسف دەکەم زۆر جار خەیاڵ یارمەتیدەرە بۆ دەرککردن و بەگەڕخستنی عەقڵ.

شەیتانێك لە شیتانەکانی هۆنراوە وتی: پرسیارم لە جنۆکەیەکی کۆمەڵەی سرودوستان کرد، لەکوێ نیشتەجێیت؟

وتی: ئێمە دەفڕین و سەمادەکەین لەنێوەند ئاسمان و زەویدا لەسەر باڵ و ڕیشە شەپۆلەکانی با..

گەر وویستمان بحەووێینەوە دەچینە گوێکەکانی ئەو مرۆڤە میواندارە بە بەزم و کەیفێ کە هەندێ جار بەشادییەوە پێشوازییمان دەکات و هەندێ جاریش بەفرمێسکەوە.

وتم: وەسفێکی ئەم جێنشینانەم بۆ بکە بارودۆخیان چۆنە؟

وتی: من نەتوانام لە وەسفکردنیان، چونکە لەکون و کەلەبەرو کوچەو ئەشکەوت و پەنجەرەو کلاوڕۆژنەکانی لە نیشتەجێکانی ئەجینەکانی دەریا دەچێت لە قوڵترین شوێنیاندا... و بیستن وەك بینین نییە..

وتی: پێم پێئەدەی یەکجار سەردانت بکەم تابیبینم؟

وتی: خۆشی و بەزەیت هێنا، بەڵام دوای نیوەی شەو وەرە بۆ لام، کاتێك کە هاوڕێکەم لە ناخی نووستندا بێت و هەستت پێ نەکات.

شەیتانی هۆنراوە وتی: لەکاتی دیاریکراودا لەبەردەم گوێچکی پیاوەکەدا لەبەردەرگایەکی مەزندا کە چوارچێوەکەی دەوری جێگای چوونە ژوورەوەیەکی تەسکی دابوو، لەهیچ دەرگایەکدا هاو وێنەم نەدیبوو لەکەوانەیی و چەماوەیی‌دا و لە پەتکو پێچراوەکانیدا وتم: ئەمە سەرەتای سەرسوڕهێنەرە هەوڵی پێچکردنەوەم ئەدا بۆ بینینی هاوڕێکەم، دەبینم لەدەروازە تەسکەکەدا وەستاوە، لەپشت گەندە مووەکانی بەردەمیدا خۆی حەشارداوە ئاماژەی بێدەنگی کردم، لە پێشمەوە ڕۆشت و بەدوایکەوتم چووینە کەناڵەوە کە هەروەك تووێکڵێك وابوو یەکەمجار بەرەو ژوور و پاشان بەرەو خوار لە نیوەیدا تەسك دەبێتەوە لەڕووتەختەکەیدا شلەیەکی زەردی لینج هەیە، کاتی گەیشتن بەکۆتایی تووێڵەکە خۆمان بەرامبەر پەردەیەکی بچووکی ناسك بینیەوە نیوەی تەنك بوو لەشێوەی تەنکی پەردەی تەپڵ بەڵام کەمێك چەماوە، و کاتێك لەپەردەکە نزیك بوومەوە هاوڕێکەم، وەك بترسێ چرپانی بەگوێمدا و پێی وتم: تۆ لێرەوە ڕێگای چوونە ژوورەوەت نییە.

وتم: ئەی تۆ؟ من هەروەك پیشەی خۆم دەچمە ژوورەوە، و سەبارەت بەتۆ دەگەڕێیتەوە و لە کەلەبەرێکی ترەوە دەێیتە ژووری چۆن دەبێت بەتەنها بگەڕێمەوە چ بهێلمەوە باکونێك لەم پەردەیە بکەم. هەرگیز نەکەی ئەو کارە بکەی، گەر کردت گوێچکەی ئەم پیاوە لەکار دەخەیت و تورەی دەکەیت و بێ بەشی چوونە ژوورەوەی ئەم جێگایەم دەکەیت بۆ هەتا هەتایە.

وتم: ئەی ڕێگای دووەم لەکوێوەیە؟ وتی: دەردەچیت و لە بەردەم لێوەکانی ئەم پیاوەدا دەوەستیت گەر کرانەوە ئەوا دەتوانی بچیتە ژووری و کاتی داخستن هەردوو لێوەکانی بەهێواشی بەرەو گەروی دەچێت، و لەوێدا کەنالێك دەبینیت لەسەری نوسراوە کەنالی (ئۆستاکیوس) تەنها ڕێگایە کە گوێچکە بەهەواوە دەبەستێت، تۆ لەوێوە دەچیتە ئەو هۆڵەی کەلەپشت ئەم پەردەیەوە دێت، دەبینیت چاوەڕوانت دەکەم.

شەیتانی هۆنراوە وتی: ئاماژەکراوە کە بەجێهێناو چوومە گەروویەوە لەو کەناڵە پەڕیمەوە بەرەوژوور خۆم لەهۆڵێکی گەورەی نەرمە ئێسك دیتەوە کە پەردەکە تەنکە تەپڵی یەکە بەتوندی بەدیوارە کەیەوە بەسترابوو و نەیدەهێشت بچمە ژوورەوە و لەدیورای بەرامبەری کونێکی هێلکەیی هەیە کە بەهۆی پەردەکەیەوە داخراوە، و کونێکی بازنەیی هەیە کە دووبارە بەپەردەیەك داخراوە و لەدیواری پشتەوەی کونی گەورەو بچووك هەیە.

لەنێوەند ئەم دیوارانەدا زنجیرە ئێسکی سەرسوڕهێنەر هەڵواسراوە، کە یەکێك لەو ئێسکانە لەشێوەی چەکوشە و دووەم ئێسك لەشێوەی سندانی ئاسنگەردایە و سێهەم لەسەر شێوەی ئاوزەنگی زینی فەرەنگیدایە کە هەمو بەیەکەوە لکاون، شێوە چەکوشێکە دەلکێت بە پەردە تەپڵیەکەوە و دەچێتە نێوان هەردوو چینەکەیەوەو پێوەیان دەبەسترێت و پەردەکە بو ناوەوەی ژوورەکە ڕادەکێشێت بەشێوەیەك وای لێدەکات کەلەناوەوە کۆماوەو قۆقز بێت و لەدەرەوە قولکە بێت و ئاوزەنگی شێوەش دەلکێت بەکونە هێلکەیەکەی بەرامبەری، بەڵام سندانەکە نێوەندێکە لەنێوان هەردوو ئێسکەکەی تردا بەهۆی ئێسکی جیاکەرەوە بەهەردووکیانەوە دەبەسترێت بەهاوڕێکەم ووت ئەم ئێسکە هەڵواسراوانە چین؟

وتی: نازانم بەڵام ئەوەندە ئەزانم گەر ئێمە لە پەردە تەپڵەیەکەیانەوە چووینە ژووری ئەوا ئەم ئێسکانە بەهێواشی دەلەرێنەوە ئەی نهێنی چی‌یە کەوا لەهەوادا هەڵواسراون؟

وتی: نازانم بەڵام ئەوەندە ئەزانم گەر یەکێکیان نەما و یاخود پارچە ئێسکە جیاکراوەکان لەکار کەووتن ئەوا بیستن کزوو لاوازدەبێت وتم ئەی ئەو کونە بازنەییە پەردەییە چی‌یە و بۆ کوێ سەردەکێشێ؟ وتی: ئەمەیان ڕێڕەوی دووەمە بۆ گەیشتن بە دەمارەکانی بیستن وتم چی هەیە لەپشت ئەم دوو کونەوە، وتی: ئەو هۆڵەڕووتەختە کۆتاییە هەیە کەلەکۆتایی گەشتەکەماندا تێیدا جێگیر دەبین، کە مەزنترین و ئازیزترین هۆڵە لەلای خاوەنەکەی کە زۆر کەلەبەروو بەرزایی و پلیکانەی تێدایە کە مرۆڤی تیادا وون دەبێت، و هەر لەبەر ئەمەیە کە پێی دەووترێت (بیابانی وێڵ)- واتە توونی بابا) وتم: لەکوێوە بچینە ناوی؟ وتی: من لەکونە هێلکەییەکەوە یاخود لەکونە بازنەییەکەوە دەچمە ناوی، بەڵام تۆ ناتوانیت لێیانەوە بچیتە ژووری چونکە وەك دەبینیت بەپەردە داخراوە؟ وتم: کار چی‌یە؟ وتی: لەم کاتەدا هیچ ڕێگایەکم لانیە بۆت، بەتووڕەییەوە وتم ئایا لەکاتی تردا ڕێگا دەبێت، وتی: بەڵێ بەڵام پێویستمان بەکات و هەلێکی گونجاو دەبێت، وتم ئەو هەلە چی‌یە؟ وتی دەگەڕێین بە دوای مرۆڤێکی شاعیردا کە خولیایی مۆسیقا بێت، تۆ دەچیتە لای و چەند بەیەتە هۆنراوەیەکی پێدەبەخشێت کەتەنها بۆ ستران و گۆرانی بگونجێت و منیش دەچم بۆ لای چەند ئاوازێك کە بگونجێن لەگەڵ ئەو بەیتانەدا فێردەکەم گەر هۆنراوەکەی تۆ ئاوازەکەی منی بەدڵ بوو هەردووکیان کۆدەکاتەوە بەمەش تۆو لە ئامێزم دەگریت و منیش لە ئامێزت دەگرم، و دەبین بە یەك و دەتوانیت لەگەڵما بێیتە پیرۆزگای بیابانەکان.

وتم ئەو شاعیرەی کەمن شەیتانی ئەوم کە گەورەترین شاعیرە بەڵام سرودوو گۆرانی نازانێت وەك تۆ ئارەزوی دەکەیت، و کێ ئەم جۆرە هۆنراوەیە دابنێت؟ وتی: شارەکەمان بێ بەش نیە لەم نموونانە بەڵام ئەوەی بۆی ڕەخسا بێیتە شاعیرێکی بەهرە مەند نایەوێت ببێتە گۆرانی بێژ..وتم: ئەمەت چۆن زانی؟ بەزەردە خەنەیەکی مەکراویەوە وتی: بەهۆی ئەم برادەرە و زانیم کە ئێمە لەگوێچکەی داین چونکە هۆنراوەو گۆرانی زۆر باش دەزانێت گەرچی لەخەڵکیشی بشارێتەوە، وتم: چیتە لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەکانمان لێ ئاڵۆز دەکەیت.

وتی: ئەترسم گەر بەئاگای بهێنم تووڕە ببێت.. وتم گوێی مەدەرێ من لەکاتی خەونەکانیدا چەند بەیتە شیعرێکی گریاناوی پێرادە گەیەنم و کە بەئاگا هاتەوە دەیلێتەوە، تۆش لەگەروویدا سەمای بۆدەکەیت و ئەویش دەیکات بەگۆرانی.

وتی: بۆچی هۆنراوەی گریاناویت بۆ هەڵبژارد؟ وتم: نابینیت تەمەنی بەرەو پیری دەڕوات، و زۆر هۆنراوەم بەگوێی ئەوانەدا وتووە کە پێیان لە ڕۆخی قەبرە بەڵام تەنها ئەم هۆنراوانەیان لاپەسەند بووە کە ڕازوو گلەیی و سۆزی لاویەتی تیابووە. شەیتانی هۆنراوە وتی: هەبوو نەبوو، پیاوەکە بەگریانەوە بە ئاگا هاتوو لەبەر خۆیەوە بەیتە هۆنراوەکانی دەووتەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو گوێبیستی وورتە وورتی بەیتە هۆنراوەکە بووین بە ئاوازەوە، بەم شێوەیە هەردوو کمانی لە بازنەیەکدا کۆ کردەوە، هەروەك وویستمان یەك گرتنی لەنێوان ئێمەی ئاوازوو هۆنراوەدا کرد، بەیەکگرتووی دەرپەڕین لەکەناڵی گەرووەوە بۆ ئەو جێگەیەی کە تیایدا بووین کە هۆڵی گوێچکۆڵەی ناوەڕاستە، بە برادەرەکەمم ووت: ئێستا لە چ کونێکەوە بچینە هۆڵی بیابانی وێڵ؟ وتی: ئەم دوو ڕێڕەوە هەمیشە بەچەکووشە ئێسکیەکە لێدراوون، بەڵام باشتر وایە بەسەرپەرشتی ئەم ئێسکە هەڵواسراوانەدا بپەڕینەوە، بەهۆی لەرینەوەکانیان بچینە ناو پەردەی کونە هێلکەیەکەوە، ئەمە چاکترین ڕێگایە بەم جۆرە ڕۆیشتین تا خۆمان دیتەوە لەکەلەبەرە شێوە هێلکەیەکەدا کە لەدیوارەکانیدا چاڵو کون و سێ تاق هەبوون، لەیەکێکیانەوە چووین ژووری لەکەناڵە شسێوە هیلالیەکاندا خۆمان دیتەوە کە تێیدا دوو کەناڵ هەیە یەکێکیان لەشێوەی شاقوڵی و ئەویتر یا ئاسۆییە، و لەکەلەبەرەکەوە چووینە هۆڵێکی سەرسوڕهێنەر کە شێوەیەکی حەلەزۆنی هەبوو... بەهاوڕێکەمم ووت: بەڕاستی تۆ لەووتەکەتدا زیادە ڕەویت نەکرد کە ووتت جێ و ڕێمان وەك جێ و ڕێی ئەجینەکان وایە و ئەم هۆڵە چیە کەلەقاقلە جنۆکە قەوقەعی حەلەزۆن دەچێت؟ وتی: بەهەڵەدا نەچوویت.. و ئەوانیش هەر قەوقەعە ناوی دەبەن، پیدا ڕۆیشتین کە پێکهاتبوو لەسەنتەرێکی تەوەرەیی لەشێوەی ستوون و کەناڵێك کەبەدەوری پایەکەدا دەخولایەوە لەشێوەی لوولپێچی دۆریندا (١) کە بۆ دووخول یان زیاتر کە بە ڕووتەختێکی تەنك ئەم کەناڵە ئەکاتە دووبەش بە شێکیان ئێسکي بەشەکەی تری پەردەییە، و کەناڵەکە بەگومەزێکی داخراو کۆتایی دێت کەبریتییە لە سەری قەوقەعەکە (هێلکە شەیتانۆکە) بەیەکێك لەکەناڵە لوولپێچە بەچەکوش لێدراوە کە بەناو کون و کەلەبەرەکەدا ڕۆشتین تا گەیشتینە سەری قەوقەعەکە بینینمان ئەو بەشەی کە ئێمەی تیاین بەلێدانی بەشی دووەم دەنگ دروستدەکات بەهۆی کونێکەوە کە دەکەوێتە

---

١ جورە لوولە پیچکە.

نێوان دوو بەشەکەی لەسەر قەوقەعەکەدا، لەوێوە دابەزین بۆ بەشی دووەم تا گەیشتینە کونە بازنەییەکە هەروەك لەمەو پێش باسکرا بە هاوڕێکەم ووت گەڕاینەوە ئەو جێگایەی کە لێوەی دەستمان پێکرد، وتی: بەڵێ ئەم دوو پلیکانەی ناو کەناڵە لوولپێچەکە یەکێکیان بەپلیکانەی کون و کەلەبەرناو دەبرێت چونکە بەلێدانی (کون و کەلەبەرەکە) دەنگ پەیدا دەکات و دووەم بە (پلیکانەی تەپڵی) ناو دەبرێت، چونکە بەلێدانی ژووری تەپڵ لە کونە بازنەییەکەوە دەنگ دروستدەکات و هەردوو پلیکانەکە لەلووتکەی قەوقەعەکە لەیەك دەدەن و دەنگ دروست

دەکەن، و ئەو ڕووتەختەی کە بینیت بەشیان دەکات بە (تەختەی لولپێچ) ناو دەبرێت و نیوە ئێسکێکەی لە دەهلیزدا دەستپێدەکات، و شلەیەکی ڕون دەڕژێنێت، کەبە (لیمفی دەرەوە) ناو دەبرێت، و نیوە پەردەییەکەی بریتییە لە کوپەڵەیەکی پەردەیی داخراو، ئەویش دووبارە شلەیی تێدایە کەبە (لیمفی ناوەوە) ناو دەبرێت، و ئەم کوپەڵەیە لەسەرەتاوە لەدوو کوپەڵە پێکدێت کەبە یەکێکیان دەوترێت مەشکە، و بەوی تریان دەوترێت توورەگە، و مەشکەکە بەلێدانی کەناڵە هیلالییەکان دەنگ دروستدەکات کە دوو ژووری بچووکی تێدایە کەلەکاربۆنی کلسی پێکهاتووە کە شێوەی کریستاڵیان وەرگرتووە وەبە (دووژووری گوێچکەڵە) ناو دەبرێت و شەیتانی هۆنراوە وتی: هاوڕێکەم ویستی درێژە بە وەسفکردنەکەی بدات وتم: بەسە، بەسە، سوێندبێ بەخودا وەسفەکەت مێشکی پڕ کردم و چاوی لێك کردم و هۆشی نەهێشتم لەم جێگەیەدا کە بەڕاستی لەجێگەی خۆیایەتی بە بیابانی وێڵ ناو ببرێت\، بەڵام بەکورتی پێم بڵێ ئەم پەتك و دەززوە ووردانە چین کەلەهەموو کون و کەلەبەرێکدا هەن و لەکەناڵەکان و قەوقەعەکەدا مەلەدەکەن و لەناو شلەییەکاندا نوقوومبوون.

وتی: ئەمانە هەندێکیان دەمارو شاخوێنبەرن و ووردەکاریەکانیان کە نوقمی شلەییەکان بوون لەکەناڵەکان و قەوقەعەکەدا هەموو دەماری بیستنین کە بەرەو دەماغ دەڕۆن و دەنگ بۆ مرۆڤ دەگوێزنەوە، و دەبێ بۆچی بێ ئەم هەموو ئێسك و کون و کەلەبەرو کەناڵ و لوولپێچ و قەوقەع و پلیکانەو پەردەو ڕووتەخت و دەهلیزو شلەو پەردەو... هتد؟

ئەوەندە بەس نەبوو گەر دەمارەکانی بیستن لەتەپڵدا بوەستایە، کەلەرینەوەی دەنگی وەردەگرت و بەرەو دەماغی مرۆڤی دەگواستەوە؟.

وتی: سەبارەت بە شارراوەی نهێنییەکانی هیچ نازانم تەنها ئەوە نەبێت گەر یەکێکیان تێکبچێت یاخود دابخرێت و یان لەکاربکەوێت بیستنی ئەم پیاوە دەوەستێت و لەکاردەکەوێت و لەفرەو برە دەکەوێت.

شەیتانی هۆنراوە وتی: پێش ئەوەی هاوڕێکەم ووتەکان تەواو بکات لەکەنالی ئوستاکیۆسە کە هاتبوومە ژووری چوومە دەرەوە، بەسوپاسەوە بەجێم هێشتوو پێم ووت: بەڕاستی ئێمە لەماڵێك لەماڵەکانی ئەجینەکاندا بووین؟.

حەیران/ بەڵام دانایی چییە لەدروستکردنی ئەم ئامێرە ئاڵۆزە سەرسوڕهێنەرەدا؟

شێخ/ بەکورتی پێتزادە گەیەنم گەر ئەم پۆلێن و ڕێکخستنە داڕێژراوانە نەبووایە کەلە دەروازەیەکی دەرەکیەوە دەڕوات و بە( سەکۆ) ناو دەبرێت بۆ ئامێری (بیسەر) بەرەو (پەردەی تەپڵی) بۆ (گوێچکەلەی ناوەڕاست) بۆ (گوێچکەلەی ناوەوە) و لەدەمارەکانی بیستندا کۆتایی دێت هەرگیز چاوەڕوان نەدەکرا، ئەم دەنگانە بەو شێوە تێگەیشتوویییە بگوێزێتەوە بۆ دەماغ، ئەم هەموو بەرزوو نزمی و پێچاو پێچەو کون و کەلەبەرە پێچاو پێچەوە هۆڵە چوونە ناویەکەکان و کەناڵە بەیەکلکاوەکان و پەردە بەیەکبەستراوەکان و کونەداخراوەکان و ئێسکە هەڵواسراوەکان و تەختە لێکدراوەکان و پلیکانە بەرەو بەرزیو نزمیەکان و شلەمەنیە وەستاوەکان و کیسە تەنکەکان و پەردە وردەکان و هەموو دروستکراو داڕێژراون لە پێناوی بەرزکردنەوەی بڵاوبوونەوەو لەرینەوەکانی دەنگ بەشێوەیەك کە بتوانێت بەرزو نزم بکات وەك خۆی دەیەوێت تاکو ئامێری بیستن لەهەموو کتوپری و شەکەتو ناکاویەك بپارێزێت بەمەش دەست بەسۆزی گۆرانیەکە دەکەین و خۆشیەکەی زیاتر دەبێت.

حەیران/ من لەو باوەڕەدام کە ئەم ئامێرە بێ هوودە دروستنەکراوە و دەرکی سودمەندی هەندێ لەبەشەکانی دەکەین، بەڵام لە شێخی گەورەم دەپرسم ئەو داناییە چییە لە دروستکردنی ئەم ڕێکخراوە ئاڵۆزانەی لەئێسك و روتەخت و کونو کەلەبەرو دەرکەو شلەمەنیو قەوقەع و کەناڵەو پلیکانەکان؟

شێخ/ لە (ڕێکەوت) بپرسە کە دروستکەری ئەم ئامێرە سەرسوڕهێنەرەیە.

حەیران/ پەنا بەخوا لەم گومڕاییە ئاشکرایە.

شێخ گەر باوەڕت بەڕێکەوت نی‌یە، لەخانەکانی پارچە گۆشتی جووراو بپرسە کە گوێچکەی دروستکردوە، وادەردەکەوێت ئەم پارچە گۆشتە ژیر و دەرکەر و دانا و زانابێت بەسرووشتی شتەکان و تایبەتمەندی‌و سیستەم و نهێنی‌یەکانیان...

دەزانێت کەدەنگەکان بەهۆی شەپۆلەکانی هەواوە بەئێمە دەگەن ئەم شەپۆلانە تیایاندایە زۆر تیژو سەختن و تیایاندا هەیە لاوازو سوك و نەرمە، و هەندێکیان بەشاقولی دێن و هەندێکی تریان لەلاوە دێن، کە چالایی گوێچکەی دروستکردووە، و پێکهاتەیەکی کرکراگەیی هەبێت نەئێسك بێت و نەگۆشت، پێچراوە و نەرمی لەخۆ گرتبێت تاکو شەپۆلی دەنگەکان لە پێچراوەوە بگەڕێنەوە بۆ بەشی نەرمی تادەگاتە ئامێری بیسەر، و دەزانێت ئەو پایەی کەدەنگەکان هەڵدەگرێت لەوانەیە گێژەڵوکەیەکی توندو تیژ بێت لەوانەیە لەگەڵ خۆیدا شتی زەرەرمەند هەڵبگرێت لەخاك و خۆڵ و میکرۆب، لەبەر ئەوە وای لە ئامێری بیسەر کردوە کە شێوەیەکی چەماوەیی کەوانەیی هەبێت بەرەوژوور، و لەبەر دەرکەکەیدا پەرژینێکی لەموو بۆ کردووە و لەناویدا لینجی زەردی مێویی هەیە، و بەهۆی چەماوەییەکەیەوە خۆی لەشەکەت و ناکاوی با بپارێزێت، و بەهۆی پەرژین و لینجی زەردە مۆمیەکەیەوە خۆی لەزەرەرمەندی بپارێزێت.

دەزانێت کە هەندێ لەدەنگەکان نەرم و بەچرپەن، لەبەر ئەوە ئامێری بیسەر شێوەی ئەشکەوتی پڕ لەهەوای لەخۆ گرتووە تاکو ببێتە هۆکارێك بۆ بەهێزکردنی دەنگەکان و دوو ئەوەندە کردنیان بۆ دەنگدانەوەیان بەو جۆرەی کەلەگەرماو ئەشکەوتەکاندا گوێبیستی دەبین کە لە کەنارێکی دەنگی لاواز دەنگدانەوە دروست دەبێت.

دەزانێت کە پەردەی تەپڵی شپرزە چاکترین ڕەقە ئەندامە بۆ گەیاندنی دەنگ لەبەر ئەوە پەردەی تەپڵی‌و پەردەی کونە هێلکەیی‌و پەردەکانی تری لە گوێکەی ناوەوە دروستکراوە.

دەزانێت گەر ڕەقە ئەندامێکی بچووك لەلایەکی پەردە شپرزە بەستراوەکە چەسپێنرا لەرینەوەکانی دەنگ بەباشترین شێوە دەگوێزرێتەوە، و زنجیرەی پارچە ئێسکە هەڵواسراوەکەی دروستکرد. و بەستیەوە بە پەردەی گوێ و پەردەی کونی هێلکەیی.

دەزانێت هەموو ڕەقە ئەندامێك بەنێوەندێکی جیاواز لەخۆی دەوردراوە لەناوەرۆکەکەی خۆیدا لەرینەکان تودتر دەنێرێت وەك لەناردنی لەرینەوەکان بۆ چواردەوری وای لەسێ پارچە ئێسکەکە کردوە کە هەڵواسراو بێت لەهەوایەکدا کە

چـوارده‌وری گرتبێـت تـاکو لــه ئێسـکی سـەری جـیابکاتەوه و دووبـاره لەڕووتەخـتی لوولپێچـدا ئـەم کـارەی کـردووه بەشـلەیەکی جیاواز لـەخۆی چـواردەویداوه تـاوەکو لەرینـەوه بەردەوامـەکان لــە ئێسـکەکان و ڕووتەخـته لوولەپێچـەکا نەگوازرێـنەوه بـۆ ئێسکەکانی سەر و لەناو بچن.

دەزانێـت کـە زنجیره ئێسکەکان دووچاری هەندێ شت دەبن کە لەکاریان دەخەن بۆ گواستنەوەی دەنگەکان لـە پەردەی گوێـوه بۆ پەردەی کونـی هێلکەیی هەر لەبەر ئەوه کونی بازنەیی دروستکردووه و بەپەردەیەك داپۆشیوه کەیارمەتیدەر بێت بۆ گواستنەوەی دەنگەکان بۆ گوێکەی ناوەوه.

وای لەهـەردوو کونەکـە کـردوه کـە ڕێگـە کـەیان پلـیکانەیی بـن بـۆ چـوونە نـاو قەوقەعەوه.

کە شێوەی حەلـەزۆنی‌و لوولپێچـی باشترین شێوەیە بۆ بڵاوبوونەوەی لیمفی دەماری بیستـەرەکان لە پانتاییەکی بەربڵاودا بۆ ئەندامێکی بچووك لە جێگایەکی تەسکدا، و هەر لەبـەر ئـەوه قەوقەعەکـەی دروسـتکردوه و دوو کـەناڵی لوولپێچـی دوو پلـیکانەداری دەنگـداری تـێدا دروسـتکردووه کـە یەکێکیان شێوه دەهلیزیی‌یە لەکونە هێلکەییەکەدا و دووەمینی دادەبەزێتە ناو پەردەی گوێوه بۆ کونە بازنەیی‌یەکە و لەکەناڵی لوولپێچەدا ئەو ڕووتەختە لوولپێچە ئێسکی‌یە پەردەیەکی دروستکردوه کە شلەی لیمفی دەڕژێنێت.

دەزانێـت کەهـەندێ لەدەنگەکان لـە کڵاوەی سـەرەوه دێـن لەبـەر ئـەوه کەناڵـە شـێوه هیلالـیەکاتی دروسـتکردووه تـا... یارمـەتی کۆکـردنەوەی ئـەو شـەپۆلە دەنگانـەبدەن کەلـە کڵاوەی سـەرەوه دێن و ڕێگەیان بگۆڕن بەگوێرەی ڕووی بۆشاییە چەماوەییەکان و بیانگەیەننە دەمارەکانی بیستن کە بڵاوببوونەتەوه لەشلەمەنیەکانی خۆی و قەوقەعەکەدا.

هـەردوو کـپەڵەی پـەردەداری پڕ لـیمفی دروستکرد و لەیەکێکیاندا هەردوو پەردەی دوو گوێچـکەکەی لەسـەریەك دانـا، تـاکو بـەهۆی دەنگدانـەوەیان لەرینـەوەی دەنگەکان زیـاد کـەن و لـەسەرو ئەمانەشەوه دەزانێت، ئەو خانانەی کەهۆشمەندن و دەرککەرن ئەی حەیـران، کـەوا هـەوا پاڵـە پەسـتۆیەکی دەرەکـی تونـدوو تـیژو زاڵـی هەیـە لەسەر پەردەی گـوێ‌و زەرەرمـەند دەبێـت بـۆی گـەر بەرامبەر نەبێت لەگەڵ ئەو هەوایەی لەناو گوێکەی نـاوەندا هەیـە و دەبێـت بـە بـەردەوامی هاوکێش و یەکسان بێت لەگەڵیدا لەپاڵەپەستۆی هـەواو پلـەی گـەرمایدا وەك خۆت دەزانیت ئەی حەیران لەکاتی هەناسەوەرگرتنی قووڵ

و دووردوودرێژدا و گەر کونەکانی لوت و دەم داخراوبێ پەردەی گوێ دەشپرزێو لەکاتی هەناسەدانەوەدا بەرەو دەرەوە دەچەمێتەوە و لەکاتی هەناسە وەرگرتندا بەرەو ناوە و دەچەمێتەوە، بەمەش بیستن نارێك دەبێت هەرلەبەر ئەوە لوولەی ئۆستاکیوس دروستبووە، و لەو یوە هەوا دەخاتە ناو گوێکەی ناوەندەوە، و لەهەمان کاتدا وای لەم لوولە ئۆستاکیوسە کردوە کە دەنگەکان ڕون و ئاشکرا بکات وەك چۆن کونی ئامێرە مۆسیقیەکان دەنگەکان ئاشکرا و ڕەوان دەکەن و هەروەها کردویەتیە ڕێوڕەوێك بۆ دەرهاویشتنی لینجی ناو پەردەی گوێ.

ئایا خانەکانی ئەم گۆشتە جوراوە ژیرو دەرك کەرو داناو زاناو بەتوانا، کە توانای ئەم هەموو نهێنی و تایبەتمەندی و سیستمانەی بزانن کەزانایان بەدەریانخست دوای ئەوەی چەندەها چەرخ بەسەر دروستکردنی مرۆڤدا تێپەڕی، ئامێری ئالۆزی گوێی بە پێی پێویستیەکانی ئەم نهێنیانە دروستکرد.

حەیران/ پاك و بێگەردی بۆ خودای مەزن و داناو زانا و بە توانایە. چەند پاك و بێگەردە.

شێخ/ بەڵێ چەند بێگەردو مەزنە ئەی حەیران.

نەفرت لەبێ ئاگایان لێ ئەوانەی کە ﴿**لَهُـمْ قُلُوبٌ لا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لا يُبْصِـرُونَ بِهَـا وَلَهُمْ آذَانٌ لا يَسْمَعُونَ بِهَا أُولَئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُولَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ**﴾الأعراف:١٧٩

حەیران/شێخی گەورەم ئەمشەو دەیەوێت سەبارەت بەچ ئایەتێك لە ئایەتەکانی خودا باسم بۆ بکات؟

شێخ: سەبارەت بەچ ئایەتێکی خودا دەتەوەێت باست بۆ بکەم؟

هەموو ئەندامەکانی لەشت ئاماژەی بوونی خودا دەکەن، چونکە هەرچی لەتۆدا دروستیکردووە ڕازاوە و ڕێکە لە پێکهاتەو ڕێکخستندا، بەرزی کار و ووردی هەڵسەنگاندنی شیاوە هاویەکە و لە ئامانج و جوڵەدا و گەر بەکەمترین ئەندام بێنە بەرچاوت وەك موویەك و سەرەنینۆکێك و یاخود مەزنترین و ترسناکترین ئەندام وەك چاوو گوێچکە و دڵ و جگەر و گەدە و ڕیخۆڵە و زمان و لێو وەیان ئەو شتانەی کە بەچاو نابینرێن لەملیۆنەها خانە و دەمار کە زۆر سەرسوڕهێنەرترو ڕازاوەترن لەنهێنییەکانیاندا بەڵام ئەی حەیران بەکورتی ئەو ئایەتانەت بۆ باسدەکەم کە خوای گەورە و کاربەجێ خۆی هەڵیبژاردوون، و لە قورئاندا زۆر ئاماژەیان بۆ دەکات تاکو بەڵگەی بڕەر بهێنێتەوە لەسەر بوون و توانا و کاربەجێیی خۆی، بەبێ وەسفکردنی ئەو ئەندامانەی کەئەو سەردەمە ناویان نەدەزانرا، نەخوازە کارەکانیان گەرمانەوێت ئەی حەیران لەم گفتوگۆیەدا باسی هەموو دروستکراوەکان بکەین کەخودا لە ئێمەدا خستویەوە لە ئەندامی گەورەو بچووك و شارراوەو بەدەرکەوتووەکان، هەموو نووسراوەکەت سەرەو ژێر دەبوون کە دەمویست بیکەینە ڕێپیشاندەرێك بۆ باوەڕ هێنانت بەهۆی بەڵگەکانی قورئان و نوسراوەگەورەکانی بواری پزیشکیو تۆژەرەوەو سوودی ئەندامەکان هەرگیز لام وانییە کە تەمەنم بەباسکردنیان ماوەم بدات، و هەروەها کاتی تەرخان کراویش بۆ تۆ نییە کە بەشت بکات تەنها ئەوەت بەسە کە سنگت فراونکات بۆ لێکۆڵینەوەو گەڕان بەدوای داناییەکانی خودادا کەلەخۆت و ئاسۆکاندا هەیە.

دەشێت یەکێك بێت لەوانەی کە فەرموودەی خودایان بەسەردا دەگونجێت کەدەفەرموێت ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحاً وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾فصلت:٣٣، و بەزمانحالی (جسر) باسی چاوم بۆ کردیت، و هەندێك لە ئایەتەکانی قورئانم بۆ باسکردي کە سەبارەت بە ئاسۆکان هاتوون لەپاشدا لاماندایە باسکردنی هەندێك لەو ئایەتانەی کەلەسەرخۆت هاتوون، باسی بینین و دروستکردنی جەنینم بۆ کردیت لەمندالّدانی دایکیدا و ئێستاش باسی زمان و لێوت بۆ دەکەم.

حەیران/ بەلاَم من وای دەبینم ئەم دوو ئەندامە ماسولکەیی‌یە بچووکە شایەنی ئەوەبن کە شێخم لە باسکردنیاندا ماندوو بکەن.

شێخ/ خودا لەقورئاندا ناویان دەبا تاکو بیانکاتە بەلّگە بۆ بوون و توانایی و کاربەجێ‌یی خۆی، کەچی تۆش بەکەمیان دادەنێیت؟

حەیران/ پەنا بەخوا.

شێخ/ زمانت بگرە ئەی حەیران، و ئاگاداربە گالّتەت بەرازاوەی رازاوەکان نەیەت، پەرستگارو پەرستکایە کە خاوەنی چوار وەزارەتە، گەرپاراستت ئەوە پارێزراو دەبێت و گەر زمانت بەرەلاّکرد ئەوا زەرەرمەند دەبێت، و گەر خواردنت دایە ئەویش خواردنت دەداتێ، و گەر بیدوێنیت ئەتدوێنێ و گەر پرسیاری لێ بکەیت فێرت دەکات، پێش ئەوەی بزانی نهێنی دانایی لەجۆرایەتی و کارو پیشەکانی و گۆڕاندنی پیت و ووتەکانی و ژمێرەی مەمیلەکانی، و جیاوازی جولّەکانی لەنێو هەردوو لێوو مەلاّشوودا، و جیاکردنەوە دەمارەکانی و بوونی بەردەوامی‌و ئاسانکردنی لیك تیایدا.

حەیران/ نەمدەزانی ئەم ماسوولکە بچووکە خاوەنی ئەم هەموو پلەو پایەیە.

شێخ/ هەموو ئەندامێکت لەئەندامەکانی هەست ئەی حەیران یەك کاریان هەیە، تەنها زمان نەبێت، چاو بۆ بینینە، گوێچکە بۆ بیستنە، لووت بۆ بۆنە، و سەری پەنجەکانت زیاتر لەهەموو ئەندامەکانی تری پێستی هەست بەلێخشاندن دەکەن، بەلاّم ئەم زمانە ڕێکەوت وای بۆ ڕەخساندوە کە ببێتە ، ئامێر بۆ چێژکردن و جووین و قوتدا هەرسکردن و هەستکردن و خشاندن و قسەکردن، و بۆ ئەوەی ببێتە ئامێرێك بۆ چێژکردن، ڕێکەوت مەمیلەی لەهەردوولای ڕووتەختەکەیدا ڕاخستووە تاکو خواردن.بمژێتو بیگەیەنێتە دەمارە بلاّو بوەکانی ناوەوەی و هەروەها ڕێکەوت ئارەزوی کردوە کە دوو جۆر لەم مەمیلانە

تایبەتمەندن بەچێژ کردنەوە بەبێ هەستکردن بەکرداری لێخشان، تاکو تێکەڵ نەبن بەمەش بەوەستانی یەکێکیان کاری ئەوی تریان تێکبچێت گەر هەموو هەستە گشتییەکانی تری مرۆڤێك نەمێنێت ئەوا هەستی چێژ کرنی بەبەردەوامی بمێنێت، یاخود بەپێەوانەوە چێژ کردنی نەمێنێ و هەستە گشتیەکانی تری بمێنێ.

لەبەر ئەوەی کە ئەم مەمیلانە خواردن نامژن تا تواوەکان شیکار نەبن، تەنها لەماڵێکدا کە زمان شێدار بێت ڕێکەوت ئارەزووی وابوو، کە زمان بە پەردەیەکی دەزوولەیی پڕ لەکیس داپۆشێت و چەند ڕژێنێك بەسەر لیکە ڕژێنەکانی تردا، و گەر وانەبووایە زمان نەتوانا دەبوو لەچێژ کردنی خواردندا و تەنها دەیتوانی هەست بەلێخشاندنی خواردن بکات، و دەتوانیت لەخۆتدا ئەم کردارە هەست پێبکەیت.

کاتێك تووشی هەڵامەت ببیت و زمانت ووشك بێت هەست بەچێژی خواردن ناکەیت گەر تواوەش بێت، و لەبەر ئەوەی خواردنەکان چێژەکانیان جیاوازە و لەبەیەگەیشتنیاندا هاوەڵیی و دوور کەوتنەوە هەیە، ڕێکەوت ئارەزوویکردووە کە ئەم مەمیلانە بەرادەیەکی کەم جیاوازبن لەچێژ کردن دا و توانای پاراستنی هەندێ چێژ کردنیان بمێنێ تەنانەت پاش نەمانیشیان و هەر بەهۆی ئەمەوەیە چێشتکەرە لێهاتووەکان جۆرەها خواردن تێکەڵاو دەکەن و لەبەر ئەوەی زمان بەگوێرەی جێگاو کارەکانی پێویستە زۆر هەستدار بێت، تاکو پاروەکە بجووڕێت و ئەملاولای پێبکات لەناودەمدا و لەددانی بڕرەوە بیبات بۆ کاکیلەکانی بەشێوەیەك کە بتوانێت بچووکترین بەشی خواردنەکە لەناو هەموو دەم و ددانداا بگوێزێتەوە و بەهۆی هەستیاریە زۆرەکەیەوە خۆی دەپارێزێت لەهەموو زەرەرمەندێك وەك سوتاندن و داخ و تیژ و تێهەڵچێنەررو براینداری، ڕێکەوت وای وویست کە مەمیلەی تایبەتی هەبێت بۆ هەست و لێخشاندن هەروەك باسکرا، و ئەم مەمیلانە دەزولەیی و هەستیارن دەکەونە ئەملاوئەو لاو سەری زمانەوە لەووردی هەستیاریدا تەنها ئەملاو لاکانی پەنجەی گەورە ئەوەندەهەستیارن.

لەبەر ئەوەی زمان ئامێرێکە بۆ جووین و قوتدان بەکاردێت ڕێکەوت وا ئارەزوویکردوە کەماسوولکەکەی زۆر زۆر پتەوبێت، چالاك و ووریاو لیکاوی ڕژینەری لیك و لینجاوی هەبێت، و گەر وانەبووایە نەیدەتوانی کاری جووین و قوتدان بکات... تەنها زمانە کەبتوانێت یاری بەپاروو بکات و بیجوڕێت و بەهۆی لیکەکەیەوە بیکات بەهەویر. گەر جووینەکەی تەواو بوو شیاوی قوتدان بوو ئەوا بەهۆی لینجیەکەوە

لوولیدەدات و پاڵە پەستۆی دەخاتە سەر لەنێوەند هەردوو ڕووتەخت و مەڵاشوویدا و بەتووندییەکەی خۆی پاڵپێوەدەنێت و خل دەبێتەوە تاکو لە کەوانەی مەڵاشوو تێەڕێت، بەم شێوەیە قوتدان لەژێر وویستی کەسە خواردنەکەدا نامێنێت.

لەبەر ئەوەی زمان، ئامێرێکە بۆ هەسکردن ، ڕێکەوت وای ویست و هەرسکردنی خواردنەکان بەگوێرەی ڕەگەزەکانیان لەیەك جیاوازبن ، هەندێکیان لەگەدەدا هەرسدەکرێن، وە تیایاندا هەیە لەریخۆڵکاندا، تەنها شتێك هەیە لەناو ئەم خواردنانەدا کە ئەویش نیشاستەیە لەگەدەدا هەرس ناکرێت، بەڵکو ڕژێنەکانی ناو گەدە دەبنە ڕێگر بۆ هەرسکردن و نەهێشتنی گۆڕینیان، هەربۆیە ڕێکەوت وائارەزووی کردووە کەتەنها ڕێگایەك بۆ گۆڕینی ئەم نیشاستانە بۆ شەکر، بەهۆی لیکەوە بێت، و گەر زمانە لیکاوییە نەبوایە کەلیك تێکەڵ بەپارو دەکات و دەیکاتە هەویر، هەرسکردنی نیشاستە ڕووی نەدەدا، کە گرنگترین خۆراکە.

لەبەر ئەوە زمان ئامێرێکە بۆ قسەکردن وەك دەزانیت ودەنگەکان لەژوورەکانی قوڕگەوە دەینە دەرێ، و لەبەر ئەوەی ژوورەکانی قوڕگ بەتەنها ناتوانن دەنگی هەموو پیتەکان دروستبکەن بەڵکو بەتەنها کاری دروستکردنی دەنگی پیتە بزوێنەکان بەبێ پیتەکانی تر.

هەربۆیە ڕێکەوت وا ئارەزوویکردووە زمان لەگەڵ دوو لێوا دروستبکات تاببنە ئامرازێك بۆ برینی هەواوو دەرکردنی دەنگی پیتە نەبزوێنەکان و گەر وانەبووایە ئەوا ڕاستەی ڕەوانمان بۆ نەدەوترا، بەڵکو وەك ئاژەڵ دەبووین، دەنگمان دەردەکردوو درێژمان دەکردەوە، و تەنها لوورە و باڕاندن یاخود ووژەو ژو قیڕاندن و یان حیلاندن و زەڕاندنمان بۆ دەکرا.

چەند سەرسوڕێنەرن ئەم ڕێکەوتانە کە زۆرو یەك بەدوا یەك و هاوڕێکن و بەیەکگەیشتوون تاکو بتوانن ئەم زمانە سەرسوڕهێنەرە دروستبکەن.

حەیران/ بەڵێ گەورەم ڕاستە زمان ئەندامێکی سەرسوڕهێنەرە بەڵام سەبارەت بەلێو، تەنها یارمەتیدەرن بۆ دروستکردنی هەندێ لەدەنگی پیتەکان.

شێخ/ ڕازی دەبوویت ئەی حەیران گەربەبێ لێو بوویتایە ددانت ڕیچ بووایە لیکی پیابهاتایەتە خوارەوە و بە ئاسانی تەپ و تۆز سەرسنگی بگرتیتایە ، و مێش بە ئارەزووی خۆی بەمەڵاشووتەوە بنوسایە.

ئایا سوپاسی ئەم ڕێکەوتە ناکەیت کەبەجوانترین شێوە مرۆڤی دروستکردوە، و دوو لێوی داوەتێ، دەم و چاوی پێرازاندۆتەوەو دەمی پێداپۆشیووە و کردۆیە بەرگرێك بۆ لیکەکەی و ڕێگر بێت بۆ نەچوونە ژوورەوەی تۆز بۆ ناو سییەکانی و مێش بۆ مەلاشووی تا... هەناسەی بەسوود لە لووتیەوە وەربگرێت وەزەرەر مەندەکان لەقوڕگ و گەروویەوە دووربخاتەوە.... ؟

ئایا سوپاسی ڕێکەوت ناکەیت کە وا ئەم دوولێوەی چەکدار کردوە بەهۆی هێزێکی هەستیارو ناسکەوە تاکو بەرامبەر هەموو زەرەرو داخ و سوتاندنێك بوەستێت، و لەژێر پەردە لینجەکەیانەوە ڕژێنەری لیکی پێداون تاکو بەتەڕی و شێداری بمێننەوە، و بەووردی دەمارەوە بەستوونیەوە تاکوو هەموو جووڵەیەکیان لەکردنەوەو داخستن و پێچانەوەو گرژکردن و خاوکردنەوە بە وویست و هەڵبژاردنی مرۆڤ خۆی بێت، و هەر ساتێك بیەوێت بیکاتەوەو دایخات بەهۆیانەوە هەوا وەردەگرێت و دەیبڕێت و دەنگەکان لای خۆی دەهێڵێتەوە تاکو بتوانێت دەنگی پیتەکانی لێوە دروست بکات.

و گەر ئەم هەموو ڕێکەوتانە نەبوونایە ئەی حەیران ئەم مرۆڤە جوان و قەشەنگ و ڕەوانبێژو پاك و خاوێنە دەگۆڕا بۆ مرۆڤێکی سیما بەدی ددان ڕیچی پیس و پۆخڵ، و لیك دەهاتە خوارێ بەسەردەم و چەناگەو پۆشاکیدا، و مێش ومەگەز لەسەر لیکی کۆمەڵیان دەبەست.

حەیران/ بۆچی شێخی گەورەم هەرناوی ڕێکەوت دەبات وەك گاڵتەم پێبکات وایە؟

شێخ/ ئەی حەیران من گاڵتەت پێناکەم، بەڵام دەمەوێت تۆ بخەمە ناو کۆسپەکان، و خۆشم بگەیەنمە لوتکەکان.

حەیران/ چ کۆسپێك و چ لووتکەیەك؟

شێخ/ کۆسپی گومان کە خودا دەیەوێت ئێمەی پێوە بتلێتەوە بچینە ناخی، و لوتکەی باوەڕداری کە خودا دەیەوێت بەماندویی و گەڕان بەدوایدا بگەین پێی.

حەیران/ لووتکەی باوەڕ هێنان چییە کە تۆی باوەڕدار دەتەوێت پێی بگەیت.

شێخ/ بریتییە لە ڕێنمایی و داواکارییەکانی هەق ئەی حەیران... **﴿أَلَمْ نَجْعَلْ لَهُ عَيْنَيْنِ، وَلِسَاناً وَشَفَتَيْنِ، وَهَدَيْنَاهُ النَّجْدَيْنِ، فَلا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ، فَكُّ رَقَبَةٍ، أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ، يَتِيماً ذَا مَقْرَبَةٍ، أَوْ مِسْكِيناً ذَا مَتْرَبَةٍ، ثُمَّ كَانَ**

مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ وَتَوَاصَوْا بِالْمَرْحَمَةِ﴾البلد:٨-١٧

ئەمەیە لوتکەی باوەڕهێنان

هەر لەبەر ئەمەشە وام لەسەر ڕۆخی قەبر و بە درێژایی شەویش شەو نخوونی دەکەم تاکو بانگهێشتەی لای خودات بکەم ئەی حەیران.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێ/ شێخ مەوزون پاش نوێژی بەیانی چووە ناو باخەکەی، هەروەك پیشەی ڕۆژانی ئاسایی خۆی، بەڵام بۆیەکەم جارە ئەم پیشەیەی بگۆڕێت و پاش ئەوەی لەمزگەوت هاتە دەرەوە پێی ڕاگەیاندم کە خۆم نانی نیوەڕۆی بۆ بەرم و ئەم فەرمانەی زۆر دڵخۆشیکردم، چونکە لەمێژە ئاواتم بوو ڕۆژانێکی لەگەڵدا بەرمە سەر و بینینم ئەو ڕۆژانەی چۆن دەباتە سەر هەر لەکازیوەی بەیانەوە تا سەرەتای شەو.

کاتێك بجێورەکە هاتوو خواردنی شێخی هێنا وە سەرکەوت بۆ سەر منارەکە بۆ بانگدانی نیوەڕۆ وتم ئەمڕۆ کارەکەت من ئەیکەم و خواردنی شێخ وەك ڕۆژانی تر لە پەرژینی باخەکەدا دادەنێم، و لەپاشدا دەچم بۆ گوندی (خەرتەنك) بۆ کارێکی پەلە، سوپاسی کردم وتی: نەکەی هەڵە بکەی لەجێگاداناني خواردنەکە ، وتی: هەر ئەو جێگایە کە یەکەمجار هاتی ، ئایا لەیادت ماوە.

تاوم دایە خواردنەکەی تابیبەم بۆ باخەکە، چوومە ناوە و بۆ شێخ گەڕام، لەو جێگایە نەم دیتەوە کەلام وابوو لەژێر درەختێکدا بێت یاخود لەقەراغی جۆگەکان بێت... دەستمکرد بە بانگردنی تاکو گوێبیستم بێت... و پاش دووبارە کردنەوەی بانگردنەکەم، گوێم لەهیچ وەلامێك نەبوو، موچڕکەیەکی ترسناك بەلەشمدا هات، بە بازدان بەرەو کۆتایی باخەکە چووم تاگەیشتمە زەوییەکی ووشکی بەرفراوان، دەبینم شێخ لە کۆتایی لایەکی زەوییەکەدا دانیشتووە، کە گەیشمە لای بەزەردەخەنەیەکەوە وتی فەرموو لام دانیشە، و کە دانیشتم سوپاسی کردم و داوای لێبوردنی کرد لەبەر ئەوەی بۆتە هۆی ماندوبوونم.

حەیران، زۆر بانگم کردی بەڵام گوێم لەهیچ وەلامێك نەبوو تەنانەت ترس دایگرتم.

شێخ/ گوێبیستی هاوارەکەت بووم وەلامیشم دایەوە بەڵام دەنگی پیاوێکی پیر ناگاتە دەنگی تۆی گەنج ئەی حەیران.

حەیران وتی/ پاش ئەوەی شێخ خواردنی نیوەڕۆی خواردو نوێژی کرد لێم پرسی.
حەیران/ بۆچی شێخی گەورەم ئەم جێگایەی هەڵبژاردووە دوور لەباخ و ئاوەکە.
شێخ/ بەئارەزوی خۆم ئێرەم هەڵنەبژاردووە، بەڵکو لەسەر خواستی یەکێك لە دانیشتوانی گوندەکەم کە وویستی سەبارەت بەزەوی‌یەکەی پرسیارم لێبکات و ڕێنمایی چۆنێتی ئاوەدانکردنەوەی بکەم.
حەیران/ چ کاتێك شێخی گەورەم جوتیارێکی زانا بووە بەکشتوکاڵ و زەوی و ئاوەدانکردنەوە؟
شێخ/ داوای زانیاری لێنەدەکردم، بەڵکو داوای موعجیزەم لێدەکات.
حەیران/ موعجزە... ! داوای چی دەکات؟
شێخ/ خاوەنی ئەم زەویی ووشکە بەرفراوانە دەیەوێت دار و درختی تیادا بڕوێنێت و ئاوی بدات.
حەیران، ئەمە ئاسان ڕواندنی درەخت و ئاودانی کاری موعجزە ی ناوێت.
شێخ/ ئەمە ڕاستە سەبارەت بەڕواندن، بەڵام ئاوەکە دوورە و زەویەکە بەرزە، پێم ڕاگەیاند، تەنها دەتوانێت بۆ هەڵگرتنی ئاوی زستان و بەکارهێنانی بۆ ئاودان ئەستێڵێك دروستبکات.
وتی/ بەڵام ئاوی ئەستێڵەکە تەواو دەبێت، و منیش دەمەوێت بە بەردەوام هەبێت.
وتم/ چۆن؟
وتی/ دەمەوێت ڕێگایەك بدۆزینەوە کە ئاوەکە بگاتە ئامێرێکی جولێنەر کە پاڵ بەئاوەکەوە بنێت بۆ سەر زەویی‌یەکەو ئاوی بدات و پاشان بۆ ئەستێڵەکە بگەڕێتەوە و دووبارە بۆ زەوییەکە و لەپاشدا بۆ ئەستێڵەکە و دووبارە بۆ ئامێرە جوولێنەرەکە و بەم چەشنە هەتا هەتایە ئاوەدان و بەردەوام دەبێ.
وتم/ هەتا هەتایە! بۆ تا... هەتا هەتایە ؟
وتی/ بۆ درێژایی ژیانم کێ ئەزانێت، لەوانەیە سەد ساڵ بژیم.
وتم/ خوا ویستی لەسەر بێت تەمەنت درێژ دەبێت، بەڵام ئەو ئاوەی کە دەتەوێت بگەڕێتەوە، گەر توانرا هەندێکی بگەڕێنیتەوە لەقوڕو گڵەوە دەگەڕێتەوە کە دەبێتە هۆکارێك بۆ پەك کەوتنی ئامێرە بزوێنەرەکە.
وتی/ ناتوانین پاڵێوەر (مصفی) یەکی بۆ دابنێین کەلەو خلتەو خاك و خۆڵە پاکی بکاتەوە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئەستێڵەکە.

وتم/ چی بەرەو پاکەرەوەکەی بەریت؟

وتی/ ئامێرە جوڵێنەرەکە خۆی، ئایا ناتوانێت لەلایەکی ترەوە ئاوەکە ئاوەڕۆ بکات بۆ ئامێری پاکەرەوەکە.

وتم/ گەر بۆ مانکرا دروستکردنی ئەم ئامێرە بەمچەشنەکێ ئاوەکەمان لە ئامێری پاکەوەکەرەوە کە دەگەڕێنێتەوە بۆ ئامێرە جوڵێنەرەکە دووبارە بۆ ئاودانی زەوییەکە.

وتی/ ئامێرە جووڵێنەرەکە بە پاڵە پەستۆیەکی توندەوە بەرەو ئامێرە پاکەرەوەکەی دەنێرێت بەجۆرێك کە لەکونەکانیەوە دووبارە بەرەو ئامێرە جوڵێنەرەکە بگەڕێتەوە.

وتم/ بەڵام ئەم ئاوە هەر کۆتایی دێت چەند ئەستێڵەکە گەورەش بێت.

وتی/ ئایا ڕێگاچارەی تر نی‌یە بۆ بەردەوامی ئەو ئاوە؟

وتم/ چۆن؟

ووتی/ ناتوانین کە ئەستێڵکە ئاوی تیادا نەما ئاوی تری تێبکەین.

وتم/ لەکوێوە ئاوی تری بۆ بێنین؟

وتی/ ناتوانین لە سەرێکی ئەستێڵەکەوە ئامێرێکی جوڵێنەری تر دابنێین و بۆرییەکی درێژی بۆ دروستبکەین تا... ئاوەکەی لێوە بێت لەکون و کەلەبەرو ئاوو گژوگیای زەوییەوە و بەهۆیەوە ئەستێڵەکە پێ پڕبکەین، بەمەش ئاوەکە کۆتایی نایەت؟

وتم/ بەڵێ ئەبێت بەڵام چ ئامێرێك ئەم ئاوی گژوگیاو کە لەبەرەی زەویمان بۆ ئامێری جوڵێنەر ی سەرئەستێڵەکە بگەیەنێت.

وتی/ ناتوانین والەهێزی ئامێری جوڵێنەری یەکەم بکەین ئاو بگەیەنێتە ئامێرە جوڵێنەرەکانی ترو بەردەوامیان بکات.

وتم/ بەڵێ دەتوانین، بەڵام ئایا ئامێری جوڵێنەری یەکەم بەرگەی ئەم هەموو پەلەپەستۆو ماندوو بوونە دەکات.

وتی/ ناتوانین بەشێوەیەکی وا ووردو پتەوو بەهێز دروستی بکەین کە چرکەیك نەوەستێت.

وتم/ بەڵێ، ئەمە ئەشێت لەئامێرێکدا کەبۆ ڕۆژێك یان مانگێك یاخود ساڵێك و یان دوو ساڵ کاربکات بەڵام تۆ دەتەوێت ئامێرێکی وەها بێت کە بەبەردەوامی بۆ ماوەی ١٠٠ ساڵ بجووڵێت و چرکەیەك لەکارنەوەستێت.

وتی/ بۆ ئەمە مەحاڵە؟

وتم/ نەخێر، ئەمە بۆ عەقڵ مەحاڵ نییە، بەڵام ئەم جوڵێنەرە سەرسوڕهێنەرانە، پێویستیان بە ئەندازیارێکی شارەزای بەتوان هەیە، بزانێت چۆن دروستیان دەکات، و چۆن بەیەکیانە و ببەستێت، و هەندێکیان بە هەندێکیان ئاو بدات، و چۆن لە کانزایەك دروستیبکات کە ژەنگ هەڵ نەهێنێت و دووچاری داخوراندن نەبێت، یاخود لە جۆرە گەردیلەیێ دروستی بکات کە خاوەنی عەقڵ و ڕێکخستن بێت تاکو بتوانێت لە جێی گەردیلە داخوراوەکان گەردیلەی تر دروستبکات.

وتی/ وایدەزانی کە گاڵتەی پێدەکەم، و ئایا گەردیلە و کانزا عەقڵ و ڕێخەری هەیە؟

وتم/ لە ئەندازیاری مەزن بپرسە.

وتی: ئایا کارەکە پێویست بە ئەندازیاری مەزن دەکات؟

وتم/ ئایا... وا ئەبینی ئەو هەموو داواکاریانەت و نەخشە دانانەت لەخودی خۆیدا بەبێ ئەندازەو ژمێرەو بیرکردنەوە ڕوودەدات؟

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت: ئالێرەدا شێخ خۆی پێنەگیرا دەستیکرد بە پێکەنین.

حەیران/ گاڵتەم پێدەکەیت، گەورەم.

شێخ/ گاڵتەت پێناکەم ئەی حەیران، بەڵام چیرۆکی (دڵت) بۆ دەگێڕمەوە سەبارەت بەکردارو کاریگەرو مەبەست و پێویستیەکەی، و ڕدە و توانایی دیوارو بەرد وە پەنجەرەو ژوورەکانی و دەرگا و پەردەکانی و ئەشکەوت و چەڵەکانی و جۆگەلەو پێچەکانی و ڕونیو لێڵی و چالاکیو شەوخونیو ئارامیو بەئاگایی و مەزنی و مەترسی زۆری...

حەیران/ ئەمە هەمووی لەم دڵە بچووکەدایە؟

شێخ/ ئەمە هەندێك لەو ڕێکخراوانەیە کەهاوکێشەی وەسفەکەی ماوەمان پێدەدات و لە گێڕانەوەی ڕازاوەکانی خودا وویستی ئەم ئاژەڵە بژی و زیندوو بێت، و ژیان بریتییە لە خۆراك و گەرمی و ئەو خوێنەی تیا دروستکردین کە خۆراك و گەرمی لە ش هەڵدەگرێت بەڵام ئەم خوێنە پێویستی بە بەردەوامی خۆراك هەیە، لەبەر ئەوە گەدە و جگەرو ڕێخۆڵەی بۆ دروستکردین و لەخۆراکماندا ڕەگەزی کاربۆنی تیادا جێگر کردووە کە خۆراك و گەرمی لە ئەنجامی سوتاندنی بەیەککگرتنی لەگەڵ ئۆکسجیندا، بەڵام ئەم سوتاندنە لەناو لەشدا ژەهر دروستدەکات کە ئەویش دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە لەبەر ئەوە پێویستە خۆمانی لێ ڕزگار بکەین لەگەڵ ئەو هەموو ژەهرانەدا، چۆن خۆمان لەم ژەهرانە ڕزگار بکەین؟

خـــودای دانـــا ویســـتوویەتی لەلـــەشماندا دوو پاڵـــێوەنەری مـــەزن دابنێـــت، بـــەڵکو دووســـوتێنەری گـــەورە، دووســـی بـــۆ دروســـتکردووین پـــڕی دەکـــەین لەهـــەوا بـــەهۆی هەناســـەوەرگرتنەوە تـــاکو بـــەهۆی ئۆکســـجینەکەیەوە خۆراکەکـــەمان بســـوتێنین، واتـــە کاربۆنەکەمان، و هەموو ئەو پاشەڕۆ و ژەهرانەی لەخوێنماندا هەیە، و لەپاشدا ئەم ژەهرە سـوتاوانە بـەهۆی هەناسـەدانەوە فـڕێ دەدەیـنە دەرەوەی لـەشمان بـەڵام گـەر ئـەم خوێـنە بەوەستاوی‌و نەجولاوی لە لەشدا مایەوە ڕێگای نابێت بەرەو پاکەرەوەکان بڕوات تاکو ژەهـرو لاشـەی خانـە مـردووەکانی تـیادا فڕێبدات جگـە لـە پاشـەڕۆ و پیسـیەکانی تـر، و زەحمەت دەبوو لای کە خۆراکی نوێ لە گەنجینەکانی گەدەو ریخۆڵەو جگەر وەرگرێت.

بەڵکو زەحـمەت بـوو لای ئـەم خۆراکـە نوێیانە بلاوبکاتـەوە و بەخێرایـیەکی پێویست دابەشـی بکـات بەسەر هەموو ئەندامەکانی لەشدا، گەر بەوەستاوی لە لەشدا بمێنێتەوە لە ئـەنجامی ئـەم وەستانەی جەسـتە دەمـرد: چـونکە لەلایەکـەوە ناتوانێـت ئـەم خۆراکـە لـە گەنجینـەکەی خـۆی بەئاسـانی وەرگرێـت تەنانـەت گـەر بۆشـی بـبێتە شـیر لـەدیوارەکانی گـەدەو جگـەردابۆی بێتە خوارێ نایگاتێ تەنها چەند دڵۆپێکی کەم نەبێت و لەبەر ئەوەی وەستاو و نەجولاوە پاش چەند ڕۆژێکی زۆر بەسەر لەشدا دابەش دەبێت.

لـە حالی واشدا لەبرسامردن ڕوودەدات و لەبرەئەوەی لە حاڵەتی وەستان و نەجولەدا ناتوانرێـت ژەهـرو پاشـەڕۆکانی بگەیەنێتە پاکـەرەوەکان بـۆ سوتاندنیان و ئەمـەش دەبێتە هـۆی مردنـێکی کـتوپڕ بـەهۆی ژەهـراوی بوونـیەوە، و لەبـەر ئـەوەی دووبـارە ناتوانێـت لەگـەڵ ئـەم وەستانەدا ئۆکسـجینی نـوێ بەپێی خێرایی پێویست وەرگێت لەسی‌یەکانەوە تـاکو خۆراکەکـەی پـێی بسـوتێنێت لـە بابـەتی ئـەو ئۆکسـجینە کۆنـەی کـە بەسـوتاندن گۆڕاوە بۆ ژەهرێکی کوشندە، و لەم کاتەشدا مردن بەهۆی خنکانەوە ڕوودەدات.

کەواتـە پێویستە ئـەم خوێـنە بجولێـت و بـڕوات، و لـە ڕۆیشـتنیدا خێرایـیەکی مـەزنی هەبێـت، و بـەهۆی ئـەم خـێرایی‌یە زۆرەوە بەسـەر گەنجیـنە خۆراکـەکاندا دەڕوات و پێویستیەکانی خۆی لێوەردەگرێت.

بەچـاو تروکاندنـێك دەیگەیەنێـتە هـەموو بـەش و لایەنـەکانی جەسـتە و بـەهۆی ئـەم خێرای‌یە مەزنـەوەی دەگاتـە پاکـەرەوەی ژەهـرو پاشـەڕۆکانی تـاکو فـڕێی بداتـە ناویـان خـێراتر لەچـاو تروکانـێك، و لەسـی‌یەکانەوە سـووتەمەنی تـازە لـە٥٣ ئۆکســجین وەردەگرێـت و دەسـتەکات بـەدووبارە کـردنەوەی کـرداری سـوتاندنی خۆراکەکـەی بەمەش خۆراك و گەرمی بۆ لەش دابین دەکات.

حەیران/ پاك و بێگەردی بۆ دروستکەری مەزن... بەڵام ئەم هەموو خێراییە بۆچی لە ڕۆیشتنی خوێندا، و چۆن بەچاو تروکاندنێك تەواو دەبێت... ؟

شێخ/ بۆچی ئەم هەموو خێراییە... ؟! چونکە سووتاندن هەر بەسروشت خێرایە و ژەهراوی بوونیش خێرا ڕوودەدات.

تاقیبکەرەوە هەناسەت بگرەو چەندە دەتوانی لەپێشدا سیەکانت پڕکە لەهەوا ئەوجا سەرنج بدە، تا چەنێك دەتوانیت، کە هەناسە نەدەیت.

گەر بشتەوێت سیەکانت هێندەی کۆپەلەیەك بێت بۆ ئەوەی ئۆکسجینێکی زۆر بگرێت کەبەشی ئەو بکات خوێن بە هێواشی بڕوات وپاش کاتژمێرێك بگاتەوە سیەکان هەرنابێت.

زانست دەریخستووە کە دڵۆپێك خوێن پێویستی بەنزیکەی (٢٠) چرکە هەیە بۆ دەرچوونی لە دڵەوە و گەڕانی بەسەر هەموو ئەندامەکانی لەشدا و دووبارە گەڕانەوەی بۆ شوێنی دەرچوونی.

واتە بەڕادەی ڕێژەی لێدانی دڵت بەنزیکەی (٢٥) لێدان یاخود بەڕژەی دووپاتکردنەوەی ڕستەی (لااله الا الله) بۆ (١٠) جار.

حەیرانت/ هیچ خواوەندێك نیی‌یە تەنها خودای دروستکەری مەزن نەبێت.

شێخ/ ئەمە لەحاڵەتی حەوانەوە و مام ناوەندیدا، تاقیبکەرەوە و هەناسەیەکی قووڵ وەرگرە: واتە زۆرینەی ئۆکسجین وەربگرە دەبینیت لێدانی دڵت هێواش دەبێت.

تاقیبکرەوە و هەناسەت بگرە بۆ کەم بوونەوەی ئۆکسجین و یان ماوەی هاتنە ژوورەوەی ئۆکسجین زۆر بدە.

تاکو سوتاندن زۆر بێت دەبینیت دڵت زۆر بەخێرایی سەرسوڕهێنەر لێدەدات تاکو ڕێژەی پێویستی خۆی بۆ ئۆکسجین لە خوێن وەرگرێت.

حەیران/ پاکو بێگەردی بۆ دروستکەری مەزنە.

شێخ/ئێستا، ئەی حەیران، بۆت بەدەرکەوت کە خوێن پێویستیەکی زۆری بەخێرایی جوولە هەیە، و بەجوولێنەریش و ئەم جوولێنەرە مەزنە دڵە.

وەتا... ئێرە کردارە کە ساکارە گەر وامان دانا دڵ بریتی‌یە لە پەمپێك پاڵ بەخوێوە دەنێت بۆ ئەندامەکانی لەش دەڕوات و دەگەڕێتەوە بۆلای و دووبارە پەمپی دەداتەوە.

بەڵام کارەکە زۆر لەمە ئاڵۆزترە: پێویستی بەدوو پەمپ ئەبێت یەکێکیان پاڵ بەخوێنەوە دەنێت بەرەو لەش و ئەوی تریان پاڵ بەخوێنەوە دەنێت بەرەو سیەکان تاکو

لەوێدا پاك بینەوە و بەرەو دڵ بە پاکو بێگەردی و بەهێزو بەچالاکی و بەئامادەکراو بە سوتێنەری پێویست، و تەنها پەمپێك بەشی ناکات بۆ پاڵپێوەنانی خوێن بەرەو ئەندامەکانی لەش.

گەیاندنی بۆ سیەکان و پاش گەڕانەوەی بۆ دڵ چونکە کاتێك کە خوێن لەپەمپ دانی یەکەمەوە دەردەچێت لە شاخوێنبەری گەورەدا کەبە (ئاورت) ناو دەبرێت، دابەش دەبێت بۆ چەندەها لق پاشان بەهۆی هێزی پەمپدانی یەکەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ دەمارە خوێنهێنەرەکان، و لەوانەوە لەگەورە دەمارە بۆشایی خوارەوەدا و لەگەورە دەمارە بۆشایی سەرەوەدا کۆ دەبنەوە بەم هاتوو چۆ درێژەو تێکەڵ بوونە هێزی پاڵپێوەنانی پەمپدانی یەکەم کەم دەبێتەوە، ئیتر ناتوامێت دووبارە بگاتەوە سیەکان و لەوێشەوە بگەڕێتەوە بۆ دڵ، کەواتە پێویستی بە پەمپی دووەم هەیە، بەرەو سیەکان پاڵی پێوە بنێت، تاکو لەوێدا پاك ببنەوە و بەرەو دڵ بگەڕێتەوە، وەك دەبینین بەهۆی ئەم کردارەوە وەك پێم وتی: پێویستی بەدوو پەمپی هەیە چارە چی‌یە؟ ئایا دروستکەر دوو پەمپی دوور و جیا لەیەکتر دروستدەکات؟ ئەمە ئاسانە بۆی، بەڵام ئاشکرایی دانایەکەي و مەزنی توانایەکەی، هەردوو پەمپەکەی لەیەك دڵدا دروسکردووە، و هەردووکیان لەیەك کاتدا کاردەکەن لەبەر چەندەها دانایی زۆر: یەکەمیان خۆمان بەدووردەخەین لەو مەترسیەی کەلەوانەیە ڕووبدات، کە ئەویش نەخۆشیو هەرس نەکردنیان دڵە ڕاوکێ و دەمارگیریی‌یە لە پچڕاندنی یەکێك لەپەمپەکان کەدەبێتە هۆی تێکچوونێکی کوشندە لە ڕۆشتنی خوێنەکەو سوتاندنی و دووەم دانایی یەك پەمپ لە بۆشایی سکدا سوك و ئاسانترو جێگا کەمتر دەگرێت و دانایی سێهەمی کە خودای بەتوانا هەموو شتێك بە جوانی و ڕێکی دروستدەکات.

یەك پەمپی لە دروستکراوەکاندا زۆر سەرسوڕهێنەرترە و گونجاندنو شیاوی تیا سەیر ترە، و بەبەڵگە ترە لەسەر توانایی خودا، و ئەمەیە نهێنی داهێنان کە عەقڵی سەرسام کردوە، گەردروستکەر ویستی هەردوو پەمپەکە لەیەك دڵدا دابنێت و لەکاتی پەمپدانیو پڕکرندا یەکبگرن و خوێنی ئاڵی بێگەردتێکەڵ بەخوێنی ڕەشی پیس نەبێت، چار چی‌یە بۆ ئەمە خودا دڵی کردۆتەوە دووبەشەوە، یەکێکیان لەلای ڕاست ئەوی تریان لەلای چەپ و دیوارێکی بێ کون و دەرکەی خستۆتەو نێوەندیان و گەر بۆ هەریەکێك لەو پەمپانە تەنها ژورێك هەبوایە کتوپڕ دەبووە هۆی وەستانی پەمپەکە وەیان دەرچوونی خۆێنەکە لەدەمی پەمپەکە دەوەستا.

حەیران/ تێنە گەیشتم ئەی گەورەم.

شێخ/ دڵ لەهەر چرکەیەکدا نزیکەی (٢٠) سانتیمەتر لە خوێن دەهاوێژێت واتە بەخێراییەکی زۆرو بێ وەستان پەمپی دەدات گەر ژوورەکە جێی یەك پەمپی بووایە و گەر ژوورەکەی بگوشێت بۆ پەمپدانی خوێن بەم گوشینە ڕۆشتنی خوێنی پاك بۆ سیەکان دەوەستێت و بەهۆی ئەم گوشینەوە خوێنەکە بەرەو دواوە بۆ لای خویان دەگەڕایەوە و هەروەها ئەو پەمپەش کە خوێنی پیس بەرەو سیەکان دەبات بەبجۆرە و دەگوشرێن و هاتنی خوێنی پیس دەوەستێت لە خوێنهێنەرەکانی هەردوو ژوورەکە بۆ دڵ و خوێنەکە تیایاندا دەگەڕانەوە ئەو کاتە چار چی‌یە؟

دەبێت لەدڵی چەپدا خوێنە ئاڵە بێگەرەکە خاوەنی دوو ژوور بێت یەکێکیان لەسەرەوە ئەوی تریان لەخوارەوە، دەبێت لە دڵی ڕاستدا خوێنە ڕەشە پیسەکە خاوەنی دوو ژوور بێت ژووری سەرەوەی لای چەپ کەبە (گوێچکەلەی چەپ) ناودەبرێت پێشوازی دەکات لە خوێنی ڕەشی پیسی هاتوو لەدوو خوێنهێنەرەکانەوە، و لەوێوە دەکرێنە ژووری خوارەو کە بە (سکۆڵەی ڕاست) ناو دەبرێت، و ئەمیش لەلای خۆیەوە دەیگوشێت و پاڵی پێوە دەنێت بەرو سیەکانی تاکو پاك بکرێنەوە پاشان بەهۆی هێزی نوێی هەردوو سیی‌کانەوە بەپاکی‌و بێگەردی بەرەو (گوێچکەلەی چەپ) دەچن و پاشان بەرەو (سکۆڵەی چەپ)و لە وێشەوە بەرەو شاخوێنبەر دەچن... هەربەم چەشنە دەبێت... تا مرۆڤ لەژیاندا بێت...

گەر ئەو شوێنی هاتنە ژوورەوەی نێوان گەوێچکەلەو سکۆڵە هەمیشە کراوە بوایە کارەکە تێکدەچوو، چونکە ئەو گوشینە کەماسولکەکانی دڵ پێی هەڵدەسێت بەهێزێکی ئەوەندە پتەو کە بتوانێت خوێنەهاتووەکانی هەردووسی و خوێنهێنەرەکان بەرەو دوا بگێڕێتەوە و ئێمە ویستمان دوو ژووربن بۆ پاراستنی ئەم پاڵە پەستۆیانەی کەلەنێوان خوێنی هاوڕێژراو خوێنی گەڕاوەدا هەیە بۆ ئەمە کار چی‌یە؟

پێویستە لەنێوان ئەم دوو ژوورەدا دەرکەیەکی داخراو هەبێت تاکو نەهێڵێت لەکاتی کرداری گوشین و هاویشتندا خوێنەکەی بگەڕێتەوە بەهۆی بوونی ئەو دەرگایەوە، گوێچکەلەی چەپ دەتوانێت بەبێ هیچ ڕێگرو نەهیشتنێك پێشوازی لە خوێنی هەردوو سیەکان بکات، و سکۆڵەی چەپیش دەتوانێت خوێنەکە بگوشێت و بیهاوێتە شاخوێنبەرەوە بەبێ هیچ بێزارکردنێکی دراو سێکەی کە گوێچکەلەی چەپە.

بەڵام دبێت ئەم دەرکەیە هەمیشە داخراو بێت؟ ئەمە لای عەقڵ شیاو نی‌یە لەکوێوە خوێنی ئاڵی تازە بچێتە سکۆڵەی چەپەوە، خوێنی ڕەشیش بچێتە سکۆڵەی ڕاستەوە. ئارەزوی دروستکەری مەزن وا بوو ئەم دوو دەرگایە بەشێوەی دوو ماسولکەیی دەماراویی بەیەکدا چووین کە بتوانن لەخۆیاندا بکرێنەوەو داخرێن چرکە لەدوای چرکە بەبێ وەستان بەڵام دوو صەمام بۆ دوو دەرگا لە دوو دڵی جیاکراوە لەیەکتر بەهۆی دیوارێکەوە، ئایا پێویست دەکات کردنەوەو داخستینان پێکەوە بێت لەیەك کاتدا؟

ئەوانە دوو دڵی سەربەخۆن، ئایا ئەتوانرێت کردنەوەو داخستن لە دوو لێدانی جیاوازدا بێت؟

نەخێر هەرگیز نابێت، چونکە لە ڕاستیدا یەك دڵ هەیە، بەگوێرەی جولەو گرژ بوون و گووشین و پەمپدانی، و ئەگەر لەبەشەکانیشیاندا دوو دڵ بن.

گەر دڵ هەمووی گوشرا چی ڕوودەدات لە کاتێکدا داخەری دڵی لای ڕاست داخراو بێت کە خوێنی ڕەشی لێوە دەردەچێت بۆ هەردوو شادەماری سی‌یەکان... ؟ ئەمەش دڵ دەتەقێنێ و دەیدڕێ.

کەواتە دەبێت هەردوو داخەرەکە بەیەکەوە بکرێتەوە تاکو ئاسان بێت هاتنە ژوورەوەی خوێن بۆ هەردوو گوێچکەلە، و بەیەکیشەوە داخرێت تاکو هەردوو سکۆڵە بەیەکەوە پاڵ بەخوێنەوە بنێن بۆ دەرەوە هەر بەجۆرەیە لەشوێنی هاتنە دەرەوەی خوێنی ئاڵ لەسکۆڵەی چەپەوە بۆ شاخوێنبەر و لەشوێنی هاتنە دەرەوەی خوێنی ڕەش لە سکۆڵەی ڕاستەوە بۆ دەمارە خوێنبەرەکانی سیەکان.

دو دووبارە پێویستە لەشوێنی هاتنەدەرەوەی ئەم دوو خوێنەدا کەدا داخەرێك هەبێت بۆ هەریەکەیان تاکو خوێن لەشاخوێنەبەرو دەمارەخوێنبەرەکانی (سی) یەوە ئەگەڕێتەوە بۆ دواوە و پێویستە ئەم دوو داخەرە بەیەکەوە داخرێت و بەیەکەوە بکرێنەوە.

وەك ئەو دوو داخەرەی کەلەگەرودا هەن...

ئالێرەدا هاتینە کۆتایی فەرمانی کرداری پەمپدانی (هاویشتنی) خوێن و وەرگرتنەوەی سەبارەت بەهەردوو جۆرەکەی ئاڵ و ڕەش تەنها ئەوەمان لەسەرماوە کە بزانین چۆن خوێن دەگاتە هەموو بەشەکانی لەش، و لە لەشدا پەلی بەرز هەیە وەك سەرو هەردوو قۆڵ، و پەلەکانی خوارەوە، وەك هەردوو قاچ سلك لەناو بۆشایی لەشدا هەیە، چۆن بەهۆی یەك شاخوێنبەرەوە خوێن دەگاتە ئەم سێ بەشە؟ ئایا وای لێبکەین کەلە سەرەتادا سەر بڕوات و لە پاشدا بۆ ناو بەشەکانی سلك و ئینجا بۆ هەدووو قاچەکان، ئەو کاتە ئەو

خوێنەی کەدەگاتە ناوەوەی سك و هەردوو چاچ بریتی‌یە لە خوێنی پیس و ژەهراوی، چونکە خوێن لەسەردا بە بەشکراوی دەڕوات و لەهەردوو قۆڵیشدا دووبارە بە دابەشکراوی دەڕوات.

لەسەرو قۆڵدا خوێن دەگاتە هەموو کون و کە لەبەرو خانەیەك بەهۆی چەندەها دەمارەوە کە تا ئێستاش دابەشکردن و ووردبونی لەخۆ گرتووە، تاکو دەبێتە (تاڵە موولوولەی ووردی خوێن) و لەبەر زۆر ووردیەکەی واناو دەبرێت، و پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شاخوێنبەر تا... جارێکی تر کۆ ببێتەوە تیایدا تاکو لەوێوە بگاتە ناوەوەی سك کەلوێشدا دووبارە بەش دەبێت بۆ بەش و دەمارو تاڵە دەمار؟ و چۆن جارێکی تر دەگەڕێتەوە و لە شاخوێنبەردا کۆدەبێتەوە بۆ ئەوەی بنێررێت بۆ هەردوو قاچ... ؟ ئەو کاتە چەند پیسی و ژەهرێ لەخۆی دەگرێت؟ کەواتە، دەبێت وای لێبکرێت کەبەشی گەورە لە شاخوێنبەرەوە جیا ببێتەوە یەکێك لەو بەشە گەورانەی بەرەو سەرو هەردوو قولْ بڕوات، و بەشی گەورەی تریش بەرەو ناوسك بڕوات وبەشی گەورەی سێەمیش بەرەو هەردوو قاچ بڕوات و ئالێرەدا توانیمان خۆراکو گەرمی پێویست بۆ لەش دابین بکەین بەیەکسانی، و ئەوەی ماوەتەوە کە چۆن پاکژی‌و پالاوتن، ئۆکسجینی تازەی هەمیشەیی بۆ دابین بکرێت، لە ڕێگای سیەکانەوە و چۆن خوێن بگەڕێتەوە بگەیەنرێتە سی‌یەکان؟

دروستکەری داناو بێگەرد بۆ ئەم گەڕانەوەیە دەماری تایبەتی ساز کردوە کەپێی دەوترێت خوێنهێنەرەکان، کە خوێنی ڕەشیش لەسەرەوە دەچێتە بۆ شایی خوێنهێنەری خوارو، و ئەم دوو خوێنهێنەرە ڕێڕەوی خۆیان دەگرن تا دەگەنە (گوێچکەلەی ڕاست) و لە پاشدا بۆ (سکۆڵەی ڕاست) و لەوێشەوە خوێن بەرەو سیەکان دەچێت دەسوتێنرێت و لەپیسی و ژەهرو پاشەڕۆ ڕزگاری دەبێت، و ئۆکسجینی نوێ وەردەگرێت، و بەخوێنی ئالی گەشی پڕ لەوزە دەچنە ناو هەردوو خوێنهێنەری سی‌یەکان و بەرەو دلْ ڕێدەکەن تا... لەوێ دەڕژێن، لەکاتی کردنەوەی دلدا لەهەموو چرکەو پەمپدانێکدا لەگوێچکەلەی چەپ تاکو بچێتە سکۆڵەی چەپەوە و لەوێوە دەیهاوێژێتە شاخوێنبەرەوە و بەم چەشنە...

حەیران/ پاك و بێگەردی بۆ دروستکەری مەزن... چەن بێگەردە.

شێخ/ لەلای تۆ وایە ئەم شتە سەرسوڕهێنەرە نامۆیانە لەم ڕیژەی دەمارو خوێنبەرو خوێنهێنەرانەدا کۆتاییان دێت؟

نەخێر ئەی حەیران، بەڵکو خوێنبەرو خوێنهێنەری تر هەیە لە دڵدا،

حەیران/ چۆن؟

شێخ/ ئایا دڵ مافی ئەوەی نییە کە خۆراك بەهەموو لەش دەدات، خۆیشی خۆراك وەربگرێت.

حەیران/ بەڵێ لەو خوێنەی کە تیایەتی خۆراك وەردەگرێت.

شێخ/ بەڵام دڵ وەکو هەموو ئەندامەکانی تری لەش کەلەهەموو ئەندامەکانی تر مەزنترە، جۆرەها دەمارو موولوولەی ووردی تێدایە کە دەگاتە قوڵترین خانە لە پێکهاتەکەیدا، کە خۆراکی دەداتیو پیسی ژەهرو پاشەڕۆ دەگەڕێنێتەوە و دەبێت ئەم خوێنە پیسە ژەهراویە هەمان ڕێگای پێشوو بگرێت، بەخوێن هێنەرەی تایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ دڵەکە دەڕژێتە گوێچکەلەی ڕاستەوە لە سکۆڵەی ڕاست بۆ پاڵاوتن بنێررێت و هەر بەمجۆرە خودای دروستکەری کاربەجێ خوێن دەگێڕێتەوە بۆ دڵ خۆی ، دوو خوێنبەری کە پێیان دەوترێت (دوو شاخوێنبەر) کە لە شاخوێنەبەری گەورە جیادەبنەوە لە شوێنی دەرچوونی خوێن لە دڵدا، واتە لەو کاتەی کە خوێن بەووزەترین و بەپاکترین شێوەیە، چۆن، نەء کە دڵ خۆی خوێن دەبەخشێت بەهەموو بەشەکانی لەش کە خۆی بەمافترین و بە پێویستی ترین ئەندامە بۆ خوێن بە خۆراك و ڕێژەو پاکیو بەووزەییەکەی بەتەنها پێنج یەکی خوێنی لەش وەردەگرێت، لەگەڵ ئەوەی کەقەبارەکەشی ئەگاتە یەك لەسەدی قەبارەی لەش و زیاتر ئۆکسجینی لەخۆ گرتووە، و ئەندامەکانی تری لەش لە چواریەکی ئۆکسجین زیاتر نابن کەلە خوێندا هەیە، و هەر بۆیە خودای دروستکەر بۆ ئەم دڵە خوێنەبەرو خوێنهێنەری تایبەتی دروستکردوە ئەمەیە دڵ ئەی حەیران... ئەمە یە دڵ لە کردار و چالاکیەکەی دا، لەمەبەست و پێویستی و ڕادەو ڕێژەی، و دیوارو لێواری، و پەنجەرەو ژوورەکانی و دەرگەو پەردەکانی، و ئەشکەوت و چاڵەکانی، و جۆگەو گۆلاوەکانی، و بێگەردی و لێلیەکانی، و نەریت و شەونخونی، و ئارامی و بەئاگایی و مەزنی و مەترسیەکەی.

ئەمە ئەو دڵە هەژارەیە کە ٧٠ ساڵ یان ٩٠ ساڵ لێدەدات بەشەوو بەڕۆژ کە چاو تروکاندنێك ناوەستێت... ئەی حەیران...

هەموو ئەندامانی لەش بەئارەزووی خۆت دەتوانیت زۆر بیحەوێنیەتەوە یان کەمێك تەنها ئەم دڵە هەژارە نەبێت کە هەمیشە شەونخونیت دەکات بە درێژایی تەمەنت، نەوەنەوز دەدات نەخەو دایدەگرێت نەلەیادی دەچێت و نەهەڵەدەکات، نەهەڵدەتووتیو

نەئەشکەوێت نەدا دەمرکێت و نەدەکوژێتەوە نەبێزار دەبێت و نەگلەیی دەکات و تۆش ستەمکاریت ئازاری دەدەیت و بەغەم و پەژارە تووشی دەکەیت، و بەرق و کینەکانت داخی دەکەیت و بە ئەوینت خۆشحالی دەکەیت و بەفرمێسکت دەیگرێنیت و بە غەمت دایدەرزێنیت... و ئەو لێبوردن و لێخۆشبوونە چالاك و بەئارامە ، بەفەرمانی ئەوەی کە باشترین شێوە دروستیکردوە، و کەرەسەو پێویستیەکانی بۆ ئامادە کردوە پشکووی تێدا داگیرساندوە، وەرادەو ماوەی بۆ داناوە گەرماوەکەی تەواو بوو و لەکارەکەی کەوت، لەقەفەزەکەی خۆیدا هێمن دەبێتەوە لەغەم و پەژارە ئاسودە دەبێت.

(هاوار بۆ ئەو کەسانەی کە دڵیان بەرامبەر ناو هێنانی خودا رەقە).

ئەی حەیران ﴿فَوَيْلٌ لِلْقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمْ مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ﴾الزمر:٢٢

ئەی ئەم ژیانە ئەی حەیران تۆن چووزانیت ئەم ژیانە چی‌یە خودا دروستیکردوە لە سەنگێکی مردوی کەڕی رەقۆتەق، و لە پاشدا بۆتە زیندوویەکی تێکۆشەرو دەرککەرو بەئاگاو توورەو ڕەزامەند، سوپاسکەرو گلەیکەر، پێدەکەنێ و دەگری... خۆزگە بمزانیایە بەشی ڕێکەوت چەندە لە دروستکردنی لە خاك و لەئاو ئەی حەیران؟

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلا يُؤْمِنُونَ﴾الانبياء: ٣٠.

﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِنْ مَاءٍ﴾النور: ٤٥.

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنْتُمْ بَشَرٌ تَنْتَشِرُونَ﴾الروم: ٢٠

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ طِينٍ ثُمَّ قَضَى أَجَلاً وَأَجَلٌ مُسَمًّى عِنْدَهُ ثُمَّ أَنْتُمْ تَمْتَرُونَ﴾الأنعام: ٢.

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ وَإِنْ يَسْلُبْهُمُ الذُّبَابُ شَيْئاً لا يَسْتَنْقِذُوهُ مِنْهُ ضَعُفَ الطَّالِبُ وَالْمَطْلُوبُ، مَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾الحج: ٧٣-٧٤.

﴿فَاسْتَفْتِهِمْ أَهُمْ أَشَدُّ خَلْقاً أَمْ مَنْ خَلَقْنَا إِنَّا خَلَقْنَاهُمْ مِنْ طِينٍ لازِبٍ، بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ، وَإِذَا ذُكِّرُوا لا يَذْكُرُونَ، وَإِذَا رَأَوْا آيَةً يَسْتَسْخِرُونَ﴾الصافات: ١١-١٤.

ئەمەش هەندێ لە فەرموودەکانی قورئانن سەبارەت بە دروستکردنی ژیان لە (قوڕێکی لینج) زانست هەمان بۆ چوونی هەیە.

کەواتە ئەو ژیانە چی یە کە زانایان و قورئان ڕێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە پێکهاتەیە لە (ئاوو لە قوڕ) و لە ڕۆخی شاراوەی نهێنی‌یە کانیدا دەستەوستانن و ئەو زانایانەی کە شتی زۆریان زانیوە لە بەش و سەرچاوەکەی و ڕەگەزو سروشتی‌یەکەی و ڕێکخستن و سیستمەکانی و زانیان هەموو زیندەوەرێك لە خانە پێکدێت و یەك خانە لەتنۆکی یەکەم

پێکدێت (پرۆتۆپلازما) و زانیان ئەم تنۆکی یەکەمە پێکهاتووە لە کاربۆن و ئۆکسجین و هایدرۆجین و نایترۆجین... و تاقیانکردەوە کە لە شتێکدا ژیان دروست بکەن و لە پاشدا دانیان نا بە نەتوانایانیاندا، و لەگەڵ قورئاندا رێکەوتن تەنانەت دروستکردنی مێشك مەحاڵە.

ئایا نایەتەوە یادت ئەی حەیران وتەکەی (بوخنەر) (خودی خرۆکە لە ساکاریشدا خاوەنی بنەماو پێکهاتەیەکە، کەناشێت لەبێ گیانەوە دروستبوو بێت: بەڵکو دروستبوونی لە بێ گیانەوە بەرای زانست بە موعجیزە دادەنرێت وەك چۆن عەقڵ باوەرناکات گیانلەبەرە گەشەدارەکان راستەوخۆ لە بێ گیانەوە دروستبووبن)

حەیران/ چۆن نایەتەوە یادم.

شێخ/ وتەی (تۆماس ئەکویناس) ت نایەتەوە یاد کە دەڵێت (هیچ زانایەك نی‌یە لە زاناکانی سروشت هەموو شتێك سەبارەت بە سروشتی مێشك بزانێت)

حەیران/ چۆن نایەتەوە یادم.

شێخ/ بەلام ئەم قورئانەی کە دەفەرموێت بەخەڵکی **﴿يَـا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ لَنْ يَخْلُقُوا ذُبَاباً وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ﴾**الحج:٧٣ کە پێش هەموویان کەوتووە ئەی حەیران...

حەیران/ گەورەم وایان دەبینیت کە لە قورئانیان وەرگرتبێت؟

شێخ/ عەقڵە ساغەکان لە رەوا و حەقیقەتەکاندا بەیەك دەگەن ئەی حەیران، و چەند زانست زیاتر بێت، گەیشتن بە حەقیقەتەکان ئاسانترو نزیکتر دەبێت.

هەر لەبەر ئەمەیە کە دەبینین زاناکان پاش نوشستە ماددیەکان کە هەندێکیان دووچاری بوون لە کۆتاییەکانی سەدەدەی نۆزدەهەم دەگەرێنەوە بەرەو گەیشتن بە حەقیقەت، و نزیکە هەموو یەکبن بە زمانحاڵی گەورەکەیان لە سەر ئەوەی کە ئەم سیستم و یاسایانە کە لە سەر بنەمایان ژیان دروستبوو، گەشەی کردووە و، یەکێتی لە خۆ گرتووە بۆ مەبەست و وویست و بایەخدان و دانایی کەمەحاڵ دەبێت لەلای عەقلێکی ساغی خاوەن بیر باوەر بەوە بکات کە ئەم ژیانە بەهۆی رێکەوتی کوێرانەوە پەیدا بوو بێت، زانای گەورەی ئینگلیزی (لورد کلڤن) ئەم باوەرە لەناو خەڵکدا بلاودەکاتەوە و گاڵتەی بەوانە دێت کە دەڵێن دروستبونی ئەم ژیانە لە رێکەوتەوەیە و، سەری سورماوە لە هەندێ لەو زانایانەی کە چاو دەپۆش لە بوونی دیاردەکانی دانایی و سیستم بەهۆی بەڵگەی تەواو برەرەوە لە سەر بوونی خوداو تەنهاییەکەی کاتێك دەڵێت (رەحمەتە بۆ مرۆڤ ئەندێشەی سەرەتایی ژیان و بەردەوامیەکەی بکات، بە بێ بوونی هێزێکی

دروستکەری سەرپەرشتیاری بالادەست، و لەناخی دەروونمەوە سەرم سوڕدەمێنێ لە هەندێ زانایان هەبن لە توژینەوە فەلسەفیە کانیاندا لەسەر ئاژەڵ لەو زایانایانەی کە توێژینەوەی پڕ لە فەلسەفەو حیکمەتیاندا چاو دەنوقێنن سەبارەت بە سیستەمەکانی ئەم گەردوونە. لە بەڵگەی بڕەرو ئەو شتانەی کەهەمانەو لەچوار دەورماندایە بەهۆی بەڵگەی بەهێزو بڕەوە سەبارەت بوونی سیستمێکی دانراوی هەڵبژێراو، و ئەم بەڵگانە بەهۆی سروشتەوە ئاماژەی دیاردەکانی ویستێکی ئازادە و فێرمان دەکات کە هەموو شتێکی زیندوو ، ئیعتیماد دەکا لە سەر یەك دروستکەری هەمیشەیی فەرموو ئەوە ئەنیشتاینی مەزنە کەلە دوای کلفنەوە دێت و دەڵێت (ناوەرۆکی هەستی ئاینی لە ناخدا ئەوەیە کە بزانین ئەو کەسەی کە ڕێگا چارەی پێ نی‌یە بۆ زانینی حەقیقەتەکەی لەگەڵ ئەوەشدا بوونی هەیە و بە بەرزترین نیشانەو بە پرشنگترین روناکی جوانی‌یەوە ئەو زاتەمان بۆ بەدەردەکەوێت... و من ناتوانم ئەندێشەی زانایەك بکەم کە ئەتوانێت دەرکی جیهانی بوون بکات کە پابەندی ئەو دانایییەیە کەوای لێدەکات لە لای عەقڵ ئاشکراو زانراو بێت و زانست بەبێ باوەڕ ڕەوتێکی شەلی دەبێت و باوەڕیش بەبێ زانست وەك کوێر دەست دەکوتێ).

ئایا لەم بەیەك گەیشتنە باشترت دەوێ ئەی حەیران لە نێوەند عەقڵە مەزنەکان و زانا مەزنەکان و لە نێوان ئەو قورئانەی کە دەفەموێت:-

﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾فاطر:٢٨؟

حەیران/ ڕاستە ئەوانەی لە خودا دەترسن زانایانن.

شێخ/ ئەم مرۆڤە ئەی حەیران کە دەربارەی ئەو، خودا دەفەرموێت بە باشترین شێوە دروستمانکردووە، بەشی ڕێکەوت چەندە لە دروستکردن و ڕێکی و جوانیدا، و چاودێری و ڕێز پێدانی و عەقڵ پێدان و فێرکردنی... ؟

﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْأِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾التين:٤

﴿يَا أَيُّهَا الْأِنْسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ، الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ﴾الانفطار/٦-٧

﴿الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ وَبَدَأَ خَلْقَ الْأِنْسَانِ مِنْ طِينٍ﴾ السجدة:٧.

﴿أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً﴾الكهف:٣٧.

﴿هُـوَ الَّـذِي خَلَقَكُـمْ مِـنْ طِـينٍ ثُمَّ قَضَى أَجَلاً وَأَجَلٌ مُسَمّىً عِنْدَهُ ثُمَّ أَنْتُمْ تَمْتَرُونَ﴾الأنعام:٢.

﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُمْ مِنْ طِينٍ لازِبٍ﴾الصافات:١١.

﴿هَـلْ أَتَى عَلَى الْأِنْسَانِ حِينٌ مِنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُنْ شَيْئاً مَذْكُوراً، إِنَّا خَلَقْنَا الْأِنْسَانَ مِنْ نُطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾الانسان/١-٢.

﴿اقْـرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الْأِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ، الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ، عَلَّمَ الْأِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾العلق/١-٥.

(وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا )(البقرة: من الآية٣١))إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِنْ طِينٍ (٧١) فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ) (صّ:٧٢).

ئەمە هەندێکە لەو فەرموودانەی قورئان ئاماژەی بۆ کردووە کە مرۆڤی دروستکردووە لەئاوو لە خاك بۆ کاتێکی دیاریکراو لە لای خۆی، دوای ئەوەی کە هیچ جۆرە بوونێکی نەبووە لە سەر زەوی کە نزیکە لە وتەکانی زانست سەبارەت بەدروستبوونی مرۆڤ لە خاك و لە ئاو لە تنۆکی یەکەم، لە چەند ماوەیەکی دیاریکراوی گەشە پێکردندا دوای ئەوەی کەهیچ دیاردەیەکی نەبووە لە چینەکانی ژێر زەویدا، ئایا بەشی ڕێکەوت چەندە لە دروستکردنی ئەم مرۆڤە دا ئەی حەیران ؟!!

ئەم مرۆڤە سەرسوڕهێنەرە کە ژیانی دەست پێدەکات لە خاك و ئاوو تنۆکێك، هەروەکو هەموو ئاژەڵێکی بێ زمان وایە، لە پاشدا دەبێە فەیلەسوف (هەمو ناوەکان فێر دەبێت) و عەقڵی فراوان دەبێت بۆ دەرك کردنی هەموو شتێکی ئەم گەردوونە لە بوون و ماددەو سیستم و ڕەواو چاکەو جوانی و لەمانەوە زانست واتە هونەرو ئەدەب و هۆنراوە و ستران و دانایی و فەلسەفەو تەصەوف دا ئەڕێژێت و لەسەر ڕۆشنایی ئەمانەوە حەقیقەتی بوونی خودا کەلەناویدا هەیە تیایدا دەرك دەکرێ بێ ئەوەی بزانێت.

ئایا دروستکردنی ئەم مرۆڤە بەم شێوەیە دیاردەیەکە لە دیاردەکانی ڕێکەوت ئەی حەیران؟ ئەم مرۆڤە چی‌یە و چ لەسەر سوڕهێنەرەکانی بهێنمەوە یادت؟

چۆن لەو سێ تاریکیەدا دروست دەبێت چۆن لە سکی دایکیدا گەشە دەکات لە تنۆکێکەوە بۆ گۆشتێکی هەڵواسراو پاشان بۆ گۆشتێکی جوراو و لە کۆتایدا بۆ مرۆڤێکی تەواو، دروستکردن لەدوای دروستکردن... !

چۆن لەسکی دایکیدا بەورێگا سەرسورهێنەرە خۆراك دەدرێت چۆن هەناسەئەدا..... چۆن شیر ئەخوا.... چۆن خواردن دەخوا.... چۆن دەیجووێت.... چۆن قوتی دەدات... چۆن هەرسی دەکات... چۆن خۆراکەکانی دەمژێت.... چۆن لەشی گەرم دەکاتەوە.... چۆن بۆ شاییەکانی پاکدەکاتەوە چۆن پاشە ڕۆکەکانی فڕێ دەدات... چۆن دەیگۆڕێتەوە بەووزەیەکی نوێی تر؟ چۆن پاڵ بەخوێنەوە دەنێت لە جۆگەکانی جەستەیدا تاکو هەموو کێڵگە فراوانەکانی پێ تەڕبکات بەهۆی ئەو پاڵپێوە نەرە سەر سوڕهێنەرەی کە خاوەنی چەندەها ژووری بەشکراوو داخەرە فەرماندەرەکاندا کە کاردەکات بەدرێژایی چەرخێکی تەواو لە سوڕی خوێنی بەردەوامدا کە دەڕوات بە جۆگەلەی خوێنە ئالەکاندا بە خوێنی پاك و پاڵێورا و تا... ئەو پەڕی پەلەکانی جەستەیی و بە جۆگەلەی شین دەگەڕێتەوە کە پڕە لە پاشەڕۆك وپەککەوتەکان و خانە مردووەکان دەگەڕێتەوە بۆ پاڵێوگەکان بەڵکو بۆ سوتێنەرێکی مەزن کە پاکژو پاکسازیان دەکات و وزەی تازەیان لێباردەکات، تاکو بگەڕێتەوە بۆ پاڵپێوەنەرەکە تاکو جارێکی تر پاڵی پێوە بنێت بەرەو جەستە، تاکو ژیان بۆ چەرخێکی تەواو بەردەوام بێت و یەك چرکە نەوستێت؟

چۆن ئەم مرۆڤە ئەو خۆراکە لە جگەریدا دەیگۆڕێت و ڕاستی دەکاتەوە و هەڵیدەگرێت.

ئەم جگەرە چییە... ؟ و ئەم ڕژێنەرە مەزنە ئاشکرایە چییە سەخی و ڕەزیلە سەنگین و ژیرە، ڕاستکەرەوە و ڕاستکارە، هەڵگرو بەدەستهێنەرە حەشاردەرو چاو چنۆکە، گەر شەکر لە خوێندا یەك بەرێژەی یەك لە هەزار دا زیاد بکات ئەو قەدەغەی دەکات بێ بەشی دەکات، و گەر کەمی کرد بەخشندەو سەخی دەبێت، و گەر لە سنوری خۆی زیاتر بوو هەڵیدەگرێت بۆ کاتی پێویست، پاش گۆڕینی تاکو بە تریاك خۆراکت بداتێ و بتپارێزێ لە ژەهرەکانی ئەم ڕژێنەرە هۆرمۆنیانە چین کە خاوەنی ڕژێنەری کیمیای شارراوەن کە زاڵن و فەرمان دەکەن بەسەر دەمار و ماسولکە و ئێسك و عەقڵ و دڵ و خوێنبەرەکان و نەژاد و جەستە گەورە دەکات و بچووکی دەکاتەوە، و درێژی دەکات و کورتی دەکاتەوە عەقڵ ژیر دەکات و سست نابێت، جەستەگەرم دەکات و سارد نابێتەوە پاڵە پەستۆی خوێن بەرز و نزم دەکاتەوە و دەمارەکان چالاك و سست دەکات و ڕژێنەی خوێن دەپارێزێ و ڕادەکەی ڕادەگرێت و شەکر زیاد دەکات لە کەمبوونیدا و لە زۆر یشدا دەیوەستێنێ و کلسی ئێسکەکان ڕادەگرێت و نەژادیی دەدات بە خانەکانی نەژاد..ئەی حەیران؟

ئەم خانانە چین کە بەچاو نابینرێن و ژمێرەیان لە لەشی مرۆڤدا دەگاتە چەندەها ترلیۆن، و چۆن کۆمەڵ کۆمەڵ ڕێکدەکەون بۆ ئەوەی لایەك لە لەش پێکبهێنن، هەروەك هەنگ و مێروولەوان کە دەزانن بەو ڕۆڵەیان هەستن کە پێیان سپێردراوە لە ڕۆمانی ژیاندا... ؟

ئەم هاوپەکبوونە میکانیزمە کیمیاییە دەمارییە چییە کەوا لە هەموو ئەندامەکان و خانەکان و ڕژێنەکان دەکات گوێبیست و هاوکاری یەکتربن بۆ دۆزینەوەی هاوکێشێکی چەسپاوی وورد لە خوێن و ئاوو گەرمیو سیچکاوەکان و گوشینەرەکان و خوێ و ترش و چەوریەکان و شەکرەکانی لەش و هەڵدەستێت بە چاکبوونەوەی هەموو خراپبوونێك و دروستکردنەوەی هەموو ڕامالکراوەکان و بە جێگرتنەوەی هەموو کەمیەك و سارێژکردنی هەموو نەتوانایییەك، و ڕاستکردنەوەی هەموو زیادە ڕەویەك، و دوورینەوەی هەموو دڕاوێك و پینەکردنی هەموو کونێك و گرتنەوەی هەموو شکاوییەك و نەهێشتنی هەموو خوێن بەر بوونێك، ئامادەکردنی هەموو هێزێك و تیژکردنەوەی هەموو چەکێك و دروستکردنی هەموو ژەهرو دژە هەرییەك بۆ بەگژدا چوونی هەموو دوژمنکارێك و یارمەتیدانی سوپا بە سەربازی نوێ، لە جیاتی شەهیدانی نیشتمانی پیرۆز... ؟

ئەم عەقڵەی کە هەموو عەقڵێکی سەرسام کردووە، و تا ئێستا ڕاماون لە نهێنییەکانی ئەی حەیران، لە چ سەرسوڕهێنەرییەکی باست بۆ بکەم؟ چۆن ملیۆنەها ملیۆن لە زانیاری گەنجینە بکەین، و لەکوێ هەڵیبگرین و چۆن لەکاتی پێویستدا لە گەنجینەکانیاندا دەریان بهێنین.

چۆن شت بهێنینەوە یادمان و چۆن بەراوردو شیکارو ئاکامخوازی و فەرمانڕەوایی بکەین ئەی حەیران؟

و ئەم پارچە گۆشتە چییە و ئەم زمانە کەچەپکێ دەمارە چییە کە خوا بە هۆیانەوە هەمو ناوەکانی فێر کردووین و بەهۆیەوە خراوینەتە سەروو فریشتەکانەوە ئەی حەیران..؟

ئەم ئامێرە دەماراوییە سەرسوڕهێنەرە ساماناکە چییە کە زاڵین بەسەریدا، و زاڵە بەسەرماندا بزانین و یاخود نەزانین زاڵین بەسەریا لایەنێکیدا لە هەندێ لە ئەندامماندا.

بەویستی خۆمان و هەروەها ئەویش لەلایەکی ترەوە بەهۆی دەزوولەکانیەوە زاڵە بەسەر گرنگترین و مەزنترین زوربەی ئەندامەکانمان بەڵکو لەهەموو خانەیەکی لەشماندا بە ویستی تایبەتی ڕەهای خۆی بەبێ هیچ زانیارییەکی ئێمە هەروەك دوو عەقڵی سەربە خۆ لەم ئامێرەدا هەبێت وایە بە ئاگاو بەبێ ئاگا کە باشتر وایە هەربە بەئاگا ناو ببرێت چونکە

بەئاگاکە لەوانەیە هەڵە بکات بەڵام بێ ئاگا هەرگیز هەڵە ناکات چونکە (بەئاگا) ئاگاداری کارەکانی هاوڕێکەی نی‌یە هەرگیز خۆی تێهەڵناقورتێنێو گەر ئاگاداری بێ و خۆی تێهەڵقورتێنێ ئەوا تێکیدەدات و بە پێچەوانەوە بێ ئاگا ئاگاداری هەموو کارەکانی (بەئاگایە) و دەستێوەردانی دەکات بەنهێنی بۆ ڕێکخستنی، و گەر (بەئاگا) وەستا و لە کارکەوت، هەموو ئاکامی وەستان و لە کارکەوتنەکەی ئەوەیە ماسولکەکانمان لە جوڵە دەوەستێت و مێشکمان بەتوانا دەبێت لەبیرکردنەوەی ڕاست و حاڵمان وەك نوستوو دەبێت، و گەر بێ ئاگا لە کار وەستا (دڵ و گەدە) تێکدەچن و هەروەها جگەرو گوێو چاو تێکدەچێت بەڵکو هەموو شتێك لە لەشماندا تێکدەچێت، و ئەو کاتە مردنی بێگومان چاوەڕێمان دەکات، ئایا ئەم جیاکردنەوە سەرسوڕهێنەرە دەسەڵاتدارە دانایە لە نێوان ئەم دوو دەسەڵاتدارەدا دیاردەن لە دیاردەکانی ڕێکەوتی کوێرانە ئەی حەیران؟!

ئەم مادە چنراوە کە زیاتر لە ١٢ ملیۆن خانەن کە هەریەکەیان بەهۆی لیمفە دەمارەکانەوە نەژمێرەو نەئامار دەکرێن.

بە ووردی و هاویەکبوونێکی بێ شومار کاردەکەن، هەروەك یەك خانە بن وان، ئەی حەیران؟

ئەم (پەردە سەحایە)ی مێشکە چی‌یە هەروەها بنکەیەکی سەرکردایەتی وایە لەهەمو ماڵێك لە ماڵەکانیدا، ڕێکخەرێك کەبەهەزارەها نامەي هاتوو لەدەرەوە وەردەگرێت لە ڕێگەی هەستیارەکانەوە و هەواڵ دەگەیەنێنە سەرکردایەتی بەرزتر... ؟

ئەو سەرکردە بەرزە کێ‌یە کە ڕێکخستنی ئەو هەموو نامەیە دەگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەمەیان دوا ئەخات و ئەوی تریان دەخوێنێتەوە و یان فڕێی دەداتە قوڵایی ناخیەوە، و بەراوردو شیکار و ڕاستکردنەوە دەکات تاکو ئاکام خوازی لێ بەدەست دەهێنێت و لە هەستە کۆن و نوێ هەڵگیراوەکاندا دەرککردنی سەرسوڕهێنەری عەقلی پێکدەهێنێت و لەو گیانلەبەرە بێ زمانە خوێن ڕێژە ئاژەڵی‌یەی دەردەچێت.

هەندێ جار وا بەرز دەبێتەوە وەختە بگاتە سەر سەکۆی ئەو خودایەی کە کردویەتیە خەلیفەی خۆی لە سەر زەوی وەڕێزی لێناوە و بەهۆی قەڵەمەوە فێری کردوە.... ئەی حەیران... ؟

ئایا ئەم هەموو بەخشندەیی‌یە ووردەکاری و دروستکردنی ڕاست و ڕادەو ئەندازە دانان و ڕێکخستنە، فەرمان و ڕاستکردنەوەی و پێکەوە لکاندن و گوێبیستی یەکتر و هاوکاری و هاوشێوەی لە نێوەند ملیۆنەها ملیۆن و لە گەردیلە و خانە و دەماردا ئایا ئەمانە هەموو بە گشتی دیاردەن لە دیاردەکانی ڕێکەوت ئەی حەیران؟

(ئایا باوەڕ دار نابیت بەوەی کەلەخاك دروستیکردیت و کردووی‌تیە پیاو) ئەی حەیران

﴿أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلاً﴾الكهف:٣٧.

﴿بَلْ عَجِبْتَ وَيَسْخَرُونَ، وَإِذَا ذُكِّرُوا لا يَذْكُرُونَ، وَإِذَا رَأَوْا آيَةً يَسْتَسْخِرُونَ﴾الصافات/١٢-١٤.

(بەڵکو سەرت سوڕماو گاڵتەمان پێدەکەن، و گەر بیهێنینە یادیان، ناهێتەوە یادیان و گەر نیشانەیەکیان دي گاڵتەی پێدەکەن).

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت... ئالێرەدا شێخ چاوەکانی پڕ بوو لە فرمێسکو گریا، خۆم دا بەسەر هەردوو دەستیا ویستم ماچی بکەم و بەفرمێسك بیان شۆم بەدەنگێکی گریاناوییەوە وتی، ئەی حەیران (هاوار بۆ ئەوانەی دڵ ڕەقن بەرامبەر یاد کردنەوەی خودا).

... چەند جارێك دووبارەی کردەوە تا... خامۆشی دایگرت و خۆیدا بەدەستی بێ دەنگیەکی قوڵەوە.

هەربەبێ دەنگی ماینەوە تا تیشکی خۆری ڕۆشنەکەر بەئاگای هێناین لە نێوان ئەو درەختەی کە سێبەری بۆ ئارامگای ئیمامی بوخاری کردبوو، شێخ بەدەنگێکی لاوازی گریاناویی‌یەوە وتی؟ ئەی حەیران من ماندووم، پێویستی دەست نوێژ هەڵگرتنم بۆ ئامادە بکە.... دوای ئەوەی دەست نوێژمان هەڵگرت و نوێژی بەیانیمانکرد شێخ چووە جێنوستنەکەی‌و وتی/ دامپۆشە، دامپۆشە، ئەی حەیران، ئەم شەو سەرمام بووە و شەونخونیش ماندوویکردووم

# ئامۆژگاریەکانی شێخ

## (٦)

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ ﴾(فصلت:٣٣)

(دوو جۆر لـە خەڵك هەیە کە دەشێت بە ژێر ناویان بەرین) ئەوانە و ئەو کەسانەن کە خودا دەپەرستن لەبەرئەوەی دەیناسن و ئەوانەی کە بەڕاستی لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکەن لە بەر ئەوەی نایناسن) باسکاڵ.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت: پاش ئەوەی کە شێخم دا پۆشی و لەلای هاتمە دەرەوە، نەنووستم لەبەر ئەوەی چاوپێکەوتنم هەبوو لەگەڵ پیاوێکی خەڵکی خەرتەنکدا چووم بۆ لای ئەو ڕۆژەم لەلای ئەو بردە سەر، و پاش ئەوەی گەڕامەوە و نوێژی خەوتنانم لە گەڵ بجێورە پیرەکەدا کرد.

وتی/ ئەمڕۆ شێخت بینیوە؟ وتم/ نەخێر نەم دیوە چونکە لەگەڵ کازیوەی بەیاندا چوومە دێکەو ئێستا گەڕاومەتەوە وتی/ من زۆر دڵم لە لایەتی، دوای نوێژی ئێوارە چووم توێشەبەری خواردنەکەی بهێنمەوە، دەبینم هەروەك خۆی بە پەرژینی باخەکەوە هەڵواسراوە کە بۆم دانا بوو.

خواردنەکەشی هەروەك خۆی مابوو، ئایا دەتوانیت بچیت لە باخەکەدا بە باشی لە دوی بگەڕێیت، چونکە ئەم ئێوارەیە زۆر ساردە.

وتم/ پێویست بەوە ناکات،ـ چونکە بەم سەرمایە لە باخەکەدا نامێنێتەوە لام وایە لە ژوورەکەی خۆیدا بێت و لەوانەیە نەخۆش بێت بەرە بەیان کەبە جێمهێشت بێ ئارام و ماندوو بوو، ئێستا دەچمەلای، تۆ بێ خەم و پەژارە بچۆرەوە بۆ لای ماڵ و خێزانت و پاش ئەوەی خوا حافیزیم لەم پیرە مێردە کرد، دەرگای مزگەوتم داخست و گەڕامەوە ژوورەکەی شێخ، دەبینم تاریکە موچڕکەیەکی ترس دایگرتم کاتێك بە خەیاڵمدا هات کە توشی نارەحەتیەك بوو بێت، و ترسانم کتوپڕ بچەمە سەری بەهێواشی پشتاو پشت گەڕامەوە، لە مزگەوت هاتمە دەرەوە و بە حەوشەکەدا گەڕام تا... گەیشتمە باخچەیەکی بچووکی پەرژینکرا و کە ئارامگای ئیمامی تیادایە تاکو لەوێوە سەیری پەنجەرەکەی شێخ بکەم کە دەڕوانێتە سەر ئارامگاکە، دەبینم هێشتا لە جێنوستنەکەیدایە

گوێبیستی ناڵەو بزرکاندن بووم هەروەك پاڕانەوە وا بوو، و کاتێك لە پەنجەرەکە نزیك بوومەوە گوێم لەدەنگەکە گرت دەیووت ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحاً تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾الاحقاف:١٥.

(پەروەردگارم یارمەتیم بدە تا... سوپاسی بەخشندەیت بکەم ئەو بەخشندەیەی کە بەمن و دایکم و باوکمت بەخشیوە و بەردەوام بم لەسەر کرداری چاکە کە تۆ رەزامەندیت پێی هەبێت و وەچەکانم باش بکەیت، من بۆلای تۆ گەڕاومەتەوە دەیەکێکم لە موسڵمانان)

لە پاشدا ناڵەیەکی قوڵی کرد، گوێم لێبوو دەیووت، دوای ئەوە ﴿وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافاً خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً﴾النساء:٩.

باترسیان هەبێت ئەوانەی کە پاش خۆیان وەچەی لاواز بەجێدەهێڵن کە ترسیان لێیان بووە، با لەخوا بترسن و بیپەرستن و گوفتاری ڕاست بدەن) لە پاشدا دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە و کوڵپەی گریان دایگرت و دەیووت خودامان پەروەردگارمان دوورمان بخەرەوە لە ململانێی خراپەکاری بە بەزەیی خۆت کە هەر خۆت خاوەن بەزەیت).

لێرەدا پشتاو پشت بە پەلە بۆ مزگەوتەکە گەڕامەوە.

سەرمای زۆر ترساندمی چوومە لای شێخ، پێش ئەوەی مۆڵەتی چوونە ژوورەوەم بدا، و کاتێك چاوی پێم کەوت وتی/ مەترسە... من.. نا ئێستا زیندووم... بەڵام نەخۆشم... چراکە ڕۆشنکەرەوە، هەندێ ماستم بۆ بهێنە تاکو برسێتیەکەمی پێ بشکێنم، ڕۆژم بەراکشاوی لەناو جێدا بردە سەر، دوای ئەوەی ماستەکەی خواردو فەرمانیدا یارمەتی دەست نوێژ گرتنی بدەم لە پاشادا نوێژی خەوتنانی‌یە دانیشتنەوە کرد و گەڕایەوە جێنووستنەکەی و دانیشت و پاڵیدایەوە، بەزەردەخەنەیەکەوە سەیری کردم و وتی/ ئەی حەیران! خودا نەیفەرمووە (سیخوڕی مەکەن)؟ نەیفەرمووە: ﴿أدخلوا البيوت من أبوابها: لەدەرگاوە بچنە ماڵانەوە﴾، بەڵام سیخوڕی من بەرابەر بەتۆ خۆشەویستێکی یە

پەرۆشەوە بوو ئەی گەورەم، توو خودا پێم بڵێ چی تۆی گریان و لە بەر چی ناڵەو ئاهت دەکردا.

شێخ/ ئەمە بێزاری تەنهایی پیرەمێردێکی بەرەو نەمان چووە هەست بە نزیکردنەوەی نەمانی بکات لە ژیاندا ئەی حەیران...

حەیران/ تەمەنت درێژ بێت ، ئەی گەورەم.

شێخ/ تەمەن درێژ بوو ئەی حەیران... و یەکێك لە بەخشندەکانی خودا بۆ بەندەکانی بیباتەوە بۆ خۆی پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی پیری و.پەککەوتەیی و داماوی و کەسیفی و لە ترسی مردن نەدەگریام بەڵام پەنام بۆ خودا دەبرد لە تەنهایەکەمدا... و ئەو چەند بێگەردو پاکە وا حەزدەکات کە بەندەکانی بە ترس و لەرزەوە هاوار و پەنای بۆ بەرن.

حەیران/ ئەی هۆی پاڕانەوەت چی بوو ئەی گەورەم؟

شێخ/ هەریەك لە ئێمە ئازارو هیواو ترس و یادگاری خۆی هەیە ئەی حەیران و هەموو کەسێك دەپاڕێتەوە بۆ ئەو شتانەی کە پەیوەندیی بەخودیی یەوە هەیە، پاشان شێخ ڕووی لەمن وەرگێڕا بەرە و پەنجەرەکە، و فرمێسك چاوەکانی پڕ کردبوو، و خۆی خەریك دەکرد بە داخستنی پەنجەرەکان تا سەرنجدانی من لە خۆی بەدوور بخاتەوە، دایبخە ئەی حەیران، چونکە سەرمای پایز زەرەرمەنترە لە سەرمای زستان. لە جێنوستنەکەیدا نزیك بوومەوە، دانەویم بەسەریدا تاکو پەنجەرەکە دابخەم، شێخ وا هەستی کرد دەگریم.

وتی/ مرۆڤ بێدەسەڵات دروستکردوە ئەی حەیران.

حەیران/ باوکت کێیە گەورەم؟

شێخ/ باوکم و باپیرم دوو بەندەی باش بوون لە بەندە چاکەکانی خودا.

حەیران/ منالەکانت لە کوێن و هەواڵیان چی‌یە؟

شێخ/ ئەوان لە سەمەرقەندن و لەژێر چاکەو بەخشندەیی زۆری خودا دادەژین.

حەیران/ کەواتە بۆچی دەبینم زۆر بە پەرۆشی بیریان دەکەیت و لە دوا ڕۆژیان دەترسیت.

شێخ/ پارە هەموو شتێك نی‌یە ئەی حەیران..خودایە بەدووریان بخەی لە ململانێی خراپەکاری و بە پەردەی جوان و ڕازاوەی خۆت دایان پۆشە.

حەیران/ بۆچی دووریت هەڵبژاردووە لێیان و وازت لە خەڵك هێناوە لەم مزگەوتەدا بەتەنها دەژیت؟

شێخ/ دوورنیم لێیان و سەمەرقەند هێندەی فەرسەخێك دوورە لە خەرتەنکەوە بەڵام بۆ دابینکردنی بژێویان (٤٠) ساڵ هەوڵمدا و ئێستاش هاتووم تێبکۆشم بۆ بژێوی دوا ڕۆژی دیاریکراوی خۆم.

حەیران/ ئایا تێکۆشان لە پێناوی ماڵ و منداڵ و هەڵس و کەوت لەناویاندا، مەزنترین چاکە نی‌یە لەلای خودا؟

شێخ/ بەڵێ ، بەڵێ... ئەی حەیران. ،..بەڵام مرۆڤ کە هەستی بەنزیکبوونەوەی ڕۆژە دیاریکراوەکەی کرد، حەزدەکات دا ببڕێ بۆ خودا.... و ئەمەش لە قەرەباڵغی شاردا بە ئاسان بەدەست نایەت و لەم مزگەوتەدا لە نێوەند ئەم باخ و بێستانەدا ، یادگاری ڕۆژانی لاوی تێدایەو دێنەوە یادم و خۆشحالم دەکەن و لەهیچ شوێنێکی تر بەختیار نابم تەنها لەم جێگایەدا نەبێت و بەدرێژایی ژیانم کاتێ کە دووچاری بەڵاو نەهامەتی دەبووم پەیمانم بەخوم دەدا کە ئاواتە خوازی ئەو ڕۆژە بم کە دابڕم بۆ پەرستنی خودا لە مزگەوتێکدا لای ئارامگای پیاو چاکێك، خودی مرۆڤ ئەی حەیران گەر ئاواتە خوازی دووری و تەنیایی بوو لە خەڵك تەنها بەختیاری و خۆشحالی بە پەرستنی خودا دێت، و هەست بەنزیکبوونی لە خوداوە ناکات گەربەتەك بەندەیەکی نزیك لە خوداوە نەبێت.

حەیران/ ئەمە ڕاستە و ئێمە وا ڕاهاتووین گەربمانەوێت لە پادشاکانی ئەم زەمینە نزیك ببینەوە پەنا دەبەینە بەر خەڵکانی نزیك لەوان.

حەیران: ئەمە ڕاستە و ئێمە وا ڕاهاتووین گەر بمانەوێت لە پادشایەکی ئەم زەی‌مینە نزیکبینەوە پەنا دەبەینە بەر خەڵکانی نزیك.

شێخ/ ئەمە گەلێك جیاوازو دوورە ئەی حەیران (کێ دەتوانێ سوزو لێبوردەنی خودامان بۆ بەدەست بهێنێ، تەنها بەفەرمانی ئەو نەبێت... ).

بەلام لەگەڵ ئەم ڕاستیە بێگومان نەشدا، هەست بە چێژی ملکەچی دەکەین بۆ خودا نە ڕێگای بەدەستهێنانی سۆزو بەزەیی خودا بەهۆی پیاوچاکان و خۆشەویستانی خوداوە و هەروەك ددان پنێین بە گوناهەکانمان وایە، خۆمان بە ملکەچ و بێ نرخ دەبینین، بەرامبەر خودا، لەوەی کە نزیك دەرکەی بەزەیی خودا ببینەوە بێ خۆ حەشاردان لە پشت پیاو چاکان و نزیکانی خودا.

حەیران/ ئێستا مانای وتەی ئەو ڕۆژە تێدەگەم کە هاتم و بێزارم کردیت و لێم تێکدایت چێژی چوونە قوڵایی ملکەچی و پەرۆشیت بۆ خودا بەڕاستی گەورەم بارێکی قورس بووم لە سەرت و لە خودا پەرستی بەدوورم خستی.

شێخ/ خود پەرستیت زۆر تر کردم ئەی حەیران... و بە پێچەوانەوە باشترین جۆرەکانی خودا پەرستیت بۆ ڕەخساندم.. ئەی حەیران ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلاً مِمَّنْ دَعَا إِلَى اللَّهِ﴾فصلت:٣٣ ؟

حەیران/ خودا پاداشتی چاکەت بداتەوە، گەورەم.

شێخ: بەڵام ئەمشەو بە باسکردنی خۆمەوە خەریکت کردم.

حەیران/ هەمو گوفتارێك لە گەڵتا چاکەیە..و بەماندوی و بێزاری تۆم بینی، و ئارەزووی شەو نخوونی ناکەم، چونکە لەو کاتەی کە خۆر هەڵهات و تۆم بەجێهێشت نەنووستووم و چووم بۆ خەرتەك بەهیلاکی و ماندوویی گەڕامەوە وەك تام لێهاتبێت وا بوو.

شێخ/ خۆت ماندوو کرد کاتێك هاتیە دەرەوە لە باخەکەدا لە دووامدا گەڕایت بەم سەرما تەزینە..هەستە هەستەو بڕۆ جێنوستنەکەت... و ئەم داپۆشەرە بگرەو خۆتی پێدا پۆشە.

حەیرانی کوڕی ئەزعەف دەڵێت کاتێك شێخم بەجێهێشت و چوومە جێنوستنەکەم هەستم بەلەرزو تا دەکرد... و ئەو شەوەم بردە سەر وەك (لەسەر پشکۆی ئاگربم وابوو، کاتێك کازیوەی بەیان بەدەرکەوت، بجێورە پیرەکە هات، زۆرم لە خۆم کرد تا دەرگاکەم لێکردەوە، هەرکە بینیمی بەم حاڵە هاواری لێهەستا و بەرەو لای شێخ ڕایکرد و پێی وت شێخیش ڕووی تێکردم بەسست و هێواشی بەرەو لام هات، ولێم نزیك بووەوە، دەستی گرتم و بە گەرمی تاکەم دەموچاوی گرژ کردو فەرمانی بەبجێوری مزگەوتەکە کرد کە گەورەی گوندەکە بانگ بکات و بمگەیەنێتە نەخۆشخانە لە سەمەرقەند بێهودە هەوڵمدا کەواز لەناردنم بەرەو سەمەرقەند بهێنێ بەڵام زۆر سوور بوو لەناردنم و دەیووت: خوا ئارەزوو بکات هیچ نابێت کوڕم، بەڵام تۆ خەڵکی ئێرە نیت و نە کەس و کارت دا بڕاویت، و تا کەشت زۆر بەرزە، وتم: گەورەم من جۆرەکانی تا.. ئەزانم، هەیانە کاتی‌یە لە شەوو ڕۆژێکدا تەواو دەبێت بهێڵە لەلات بمێنمەوە تا.. بەیانی بەڵکو لێم ببێتەوە، گەر وانەبوو فەرمانت ڕەوایە جێبەجێی دەکەم وتی: خوازیارم کاتی

بێت بەڵام لە تۆ باشتر جۆرەکانی تا دەزانم، ئەو تایەی کە لەسەرماوە دەکەوێتەوە، بەم کتوپڕییە دوای ڕۆژێکی تەواو، پێویستی بە تیمارو چاودێری هەیە، و پشتگوێخستنی ئەنجامی باش نییە نەگەیشتە کاتی نیوەڕۆ تاکەم زیاتر بەرز بووەوە، و هەستم بە وورپیەك دەکرد لە سەرمدا لە پاشدا لەهۆشخۆم کەوتمو پاش دوو ڕۆژ بە ئاگا هاتمەوە، خۆم لە نەخۆشخانە بینیەوە لە دوایدا بۆم دەرکەوت کە شێخ مەوزون خۆی منی بۆ ئێرە هێناوە و فەرمانی بە چاودێری کردنم داوە، فەرمانیشی بەجێهێنراو بوو.

دوو هەفتەی تەواوم لەنەخۆشخانەکەدا بردە سەر... تا مەترسی نەخۆشیەکەم لە سەر لاچوو و پزیشکەکە ماوەیدا کە سەردانم بکرێت، یەکەم کەس کە سەردانی کردم مجێوری مزگەوتەکە بوو، هەواڵی پێگەیاندم کە شێخ پاش گەڕاندنەوەی لە سەرمەرقەند دڵی کتوپڕ دوچاری نەخۆشی بووە، لەو ڕۆژەوە لە جێگادا کەوتوە، پزیشکەکەم بانگکرد تکام لێکرد فەرمانی دەرچوونم لە نەخۆشخانەکە بدات، مۆڵەتی نەدا وتی/ تۆ تازە بەرەو چاکبوون دەچیت و بەلایەنی کەمەوە دەبێت هەفتەیەکی تر بمێنیتەوە، تاوەکو مەترسیت بەتەواوی لە سەر لادەچێت پێم ڕاگەیاندی کە دڵم لە لای شێخە، وتی/ ئێستا ئەو باشترە و بەسەلامەتی ئەم جەڵدەیەی بەسەردا تێپەڕی و ئاگا دارم کردەوە کەنابێت جێنوسەتەکەی بەجێبهێڵێت و لەهەموو تورە بوون و گرژ بوونێك خۆی بپارێزێت، نەمهێشت برای مجێورمان هەواڵ بگەیەنێتە کەسوکاری شێخ تاکو سەردانی منداڵەکانی غەمباری نەکەن و نەبێتە هۆی تازەبوونەوەی جەڵدەکەی و بیکوژێت و پێم ڕاگەیاند کەواز لە خوێندن و نوسین بهێنێت.

مجێورە پیرەکە بە گوێبیستی قسەکانم وتی/ بەڵام بەدرێژایی ڕۆژ خەریکی نوسینە، گەورەم، و بێ هودە هەوڵم ئەدا نەهێڵم، نوسینەکانیشی هەموی لە پێناوی حەیرانی گەورەم دایە.

ووتم/ لە پێناوی مندا؟ وتی/ بەڵێ لە پێناوی تۆدا، بەدزیوە سەیری نووسینەکانیم دەکرد دەبینم ناوی تۆی زۆر تیادا دووبات دەبێتەوە.

وتم/ ئەمە سەیرە، کتێبەکە لە کوێیە، و بۆچی بۆی نەناردووم.

وتی/ نازانم، نوسینێکی دوورو درێژو گەورەیە.

پاش چەند ڕۆژێك مجێورە پیرەکە هات بۆ لام و (دەفتەری ئامالی) بۆ هێنام و سەلامی شێخی پێگەیاندم، دەفتەرەکەم وەر گرت و لە دۆڵابەکەدا هەڵم گرت و دەرگایم داخست.

لە پاشاندا لە پیرە مێردەکەم پرسی/ بۆچی شێخ ئەم دەفتەرەی بۆ ناردووم/ وتی/ نازانم بەلاّم ڕایسپاردم کە بیگەیەنمە دەستی خۆت، بۆ هەندێ خەیاڵی ناخۆش چووم... پیرە مێردەکەم سوێندا کە هەواڵی ڕاستی شێخم پێ بڵێت سوێندی خوارد کە دەژی و تەندروستی باشە وتم/ ئەی ئەو نامەیە کوا کە دەتووت بۆ تۆی دەنوسێت؟ وتی/ نازانم، بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ بحێورەکە دا برا لیم ، غەم و پەژارەی شێخ دایگرتم، و کاتێك هەواڵی شێخم لە پزیشکەکە پرسی خۆی کەڕ کرد لە وەلاّمدانەوەم و بۆ ڕۆژی شەشەم پیرە مێردەکە سەردانی کردم، بەڕوویەکی غەمبارو زویرو سەرکزو پێلّو ووشك هەڵهاتووەوە، هەرکە هەواڵی شێخم پرسی دایە قوڵپی گریان و بەهاوارەوە دەیووت شێخ کۆچی کرد.... کۆچی کرد ئەی حەیران بەلاّم تۆی لە یاد بوو وەك چۆن منداڵەکانی خۆی لە یاد بوو.

هەردوو کمان بەدەنگی بەرزەوە دەگریاین تا هەموو نەخۆشخانەکە پێیزانین، پزیشکەکە هات ودەستیکرد بە سەرزەنشتی پیرەمێردەکەو بە هەواڵدانی کۆچی شێخ بەمن پاش ئەوەی کە نەختێ ئارام بوومەوە پێي ڕاگەیاندم کە شێخ دوچاری جەڵتەی دووەم بوە و دڵی لە توانایدا نەماو ماڵئاوایی لێکردین و لەسەر وتەی خۆی لە باخچەی نزیك مزگەوتەکە نێژرا کە ڕۆژانی دوایی لەوێ دەبردە سەر.

پاشان پزیشکەکە ماوەی درچوونمیدا، جلەکانم لە بەرکردو دەفتەری ئامالیم هەڵگرت، لە گەڵ پیرە مێردەکەدا بۆ خەرتەنگ چوین لە پاشدا بۆ مزگەوتەکە، لە وێدا لە سەر ئارامگای شێخی خۆشەویست دانیشتم بە فرمێسکەکانم خاکەکەیم ئاو ئەدا، تا... شەو داهات من هەردەگریام کەهەستم بە کاریگەری سەرماکرد بۆ مزگەوتەکە گەڕامەوە لەگەڵ بحێورەکەدا چووینە ژوورەکەی شێخ کە نەیدەویست ئەو شەوە بەجێم بهێڵێت، پاش ئەوەی کە بحێورەکە نووست دەستمکرد بە پشکنینی دۆلاّبەکەی شێخ بۆ ئەو نوسراوە دەگەڕام کە دەیانووت بۆ تۆی نوسیوە، هیچ دیاردەیەکم نەدیتەوە خەولەچاومدا شکابوو لەبەر غەم و پەژارەی شێخ مزگەوتم لاتەنگ بوو لەگەڵ فراوانیەکەیدا، گەر سەر مانەبووایە بەرەو چۆڵەوانیەکە ڕێم دەکرد.

شەوی زستانم لێ درێژ بوو لە دووی کتێبێك دەگەڕام تاشەوی پێبکەمەوە.

بەلاّم کەسوکاری شێخ هەموو کەل و پەل و کتێبەکانیان بردبوو و تەنها دەفتەری ئامالیم لە بەردەستدا بوو کە خۆمی پێوە خەریك بکەم دەستمدایە و ئەو گرێیانەم کردەوە کە شێخی خوا لێخۆشبوو بەدەستی خۆی بە ستبووی، هەرکە دوو توێی دەفتەرەکەم

کردەوە چاووم بەنوو سینێك کەوت کە بە دەست و خەتی شێخ نووسرا بوو دەبینم ئەو نووسینەیە کە بۆمنی نووسیبوو.

ئەمەش نووسراوەکەیە:-

کوڕی خۆم حەیرانی کوڕی ئەزعەف!!

سڵاو بەخشندەیی خودات لێبێت: سوپاس بۆ خودا بۆ تەندروستی باشت.

دوای ئەوە من هەست بە نزیکبونەوەی مردنم دەکەم لەو کاتەوەی کە تۆ لێرە دووریت، تووشی جەلدەی دڵبووم و چاوەڕوانی چاکبوونەوە ناکەم... زۆر مەبەستم بوو پێش ماڵاواییو مردنم و پێش گەیشتنم بە خودا ئەو ئامانجەی لە ئەستۆمدا بوو بەرامبەر بە تۆ تەواوی بکەم، لەبەر ئەوە ئەم نامەیم بۆ نووسیت کە هیوادارم بیکەیتە پاشکۆی دەفتەری ئامالی ئەی حەیرانی کوڕی ئەزعەف! هاتیەتە لام بەسەر لێشێواوی و گومراییەوە کە دووچاری قوڕێکی زانیاری پچڕپچڕ و زانستێکی کرچ و کاڵ بوو بویت کە هەردووکیان لە عەقڵێکی خۆ بەزلدا کۆك بو بوون، بە خۆرسکی ئاواتە خوازی دەرککردنبوو بەخۆبەزلی خۆیەوە سەرکێشیو ملی درێژ دەکرد بۆ زانینی شتەکانی دوای دەرککردن... و هەموو هەوڵێکم لە گەڵتا بەگەڕخست تاکو بەرەو ڕاستی بێ گومانت ببەم، و وابزانم سەرکەوتوو بووم لە ڕێپیشاندانت چونکە وەك ئاوێنەیەك خودی خۆمم لە کاتی گەنجیمدا، لە تۆ بەدی کرد و زانیم دەردەکەت چیـیە و چۆنیش تیمار دەکرێت تا... بگەڕێیتەوە بەرەو هەق و ڕاستی، موداراتم کردی وەك چۆن موداراتی خۆمم دەکرد و تیمارمکردی وەك چۆن خۆمم تیمار کرد، خوازیارم دەرباز بوو بیت لێی وەك چۆن من دەرباز بووم لێی.

ئەی حەیرانی کوڕی ئەزعەف:

بزانە چۆن کە باوەڕت بە خودا (هەق و ڕاستیە) و (مەرج و پێویستیە) کە دەڵێن (هەقە) بۆت بەدەرکەوت لەو باسانەی کە لەشەوانی درێژدا تۆژینەوەیان لەسەر دەکرد.

کە دەڵێن (مەرج و پێویستە) تۆ دەزانیت ئەی حەیران، کاتێك دەرکی دەکەیت وەك دەرك کردنی باوەڕدارانی و بێ باوەڕان بە گشتی بە بێ جیاوازی و باوەڕ هێنان بە خودا بریتییە لە بنەماکانی چاکە کردن.

-بەستەنەوەی خراپەکاری.

- پایەکانی ویژدان.

-پاڵپشتی سووربوون لە سەر کارە لەتەنگانەدا.

-دەرمانی ئارامیە لەبەلاو نەهامەتیدا.
کۆلەکەی ڕەزامەندی و قەناعەتە لە بەخت و بەشدا.
ڕووناکی هیوایە لە دەروندا.
دامرکانەوەی دەروونە گەر ژیان زویری غەمباری کردین.
- ئاسودەیی دڵە بۆ مردن و نزیکبوونەوەی ڕۆژانی کۆتایی.
-قوڵفەی نەپساوەیە لە نێو مرۆڤایەتی و نموونە بەرزەکانیدا وتەی ئەوانە هەڵت نە خەڵەتێنێ کە دەڵێن: ڕەوشتی بەرز مرۆڤ بێ پێویست دەکات لە باوەڕ، چونکە ئەو ڕەوشتە بەرزانەی کە ئێمە لە سەری ڕاهاتووین بۆ گونجاندنە لە نێوان غەریزەو پێویستیەکانی کۆمەڵ، پێویستە لە چارەسەرکردنی ئارەزووەکان لە تەنگانەو نەهامەتیدا، پشت بە باوەڕبەبەستێت بەڵکو ئەو شتەی کە بەویژدان ناوی دەبەین ئەویش لە ناوەڕۆکیدا پەنا بۆ باوەڕ دەبات.

ڕێڕەو کردنی خەڵك بۆ ڕەووشتی بەرز ئەی حەیران... یان بەهەڕەشەو توندو تیژی کاربەدەستان دەبێت و یان بە ئامۆژگاری قورئان و یان ناپەسەندکردنی لەلایەن کۆمەڵگاوە گەر ڕەها بووین لە دەست دەسەلاتی یاساو ئاین و کۆمەڵەوە تەنها ئامۆژگاریکەرێکمان بۆ دەمێنێتەوە کە ئەویش ویژدانە و ئێمە ئێستا لە ململانێی ئارەزوی غەریزەکاندایین لە گەڵ وویژداندا، تەنها لە لای خەڵکانێکی کەم ویژدان سەرکەوتن بەدەست دێنێت و تەنانەت ئەو کۆمەڵە کەمەش زۆر پەیوەست نابن بە ویژدانیانەوە لە کاتی زاڵبوونی ئارەزووەکان بەسەریاندا تەنها ئەوانە نەبێت کەلە خودا دەترسن.

گەر ڕەوشتی بەرز بخەینە لاوە سەرنجبدەینە پێویستەیکانمان بۆ باوەڕ و لەو ڕووەوە کە پاڵپشتێکە لە تەنگانەدا و دەرمانسازە لە نەهامەتیەکاندا، و دامرکێنەری دەرونە و دڵنەوایی دڵە و تیمارە بۆ ناخۆشیەکانی ژیان، دەبینین لە کاتی وونبونی باوەڕدا، زۆر بێ بەخت دەبین لە ژیاندا و کەمترین پلەمان دەبێت لەناو پلەکانی بوونەوەردا بەرامبەر بێ نرخترین ئاژەڵ و بێ دەسەلاترین جانەوەرو دڕندە.

ئاژەڵ وەك ئێمە برسی دەبێت، بەلام بێ غەمە لە پەیدا کردنی ڕسق و ڕۆژی نەداری و هەژاری و پێویستیەکانی تری ژیان وەك ئێمە لە دایك دەبێت و هەروەك ئێمە وەچەی لە دەست دەچێت بەلام دوورە لەهات و هاواری غەم و پەژارەیی بۆ تەنگانەو کەسانی مردوو و هەتیوانی بێدەسەلات.

هەروەها ئاژەڵیش وەك ئێمە ئازار دەچێژێت و فرمێسك دەڕێژێو بێ خەو دەبێت و واز لە سوزو خۆشەویستی خزم و کەسان دەهێنێت و نێوانیان تێکدەچێت و بەهۆی درۆو چاو پیسی و دوو زمانی و دڵپیسیو ڕق و کینە و ناسوپاسی بە خشندەیی و سپڵەیی بەرامبەر چاکەماڵیان لێتێکدەچێت و بەهۆی جۆرە دەرککردنێکەوە سودمەندەکان و زەرەرمەندەکان جیادەکاتەوە، بەڵام دەرباز بووە لە بەرپرسیارێتی و قورسایی هەڵگری گوناهەکان گری گومان و ناخۆشی ڕامهاتن و ئازارەکانی ویژدان...

وەك ئێمە نەخۆش دەکەوێت و دەمرێت، بەڵام دوورە لە بیرکردنەوەی دەرئەنجامەکانی نەخۆشـیو دووری خۆشەویستان و ئازارو ناڵەکانی سەرەمەرگ و دوا ڕۆژی مردووان...

درندەکان خوێن دەڕێژن بۆ تێر بوونی ئارەزووەکانیان، بەڵام خوێن ناڕێژن لە پێناوی خۆ بەگەورەیو بێ چاوو ڕووی و ڕابواردن و خۆشی، و بۆ پلەو پایە و دەسەڵات لە سەر گۆی زەوی بەڵام ئەم گیانلەبەرە فەیلەسوفە، لاوازە هاوارکەرە، ترسنۆکە، تەماعکارە، فێڵبازە خۆ بەگەورە زانە ئارەزو بۆ ڕابوورادن و خۆ بەزلی و توندو تیژی ، خوێن ڕێژی دەکات کە زیاتر لەبیرکردنەوەکانیەوە دووچاری گرفت و ناخۆشی دەبێت.

تەنها باوەڕ بە هێزی دەکات و دڵنەواییو خۆشحاڵ و ئاواتەخوازو ڕەزامەندی دەکات، هەر باوەڕە دەیکاتە مرۆڤێك کە تێکۆشەربێت بۆ نموونەی بەرزەیی، و فریشتەکان کڕنووشی بۆ بەرن... و بەبێ ئەم باوەڕە ئەم مرۆڤەبێ دەسەڵاتە بێ بەختترین بوونەوەر دەبێت و دووچاری زۆرترین بەڵاو نەگبەتی دەبێت مەزنترین و سوکترین پلەی دەبێت.

ئەو بیرکردنەوانەی کە ناخۆشیەکانی دەخستەوە تەنها ڕێگاچارە بۆی باوەڕ بوو.

مرۆڤ عەبدی بیرکردنەوەکانێتی پێش ئەوەی بەندەی پەروەردگاری بێت و تەنها بەم بیرکدنەوەیە دەبێتە بەندەیەکی ڕاستەقینەی خودا کە زۆرترین بەختەوەری و بەدبەختیەکانی ژیانی ئەم دونیایەو دونیای کۆتایی پێ نەخش دەکات.

خودا ئەم مرۆڤەی دروستکردو بەرزی کردەوەو ڕێزی لێنا و جیایکردەوە بەهۆی عەقلە ژیرە بیرکەرەوەکەی کە بەهۆیەوە هەموو ناوێکی فێرکرد وەکردیە جێنشینی خۆی لەسەر زەویو پلەی سەرو فریشتەکانی پێبەخشی و سەرکەوتنی بەوانەبەخشی کە فەرمانەکانی خودا جێبەجێدەکەن و شکستی دانا بۆ ئەوانەی فەرمانەکانی پێشێل دەکەن

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا، فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا، قَدْ أَفْلَحَ مَنْ زَكَّاهَا، وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾الشمس/٧-١٠

کەواتە ئەی حەیران چۆن ئەو نەفسە پاکژ و پاکسێز دەکەیت...؟

ئیمە بە بیر کردنەوە پاکژی دەکەین تا... دەگاتە نمونەی باوەڕی بێگومان و تەواو بەراستی و چاکەو جوانی کە تیایاندا خودا بەدی دەکەیت و لە چێژ و خۆشی باوەڕ دەرکی نیهێنی خۆشیو ناخۆشیو لاوازیو بەهێزیو نەتوانایی و توانایی و کۆیلەیی و ئازادی دەکەین، بەڵکو دەرکی نهێنی دروستکردنەکەش دەکەیت و دانایی لە سەر دوو ڕێبانی (ڕێڕەوی چاکەو خراپە) (النجدین) و پێکهاتنی لە سەر ئەو شێوەی کە بشێت بۆ (هاودژی) کە بەبێ ئەو مانای عەبدایەتی بۆ خودا نەزانراو دەبێت و ڕێڕەوی ڕاستی مانای پەرستن و خۆپاراستن و لە پێناوی دروستی عەقڵ و دڵ و وویژدان و مرۆڤایەتیەکەمان و نموونە بەرزییەکەی و دروستی کۆمەڵەوە نەبێت بە گشتی بالە ڕوو بانگێشەی باوەڕ هێنان بۆ خودا بکەین و ئاسان و ئاشکرای بکەین بۆ عەقڵ و هەروەها دەرونیشی بۆفراوان بکەین ئەی حەیرانی کوڕی ئەزعەف.

لە سەردەمی گەنجی و لاویدا دووچاری نالەو ئازارەکانی گومان و سەرسامی بووم هەروەك تۆ دووچاری بوویت و زۆری لێکردم کە لایەنی فەلسەفە بگرم، هەروەك تۆ، و خولیای موناقەشەگیری و سەفسەتەی کردم بە زانستیکی پچڕپچڕو سەرنجدانێکی نارۆشنەوە، هەروەك چۆن تۆ خولیاي بوو بوویت.

ئازاریدام دەستەوەستانی هەندێ لە پیاوانی ئایینی و هەروەك تۆ منیش دابڕام لە لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەکان.

ڕۆژان و سالان تێپەڕین بەئازارەکانی ژیان دەتلامەوە لە خودی خۆم و ئەوانەی خۆشمدە ویستن کە دووبارە گومانیان لام تازە دەکردەوە بە چەشنێك لە بێ باوەڕییەوە نزیکتر بووم وەك لە باوەڕهێنان بە خودا و بەدبەختی هاوەڵم بوو، و پالی پێوە دەنام بۆ گومان و وێڵی و کەوتبوومە نێوان ڕۆخی باوەڕهێنانی بۆماوەیی (الموروث) و بێ هیوایی لە بەخشندەیی خودا ڕۆژگار هاتوو چوو، تا بوومە یەکێك لە هاودەمانی ئەمیر، بوومە هاوەڵ و خۆشەویستی و لەگەڵیا چووم بۆ حیجاز لە مەدینەی منەوەرە ڕێنمایی شێخێکی بەڕێزی پیاو چاك بە شێخ عبدالقادر دەناسرا لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ بینینم پاش نوێژی بەیانی دەرس بە کۆمەڵێك زانایانی هیند دەڵێت ئەوانەی بۆ حەجکردن هاتبوون، و

منیش وەك ئەوان بۆ دەرسەکە دانیشتم، گوێم بۆ شێخ دەگرت سەرم سوڕما کاتێ دەبینم کتێبێك لە بەردەمیدا دەیخوێندەوە بەبێ وەستان بۆ مەبەستی دەربڕینێك یاخود لێکۆڵینەوەیەك و یان شیکردنەوەیەك و یاخود ڕەخنەیەك، و ئەوەی کە جێگای سەرسوڕهێنەر بوو زیاتر ئەو کتێبە ی کە دەیخوێنێتەوە بریتی بوو لە کورتکراوەی وتەی ڕێبازی فەیلەسوفە سروشتییە مونکرەکان بۆ بوونی خودا.

هەرگیز نەم بیستووە کە ئەمجۆرە باسانە لە مزگەوتدا بخوێنرێتەوە و کاتێك ماوەی وانەکە تەواو بوو دەوربەری شێخ چۆڵ بوو نزیك بومەوە لێی ناوی ئەو کتێبەم لێ پرسی و سەرسامی خۆمم بۆ بەدەرخست وتی: کوڕم ئەمانە کۆمەڵێك لە زانیانی هیندن، هەریەکێك لەوانە لەمن زیاتر زانایە لە بابەتی فقهو تەفسیرو حەدیسدا واڕاهاتوون بەدرێژایی مانەوەیان لە مەدینە هەموو ڕۆژێك گوێبیستیوانەیەك بن لە یەکێك لە زاناکانی ئەم شارە تەنها بۆ مەبەستی پیرۆزی ، و لە پاشدا داوامان لێدەکەن ماوەیان بدەین ئەمانیش بیلێنەوە بەمەبەستی پیرۆزی و ڕێزپێدان، و بەمەش باشترین پاداشتمان دەدەنەوە.

لە سەرەتاوە کە هاتنەلام ڕام وەرگرتن کە چیان بۆ باسبکەم، فەرمانیان بۆمن بە جێهێشت باسی کتێبی (رسالة الحميدة)ی شێخ جسرم بۆ کردن کە شێخی منەو منیش خەڵکی شارەکەی ئەوم شادمان و خۆشحاڵ بوون پێی، چونکە ناسراو بوو لەلایان وەرگێڕا بوو بۆ زمانی ئۆردی و منیش بە پێی لێکۆڵینەوەو ڕا دەر بڕینێك بۆم خوێندنەوە چونکە زۆ ئاشکرا بوو لە لایان و لەبەر ئەوەی منیش زانیاریم سەبارەت بە فەلسەفە کەمە، ترسام کە ڕێگام بگرن بە پرسیارێك و یان چۆن و چوونێك کەنەتوانم نەوەڵامی بدەمەوە نەچارەسەی بکەم.

بەهۆی شێخی جسرەوە سوودمەندی پیرۆزی دەستگیر بووم لە خوێندنەوەی ئەم کتێبە، و ساڵ بە ساڵ زیاتر سوودی لێ وەردەگرم قوتابیو زانا نییە لە هیندەوە نەیەت و داوای خوێندنەوەی کتێبی (جسر)م لێنەکات، و چەند بەرگێکی لێ دەکرێت و دەیکاتە دیاری بۆ شارەکەی خۆی.

پاش ئەوەی شێخ باسی ڕەچەڵەکی وولاتەکەی خۆی بۆ کردم و چۆن کۆچی کردوە و هاتۆتە نزیك مەدینە، داوای بەرگێکی (رسـالة الحميدة)م لێکرد، بۆی هێنام سوپاسم کردو گەڕامەوە بۆ ئەوماڵەی کە لێیدا بەزیبووم دووشەوم تەرخان کرد بۆ خوێندنەوەی ئەم کتێبە و خوێندنەوەیم دووبارە کردەوە پاش ئەوەی لە جسر بینیم بەرزی فکرو

فراوانی زانست و تێبینینە دروست و ڕاستەکانی و دەرك کردنی گەورەیی عەقڵی، و دووری لە دەستە وەستانی و پەنابردنی بۆ عەقڵ و ڕێزی زانست و بلیمەتی بۆ هاورێکخستنی لە نێوان حەقیقەتی زانستە بڕەرەکان و حەقیقەتی ئاینی ڕۆشن،

کاتێك ئەمیر ماوەی سەردانەکەی بۆ مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ تەواو بوو لە ڕێگای دەریاوە بەرەو شام گەڕاینەوە داوای مۆڵەتم لێکرد کە بهێڵێت سەردانی (جسر) بکەم لە شارەکەی خۆی مۆڵەتی دامێ و لە تەرابلسی شامدا بەزیم بۆ سەردانی کە زۆر لەم مزگەوتە دەچێت کە ئێمەی تێداین.

کاتێك خۆم پێناساندو باسی ڕەچەڵەك و باو باپیرانی خۆمم بۆ کرد و چیرۆکی خوێندنەوەی کتێبەکەیم باسکرد بۆ ئەو مەبەستمە ئەم سەردانەم بۆ کرد وەزانی کە دەناڵێنم بەدەست ئازارەکانی گومان و ناخۆشیەکانی سەرسامی.

پێشوازي کردم و پرسیاری زانایانی ولاتەکەمی کرد یەك بەیەك، ڕێزی لێگرتم و لە ماڵێك لە ڕۆخی حەلەبدا جێحەوانەوەی بۆ تەرخانکردم، کە دەڕوانێتە سەر مزگەوت و باخچەکەی چواردەوری و لەپاشدا هەموو ڕۆژێك بۆ مزگەوت هاوەڵیم دەکرد تا.... گوێبیستی وانەکانی ببم لە گەڵ کۆمەڵێك لە گەورە زانایانی قوتابیانی.

پاش ئەوەی مانگێك لە میوانداری ئەو مامەوە، مۆڵەتی ڕۆشتنم لێ وەرگرت بۆ گەڕانەوە بۆ وولاتەکەی خۆم و بەهانەی خۆمم بۆ هێنایەوە و پەیوەندی زۆرم بە ئەمیرەوە، وتی/ ئەبا نور ئەم چەند ڕۆژە کەمە دادت نادات بەڵام ئامۆژگاریت دەکەم بۆ زیاتر خوێندنەوەی فەلسەفە، تا... هیچ شتێکی لێ بەجێنەهێڵیت و زیاتر زانستەکانی سروشت و قورئان بخوێنەرەوە...

وتم/ چۆن خوێندنەوەی فەلسەفەم زیاد بکەم کە من ئەم گومانەم لە وەوە بۆ هاتووە، وتی/ کورم ئەبا نور، فەلسەفە دەریایە بە پێچەوانەی دەریاکانی ترەوە، مەلەوان تیایدا دووچاری مەترسی دەبێت لە ڕۆخ و قەراغیدا، و لەناخ و قوڵایدا دڵنیا و باوەڕ دار دەبێت بیخوێنیتەوە ئەبا نور بە ئارامی و لەسەر خۆیی، هیچ بەجێنەهێڵیت لەو وتانەی کەفەیلەسوفەکان سەبارەت بە بوون و تەنهایی خودا وتوویانە.

لە پاشدا وتەکانیان کۆبکەرەوە و بەراوردو مەزەندەیان بکە و هەروەها ئەو ئایەتانە کۆبکەرەوە کە لە قورئاندا سەبارەت بە بوونی خودا هاتوون.

بەووردی بیانخوێنەرەوە لەژێر تیشکی ئەو فەلسەفەو زانستانەی کە خوێندوتەوە دووبارە مەزەندە لە نێوان زانست و ئایندا بکە بەهۆی عەقڵەوە لە پاش ئەوە خۆت

دەبینیتەوە لە ئامێزی باوەڕ و دڵنیایدا و سورەتی (الضـــحی)و سورەتی (الأنبیاء) زۆر بخوێنەرەوە، هەرگیز بێ هیوا مەبە لە بەزەیی خودا، گەر تۆ بەڕاستی بگەڕێیتەوە بۆ لای خودا تۆ بەکاربیت...

﴿وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى﴾الضحی:٥

لە پاداشدا خودا ئەوەندەت پێ دەبەخشێت کە ڕەزامەندبیت...و ڕێگای ڕاستت پیشان دەدات کاتێ گەڕامەوە بۆ وولاتی خۆم چاوم کەوت بە شێخی ئیسلام لە (طەشقەند) باسی جسرو کتێبەکەی‌و سەردانم بۆ وولاتەکەی‌و گەڕانم بەدوایدا کرد.

لە وتەکانم تەواو نەبوو بووم دەیبینم فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوارێ، پاشان پێی وتم/ ئەو کتێبەی جسر لە وولاتی ئێمە بەناو بانگە وەرگێڕاوە بۆ زمانی تورکی، زانایەکی وڵاتەکەمان نابینیت کە ئەم کتێبە نەناسێت، و هیچ کتێبخانەیەك نی‌یە کتێبی (الرسالة الحمیدة)ی تیادا نەبێت لەگەڵ ئەصلە تورکیەکەشی و هەروەها خاوەنی کتێبی (الحصون) لە علمی کەلامدا لە ژێر ناوی (العقائد ألأسلامیة) لە ولاتی ئێمە چاپکراوە و پاشان شێخ دەربارەی جسر درێژەی بە باسەکەیدا سەبارەت بە باوەڕو دڵسۆزی و بەرگری لە ئایینی ئیسلام، کاتێك داوای ڕۆشتنم کرد کورەکەی تا لای دەرگاکەی گەیاندم و لێم پرسی هۆی گریانی شێخ چی بوو؟ وتی/ باوکم جسری زۆر خۆش دەوێت، خووگرتنی پێوەی و ئەندێشەی زۆری بۆی گەیشتووەتە ڕادەیەك هەرکاتێك دڵی تەنگ ببێت کە زۆر جاریش دڵی تەنگ دەبێت بە تایبەتی لەم تەمەنەیدا کە بەساڵا چووە و تەندروستی باش نی‌یە، هەموو کاتێك ئەو هۆنراوەیەی بۆ دەخوێندمەوە کە شێخ جسر لە یادی لە دایکبوونی پێغەمبەردا ﷺ دایناوە، و هەمیشە کە بۆی دەخوێنمەوە فرمێسك بە چاویدا دێتە خوارێ‌و پێم دەڵێ/ خودا پاداشتی چاکەت بداتەوە ئەی (ضیائەدین) دڵ و دەرونت ئارام و خۆشحاڵ کردم سوێند بەخودا ئەم هۆنراوەیەم ئەوەندە بۆ خوێندۆتەوە دەرخم کردوە ئەبانور و دوای گەڕانەوەمان لە حیجاز بە دوومانگ داوام لە ئەمیر کرد کە بمبەخشێ لە خزمەتکردنی، ئەی حەیران خۆم تەرخانکرد بۆ خوێندنەوە ئەوەندەم فەلسەفەو قورئان خوێندۆتەوە تاخودا ئارەزوو بکات لەو چەند ساڵەدا.

کتێبم تێدا نوسی، و ئەو ئایەتانەم کۆکردەوە کە ئاماژەی بوونی خودا دەکەن و دووبارە بەراووردم لە نێوان زانست و ئایندا دەکرد بەهۆی فەرمانی عەقڵەوە وەك چۆن

(جسر)فەرمانی پێکردبووم و لە پاش ئەم (١٠) ساڵە تێکۆشانە گەیشتمە باوەڕ و دڵنیایی و دەرگاکانی بەزەییم بۆ وا لاکرا هەروەك چۆن جسر مزگێنی دابومێ... تاوەکو ڕەزامەندیم بەدەستهێنا.....

بەڵام ڕێپێنیشاندان و باوەڕی بێگومانم بەدەستمهێنا بەهۆی بەراوردکردنی لە نێوان وتەی زۆرینەی بلیمەتەکان لە گەورە فەیلەسوفان کە باوەڕیان بە بوونی خودا هەبووە و وتەی کەمێك لە گوماندارە لاوازەکان بەراورد دەکرد لە نێوان بەڵگەکانی فەلسەفەو قورئاندا، و بەکۆکردنەوەی هەموو ئەوانەی لە قورئاندا هاتووە لەو ئایەتانەی کەلە دروستکردن و پێکهاتندا ئاماژەی بوونی خودا دەکەن و تێڕوانینی ئەو ئایەتانە لە سەر ڕۆشنایی حەقیقەتی بڕەرەکانی کە زانست چەسپاندونی، بە چەشنێك دڵم ڕۆشن بووەوە کە خودام تێدا دەبینیی.

بەووردی لە نێوان وتەی فەیلەسوفە ڕەسەنەکان کە پەیوەستن بەمەرجی فەلسەفەوە کە ئەمە (تێڕوانینی عەقڵیە و دووو و ڕووتە لە هەموو ئارەزوویەك و مەبەست و لایە نگرەییەك تەنها گەڕان بەدوای حەقدا نەبێت) بەمانای ئەوەی کە بێ باوەڕیان تیانییە بەهەموو مانای وتەیەك کە مەبەست و ئامانجیان تەنها ئینکاری بوونی خودایە، ئینکارێکی ڕەهایی یاخود بە ئارەزوو لکاندنی هەندێ سیفات پێوەی، کە پێچەوانەی تەنهایی و تەواو یەکەیەتی، لە هەمانکاتدا (شکاك) یان تێدایە کە بەدووی هەقدا دەگەڕێن بە بێ چوونە ناو شارراوە و نهێنیەکان، دووچاری گومانی وا دەبێت کە دەرباز بوونی نییە وەك لێکۆڵەرەوە و فەلسەفەچی و مفکرەکان هەرچەند پایەشیان بەرز بێت لە باوەڕداریدا، چونکە لە سورشتی (توێژینەوە) لە دوای نهێنی و شارراوە گەر ئاشکراو ڕوون بوونایە توژینەوە و بیرکردنەوە و تیڕوانین و سەرنجدان و گومان و بەڵگە خوازی پێ نەدەویست بەڵام لێکۆڵەرەوەکان لە نێوان خۆیاندا جیاوازیان هەیە لە عەقڵ و گومان و ژیری و ئارامیدا، بلیمەتی بەتواناایان تێدا هەیە کە ململانێ و بەرەنگاری تاریکی گومان دەبێت، تا دەگاتە سپێدەی دڵنیایی و باوەڕ، لە دوای ئەم دڵنیا بوونە گوێ ناداتە وێڵی گومان، و هیچ پێچەوانەیەکی عەقڵ لای دروست نابێت لەگەڵ ئەو باوەڕەی کەبەدەستی هێناوە و لاوازیان تێدا هەیە کە دەناڵێنێ لە ژێر قورسای گومانەوە بیردەکردنەوەیان دەپچڕێت بێ ئەوەی بچنە قوڵایی و ناخیەوە و کولبوونی عەقڵیان سەبارەت بە ئەندێشەی شتەکان دەکەنە بەڵگە بۆ نەتوانایی بەگەڕخستنی عەقڵ یاخود نهێنی و شارراوەکانی دانایی و حیکمەت دەکەنە بەشێك لە بەشەکانی دروستکردن و مەبەست و دەیانکەنە هۆکارێك

بـۆ گومـان لـە بـنەڕەتدا کـە بـاوەڕی تـەواو دانـی پیادەنێـت، سەرسـام و دەسـتە وەسـتان دەوەستن لە نیوان تروسکایی عەقڵ و دامرکاندنیدا:

﴿مَثَلُهُمْ كَمَثَلِ الَّذِي اسْتَوْقَدَ نَاراً فَلَمَّا أَضَاءَتْ مَا حَوْلَهُ ذَهَبَ اللَّهُ بِنُورِهِمْ وَتَرَكَهُمْ فِي ظُلُمَاتٍ لا يُبْصِرُونَ﴾البقرة:١٧.

﴿يَكَادُ الْبَرْقُ يَخْطَفُ أَبْصَارَهُمْ كُلَّمَا أَضَاءَ لَهُمْ مَشَوْا فِيهِ وَإِذَا أَظْلَمَ عَلَيْهِمْ قَامُوا﴾البقرة:٢٠.

دەستەوسـتان دەبـن بەرامـبەر گومانـیان و دەڵـێن/ ئـێمە نـازانین و(لا نـدری)، و بـە (یەکگەیشـتن) ئاماژەی کردم بۆ هەق و باوەڕ تەواوو باوەڕ لە نێوەند بلیمەتەکانی هەموو گەلانێك و هەموو چەرخێك لەسەر ئەوەی کە ڕاستی یەکە و هیچ عەقڵێك بە پێچەوانەی ئەوەوە نیە لای گەلێك کە بیر بکەنەوە و دەرك بکەن و عەقڵ بەگەڕبخەن و باوەڕدارو بێ گومانبن هەروەك چۆن قورئان وەسفیان دەکات ئەی حەیران و بەراوردکردن لە نێوان بەڵگەکانی عەقڵدا بەدەربخست بۆم هەروەك چۆن قورئان لەسەر بوونی خودا ناویان دەبات (دروستکەری دەسەڵاتدارو نەخشە کێشو زاناو داناو بەتواناو وویستراو دادوەرو بە بەزەیی لەم دونیاو لەو دونیا یەك و تەنهایە، تاکو بەنیازو مەبەستە ئەوەی کەلەکەس نەبوە و کە سیشی لێ نابێت، و هیچ هاوچەشنێکیشی نی‌یە) و ئەو بەڵگانەی کە فەیلەسوفان و زانایان لە موسڵمان و ئەوانی‌تر کرد وویانەتە بەڵگە خوازی لە سەر بوونی خوداو تەنهایی و هەموو تەواوی سیفەتەکانی لە سەر ئەوەی کە هەق یەکە وە ڕێگاکانی بەڵگە خوازیش بۆی هەریەکە، گەر ڕێنمایی عەقڵ بۆ بیرکدنەوە لە خودی خۆیەوە بێت و یان لە قورئانەو وەرگیراو بێت، و ئەم بەیەك گەیشتنە لە نێوەند پەیامو نیگای عەقڵ کە خودا پێی بەخشیووین و پەیامی قورئان بێ کە خودا ناردویەتی بەڵگەیەکی ڕاست و بڕەرە لە سەر ئاینی ڕاست کە هەرگیز لە هیچ شتێکدا پێچەوانەو دژایەتی عەقڵ ناکات، و ئەمەش مەزنترین شتە کە جسر ڕێنمایی کردووم خودا پاداشتی بداتەوە، ئەی حەیران و هاوڕێکی و هاویەکی لە نیوان ئەوانەی کە قورئان ئاماژەی بۆ دەکات لە ئایەتەکانی دروستکردن و پێکهێنانی لە دیاردەکانی مەبەست و دانایی و چاکەو وردەکاریی و سەنگاندن و ڕێژەدانان و ڕێکخەرو چاودێری و کە هەموو ئاماژەی بوونی خودا دەکەن، و لەنێوند نهێنی‌یەکانی زانست کە زانایان لە پاش هاتنی قورئان بە هەزار ساڵ زانیان ، کە ئەم قورئانە لەلایەن خوداوەیە کەپاش چەند چەرخێك بۆی بەدەرخستین هەروەك چۆن

پەیمانی پێ دابووین، نیشانەکانی لە ئاسۆو خودی خۆماندا تا... بۆمان بەدەرکەوێت کە ئەم قورئانە ڕاستە.

ئەی حەیران لە موعجیزەکانی قورئاندا هەندێ شتم بۆ بەدەرکەوت کەلەوە و پێش ئەم دەزانی ئەی حەیران پاشان هۆکانی گومان و بەڵگەکانی باوەڕم ئامارکردوە جیاکردنەوە و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانیان لەسەر ئەو ڕۆشنایەیی کەلە ئەزموونی تایبەتی ژیانی خۆمدا بەدەستم هێناوە، و لەوەی کە خودێندوومەتەوە و گوێبیستی بووم لە وتەی ئەوانەی موناقەشەگیریان بووە لەسەر بوونی خودا، و بۆم دەرکەوت و باوەڕی تەواوم هێنا، بەوەی کە بەڵگەکانی باوەڕ بەدەردەکەوێت لە هەموو ئەو شتانەی کە خودا دروستیکردوون و هۆکانی گومان پەنگ دەخواتەوە لەو شتانەی کەلەنێوان خەڵکدا ڕادەی بۆ دانراوە لە جیاوازی بەش و بەختدا لە ڕسق و ڕۆزیو ماڵ و مناڵ و تەندروستیو نەخۆشیو بەرزی ونزمیو سەرکەوتوویو دواکەوتوویو خۆشیو ناخۆشی.

ژیرێك کە بۆی ڕێکەوتبێت ببینێت بەسەرنجدانێکی تیژو تەسەل بۆ هەموو ئەو شتانەی کەلە گەردوندا هەیە لەداهێنان و مەبەست و چاودێریو داناییو ووردەکاری وچاکەو فەرمان و ڕاستکردنەوە و ڕادەدانان و سەنگاندن و ڕێکخستن و جوانیو شکۆداری باوەڕ ناهێنێت چەند گومان و بەدبەختی ڕووی تێبکات کەوا ئەم گەردوونە لە خودی خۆیدا دروستبووە و پێکهاتووە بەهۆی ڕێکەوتی کوێرانەوە بەبێ هیچ دروستکەرێکی نەخشەکێش و ڕادە دەرو زاناو دانا، هەروەها هیچ باوەڕدارێك نییە هەرچەندەیش باوەڕی پتەوبێت جگە لەم دوو هاوڕێیە، بتوانێت شتی سەرسوڕهێنەر لە بیرکردنەوەیدا لاببات لە جیاوازی بەختەکان، بۆم بەدەرکەوت کە تۆژینەوە لە نهێنییەکانی قەدەر عەقڵ بەرەو خزاندن دەبات.

بەڵام بەراوردیم دەکرد لە نێوان گومان و سەرسامیدا و لە نێوان ئەوانەی کە ژمێرەو ئامار ناکرێن، زۆرینەی بەڵگەی بڕەر لە سەر بوونی خودا لە پاش سەرنجدان و تێبینیەکی زۆرو ڕاست و ڕووت بێت لە هەموو ئارەزوکارییەك و هەموو خۆپاراستنێکی خود لە گوناهەکان جیاوازی بەخت و بەش دەتوانین بیگێڕینەوە بۆ لێکدانەوەی هێمای و گەڕانەوەی بۆ هۆکارێك کە شاراوەیە لێمان یاخود داناییەك نهێنییە لامان و یاخود تێنەگەیشتنی هەڵە لە ڕاستی مانای قەدەر هەرچەندە ئەمانە هەر جۆرێك بن شاراوەن

گومانی لێکەوتنەوە لە شارراوە و نهێنییەکان زۆر لاوازترە لەوەی کە یەقینی تەواو بروخێنێ کەوا دەبینرێت و پابەندە بە بەڵگە بڕەرەکانەوە.

بەڵێ.، حەیران، ڕوداوو تەنگ و چەڵەمە بەتەواوی باوەڕ دەهەژێنێ، وا لە عەقڵ دەکات کە هەمیشە پرسیار بکات لە نهێنی دروستبوونی ئەم مرۆڤە لاوازەو هات و هاوارکەرە، ئارەزووەکانی نەفسی هەڵپەکەر دەستدرێژ دەکات تاوەکو چاو بەسمان لێ بکات لە ئاست بەخشندەیی و دانایی خودا... بەڵام ئەم گومانە هەروەکو هەورێکی خەماوی کاتیەو دەڕەوێتەوە لە سەر ئەو دڵە خەماوی و ماتەمینە... بەڵکو گەر بتەوێت پارێزگاری لەو گومانەی نەفست بکەین و، بە ئارەزوو ڕازی بکەین و، بیکەیتە یاوەری خۆت، و تێری بکەیت لە گومانی خراپ بەرانبەر بە خودا، ئەمە درێژ خایەن نابێت، گەر وابەستەی ئالای باوەڕبیت بە هەزاران پەت لەم بەڵگانەی کە خۆت ڕستوتن و بەستوتنەوە بە عەقڵتەوە لەماوەی ئەو هەموو شەوانەی کە لەگەڵ مندا بەسەرت برد...

ئەم هەموو بەڵگە عەقڵیە بڕەرانە بۆ سەلماندنی بوونی خودا گەلێ زۆر ترو، ڕونترو ئاشکراترە لەوەی کە عەقڵی سەلیم بتوانێت لێی دەرباز ببێت، لە پێناوی کارێکدا کە پەیوەستە بە جیهانی نادیار کەوا هەڵدەگرێت هێما (تأویل) ی بکەین و بگەڕێینەوە بۆ گەلێ هۆکار، یان بۆ گەلێ حیکمەت و دانایی شاراوەی خودا لێمان هەروەکو هەزارەها شتمان لێ شاراوەیە لەم جیهانە هەستیارەی کە تێیدا دەژین، ئەوەی بەدوای ڕاستیدا وێڵە ئەگەر لە ئارەزووکاری بەدووربێت واز لە یەقین ناهێنێت لە پێناوی گوماندا، گەر ئەمەشی کرد ئەوە بەزمان.دەیکات نەك بەدڵ ئەو باوەڕدارەی یەقین لە دڵیدا جێگیر بوو بێت لەسەر قەڵای هەق بەمەرج و بیانوو نیە لەخودا ناسیندا ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَعْبُدُ اللَّـهَ عَلَى حَرْفٍ فَإِنْ أَصَابَهُ خَيْرٌ اطْمَأَنَّ بِهِ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ انْقَلَبَ عَلَى وَجْهِهِ خَسِرَ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةَ ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ﴾الحج: ١١.

خودای پەروەردگار زانایە بەوەی کە ئێمە هەندێ جار بەهۆی مەینەتیەکانی ژیانەوە، لە پەرستش و باوەڕپێهێنان دەوەستین، بەئاگای هێناو بنەتەوەو چاك دەزانێت کە ئێمە تووشی گومان و دڵەڕاوکێ دەبین فەرمانمان پێدەکات کە پابەندی ئەو زانیاریانە بین کە فێری بووین لە بەڵگە یەقینیەکان، و بەدووربین لەو شتە ئاڵۆزانەی کە جگە لە خودا کەس لێکدانەوەیان نازانێت، وەك دەفەرموێت ﴿هُــوَ الَّذِي أَنْزَلَ عَلَيْكَ الْكِتَابَ مِنْهُ آيَاتٌ مُحْكَمَــاتٌ هُــنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا

تَشَـــابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلاَّ اللَّهُ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ﴾آل عمران:٧.

ئەی حەیران لە ئایەتە هەرە موحکەمە گرنگەکانە ئەو ئایەتانەی کە بەڵگەن لە سەر بوونی خودا بە بەڵگەیەکی چەسپاو، والەو زانا شارەزایانە بە نهێنی ئایەتەکان دەکات، ، کە راوەستاو بن لەسەر قەڵای یەقین بەهیچ جۆرێك شەپۆلی گومان نایان هەژێنێ هەرچەندە سەرکەش و بەردەوام بن، لە قوڵایی ژیان و ناخۆشیەکانیدا، و ئەو زانا شارەزایانە بە زانست هەر ئەوان ددان دەنێن بە لاوازی عەقڵدا لە دەرککردنی زۆرێك لە نهێنیەکانی غەیب، ئەو کاتە پابەند دەبن بەو یەقینەی کە ئایەتە موحکەمەکان رێنموی کردوون لە رێگەی بەڵگە برەرە عەقڵیەکانەوە عەقڵیان رێگایان نادات کە دەرچن لەو یەقینەی کە وابەستە بوون لە پێناوی چەند شتێکی لەیەك چوو کە ئاڵۆز بووە لەلایان تێگەیشتنی و هێماکردنی، و نەیان توانیوە یەقینێکی تری پێچەوانە دروستبکەن کە بەربەرەکانەی یەقینی یەکەم کات یان دژی بێت، ئەوانەن خاوەن عەقڵی پوخت کە رادەوەستن لە ئاست وشەی پیرۆزی (اللە)دا ئەی حەیران..

بەڵام ئەم بەڵگانەی کە ئەم ئایەتە موحکەمانەی لە خۆ گرتووە ئەگەر بە پشێو بڵاوی بمێنێتەوە نهێنیە قوڵەکانی رون نەکرێتەوە، هیچیان بەتەنها هێزو پێزیان نابێت بۆ چەسپاندنی قەڵای باوەڕ، وا بەستە بوون بەلوتکەی یەقینەوە، بەڵام گەر ئەو ئایەتانە کۆبکرێتەوە لەگەڵ راستیەکانی زانستدا لە پانتایەکدا ، ئەو کاتە بەشێوەیەك راستی بەدەردەکەوێت کە گومان ناتوانێت جێگە بەیەقین لەق بکات، بۆ ئەم مەبەستە ئایەتەکانم بۆت کۆ کردۆتەوە ئەی حەیران بەڵگە قورئانیەکان و بەڵگەی فەیلەسوفەکان لەگەڵ نمونەکانی زانستا لەیەك گۆڕەپاندا، تابۆت بەدەر بکەوێت، بەهەموو جوانی و بەهرەمەندیەکانیەوە، ئەو شێوە تەواو کارە گشتگیرەی بۆ هەق و ڕاستی کە قورئانی لە پێناویدا دابەزیوە و عەقڵی سەلیم پشتگیری دەکات.

چەند جار دۆعای خێرم کردووە بۆ شێخ جسر کە رێنمایی کردوم بۆ سەر ئەم رێبازە تایبەتە ئەی حەیران، کۆکردنەوەی ئەم بەڵگە قورئانیانە لەگەڵ بەڵگە زانستیەکان و یەك خستنیان لەگەڵ بەڵگە عەقڵیەکان، لەیەك پانتایداو بەیەك چەپك ئەمە بوو برشتی پێداو کردینە رێبازێکی سەرەتایی بۆ بەڵگەپێ هێناوە، هەمووومان ئەی حەیران قورئان دەخوێنین، هەمووشمان راستەیکانی زانست دەزانین، بەڵام پرش و بڵاوی ئەم بەڵگەو ئایەتانەی لە

زیهـنماندا وایـان لـێ دەکـات کـە هـەر یەکـەیان بەتـەنها بەرامـبەر تـەوژمی گومـان کەنەهامەتیەکانی ژیان دای دەبرێت بەسەرماندا ئەمانە لە شێوەی دلۆپە ئاودان لەنەرمی و لاوازیدا، بەلاّم گەریەکیان گرت و لەیەك سەرچاوە و هاتنە دەرێ لافاوێك پێك دەهێنن جاری وا دەبێت شاخ ڕادەماڵن، یان وەك تابلۆیەك وایە کە مەبەست بەدەستەوە نادات و هیچ واتایەك نابەخشێت ئەگەر بێت و پارچە پارچە بێت جوانیەکانی خۆی ون دەکات، مەگەر کاتێك نیشان بدرێت لە شێوەیەکی تەواودا بە بینەران.

کاتێك ڕێنمایی کرام بۆ کۆکردنەوەی ئەم زانیاري و ئایەتانە لەیەك سەرچاوەداو، بەیەك چەپك و، لەناو یەك چوار چێوەدا، گەیاندمیە ئەو یەقینە پرشنگدارە کە بۆ تۆم گێڕایەوە لەم (داستانی باوەڕ)ەدا بەزمانی فەلسەفەو زانستی قورئان....

ئەی حەیرانی کوڕی ئەزعەف:

پارێزگاری لـەم نوسراوانە بکەو کەپێم نوسیتەوە، لەگەڵ ئەم ئامۆژگاریەی دوایمدا لـەناو خەڵکیدا بلاّوی بکەرەوە، بەئومێدی ئەوەی خودا سەرلـێ شێواوەکان بەرەو ئیمان ڕێنمویی بکـات و فیکریان چاك بکات، و هیدایەتی ئەوانەیان بدات کە دەیانەوێت بەرەو وتەی باش و ڕێگای ڕاست بڕۆن.

ئەی حەیرانی کوڕی ئەزعەف.

گەر تەمەن ما بەیەك دەگەینەوە، و گەر نا دوعای خێرمان بۆ بکە.

# پێـــرســـت

ژمارەی سپاردن لە کتێبخانەی نیشتمانی کوردستان ٤٤٢ ساڵی ٢٠٠٢

ئەوەندەی ئەم کتێبە خەبات و تێکۆشانێکی بێگەردە بۆ سەرخستنی حەق و بەرزکردنەوەی قسەی خودا، ئەوەندە کەلەپورێکی فیکری تایبەتی نیە، جا بۆ ئاگاداربون لەسەر ئەم کتێبە، بریارم دا لەگەڵ خۆمدا زانای مزگەوتەکانی قاهیرە بەشداری پێبکەم، تا مەنهەجی یەقین و رێیەکانی گەیشتن بە خوا بەدیار بخەن و ڕوون بکەنەوە.

**م. محمد غەزالی**

بە پەرۆشـــەوە ئـەم کتێبـە رێـزدارەمـان دەخـوێندەوە، کـە بـە ســەلیقەیەکی زۆرەوە نوسیوتانەوە و لە قولایی مەعریفەتان کوڵیوەتەوە، تا گشت گەوهەرێکی بێهاوتا و بەڵگەی بەهێزی لێ هەڵچنرێ، بۆ لابردنی شك و گومان بەهۆی یەقینەوە و، لابردنی بێباوەڕی و ئیلحاد بەهۆی ئیمانەوە، هەروا هێنانەوەی ئەو بەڵگانەی، کە تەنها ئەوانەی دەستیان گرتووە بە هەنگڵی هێندە توند(عروة الوثقی)ی ئیمان، دەتوانن بیهێنن و، ئەوانەش کە لە زانست دا، قاڵ بونەتەوە.

**قەشە تیۆدسیوسی شەشەم**

وا مەزانە موجامەلەت دەکەم، کاتێ پێت دەڵێم: بەهۆی ئەم کتێبەوە خێر و بێرێکی زۆرت پێشکەش بە خەڵك کردووە، تۆ لە (بێستانی خوادا) روەکت چاندوە، جا گەر ژیانی مرۆڤایەتی بەم وەسفە دروست بێ.. دەڵێم لەم بێستانەدا روەکێکی وا بەهادارت ڕواندوە، کە پاداشتەکەی لەلای خوا هەرگیز نابڕێتەوە.

**خالید محمد خالید**

گەواهی دەدەم هیچ کتێبێکی کۆن، یان نوێم نەخوێندۆتەوە، کە نیوەی کتێبەکەی ئێوە زانیاری لەخۆ گرتبێ، متمانەشم هەیە، هەر مرۆڤێکی بە ئینساف، گەر گومانی گەیشتبێتە هەر پلەیەك، دوای خوێندنەوەی کتێبەکەتان، خۆی لە جوغزی ئیمان دەبینێتەوە. چونکە ئەو شێوازە جوان و ناسکەی بەرێزتان گرتوتانە بەر، سەرەڕای وردەکاری و قوڵی و گرانی بابەتەکە، وا لە بابای خوێنەر دەکات واز لە خوێندنەوەی نەهێنێت. هەروا لەڕوی ئیعجازی قورئانیەوە، کە لە بابەتی بەڵگەهێنانەوە لەسەر بونی خوا، کە ئێوە لێی شارەزا بوون، باوەڕ ناکەم، جگە لە ئیمام (ابن تیمیە) کەسی تر دەستپێشخەر بوبێت.. بە دڵنیاییشەوە ئەو بڕیارە دەدەم، گەر کەسێك هەموو تەمەنی خۆی لە کۆکردنەوەی ئەم زانیاریە بەبەهایانەی، کە کتێبەکەی ئێوە لەخۆی گرتووە، فرۆشتبێ، ئەوا ئەو کڕین و فرۆشتنەی، قازانجدار بووە.

**م. طه جابر**

من لەبەردەم کتێبێك دام، کە هاووێنەی نیە و لەسەر شێوازی ئەو دانەنراوە، ناشکرێ لاسایی بکرێتەوە، یان وێنەیەکی وەك ئەو بهێنرێ.

**د. شوكت الشطي- زانكۆی دیمەشق**